د. ڕەفعەت ئەلسەعید

# حەسەن ئەلبەننا

## کەی.. چۆن.. بۆ..

وەرگێڕانی

ەیار عومەر

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (١٥٤)

# حەسەن ئەلبەننا

## کەی؟
## چۆن؟
## بۆ؟

نووسینی
د. رەفعەت ئەلسەعید

وەرگێڕانی
جەبار عومەر

**حەسەن ئەلبەننا**

بابەت: توێژینەوە

نووسینی: د. رەفعەت ئەلسەعید

وەرگێرانی: جەبار عومەر

پێداچوونەوەی: دلێر میرزا

تایپو نەخشەسازی: سۆران عەبدوڵڵا

تیراژ: (٥٠٠) دانە

زنجیرە: (١٥٤)

سەرپەرشتیاری چاپ: عەتا مەحمود

چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری- سلێمانی

ژمارەی سپاردنی (٣٥٩)ی وەزارەتی رۆشنبیری ساڵی ٢٠٠٢ی پێدراوە

# وتەیەك

نامەوێت هیچ لەسەر ناوەڕۆك و بابەتی ئەم کتێبە بڵێم، چونکە لەکاتی خوێندنەوەدا بەئاسانی خۆی بەدەستەوە دەدات و هیچ گرێ و گۆڵ و لێڵییەکیشی تێدا نیە کەپێویست بەڕوونکردنەوە بکات. جگە لەمەش پێم وا بێت د. ڕەفعەت ئەلسەعید بەو پێشەکیانەی کەبۆی نووسیوە هیچی بۆ من نەهێشتۆتەوە کەبیڵێم. بۆیە تەنها ئاماژە بەخاڵێکی بچوك دەکەم، کە ئەمەیە ((بۆ بەتایبەت ئەو ئەرك و ماندووبوونەم بۆ ئەم کتێبە تەرخانکردو ئەم کتێبەم وەرگێڕا نەك کتێبێکی تر؟)).

دیارە لەبارەی وەرگێڕانەوە من ئەمە یەکەم کارم نیە، بەڵام ئەمجارە وام هەست دەکرد کتێبەکە خۆی بەسەرمدا دەسەپێنێت و داوام لێدەکات بیکەم بەکوردی. چونکە ئەم توێژینەوەیە بۆ بارودۆخی ئێستای کوردستان زۆر پێویستەو پڕاوپڕ لەگەڵیدا دەگونجێت، بەتایبەتی ئەو ململانێیەی برای نووسەر لەبەشی یەکەمدا ((منداڵەکە .. وەکو پیرێك)) باسی دەکات دەقاو دەق و بەهەموو شێوەکانیەوە، لەم چەند ساڵەی کوردستاندا ڕوویداوەو بەردەوامیشە، چ ململانێی نێوان ڕۆشنگەری کۆنەپەرستی، ئیسلامگەری و عیلمانی، نوێگەری و کۆنخوازی و ... هتد.دیارە لەنێو شەپۆلی ئەم ململانێیەشدا جۆرەها تەوژم و فیکرە پەیدا دەبن، کە هیچیان بێ سەرچاوە

نین ئەم توێژینەوەیەش باس لە سەرەتاو چاوگ و چۆنێتی دروستبوونی یەکێك لەو تەوژمانە دەکات.

سەبارەت بەشێوازو ڕێزمان و چۆنێتی وەرگێڕانی ئەم کتێبەش، شێوازو زمانێکی تایبەتیم پەیڕەو کردوەو زیاتر هەوڵم داوە زمانێکی کوردی سادەو تا ڕاددەیەك گشتی بەکاربهێنم، بەپێی تواناش پشتم بە وشەی سادەو باوی ڕۆژانەی سەرزاری خەڵکی بەستوەو لەوشەی بریقەداری ئەدەبی دوورکەوتوومەتەوە، لەبەرچەند هۆیەك:-

١- لەبەرئەوەی بابەتەکە خۆی ئەدەبی نیە.

٢- مەبەستی بنەڕەتی لای من ئەوەیە ناوەڕۆك و کاکڵەی نووسینەکە بگەیێنمە خوێنەری کورد تا وەك پێویست لەئامانجەکەی بگات.

٣- کە هەستاوم بەم کارە بەپلەی یەکەم بۆ ئەوەم کردووە کە خەڵکی ئاسایی و پیشەگەرو چینە مامناوەندیەکانی کۆمەڵگە لەبنەڕەت و مێژوو و فاکتەرەکانی سەرهەڵدانی ئەم بیرۆکەو تەوژمە بگەن و بزانن کەبەو شکۆیە نین وەك بەڕووکەش دەر دەکەون. واتا خەم خواردنی من لەخەڵکی بووە بەگشتی و گرنگی دانیشم زیاتر بۆ ئەوان بووە نەك بۆ ئەدیبان و سیاسەتمەداران و دەستەی باڵای کۆمەڵ.

بۆیە دەبینیت وشەکانی (منطق ، قضیة ، مذهب ، ارهاب، طاعة، مرید، مرشد، تصور، خطر، وهم، موضوع، تنازل، عقیدة، ضرورة، واسطة،

حجاب، اعلام)و زۆری تریشم هەروەکو خۆیان داناوەتەوە، تەنها هێندە نەبێت کەبەپیتی کوردی نووسیومن.

لەلایەکی دیکەشەوە، هەندێك وشە هەن ناکرێنە کوردیو بەکوردی کردنیان دەبێتە هۆی تێکدانو زۆر کات کوشتنی واتاکەی .. بۆ نموونە: (خلفاء الراشدین) بەناچاری دەبێت بکرێتە خەلیفە راشیدەکان. (اخوان مسلمین)دەتوانین بڵێین برایانی موسوڵمان، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو دەستەواژەیە هێمایە بۆ کۆمەڵو بیرۆکەو ڕێبازێك، بۆیە دەبێت بەناچاری ئەویش وەك خۆی جێبهێڵین. هەروەها سیاسەت یان سیاسی دەتوانین بیکەینە ڕامیاری، بەڵام لەوشەسازیدا مامەڵەکردن لەگەڵیدا گرانە، بۆ نمونە (تسییس الدین) دەبێتە بەڕامیاری کردنی ئایین، بەڵام ئەمە ئێجگار کاڵو کرچە. چەندەها نمونەی تریش کەباسکردنیان لەئێستادا درێژە زۆر دەکێشێت. بەهەرحاڵ خۆت لەخوێندنەوەتدا بەرچاوت دەکەون، بۆیە خوازیارم لەو بارەیەوە گلەییم لێنەکرێت، هەموو گلەییەکانیش سەر چاوان.

خاڵێکی دیکەش کە پێویستە ئاماژەی پێبکەم، ئەوەیە کە د. ڕەفعەت ئەلسەعید لەنووسیندا زمانی زۆر قورسەو عەرەبیەکی پاراو بەکار دەهێنێت، هەندێ جار بەتایبەت دەگەڕێت بۆ وشەی نابااوو ناوازە، کەدەبێت لەفەرهەنگدا بۆی بگەڕێیت، بەتایبەتیش لەم کتێبەدا شێوازێکی بەکارهێناوە بەعەرەبی پێی دەگوترێت: (قل ودل) واتا کورتو پڕ مانا، کە ئەمەش قورساییەکی زۆر دەخاتە سەر وەرگێڕو بگرە خوێنەریش، وەئەگەر لەعەرەبیدا شارەزاییەکی باشت نەبێت پەی پێنابەیت.

دەشکرا زمانێکی ئاسانترو ئاشکراتر بەکاربهێنێت، بەڵام بۆچ نەیکردووە؟ ئەوە هۆیەکەی لای خۆیەتی و خۆی دەیزانێت.

جگە لەمەش زۆر کات بەمەبەست هەندێك ئیدیۆم و پەندی عەرەبی بەکار دێنێت کە ئەوانیش گەڕان و لێکدانەوەی وردیان دەوێت، زۆربەی ئیدیۆمەکانیش تایبەتن بەدیالێکتی میسری، کەئەمیش کێشەیەکی دیکەیە....

دیارە ئەم شێوازی (قل و دل)، یەش کەدەکرێت بە کوردی، گەر وریا نەبیت، دەبێتە هۆی کاڵ و کرچکردنی زمانی وەرگێڕانەکەت و پاش و پێشکردنی گرێی ڕستەکان و پێشخستنی دەرەنجامەکان بەر لە هۆکارەکان .. بەپێی توانا پاش و پێشەکانم ڕاستکردۆتەوە، بەڵام گەرکاری کردبێتە سەر واتاکان، ئەوا وەك خۆی دامناوەتەوە.

سەبارەت بەشێوەی وەرگێڕانەکەش، ئەوا بەپێی توانا هەوڵمداوە پەرەگراف یاخود ڕستەیەك یان گەر ناچار بووبم ڕستەیەکی سەربەخۆ وەرگرم و وەری بگێڕم، بۆئەوەی کەمتر نووسینەکە ئەوەی پێوە دیاربێت کەلەزمانێکی ترەوە وەرگێراوە. بەڵام لەهەندێك شوێندا دەسەڵاتم، نەماوە وشە بە وشە وەرم گێڕاوە، ئەمیش زیاتر لەفەرمودەکانی پێغەمبەرو ئیدیۆم و شیعرەکاندا دەردەکەوێت.

بەهەرحاڵ تاچیتر لەکاتت نەگرم، دیارە هیچ کارێکیش بێ کەم و کوڕی نیەو هەمیشە بوونیش لەنەبوون چاکترە.

جەبار

بەهاری ٩٩

# پێشەکی چاپی دەیەم

## دە ساڵو دە چاپ

چەند چاپێك کەلەقاهیرەوە گەیشتوونەتە بەیروت .. عەدەن .. تونس .. پاشان دیمەشق.

لەوانەیە لەبەرئەوە بێت کەبابەتەکە پەیوەستە بەڕووداوە هەنوکەییەکەوەو شایانی باسکردنە. لەوانەشە لەبەر ئەوەبێت کە بەئیسلام بوونی سیاسی بۆ ئەوە تەقیبێتەوە تا بەسەرماندا بسەپێنێت کەلەسەرچاوەی یەکەمی کەبریتییە لەکۆمەڵەی (اخوان المسلمین)رابمێنین.

لەوانەشە لەبەرئەوە بێت کە گوتەی ((ئیرهاب بە فیکر دەست پێدەکات)) خەریکە نزیك دەبێتەوە لەوەی قەناعەت بەوانە بکات کەپێشتر نکوڵییان لێدەکرد.

گرنگ ئەوەیە......

**دە ساڵو**

**دە چاپ**

ئەمەش شتێکە پێشتر بەخۆمەوە نەمدیوە. بەرزترین ژمارە کە کتێبی من پێی گەیشتبێت پێنج چاپ بووە، کتێبی ((مێژووی بزوتنەوەی سۆشیالیستی لە میسردا ((١٩٠٠ - ١٩٢٥)).ئەمەش سەرسامو دڵخۆشم دەکات.

جارێکی دیکەش دەمەوێت جەخت لەسەر ئەوە بکەم کە لەدانانی ئەم کتێبەداو لەنووسینی هەر ڕستەو دێڕێکدا هەموو هەڵچوونێکی سیاسی و جیاوازی فیکریم خستووەتە لاوە بەردەوامیش قوتابیەکانم فێری ئەوە کردووە کەمێژوو نووسین نابێتە مێژوویەکی ڕاست و هەق، ئەگەر نووسینەکە نەتوانێت - یان پڕ بەتوانای هەوڵ نەدات - کە ڕاستیەکان ((ڕاستیەکان)) بخاتە ڕوو. مێژوونووسیش مافی ئەوەی نیە کە هەڵوێستی خۆی (سیاسی بێت یان فیکری) بسەپێنێت بۆ شاردنەوەی هەر بڕێك لەڕاستیەکان، تەنانەت کەمترین بڕیش. یاخود قەبارەی ڕووداوێك یا هەڵوێستێك گەورەتر بکات لەقەبارەی ڕاستەقینەی خۆی، یان ڕاڤەیەکی خوارو خێچ یا نالۆژێکی بۆ دابنێت، لەپێناوی ئەوەدا کە بگاتە ئەنجامێکی دیاریکراو.

بەم شێوەیە، قەڵەمەکەمم لەهەر بەرگێکی لایەنگیری شۆردەوە - یاخود بەپێی توانا هەوڵم بۆ دا- و دەستمکرد بەنوسینێکی سەخت، چونکە دەبێت هەر پارچەیەکی نوسینەکە بە بەڵگەنامەو بەڵگەی واباوەڕپێکراو پشتگیر بکرێت کە گومان لێکردن یان سڕینەوە قبوڵ نەکات.

بۆیە .........

لەڕێی دەمی ئەوان و نووسینەکانیان و بەڵگەنامەکانیانەوە قسەم کردووەو دواوم.

لەو واقیعەش کەتیایدا بوون وەرم گرتووە.

دەرمنچەلم بۆتە ئەم کتێبە.

تـەوەرەی نووسینەکانیشـم سـەبارەت بەکۆمەڵـەی ئیخـوان، لەسـەر ڕێبازێکی بنەڕەتی دەوەستێت.. ((ئیرهاب بەفیکر دەست پێدەکات))

بۆ نموونە هیچ کەسێك ناتوانێت دادگایی ئەو منداڵە نەزانە بکات کە فەرەج فۆدەی تیرۆرکرد، ئەو منداڵە یەك وشەی لەو شتانە نەخوێندبۆوە کە (فۆدە) نووسیبووی..

ئەوەیش کەخۆیان ناویان نابوو ((مەلا ئیخوانیە میانڕەوەکە))و فەتوای دابوو فەرەج فۆدە هەڵگەڕاوەیە لەئایین لایداوە، ئەویش دادگایی ناکرێت.

هـەمان شتیش سـەبارەت بـە هـەوڵی تیرۆرکردنی نـەجیب مـەحفوز. ئـەو منداڵەی کەبەچەقۆکەی لێـی دابـوو یـەك ووشـەی نـە لەڕۆمانەکـەی ((کوڕانـی گەڕەکەکـەمان)) ((اولاد حارتنـا)) و نـە هیـچ ڕۆمـانێکی دیکـەی نـەجیب مەحفوزو کەسانی دیکەشی نەخوێندبۆوە. بەڵام بیستبووی کە (شێخ فلان) فەتوای کافرێتی نووسەرو نووسینی دەرکردووە.

ئیرهاب بەفیکرەیەك دەستپێدەکات کە کەسانی دیکە، واش دەبینێت کە (دیکە کافرە)، چونکە وا خۆی دەبینێت کەتەنها خۆی ئیسلامی ڕاستەو هەر کەسیش پشتی تێبکات پشتی لەئیسلام کردووەو هەرکەسیش لێـی لابدات لەئیسلام لایداوە.

سـەبارەت بـەم گوتەیـە یـان گریمانەیـەش ((ئیرهـاب بـەفیکر دەسـت پێدەکـات))، چـەندەها گفتوگـۆ ڕوویـداوە، کـۆن و نـوێ، هـەتا هـەوڵی

بەسیاسەتکردنیئایین یان بەئایین کردنی سیاسەتیش بەردەوام بێت، ئەم گفتوگۆیانەش بەردەوام دەبێت .. ئەو هەولانەی کەبۆتە هۆی ئەوەی هەندێك کەس ((ئایین))ی پیرۆز تێکەڵ بەو هە ڵسوکەوت و بۆچوونە ((مرۆیی))انە بکەن ڕەنگە ڕاست بن یاخود هەڵە، کەزۆربەی کاتیش بەهۆی حەزی دەسەڵاتخوازیی خاوەنەکانیانەوە هەڵەدەبن، ئەو حەزەی کە بەباڵای خۆیاندا دەبڕن بەپشت بەستن بەوەی گوایاخودی فیکرەکەیان خۆی ((پیرۆزە))کەیە، نەك تەنها تێگەیشتن و ڕاڤەو ڕوانینێك بێت بۆ فیکرە پیرۆزەکە.

ئەم تەوەرانە ڕێچکەیەك بوە. بۆ چەندەها دایەلۆگی کۆن و نوێ، دوو دڵیەکیشی لادروست کردم، پاڵی پێوەنام بۆ ئەوەی خۆم بخەمە گێژاوی ئەم تاقیکردنەوەیەوە .. هەولدان بۆ لێکۆڵینەوەی یەکەمین کۆمەڵانی بەسیاسەتکردنی ئایین لەنیشتمانی عەرەبیداو .. لێکۆڵینەوەی ئەو ئەنجام و بارودۆخانەش کەبەهۆی ئەمانەوە هاتوونەتە ئاراوەو تا ئێستاش بەردەوامن تائەم بارە بێننە کایەوە کە ئێستا تێیداین لەڕووبەڕووبوونەوەی فیکری هەندێك جارو..

توندو تیژیش هەندێك جاری تر. زۆریش لەکادیرەکانی کۆمەڵی ئیخوان نەیاری ئەم لێکۆڵینەوەیە بوون، ئەمەش زۆر سروشتیەو ماڤی خۆیانە. بەڵام سەرسامی و سەیرەکە لەوەدایە کەهیچ یەکێکیان ئەو شوێن و پەرەگرافەیان دەست نیشان نەکرد کە نەیارین و لێی ناڕازین، دیارە هۆکەشی ئەوەیە

کەنووسینەکەمان هەمیشە پشت ئەستوور بووە بە ((بەڵگەنامە)) ی باوەڕپێکراو.

ڕەنگە ئەمەش بێت کەئەو نرخ و بەهایەی دابێتە کتێبەکە.

د. رفعت ئەلسەعید

قاهیرە ۱۹۷۷

# پێشەکی چاپی نۆیەم

ڕۆژگاریش تێدەپەڕێت بۆئەوەی جەخت لەسەر پێویستی ناسین و زیاتر ناسینی ((توندڕەویی ئاینی)) بکات، سەرچاوەکانی، چاوگەکانی، بنەمافیکریەکانی، ڕێبازەکانی لەسیاسەتدا، شێوازەکانی لەکارکردندا.

ڕۆژگار تێدەپەڕێت بۆئەوەی ئەم پەندە فیرعەونیە دێرینە - پڕ ماناو حیکمەتە - دووپات بکاتەوە کەدەڵێ:((قوڕ بەسەر ئەو کەسەی باش شارەزای قەڵای دوژمنەکەی نیە لەناوەوە)). لەگەڵ هێور بوونەوەی گەردەلولی ((ئیسلامی سیاسی))، یان توندوتیژبوونی سەرەڕای ئەوەی لاف عاقڵی و گوێڕایەڵی لێ بدات یان یاخی بوون و ((جیهاد)) ڕابگەیەنێت، سەرەڕای ئەمەش و ئەوەش، توندڕەویی ئاینی دیاردەیەکی ترسناکەو شایانی ئەوەشە کەزۆر هۆشیارانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و بەهیچ شێوەیەك خۆی لێ گێل نەکرێت.

هەموو مامەڵەکردنەکانیش بێسوودن ئەگەر سەرچاوەو بیروبۆچوون و شێوازو ڕێبازەکە نەناسین ...

بەڵام، چۆن پەیوەندیم بەم مەسەلەیەوە دەستی پێکرد.

لەکانوونی دوومی (١٩٧٧) داو دوابەدوای ڕوداوە ئاڵۆزەکانی، یەکەمین سەردانم بۆ زیندانی ((قەڵا)) دەستی پێکرد، ئەمیش دواهەمین زیندانبوو لەو زیندانانەی دەوری قاهیرە کە سەردانم نەکردبوو، رەنگە پێویستیش بووبێت کە بازنەکە بێکەمو کووڕی تەواو بێت.

کاتێکیش دەرگای زیندانەکە داخرا، خۆم لەبەردەم تابلۆیەکی دیواریی سەرسوڕهێنەردا دییەوە، دەیەها بەڵکو سەدەها نامەی هەڵکۆڵراو لەسەر دیواری زیندانەکە هەبوو.

چەندەها کەس هاتوون و ڕۆیشتوون و پشتیان بەم دیوارەوە داوە.

چەندەها کەس سەعاتەکانی وەڕسی و بێزاریان بەتێڕامانەوە بەسەر بردووە، پاشان خۆیان یەکلایی کردۆتەوەو بڕیاریان داوە بەشداری لەنەخشاندن و جوانکردنی ئەم تابلۆ دیوارییەدا بکەن، ((کەوچك))کە - تەنها شتی ڕەقە ڕێگای پێ دەدرێت ببرێتە ژووری زیندانەوە - بەدەستەوە گرتوویانە بەدەستەوەو کەوتونەتە هەڵکۆڵین لەسەر دیوارەکە بۆ ئەوانەی کەپاش خۆیان دێن.

ڕەنگە دەربڕینیان لەخۆڕاگری خۆیان کردبێت، یاخود ورەی خۆیان یا ئەوانەی پاش خۆیانیان پێ بەرز کردبێتەوە .. لەسەر دیوارەکە چەندەها

وتارو نوسین چووبوون بەیەکدا، هەندێك شیوعی، هەندێك ناسری، هەندێك تەجەموعی، کرێکارانی گواستنەوەی گشتی، شێخ ئیمام. بەلآم چاوم چەندجارێك گەڕایەوەو لەبەردەم کۆمەڵە نوسراوێکی هەڵخزاوی نوێدا وەستا (کل هم یزول) ((ئەبو هەیسەم))، (دولة الظلم ساعة ودولة الحق حتى قيام الساعة) ((ئەبو قەعقاع))، (إنا أنزلنا الذكر وانا له لحافظون) ((ئەبو زرغام)).

هەموو ئەوانەی دیکە دەناسم‌و، تەنانەت خەریکە دەربڕین‌و دەست‌و خەتەکانیش جیادەکەمەوە .. تەنها ئەبو هەیسەم‌و ئەبو قەعقاع‌و ئەبو زرغام‌و براکانیان نەبێت..

لە چەند زیندانێکی تردا برایانی موسوڵمان (الاخوان المسلمين)م ناسی، پێکەوە ژیاین، بەیەکدا هەڵچوین (شەڕمان کرد)، هەر یەکەمان ڕوانینەکانی خۆی لەناخی ئەوی دیکەدا چەقاند. بەلآم ئەمانە پۆلێکی تر بوون‌و وەکو ئەبوزرغام‌و ئەبو قەعقاع نەبوون، هەرچەندە کەهێڵەکانی بەیەکگەیشتنیان‌و نیشانەکانی درێژبوونەوەشیان لەیەکتری ڕوون‌و ئاشکرا بوو..

بەم شێوەیە، چەند ساتێکی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ نادیارێکی نوێ لەبەردەممدا ئاشکرابوو. کەڕووداوە پێشینەکانی وەکو تریشقەو تەقینەوەیەك تێپەڕی‌و تەنانەت توانای بەئاگاهێنانەوەی نائاگاکانیشی هەبوو. ڕووداوەکانی پەیمانگای هونەری سەربازی، ڕفاندنی شێخی ئەلدەهبی، کۆمەڵی تەکفیرو هیجرە. بەلآم بەداخەوە بێ ئەوەی سەرنج‌و

ئاگاییمان بۆلای خۆی ڕاکێشێت تێپەڕی، تەنانەت بێ ئەوەش کەپێویستی ئەوەمان لا دروست بکات بیری لێبکەینەوەو لێی بکۆڵینەوە.

... بیرۆکەی ئەوەیش کەلەم دیاردە نوێیە ڕابمێنم ئەقڵمی داگیرکرد، وەکو هەر هەوڵێکیش بۆڕزگار بوون لەو خامۆشیەی کە زیندانێکی ڕوت و قوت و هەمیشە داخراو بەسەرمدا سەپاندبووی، زیاتر لەجارێك بڕیارم دا کە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەم.

پاش چەند مانگێك کەمێك زیندانەکە کرایەوە، نەك بۆ ئەوەی بچمە دەرەوەو زیندانەکە بەجێ بهێڵم، بەڵکو تەنها بۆئەوەی کتێب و ڕۆژنامەو کاغەزم بەدەست بگات و هەر شتێك هەڵبژێرم کەپەیوەندی بەم بابەتەوە هەبێت .. کەشتێکی تەواو تازە بوو سەبارەت بەمن.

.. پاش تێڕامانێکی قووڵیش، دەبینم کەپێویستە لەسەرەتا ڕاستەقینەکەوە دەست پێ بکەم، سەرچاوەی بنەڕەتی توندڕەویی ئایینی و ئیسلامی سیاسی، پێکەوە.

گەر نەشگەڕێمەوە سەر بنەڕەتەکەی، چۆن دەتوانم لەدەرەنجامەکەی بکۆڵمەوە.

چۆن دوای ڕێڕەوی موریدە شوێن کەوتوەکان بکەوم، هەرچەندە هەڵیشگەڕابنەوە پەیامی گوێڕایەڵیشیان شکاندبێت، بێ ئەوەی بەلێکۆڵینەوەی خودی شێخ دەست پێبکەم.

بەم شێوەیە بە حەسەن ئەلبەنناو کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین دەستم پێکرد.

هەموو ئەو ماوەیەی زیندانیش کەمابووم بەئامادەکردنی بابەتەکانی ئەم کتێبە بەسەرم برد، کەبەریش بووم تەواو لەئامادەکردن و نووسینەوەیدا نقوم بووم، لەڕۆژەکانی کۆتایی ساڵی (١٩٧٧) یشدا چاپی یەکەمی دەرچوو..

سەرسام بووم لەو هەرایەی کتێبەکە نایەوە، ڕەنگە لەبەرئەوەبێت کە یەکێکی وەك من وێرابێتی ئەوە بکات،قەڵای نەیارە بەرامبەرەکەی - کەهەندێك کەس وایان دەزانی زۆر سەخت و قایمە - بڕێت و چووبێتە ناویەوە. یان ڕەنگە لەبەرئەوەبێت کە من بەهەموو توانایەکمەوە هەوڵم داوە پابەندبم بەمەوزوعیەتی توێژینەوە ئەکادیمیکەوە، هیچ شتێکیشم بێ بەڵگەنامە نەنوسیوە، بەشێوەیەك کەتوندڕەوەکانی ئیخوان لەبەردەم کتێبەکەدا پەست و تووڕەبوون و تەنانەت فەتوای (کافر)یشیان دەرکردم بێ ئەوەی توانای مشتومڕو گفتو گۆ کردنیان هەبێت لەسەری ..

پاشان .. نۆ چاپ .. ئەمەش بوو کە خەونیشم پێوە نەدەبینی و .. بەخەیاڵیشمدا نەدەهات. ڕەنگیشە هەر خۆی بەس بێت و بگرە زیادیش بێت .. پێویستیش نەکات من قسەی لەسەر بکەم.

ڕووداوەکانیش تێدەپەڕن بۆئەوەی پێویستی زیاتر بێننەکایەوە بۆ بەردەوام بوونی گەڕان بەنێو قەڵای توندڕەوی ئاییینیدا، جۆگەو لقەکانی

سەرچاوەکە ڕوو لەکوێ دەکات، چۆن دەتوانێت بۆ خییانە بەردەوام بێت، بەردەوام بونێکی تایبەت و ڕەتکەرەوەی هەموو بنەڕەتێك. چۆن ئەو لقانە لە ووتەکانی ((کۆمەڵی ئیخوان))ەوە، کەباس لەنەزانی کۆمەڵگە دەکەن، ئامرازێك بەدەست دێنن بۆ هێرش کردنەسەر خودی کۆمەڵە چونکە خۆیان لەگەڵ (تاغوت) دا دەژین و مامەڵە دەکەن.

لەگەڵ هەڵقولانی کەحەزو فاکتەرەکانی توندڕەوی ئایینیشدا سەرلەنوێ دەنوسمەوە، لەنێوان ئەو شتانەشدا کە نوسیومن دوو بابەت هەڵدەبژێرم بۆئەوەی وەکو تەواوکاریەکی پێویست بۆ ئەم کتێبەی زیاد بکەم. دووبابەتەکەش ئەمانەن ((ئیسلامی سیاسی لەتوندڕەوییەوە بۆ زیاتر توندڕەوی)) و ((ئیخوان موسلیمین و کرێکاران)).

زیادکردنی ئەم دوو بابەتە تەنها بۆ ئەوە نیە کەجیاوازیەکانی نێوان، سەرچاوەکەو کۆتایی لقەکانی، ((حەسەن ئەلبەننا))ی ڕابەرو شوێن کەوتوە هەڵگەڕاوەکانی وەك شوکری مستەفاو عومەر عەبدولڕەحمان و ئەوانەی دیکە، ئاشکرابکەم ...

بەڵکو لەپێناوی ئەوەدایە ئەوەی کەخۆم باوەڕم وایە ڕاستە بیسەلمێنم- کە (ئەمە لەوەیە) واتا ((کۆمەڵە ئیسلامیەکان بەو توندڕەوییەیانەوە کەجێگای سەرسامی و شلۆقیەو، ((ئیخوان)) هەوڵدەدەن نکوڵی لێ بکەن و لەکۆڵ خۆیانیان بکەنەوە، هەموویان ((ئەم کۆمەڵانە)) تەنها درێژکراوەیەکی

ئەو هێڵەن کەحەسەن ئەلبەننا کێشابووی، درێژکراوەیەکی سروشتیشن و دەرەنجامێکی مەنتیقی هزرو گوتەکانی ئەویشن)).

جیاوازیەکانیشیان تەنها لەم شتانەدایە .. تەکتیك، هەڵبژاردنی کات، توانای بەڕێوەبردن.

ڕەنگە هەندێك کەس لەگەڵ بۆچوونەکەی مندا کۆکبن یان جیاوازبن، بەلام ڕاستیەکە ئەوەیە کە مەحاڵە بتوانین لەم بارەی ئێستا ڕابمێنین، بەهەموو ئەو توندڕەویە نامەنتیقیەوە کەتێیدایە، بیٚ ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەکەو .. بۆ خاوەنی یەکەمی بانگەشەکە ((حەسەن ئەلبەننا))و بەم شێوەیەش .. دیارە دەرچوونی ئەم کتێبەش، بەتایبەتی لەم کاتەدا، لەهەموو کاتەکانی ڕابردوو پێویستترە.

ئێمە کە ڕووبەڕووی مەترسی ((فیتنەی تایەفەگەری))و لێکترازانی یەکێتی‌نیشتمان و هاوولاتیان دەبینەوە، ناتوانین خۆمان لەلێکۆڵینەوەی هەموو ئەو شتانە گێل بکەین کە ڕوودەدەن و دەست لەسەرە داوەکانیان بەردەین..

ناتوانین خۆمان لەو پەندە پڕ مانایە گێل بکەین کەدەڵێت ((قوڕ بەسەر ئەو کەسەی باش شارەزای قەلای دوژمنەکەی نیە لەناوەوە)).

د. رفعت السعيد

قاهيره – يونيو ١٩٩٠

# پێشەکی

## کەی ... چۆن و ... بۆ ؟

### کــەی...؟

کەی نووسەر یان مێژوونووس دەتوانێت ئازایەتی بەدەست بێنێت، بۆ ئەوەی بەرەو تێگەیشتن یان لێکۆڵینــەوەی ڕووداوێکــی مێژوویــی، یـاخود کەسایەتیەکی مێژوویی ڕێگا بگرێتەبەر؟

ئەمەیە ئەو پرسیارەی کەزۆربەی سەرسام کردووە..

زۆرجار بریسکەی ڕووداو لەساتێکی مێژوویــی دیـاریکراودا بەشێوەیەك دەدرەوشــێتەوە کــەپاڵ بــەزۆر کەســەوە دەنێــت بەپەلــە بکەونــە نوســین. زۆرکــاتیش دیــدی سیاســی یــان ئیعلامــی لەگــەڵ بۆچــون و خــەملاندنی لێکۆڵەرەوەی مێژوودا تێکەڵ دەبێت، ئەمەش کاردەکاتە ســەر تەســەوری لێکۆڵەرەوەکــە ســەبارەت بەئاســتی پێگەیشــتنی بابەتــە مێژوویەکــەو ئامادەبوونی - وەکو بابـەتێك- بۆئەوەی ببێتە ماددەیەك بـۆ لێکۆڵینـەوەی مێژوویی.

زۆر جاریش ڕووداوێك دەپێچرێتەوەو پشتگوێ دەخرێت .. پێدەگات و دەشبێتە بابەتێك کەشایەنی لێکۆڵینەوە بێت، بەلاّم بەهۆی نەبوونی بریق و باقی ئیعلامی یان درەوشانەوەی سیاسیەوە، کە پاڵ بە زۆر کەسەوە دەنێت گرنگی پێبدات، پشتگوێ دەخرێت و لێکۆڵینەوەی لەسەر ناکرێت.

ڕووداوی مێژوویی - بەبۆچوونی من - بوونەوەرێکی زیندووە، سوڕێکی ژیانی تەواوی هەیە. پاشان هەوڵدانیش بۆ لێ نزیك بوونەوەی یان لێکۆڵینەوە کردن لەبارەیەوە دەبێتە خەتەر بۆسەر هەقیقەت و بگرە دەبێتە فشاریش لەسەری، گەر بابەتەکە سوڕی ژیانی تەواو نەکردبێت و لەبەردەم مێژوودا وەکو بوونەوەرێکی گەشەسەندوو قوت نەبووبێتەوە.

ڕەنگە جێگای داخیشبێت لەتوێژینەوەیەکی ئەکادیمیدا، توێژینەوەیەکی سیاسی بەنوسینێکی ئیعلامی بە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی تێکەڵ ببێت، لەنووسینێکدا کەباس لەجۆرە بابەت و ڕوداوێکی مێژوویی بکات کەهێشتا پێنەگەیوەو پاشانیش نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی ببێتە جێگای لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی جدی.

وەکو وەڵامدانەوەیەکیش بۆ ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە .. کەی توێژەر دەتوانێت لەلێکۆڵینەوەی ژیانی پێشەوایەکی سیاسی وەك حەسەن ئەلبەننا نزیك بێتەوە؟ ئایا کاتی ئەوە هاتووە کە ئەم کەسایەتیە هەڵکەوتووە بخرێتەژێر لێکۆڵینەوەیەکی وردەوە کەڕەهەندێکی ئەکادیمی هەبێت؟.

لەڕاستیدا ڕووداوە مێژوویەکە ئێستا لەخودی حەسەن ئەلبەننادا لەترۆپکی کامڵی و گەشەکردندا دیارە، بەتایبەتیش لەم ماوەیەدا ((ئیمامی شەهید)) بەهەموو کردەوە چاك و خراپەکانیەوە، لەبەردەم دادگای مێژوودا ڕادەوەستێت.

ئـەو پيـاوەی کـە گـەورەترين بـڕ لەمـەزنی و ڕەنگـە پيرۆزيشـی لەلايـەن سەدەها هەزار لەموريدو شوێنكەوتوانيەوە پێ بەخشرابوو. ئەو پياوەی کە بەسادەيی و قسەخۆشی خۆی و بەوەی کە بەشـێوەيەكی ويژدانـی پوخـت باسی شتەكانی - هەموو شتەكان - دەكرد، توانيبووی ئەم هەزارەهايانـە شـەيدای خـۆی بكـات و جڵـەويان بگرێتـە دەسـت .. لێيـان ڕازی نـابێ و ئەوانيش درێغی ناكەن لەوەی ملكەچی ڕەهاو گوێڕايـەڵی تـەواوی بدەنـێ لەهەموو كارێكدا كەبەدڵيان بێت يان نا.

ئەو مامۆستا سادەيەی، كە ڕۆژێك لەڕۆژان چووەسەر لەشانۆی ڕووداوە سياسـيەكانی ميسـرەوە تـا - لـەناكاو - يـەكێك لـەديارترين و سـەيرترين ڕۆڵـەكان ببينێـت و، گەمـەش - يـاخود خـۆی پێـی وابـوو - بەزۆربـەی سەركردەو پێشەواو هێزەكان بكات.

هـەوڵيش بـدات هـەموان واتێبگەيـەنێت و بگرە خۆشيی واتێبگەيـەنێت كە توانيوێتی جڵەوی ئەوانيش بگرێتە دەست و دەتوانێت زۆر بەئاسانی و لێهاتوانە گەمەيان لەگەڵدا بكات و پێبكات.

ئـــەو شـــێخەی .. كەهــــەموو خۆشەويســــتيەكی لەلايــــەن موريــــدو شوێنكەوتوەكانيەوە پێبەخشرابوو. هێرشێكی زۆر زۆريشی لەلايەن نەيارە سياسی و فيكريەكانيەوە دەكرايە سەر.

چـەندەها نازناويـان بـۆ دانـابوو وەك ((ئيمـام)) ((مورشـيد)) ((پيـاوە قورئانيەكـە)) ((پيـاوە ڕەببانيەكـە)) و زۆری ديكـەش لەدەسـتەواژەی

پیرۆزکردن و گەورەکردن. چەندەها دەستەواژەی هێرش کردنیشی لەلایەن نەیارە سیاسیەکانیەوە بۆ داڕێژرابوو، وەك ((حەسەنی راسپۆتین)) و ((شێخی جادووگەر))و چەندەها دەستەواژەی هێرشکردنی سیاسی دیکەش، کەڕەنگە بەپێی پێو دانگەکانی ڕۆژنامەگەری و نەریتە باوەکانی کاری سیاسی سالانی چلەکان، سنوریان بەزاندبێت.

ئێستا ..... نەك پێشتر - سوڕی ڕوداوە مێژوویەکە کامڵ دەبێت، پێدەگات، بەروبووم دەبەخشێت، لەمنداڵدانی هەقیقەتدا ڕادەکشێت، قولاییە مێژوویەکەی بەدەستدێنێت و توێژەر دەتوانێت لێی نزیك ببێتەوەو هەوڵبدات لێکۆڵینەوەی لەسەر بکات، یان هیچ نەبێت لێی تێ بگات.

بەلام دوێنێ - چەند سالێکی کەم بەر لەئێستا - مەسەلەکە سەخت بوو، توێژینەوەکە هەرچەندیش ئەکادیمی بووایە، بەناچاری تێکەڵ بە ڕەخنەیەکی سیاسی و دەمەقالەیەکی ئیعلامی زۆر دەبوو. ڕەنگ بوو هەڕەشەی ئەوەشی لێ بکرایە کەقوولایی مێژوویی و درێژبوونەوەی ئایندەی نیە. ڕەنگبوو مەترسی ئەو تەسەورەشی بهاتایەتە سەر، کە بانگەشەی ((شێخی بەننا)) لەژێر فشاری سیاسی و پۆلیسیدا بەشێوەیەك نەماو بزربوو کە گەڕانەوەی نەبێت. ڕەنگبوو توێژەریش بکەوتایە خەتەری دەرکردنی چەند حوکمێکەوە کەلەسەر ئەم وەهمە بنیات دەنرا.

ڕووداوی مێژوویی کامڵ دەبێت، پێدەگات، گەشە دەکات، لاواز دەبێت، ملکەچدەبێت، هەڵە دەکات، سەرلەنوێ سەر هەڵدەداتەوە .. بەم شێوەیەو

لەرێی ئەم گێرڤانەوە توێژەر دەتوانێت بەدوای ڕاستیدا بگەڕێت و ڕێگای بگرێتەبەر. ئەگەر قول نەبێتەوە بەنێو ئەم کێرڤە خوارو خێچانەداو لەگەڵیاندا بەرزو نزم نەکەیت، ئەگەر بەدوای لێکدژەکاندا نەگەڕێیت و لەرێی ڕێچکەکانی ململانێ و بەیەکدا دانە چالاك و خامۆشەکانەوە بەرێوەیان نەبەیت و لەگەڵیاندا نەڕۆیت، ئەوا ڕاستیەکان ڕووکەش دەردەکەون.

هیچ ڕاستیەکیش نیە کەڕووکەش بێت، ڕاستی - بەتایبەت ئەگەر پەیوەست بێت بە کارێکی سیاسی کاریگەرەوە - بەهیچ شێوەیەك ناتوانێت بێ قولایی بێت ..ناشتوانرێت بەهێڵێکی ڕاست پێی بگەیت، هێڵێك کەنێوانی دوو خاڵ بەیەك بگەیەنێت.

ئێستاش .. کە کۆمەڵی موسلیمین سەرلەنوێ دەستی کردۆتەوە بەچالاکی و نووسین و ئەدەبیاتەکانی دەردەکات و بڵاودەکاتەوەو، سەرلەنوێ ئاڵاو بەیداخەکانی بەرز دەکاتەوە. وێنەی ((ئیمامی مورشید)) وا دەردەکەوێت کەڕەهەندە مێژوویەکانی فۆرموولەبوو بێت. توێژەری ئەکادیمیش هان ئەدات بۆ ئەوەی هەوڵ بدات لێی نزیك بێتەوەو بیناسێت.

## چۆن...؟

ئەمە پرسیارەکەی ترە!

چۆن یەکێکی وەك من بتوانێت لەم بابەتە ئاڵۆزە نزیك بێتەوە. چونکە بتەوێ و نەتەوێ دەچێتە قاڵبی دژایەتی سیاسیەوە .. بگرە ناشی شارمەوە.

ڕەنگە هەندێك کەسیش وای بۆ بچن کە یەکێك لەنووسەرە چەپڕەوەکان بڕیاریداوە سێدارەیەکی نوێ بۆ ئیمامی شەهید هەڵبخات. ترسی دروستبوونی ئەم بۆچونە هەڵەیەش وایلێکردم دوو دڵ بم لەوەی کەخۆم لەم بابەتە بدەم، بگرە پاڵی پێوەنام کەچەند جارێکیش دوایبخەم.

کاتێك بڕیارمدا زنجیرەی ((سەرکردەکانی کاری سیاسی لەمیسردا)) دەر بکەم، وێنەی فۆرمولەبووی شێخی بەننا وەکو بابەتێکی مێژوویی لەئەندێشەمدا دەدرەوشایەوە، بەلاّم گومانی لایەنگیری بۆ ماوەیەك دووری خستمەوەو ڕێگەی لێگرتم.

ڕۆژگارەکانیش تێدەپەڕن و... هەر ڕۆژەش شتێکی نوێ لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت کە پاڵمپێوە دەنێت بۆئەوەی سەرلەنوێ بیر لەم بابەتە بکەمەوە.

بەلای کەمەوە پێویست بوو لەسەر من، هەروەها لەسەر هەموو ئەوانەش کە بە سیاسەت یا هزر یا مێژووەوە سەرقاڵن، یاخود هەموو ئەوانەی کەبیرو هۆشیان سەرقاڵبووە بەئایندەی میسرو توانای‌یەوە بۆ خولقاندنی قیکرێکی

شارستانیی پێشکەوتووی وەها شایانی ئێمە بێت کە وەکو ئادەمیزادێك لەسێیەکی کۆتایی سەدەی بیستەمدا دەژین. دەڵێم پێویست بوو لەسەرم کەبەقوڵی و وردی بیربکەمەوە لەدیاردەی ((ئیخوان موسلیمین)) و ئەو مەفیکرییانەی کە ئیخوان لەمیسردا خوڵقاندونی، کە ڕەنگە درێژەی خۆی بن یان یاخی بوون بێ لێی. هەروەها لەدیاردەی ((دەمارگیریی ئایینی))ش کەبەپێچەوانەی هەموو یاسایەکی سەردەم و هەموو لۆژێکی ژیرانەو ئاقڵانەوە دەستی بەگەشەسەندن کردووە.

بەلای کەمەوە، ئەو ئاڕاستە نوێیانەی کەلەنێوان لاواندا پەیدا ببوو، کۆمەڵانی ((تەکفیر و هیجرە)) و ئەوانەی دیکەش هەروەها پەیوەندی هەموو ئەمانەش بەو بانگەشەیەکە شێخی بەننا ژیانی خۆی لەپێناودا بەخشی، ڕایدەکێشام بۆلای ئەم بابەتە.

بەننا کێیە؟ ڕاستی ئامانجەکانی چییە؟ لێپرسراوێتی بەرامبەر هەموو ئەو شتانەی ڕوویداو ڕوودەدات و لەئاییندەدا ڕوودەدەن چییە؟

جارێکی تر چۆن؟

چۆن یەکێکی وەکو من دەتوانێت بچێتە ئەم مەیدانە سەختەوە، هەموو باسکردنێکی ئیجابیانە بەتەنازولێکی فیکری لەقەڵەم دەدرێت بەرامبەر

بەنەیارێکی سیاسی و فیکری توندوتیژ، هەموو باسکردنێکی سلبیانەش بەسزادان یان ستەم لێکردنی نەیارێکی سیاسی و فیکری لەقەڵەم دەدرێت.

ئەم شتانە بۆ ئەوە باسناکەم لێپرسراوێتیم بەرامبەر بابەتێك لەئەستۆی خۆم لابەم کەخۆی لەخۆیدا زۆر ئاڵۆزە. بەڵکو تەنها دەمەوێت خوێنەر متمانە بکات کە هەموو توانایەکم بەکار دەبەم و هەوڵ دەدەم بەرەو لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیی ڕێگام بگرمەبەر. من خۆیشم زۆر پێویستم بەم (بابەتی)ە هەیە لەپشکنین و توێژینەوەو گەڕاندا، بەئومێدی ئەوەی چەند سەرەداوێك بدۆزمەوە کە بمگەیەنێتە تێگەیشتنێکی دروستی ئەم دیاردەیە .. تێگەیشتنێك کە خۆم پێویستم پێی هەیەو، زیاتریش پێویستم بەوەیە کەڕاست و وردو بابەتیانە بێت، دەنا ترازووی هەڵسەنگاندنەکانم لاسەنگ دەبێت بەرامبەر بەتەوژمێکی فیکری کەچەند باوەڕم بەگرنگیی هەیە، هێندە باوەڕم بەترسناکیش هەیە.

## بـــۆ..؟

کەواتە بۆ ئەم بابەتە ئێستا بایەخدار دەردەکەوێت؟

گوتم - یان من وای بۆ دەچم - کەبابەتی مێژوویی بوونەوەرێکی زیندووە .. پەلەکانی ئەو فیکرەی کەشێخی بەننا کۆششێکی زۆری لەچاندنیدا کردبوو، ئێستا بەشێوەیەکی زۆر بەپەلە نوێ دەبێتەوە، ڕەنگیشە بەشێوەیەك پەل و پۆی لێ ببێتەوە کە هاوەڵانی بانگەشەکەو دوژمنانیشی پێکەوە بترسێنێت. چونکە لەگەڵ پەل و پۆ دەرکردنەکەدا چەند ڕێچکەیەکی توندڕەوو بەڵکو زۆر کات توندو تیژیش وەردەگرێت. پاشان هیچ هەوڵێکی جدیش بۆ تێگەیشتنی ئەم درێژکراوانەی ئێستا، بەپەل و پارچەکانیشیەوە، دەبێتە شتێکی مەحاڵ ئەگەر بەوردی سەیری قوڵایی ئەو بیرە نەکرێت کە ئەم هەموو شەپۆلە لەئاوەکەی دەرهێنراوە.

((بۆ)) یەکی تریش پەلەدەکات کەخۆی بسەپێنێت.

بۆ بەتایبەت حەسەن لبەننا..؟

بۆ کەسەکە خۆی، نەك کۆمەڵەکە؟

نامەوێت بۆلای وەڵامە ئاسانەکە خۆم بدزمەوەو پاساوی ئەوە بێنمەوە کە کتێبەکە تەنها ئەڵقەیەکە لەزنجیرە کتێبێك سەبارەت بە سەرکردەکانی کاری سیاسی و سەبارەت بە کۆمەڵ و حیزبە سیاسیەکان نیە.

وەڵامی ڕاست ئەوەیە کە حەسەن لبەننا تەنها دروست کەرو [illegible] ێنەرێك نەبوو بۆ کۆمەڵەکە، تەنها سەرکردەو چین دانەرو ڕێ و شوێن

دیاری کەرێك نەبووە بۆی .. بەڵکو زۆر لەمە زیاتر بووە سەبارەت بەکۆمەڵەکەو هەریەك لەتاکەکانیشی.

مەسەلەکە وێناکردنی گرانە، دیاریکردنی قەبارەو ئامانجی شوێن کەوتنێکی سۆفییانە بۆ ئیمام یان شێخ بەنوسین قورسە، ئیتر هەرچەندە دێرەکانو نووسینەکەش دوورو درێژبێتو هەرچەندە هاو واتا ڕەوانبێژیەکانیش بەکاربرێت.

مەسەلەکەش لەکاتێکدا زیاتر ئاڵۆز دەبێت .. کە ملکەچیی مورید بۆ شێخەکەیو پابەندبوونی بەسوێندی بەیعەکەوە تێکەڵ بەو گوێڕایەڵیە کوێرانە دەبێت کە هەڕەشە لەپەیمان شکێن دەکات - نەك تەنها لەداماڵینی بەرگی ئەندامێتی کۆمەڵەکە یان موریدی - بەڵکو لەبەرگی موسوڵمانێتیش دەچێتە دەرەوە .. هەروەها کاتێکیش کەپەرۆشیو خۆشەویستیو ملکەچی ڕەهاو متمانەی تەواو، کۆدەبنەوە بۆ ئەوەی تێکەڵ بەکاری سیاسی پڕ لەپێچو پەناو پڕ لە بازبازێن بێن.

لێرەدا پێوەرەکان لەرزۆك دەبنو ڕابەرە ئاینیە - سیاسیەکەش دەبێتە کەسایەتیەکی دەگمەن، جیاکردنەوەو دەرکێشانی ئەوەیش کەتاکە کەسیە لەوەی گروپییە دەبێتە کارێکی مەحاڵ.

سەیریش ئەوەیە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەکەو مێژووەکەی، ئەگەر لەچوارچێوەیەکدا بکرێت کەبەدەر بێت لە شێخ، ئەوا لێکۆڵینەوەیەکی کەم و کورِ دەردەچێت. و ئەرکی تێگەیشتنێکی تەواوی بابەتەکەمان لەجێ نەگەیاندووە بەڵام ئەگەر ڕووی ڕووناکیەکان بکرێتە شێخ، کەهەموو سەرەداوەکانی کۆمەڵەکەی لەنێوان پەنجەکانیدا کۆکردبۆوەو توانیبووی شارەزایانەو لێهاتوانە کۆمەڵەکەش و دڵی هەموو موریدەکانیشی ببزوێنێت، ئەوا توێژینەوەکەمان زۆر بەپێزترو کاملتریش دەردەچێت.

هەموو گەشتەکەش لە چل و سێ ساڵ زیاتر نیە (١٩٠٦ - ١٩٤٩) .. لەم چل و سێ ساڵەدا شێخ بەشاخەکەدا سەرکەوت و، هەموو تێشوویەکیشی ئامادەکرد کەبەپێویستی دەزانی بۆ خۆی و کۆمەڵەکەی. ئەم تێشوەش بۆ گەشتێك بوو کەشێخ وایدەزانی هەموو حەزو ئاواتەکانی پێبەدی دێت، ئەو ئاواتانەی کە نەك تەنها پەیوەستبوو بەکەسایەتی شێخ یان کۆمەڵەکەی یان تەنانەت نیشتمانەکەیەوە، بەڵکو فراوان ببوو بۆئەوەی کەهەموو موسوڵمانێکی ئەم جیهانەش بگرێتەوە چونکە بەلای شێخەوە ئیسلام نیشتمانە، بەڵکو تاکە نیشتمانیشە.

شێخ سەنگ و سەرکەوتنێکی زۆری بەدەست هێنا، تەوژمەکەش وا دەردەکەوت کە لەگەڵ ئەوداو بەپێی ئارەزوی ئەو بچێت بەڕێوە. بەڵام لەگەڵ

ئەوەشدا دڕکودالێکی زۆریشی تێوە ئالآبوو .. کۆتاییەکەشی لەسەر دەستی چەند هێزێك بوو کەتێکەڵیان ببوو، بۆبەرژەوەندیشیان کاری ئەکرد. وایدەزانی بۆ بەرژەوەندی بانگەشەکەی دەسەمۆیان دەکات، بەڵام هێندە بەخۆی زانی ماوەیەك بوو بەکاریان دەهێناو، هەر کەنیشانەکانی یاخیبوونیشی پێوە دەرکەوت کەوتنە چەکوش بەسەرداکێشانی .. پاشان کوشتیشیان.

گەشتەکە زۆر کورتە، چل و سێ ساڵ، بەڵام زۆر پڕو تەسەلەو هەموو ساتەکانیشی شایانی ئەوەیە کە بەوردی و تێڕامانەوە لێی بکۆڵرێتەوە.

نیشانەی پرسیارەکان سەرلەنوێ دەکەونەوە بانگکردنی نووسەر.

کەی و؟ چۆن و؟ بۆ؟ زۆر لەبابەتەکانی توێژینەوەکە دەبزوێنن. کەی شێخ و کۆمەڵەکە سەریان هەڵدا؟.. چۆن ئەم هەموو سەرکەوتنەیان بەدیهێناو؟ بۆ بەدییان هێناو ئەم هەموو بەرزبوون و نزم بوونەوەیەش بۆ؟

ئەم نیشانەی پرسیارانە، سەرئێشەو ئازارن بۆ توێژەر، دەوری دەدەن، یەخەی دەگرن، ناچاری دەکەن هەوڵبدات بچێتە قوڵایی بابەتی لێکۆڵینەکەیەوە، لەڕووکەشی دووری دەخەنەوە، وای لێدەکەن زۆر دوودڵبێت پێش دەرکردنی هەر بڕیارێك.

توێژەریش هیچ چارەیەکی نیە، چونکە نیشانەی پرسیارەکان ڕێچکەی توێــژەرن بــەرەو تێگەیشــتنێکی ڕاســت و .. توێژینەوەیــەکی جــدی. هەرچـەندیش نیشـانەی پرسـیارەکان توێـژەر بـێزار بکـەن و داوای ئـەوەی لێبکەن وەڵامیان بۆ بدۆزێتەوە، هێندەش ڕێنمایی دەکەن بـۆ نزیـك بوونـەوە لە هەقیقەت.

ڕەنگە نیشانەی پرسیارەکان بەتایبەت لەم بابەتەشدا زۆر بێزاریان کردبم - نیشانەی پرسیارەکان -.

ڕەنگە منیش تێرم کردبن لەوەی کەدەیانەوێ

# بەشی یەکەم

## منداڵەکە ... وەکو پیرێك

لەیەکەمین ساڵەکانی سەدەی بیستەمدا، میسر باوێشکی دەداو خەریکبوو پاش شکستە دڵتەزێنەکەی عەڕابیەکان سەرلەنوێ هەناسەی دەدایەوە .. بەکورتی، میسر خۆی دەدۆزیەوە، خۆی بەدیدەهێنا، یان بەلای کەمەوە ئەو توانایەی بەدەست دەهێنا کە ئەو بڕیارە بدات.

بەم شێوەیە سەرەتای سەدەی بیستەم بزوتنەوەیەکی شارستانیی بەتینی بەخۆیەوە بینی. خاوەنەکانی - هەریەکە لەبواری خۆیدا - هەوڵیاندەدا بەشێك لەهیواو ئومێد لەویژدانی ئەم گەلەدا زیندووبکەنەوە.

حیزبە سیاسیەکان، بەئاڕاستە جیاوازەکانیانەوە، بەپەلەو بەزۆری دەهاتنە کایەوە: (حزب الامة، حزب الاصلاح على المباديء الدستورية، الحزب الوطني، الحزب الوطني الحر، حزب المقاصد المشتركة)و ... هتد.

ڕۆژنامەگەرییش زۆرو جۆراو جۆر ببوو، شانۆش بەهەمان شێوە پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینی، خوێندنیش لەویژدانی میسردا بەخەونەکانی سەربەخۆییەوە گرێدرا، بۆیە هێزە نیشتمانیەکان هەستان بەبزوتنەوەی دامەزراندنی ((زانکۆی ئەهلی))و بزوتنەوەی خوێندنی شەوانەو خوێندنی پیشەیی.

هەروەها ڕۆشنگەرییش، وەکو جەنگێك و وەکو ئاواتێك، ڕێچکەیەکی سەرەکیبوو لە ڕێچکەکانی بەئاگاهێنانەوەی میسر. دەستەواژەکانی وەك (ئازادیی هزر، ئازادیی دەربڕین و باوەڕ)یش لەسەر زمانی میسری دووبارە دەکرانەوە، پێدەچێت بەدوودڵییەوە بووبێت، بەڵام هەرچی چۆنێك بێت دەگوترا .. ڕەنگە (شبلی شەمیل)یش- کەیەکێکە لەڕابەرەکانی جەنگی ڕۆشنگەری - سروشتی ئەم جەنگەی لەیەك دێڕی بچوکی پڕ مانادا کورت کردبێتەوە .. ((ڕاستی ئەوەیە بگوترێت، نەك بزانرێت)).

زۆر کەس دەزانن چۆن ڕێگایان بەرەو ڕاستی بگرنەبەر، بەڵام لەترسی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هێزە کۆنەپەرستەکاندا، کەژمارەو سەنگیان زۆرە، نازانن چۆن دەمیان بکەنەوەو بیڵێن.

میسریش پێویستی بە ((ڕاوەشاندن))ێکی بەهێز هەبوو، تا بەئاگابێتەوەو پەردەی دۆڕاندن و خۆبەدەستەوەدانە بێئومێدەکە لەسەرچاوی لاببات و پاشانیش هەستێت و سەرلەنوێ بکەوێتەوە ڕێ.

زۆر لەبیرمەندەکانیش هاتنە پێشەوەو هەوڵیاندەدا بەشداری لەخوڵقاندنی ((ڕاوەشاندن))ەکەدا بکەن .. لەویژدانی میسردا .. شبلی شەمیل وەکو وەڵامدانەوەیەك بۆ ئەو هەراو قاڵە فیکریەی کەدوای دەرچوونی کتێبەکەی (فەلسەفەی دروستبوون و گەشەسەندن) ((فلسفة النشوء والارتقاء)) دروست بوو، دەڵێت: ((لەوکاتەدا مەبەستی من ئەوەبوو

ئەم ڕاوەشاندنە بێنمە کایەوە کەئەمڕۆ دروست بووە، تا هزرەکان لەخەوە قوڵەکەیان ڕاپەڕێنم. جووڵەش هەرچی چۆنێکبێت لەوەستان باشترە)).[1]

ئەو کۆمەڵە پێشەوایەی بزوتنەوەی ڕۆشنگەرییش بەهەڵەدانەچووبوون یا زیادەڕۆنەبوون، لەتوانای خۆیان یاخود تاواناکانی ئەوکاتەی میسر، بەڵام ئەم ((ڕاوەشاندن))ەی هزرەکان شتێکی پێویست بوو. شبلی شەمیل بەم شێوەیە دووپاتی دەکاتەوە ((تەماحم لەوەدا نەبوو کەلەم ماوە کورتەدا خەڵکی بۆلای خۆم ڕاکێشم، دەشمزانی چەند ڕێگری سەختم دێتەپێش، بەڵام مەبەستم ئەوەبوو هزرەکان ڕاچڵەکێنم تا سەرنجیان بەرەو شتە ناباوەکان ڕابکێشم. هەرچەندە کەدەشزانم بەرد فڕێدانە ناو گۆمی وەستاوەوە بۆقە دڵنیاکان ناترسێنێت .. بەڵام دەشزانم کەهەویری خومرەتێکراو چی بەسەر دێت. کەمترین بەش لە کاریگەریی هزرە جیاوازەکان کەلەوکاتەدا بەئەقڵەوە دەنووسێت، زۆرجار بەخێرایی هەڵاتنی هەویرە کەگەشە دەکات، بەتایبەتی ئەگەر تووشی ئامادەباشیەك ببێت لەدەروونەکانەوە، کەبەهۆی زۆری ئەو فشارانەی لەسەریانە بەشێوەیەکی سروشتی ئەم ئامادە باشیەیان بەشاردراوەیی تێدایە)).[2]

.... هەر بەوشێوەیەش بوو.

---

[1] د. شبلي شميل – فلسفة النشؤ والارتقاء – چاپی دووەم –چاپخانەی(المقتطف) (١٩١٠) ص د.

[2] سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨.

لەکاتێکیشدا کەدایەلۆگی هزری لەنێوان خوێندەواراندا، یان ئەوانەی خۆیان بەخوێندەوار دەزانی، هێشتا هەر لەچەند دەمەدەمەیەکی سەفسەتەییدا کورت ببۆوە کەبەسەر چوون، وەك ((ئایا زەوی خڕە؟ .. ئایا دەخولێتەوە؟))، یەعقوب سەروف لە (المقتطف)دا دەڵێت: ((مەسەلەی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیو ڕۆژدا، لەخۆری بەرەبەیان ئاشکراترەو هەموو مرۆڤێکی عەقڵساغیش کە وردبێتەوە تێبگات باوەڕی بەم ڕاستیە هەیە)).[٣] بەڵام دونیا بەرامبەر ئەم وشانە هەڵدەستێتە سەرپێو دانانیشێتەوە .. هەموو پیاوانی ئایین بەرەنگاری بوونەوەو بەکافرو هەڵگەڕاوەیان لەقەڵەمداو بەچەندەها نوسینو گوتاریش لەگەڵیدا جەنگان، ئەم جەنگەش زۆر لەلایەنەکانی ڕاکێشا، هەندێکیان هەوڵیان دا زانستە نوێیەکان لەبنەڕەتەوە پوچەڵ بکەنەوە گوایا ((کوفرو بوختانە))، لەبەرامبەر ئەمانیشدا تەوژمێك لەڕۆشنبیران گەلاڵەبوون، وەك عەبدولڵا پاشا فیکریو مستەفا پاشا ریاز عەبدولڵا ئەلسعود هەوڵیاندەدا ئەم هێرشە لەزانستی نوێ دووربخەنەوە، واشیان دەبینی کە تاکە ڕێگا بۆ ئەم مەبەستە - وەك مامۆستا محەمەد عەبدولغەنی حەسەن دەڵێت - ئەوەیە کە ((پێچوپەنا بکرێت بۆ پشتگیری کردنی مەسەلەی گونجاندن لەنێوان زانستو ئاییندا، تا بەڕێوەچوونی سروشتیی زانستو بەرەوپێش چوونی لەوڵاتە عەرەبییەکاندا،

[٣] المقتطف - کۆمەڵەی ساڵی ١٨٧٦.

کەلەپێشتر داو هەتا ئێستاش زۆر پێویستیان پێیەتی- بەبزوتنەوەی پارێزگاران - دوانەکەوێت)) [٤]

.. لەکاتێکیشدا کە ((پارێزگاران)) توندبوون لەسەر ڕێگرتن لە زانستی نوێ و بزوتنەوەی ڕۆشنگەری، ((میانڕەوەکان))یش پەنایان بردبووە بەر پێچوپەناکردن، سوارێك شمشێرەکەی هەڵدەکێشێت و خۆی بەمەیدانەکەدا دەکات بۆ ئەوەی خوان و سفرەکە بەسەر هەموویاندا قلْپ کاتەوە .. بابەتێکی تەواو تازەش بۆ گفتوگۆکردن دەخاتە بەردەمیان کە ڕەنگە تەنها ناوهێنانی بەس بووبێت بۆ ئەوەی لەرز لەجەستەی میانڕەوەکان و ناڕازییەکاندا - وەکو یەك - دروستبکات: (( تیۆری دروستبوون و گەشەسەندن)).

ڕەنگە (شبلی)ش لەسەر هەق بووبێت کەدووپاتی دەکردەوە، مەسەلەکە پێویستی بە ((ڕاوەشاندن)) ێکی ئەقڵ و هۆشەکان هەیە. بەڵام ئازایەتیە ڕاستەقینەکە لەوەدایە کەخۆی ئەم (ڕاوەشاندن)ەی دروستکردو بەم شێوەیەش خۆی پێشکەشی خوێنەر کرد (( بۆ تۆ دەنووسم ئەی خوێنەری ئاقڵ، ئاقڵی بیرکەرەوە، داوای زانستێکی فراوان و فەلسەفەیەکی زۆرو دانابیەکی قوڵت لێناکەم، بەڵکو دەمەوێت ئەقڵێکت هەبێت کەپێوەندەکانی کرابنەوەو پەنجەرەکانی لەسەر پشتبن و بیرکردنەوە لەجێی بۆچوون بێت و

---

[٤] محمد عبدالغني حسن - عبدالله فكري - سلسلة اعلام العرب، ص ١٩ وما بعدها.

گەڕان لەجێی بڕیاردراو بێت، وەکو پێویست نرخ بدات بەدەسکەوت و بەرهەمەکانی زانست و بۆچوونە ئەقڵییەکان لەنرخی کەم نەکەنەوە)). [٥]

کاتێکیش شەمیل کتێبی ((نضرية النشؤوالارتقاء)) بلاّودەکاتەوە. هەموان لەترسدا سەرسام دەبن، کتێبێك کەتەنها پێنج سەد دانەی لێ چاپکرا .. هەمووشیان میانڕەوەکان و پارێزگارەکانیش پێکەوە، ڕووی هێرشەکانیان دەکەنە ئەو نووسەرەی کە سوور بوو لەسەر درێژەپێدانی ترساندنی ئەوانەی لەگۆمە وەستاوەکاندان، بەلاّم شەمیل بەهێمنی وەلاّمیان دەداتەوە ((ئەگەر بزانم ڕاستم و لەسەر هەقم، لەوەناترسم کە خەڵك بەهەڵەم لەقەڵەم بدەن: ئەگەر بشزانم کەهەڵەم دڵخۆش نابم بەوەی خەڵك بەڕاستم بزانن)) بەڵکو درێژە بەرکەبەرایەتیەکەی دەدات و دووپاتی دەکاتەوە کەمەسەلەکە تەنها خستنەڕووی تیۆرێك نیە لەسەر گەشەسەندن بەڵکو (( کە دان بەتیۆری گەشەسەندندا دەنێین، بەناچاری پێویست بەوە دەکات کەدان بەماددیەتی گەردونیشدا بنێین)). [٦]

.... جارێکی تریش میانڕەوو پارێزگارەکان لەترسا هەناسە هەڵدەکێشن. ((ڕاوەشاندن))ە داواکراوەکەش ڕوودەدات و، زۆر بیرمەندی تریش شان بەشانی دەکەونەڕێ: فەرەح ئەنتۆن لەگۆڤاری ((الجامعة))دا، سەلامە موسا

---

[٥] گۆڤاری (البصير) ساڵی١٨٧٨ – بابەتی ((القضاء على القضاء)).

[٦] د. شبلی شمێل – فلسفة النشؤوالارتقاء – سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٧.

بەهـەوڵ و کۆششـە چـەند لاکانیـەوە، مسـتەڤا حەسـەنێن ئەلمەنسـوری بەنووسینە ڕۆشنکەرەکانی لەسەر سۆشیالیستی و ... کەسانی دیکەش.

ئامانجەکـەش ئاشـکرایە .. ئەوەیـە کەلەمیسـری سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا، خـۆری چـاخێکی ڕۆشـنگەری نـوێ هـەڵبێت، کـە ((ڕاسـتی)) بگوترێت، کە بیرمەندو زاناو ڕۆشنبیرو نووسەر هەڵوێستێکی ڕەخنەگرانە وەرگرن لـە شارستانیەت و کۆمەڵگە فەلسەفەو نەریتـەکان، بـێ ئـەوەی کـە لەگەڵ گوتنی هەموو وشەیەکدا بترسن و دەست بۆ ملیان نەبەن.

هـەندێکیش لـەپیاوانی ئـاینی بەرەنگاری ئـەم بزووتنـەوە ڕۆشـنگەرییە دەبنـەوە .. میسریش بزووتنەوەیـەکی ئیرهـابی فیکری ترسـناك بەخۆیـەوە دەبینێـت، کـەتاوانبارکردنێکی زۆری تێـدا بـڵاوە، تاوانبـارکردن بـەکوفرو بێبـاوەڕی، (بـەکوفر کـردن)یـش دەبێتـە چـەکی سـەرەکی بـۆ تۆقـاندنی هەرکەسێك کەوشەیەکی نوێ بڵێت یان هەوڵی بۆ بدات. پاشان ئەم هەڵمەتە دڕندانەیـە زیـاد دەکـات، تـا دەگاتـە خراپـترین قۆناغـەکانی، ئـەویش بەقۆسـتنەوەی ئـەو هەلـەی کـە هـەندێك لەبانگەشـەکەرانی بزوتنـەوەی ڕۆشنگەری قیبتی بوون (سەلامە موسا)، یان مەسیحی شەوام بوون (شبلی شەمیل - فەرەح ئەنتۆن - نیقۆلا حەداد) بۆ ئـەوەی - بەئاماژەیـەك لـەحاکمی فیڵبـاز (کرومـر)ەوە - پـەنا ببرێتـە بـەر دروشمـەکانی فیتنـەی تایەفەگـەری، لەلایەکەوە لـەنێوان موسـوڵمان و قیبتیـەکاندا، لەلایـەکی تریشـە لـەنێوان موسوڵمان مەسیحیە شەوامەکاندا.

میسریش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی گوێی لەچەند دەنگێکی خنکاو بێت کە ناوبەناو هێرش دەکەنەسەر ئایینەکان و تانە لەوانە دەدەن کە دەستیان لەملیکردووە.

گوڕی ڕۆشنگەریش نزیك دەبێتەوە لەوەی کەبخنکێت و ببێتە نێچیری پیلانێکی داگیرکەرانەی کۆنەپەرستانە، ئەویش لەکاتێکدا کەبەهۆی تیرۆرکردنی بوتروس غالی پاشا لەلایەن ئەلوەردانییەوە، هەڵمەتەکانی هێرشی ئایینی دوولایەنە بەتین دەبێت و دەمارگیرەکان هەوڵدەدەن مەسەلەکە لەتەنها تیرۆرکردنی سەرەك وەزیرانێك، کەڕێچکەی خیانەتکردنی گرتبوو، لەلایەن نیشتمانپەروەرێکەوە، کەڕێچکەی ئیرهابی گرتبوو، بگۆڕن بۆ مەسەلەی کوشتنی قیبتیەك لەلایەن موسوڵمانێکەوە.

هەندێك لەپیاوانی ئایینی قیبتی و ئیسلامیش پێکەوە فوو لەپشکۆی فیتنەو دووربەرەکیەکە دەکەن، چونکە ئەمە تەنها لەقازانجی ئەوانە، قوربانیەکەش لەسەرەتاو کۆتاییدا ئەو جەنگی ((ڕۆشنگەری))ەیە کەهێندەی مردن لێیدەترسان. لەڕووبەڕووبوونەوەی ئەم خەتەرەشدا، بانگەشەکەرانی ڕۆشنگەری لەهێرشەکەیاندا هەنگاوێك دێنەپێشەوە، شەمیلیش دەنوسێت ((لەمەی پێشوودا دەبینین کەئایین خۆی بەربەستی ڕاستەقینە نییە لەبەردەم ڕێگای بنیاتنان و پێشکەوتندا، بەڵکو پیاوانی

ئایین خۆیـانن)) [٧] پاشـان تونـدو تیژانـەتر لەسـەر هێرشـەکەی بـەردەوام دەبێـت ((بـەڵام ئاییینـەکان لەکـەڵك و بـەرژەوەندیی گشـتییەوە دەگۆڕرێـن تـا دەبنـە ئامرازێك بـۆ قـازانج بـەدی هێنـان بەدەسـتی ئەوانـەوە کـە لەهـەموو ئایین و میللـەتێکدا بـۆ بازرگـانی بەکاریان هێناوە، ئەوانـەی هـەتا ئـەمڕۆش خـەڵکی فێری ئەو شتانە دەکەن کەئایین داوایـنەکردوون. چـەندەها کـەس ئایینەکـەیان بـە (دانـق)(*)ێـك فرۆشـتووە، زیادەڕۆییـان لـەموڵك و هـەقی هـەتیواندا کـردووە، چـەندەها کـەس ئایینیـان بـۆ خزمـەتی بـەرژەوەندیی سـەرکردە لوتبـەرزەکانیان بـەکارهێناوە تـا بەشـداربن لەگـەڵیاندا، تەنانـەت ئەگەر ئایینەکانیان نابێتە ژێر پێشیانەوە)). ئەم هەڵوێستەی (شەمیل)یش بەرامبـەر هـەردوو کۆمـەڵی بانگەشـەکەرانی فیتنەکـە بـوو، ناموسـوڵمان و موسوڵمانیش ((ئەی ئەوانەی (قەلەنسوە)*ی نەزانیتان پۆشیوەو عەمامەی گومڕاییتان ناوەتە سەر ، لە چ شوێنێکی ئایینەکانتاندا، شتیواتان بینیوە کەڕێگاتان پێبدات لەنێو خەڵکیدا تا ئاستی ڕقو کینە سەری شوێنکەوتووە نەزانەکانتان بچێنن بەتۆوی دووبەرەکی نانەوە بچێنن))، بـەڵکو زۆر لەمەش زیـاتر هێرشـەکەی تونـد دەکـات ((ئەگـەر مرۆڤایـەتی لەهـەموو دونیـادا

---

[٧] لەکۆمەڵە نووسینەکانی چاپخانەی (المعارف) -٧- د. شبلي شميل - بەشی دووەم (١٩٠٨) ص ٦٢.

(*) شەش یەکی درهەمێکە، بنەڕەتی وشەکە فارسیە. (وەرگێڕی کوردی).

(*) قەلەنسوە: ئەو بەرگەیە کە کاهینەکان دەیپۆشن. (وەرگێڕی کوردی).

هەستێت و گۆشتی سەرکردەی ئایینەکان - ئەوانەی کەتەنها خۆیان لێپرسراوی ئەو هەموو کارەساتەن کە بەناوی ئایینەوە ڕوویانداوەو هەتا ئێستاش ڕوو دەدەن - پارە پارە بکات، هێشتا تۆڵەی ئەو تاوانانە نیە کە ئەمڕۆ ئەوان بەرامبەر مرۆڤ کردوویانە)) [٨]

ئەمەش بەتەنها شەڕی شەمیل نەبوو، بەڵکو شەڕی تەوژمێکی تەواو بوو کەبانگەشەی ڕۆشنگەری و هۆشیارییان دەکرد.

ئەوەتا نووسینەکانی (ولی الدین یکن) یش هەر لەسەر هەمان ڕێباز بوو، هەمان بڕیش لە هێرشی توندوتیژی لەپیاوانی ئایینەوە کرایە سەر.. وەلیەدین یەکون دەڵێت ((خەڵك بەگشتی شتێکیان خۆشدەوێت، ئەگەر پێشەواکانیان خۆشەویستیان کرد لەلایان، ڕقیشیان لێدەبێتەوە ئەگەر قێزەونیان کرد لەلایان.... پێشەواکانیش لای ئێمە پیاوانی ئایینن، ئەمانیش لەوشتانەدا کەبۆیان دابڕاوەو تایبەتە بەخۆیانەوە دەستێوەردانیان پێ خۆشنیە، پێیان خۆشە کەهەر خۆیان سەرداری چارەنوسی قوڕگی ئەو خەڵکە بن و هەر مشەخۆر بن لەسەر ورگی نەتەوە، خەڵکی دەستیان ماچبکەن و کیسەکانیان پڕ بکەن)). [٩]

کاتێکیش شێخ (جمیل الزهاوی)، لەسەر ئەوەی کەبانگەوازی بۆ ئازادی ئافرەت و فڕێدانی حیجاب دەکرد، لەلایەن حوکمڕانی عێراقەوە توشی

---

[٨] الاخبار کۆمەڵەی ساڵی ١٩٠٩، بابەتی (ضحایا الجهل).

[٩] ولي الدين يكن .. المعلوم والمجهول. الجزء الثاني ص ١٥٩.

سەرکوتکردن دەبێت، وەلیەدین یەکون دەنووسێت (( پاشان ئەی موسوڵمانان .. منیش وەك ئێوە موسوڵمانم .. زیانی ئێوەم پێناخۆشەو بەشداری لەناوچوونیشتانم، ئەو پیاوانەی کە مێزەری سپی قەبەیکردوون زۆربەیان هۆشیارنین و ئەقڵیان بەشت ناشکێت .. سوڵتان عەبدولحەمید خەڵکی دەکوشت و دوری دەخستنەوەو گەنجینەکانی تالآن دەکرد .. ئەمانەش هەمووی حەرامن لەئایینەکەتاندا کەچی هیچ یەکێك لەو پیوانە بەڕوویدا نەوەستان ئامۆژگاری بکەن یا بەرپەرچی بدەنەوە .. بەلآم ئیمڕۆ، کەولآتی ئازادی فراوان بووە، پێیان ناخۆشە کەسێکی سەربەست ببینن قسەبکات، هێرش دەکەنە سەر هەر کەسێك کەلەگروپی ئەوان نەبن .. دونیا پڕدەکەن لەهەراو دەنگە دەنگ .. هەرچی بکۆڵێت و ڕاست بێت و بخواو بخواتەوە بەکافری لەقەڵەم دەدەن، تا وایان لێکردین دەست لەژیان بەردەین و خۆشیان لەهەمووکەس زیاتر باوەشیان پیاکردووە، بۆیە دەسەلآتیان لەسەرتان مەهێڵن، ئەوان بەزیانی ئێوە سوودمەند دەبن و بەدەردەسەری و ماندوێتیشتان دڵشاد دەبن، بێ ئەوەی کە خۆشتان پێیبزانن)).[10]

ڕەنگە ئەم نموونانەش بەس بێت بۆ دەرخستنی سەختی و توندوتیژیی جەنگەکە، وابزانم پێویستیشمان بەوە نیە ڕوونی بکەینەوە کەپیاوانی

---

[10] ولی الدین یكن – التجارب – ص ٢٣.

ئاییني هەردوولا - موسوڵمان‌و مەسیحی -توندوتیژانەتر وەڵامی ئەم هێرشانەیان داوەتەوە، لەوانەشە تاکە زەرەرمەند لەم شەڕە سەختەدا، بزووتنەوەی ڕۆشنگەریی .. میسر بووبێت. ڕەنگە زیانەکە خودی ئاینیشی گرتبێتەوە، ئەویش بەوەی کەهەندێك لەپیاوەکانی سوور بوون لەسەر ئەوەی بەزۆرەملێی - ڕووبەڕووی هەموو شتێکی نوێ‌و مەنتیقی و زانستی دابینێن.

کێشە ڕاستەقینەکەش ئەوەبوو کە ڕۆشنگەرخوازەکان لەم جەنگەیاندا، ڕوبەڕووی بڕێکی زۆر لەنووسینی (سەلەفی)انە دەبوونەوە، کە ئایینیان دەکردە چەند ئەفسانەیەك کەهەموو تواناکانی تێگەیشتنی ئەقڵ دەهاڕێت‌و هەموو هۆش‌و زانستەکانی بێکەڵك دەکات.

شێخ ((محمود الشرقاوی)) هانا بەرانە دەنووسێت [11] ((بانگەشەکەرانی پێشکەوتنی فیکر لەجیهانی عەرەبیدا تووشی چ ماندووبوونێکی فیکری‌و ڕوحیدەبن، کاتێك لەهەندێك لەو کتێبانەدا کەخەڵك دەیانخوێننەوە، دەبینن .. کە ((نوح)) پاپۆڕێکی لەئێسقانەکانی ئاژەڵێك دروستکرد، درێژیەکەی هێندەی ماوەی نێوان زەوی‌و ئاسمان دەبوو و پانیەکەشی هێندەی ساڵێك ڕۆیشتن؟ چ ماندوو بوونێکی ڕوح‌و ئەقڵ لەوەزیاترە کەبانگەشەکەرانی پێشکەوتن ئەوە لەفیکری ئاییندا بخوێننەوە کەخەڵکی لەهەموو جیهانی

---

[11] گۆڤاری (الهلال) -کۆمەڵەی ١٩٠٨.

عەرەبیدا دەیخوێننەوەو لەیەکێك لەکتێبەکانی تەفسیری قورئانی پیرۆزدا ((حەدیس))ێك ببیننەوە کە هی ((حذیفة))یەو خراوتەپاڵ پێغەمبەر ((د.خ))و دەڵێت (( یەئجوج و مەئجوج نەتەوەیەکن، هەر نەتەوەیەکیش چوارسەد نەتەوەیە، هیچ پیاوێکیان نامرێت هەتا هەزار کوڕ لەپشت و نەتەوەی خۆی نەبینێت کەهەموویان چەکیان هەڵگرتووە، ئەمانە لەو نەوانەی (ئادەم)ن کەزەوی وێراندەکەن و .. سێ پۆلیشن: پۆلێکیان وەکو داری سنەوبەر وان، پۆلێکیشیان درێژیو پانی هێندەی یەکەو سەدوبیستە، ئەمانە نەکێوەکان و نەئاسن خۆیان بۆ ناگرن، پۆلێکیشیان یەکێك لەگوێیەکانی ڕەخات و ئەوی دیکەشیان خۆی پێدادەپۆشێت، بەلای فیل و دڕندەو بەرازدا بڕۆن دەیخۆن، ئەگەر یەکێك لەخۆشیان بمرێت دەیخۆن، سەرەتایان لە(شام) ەو کۆتاییان لە(خۆراسان)ە، هەموو بیرە ئاوەکانی زەوی دەخۆنەوەو دەریاچەی (تەبەریا)ش، هەیانە لەجێگای نینۆکەکانیان چنگیان لێدەڕوێت و، کەڵبەکانیشیان وەك کەڵبەی شێرە)).[١٢]

(ولكنه دين اردت صلاحه .. أخاف تقضي عليه العمائم) واتا: بەڵام ئەمە ئاینێکە ویستم چاکی بکەم .. دەترسم، عەمامە لەناوی بەرێت. *

بەهەرحاڵ ، تەنها چەند ساڵێکی کەم تێپەڕیو تیری کۆنەپەرستەکان ڕوویانکردە سنگی چەند (ئەزهەری)یەکی ڕەسەن، تەنها لەبەرئەوەی

---

[١٢] ڕاڤەکردنی (الخطيب الشربيني). بەشی دووەم. ل ٣٢٨ – ٣٣١.

(*) دێڕێك شیعری (محمد عبده)یە. (وەرگێڕی کوردی).

بانگەشەی نوێگەری و ڕۆشنگەری و بەکارهێنانی ئەقڵیان دەکرد، بەبێباوەڕی و لادان تاوانبار کران ... شێخ (علی عبدالرزاق) بەهۆی کتێبەکەیەوە (الاسلام وأصول الحكم).وشێخ (طه حسین) چونکە بایەخی دابوو ((بەپەیڕەوکردنی ڕێبازی گومانی دیکارتی لەلێکۆڵینەوەکەیدا کەلەسەر ئەدەبی عەرەبی کردبووی، دوودڵیش نەبوو لەوەی گومان لەڕەسەنایەتی شیعری جاهیلی بکات، بەڵکو گومانەکانی لەمەڕ هەندێك لەبەڵگە نەویستە ئایینیەکانیش خستەڕوو، ئەویش لەکتێبەکەیدا (في الشعر الجاهلي) کەلەساڵی (١٩٢٦) دا دەریکرد)) [١٣] . خۆپیشاندانە تورەکانی ئەزهەریەکانیش دێنە سەر شەقامەکان و داوای کەللەسەری شێخ و سوتاندنی کتێبەکەی دەکەن، ڕەنگیشە خۆپیشاندانەکان هێندە توندوتیژ بووبێت بەشێوەیەك کەپێشەوایەکی ڕۆشنبیری وەك ((سەعد زەغلول)) ناچار بوو لەبەردەمیدا بگەڕێتەوە دواوەو وەکو هەوڵێکیش بۆ هێواشکردنەوەی بڵێت ((وای دابنێن کابرایەکی شێت بەڕێوە وڕێنە دەکات، ئایە ئەوە هیچ زەرەر لەئەقڵەکان دەدات)) [١٤]

---

[١٣] مارسيل كولومب – تطور مصر ٢٩٢٤ – ١٩٥٠ ترجمة زهير الشايب (١٩٧٢) ص ١٥٩.

[١٤] الكاتب نيابر ١٩٧٤ – مقال صلاح عيسى – طه حسين ومحنة العقلانية في مصر.

چەند ڕەق و ناخۆشیش بووە بەلای تەها حسەینەوە کەپێشەوا سەعد زەغلول هیچ ڕێگاچارەیەك نەدۆزێتەوە بۆ ڕزگارکردنی سەری لەقەنارەی کۆنەپەرستەکان، تەنها ئەوەنەبێت کەبەشێتی لەقەڵەمبدات.

بەم شێوەیە هەردوو بزووتنەوەکە ڕووبەڕووی یەکتر دەوەستن.

ئەمەش جگە لەوەی کەسوارێکی نوێ لەمەیدانەکەدا سەری هەڵدابوو.. بەشێوەیەکی قوڵ و ڕاست لەئایین تێگەیشتبوو، بایەخ و پێویستی ڕۆشنگەریشی دەنرخاند، دەشیویست هەردووکیان تێکەڵ بکات و شێوازێکی نوێی دەستپێکردن بۆ میسر پێشکەش بکات، ئەو سوارەش مامۆستا شێخ و ئیمام محەمەد عەبدە بوو، کە ((هەمیشە بانگەشەی دەکرد عەقڵ وەکو ئایین حوکم بکات، ئایین بەئەقڵ ناسراوە، پێویستیشە کۆششێك بکرێت کەپشت بەئەقڵیش و ئایینیش پێکەوە ببەستێت، تا موسوڵمانان بتوانن ڕووبەڕووی بارودۆخە نوێیەکانی کۆمەڵگەی نوێ ببنەوەو، ئەوشتانەی لێوەربگرن کە سوودو کەڵکی هەیە.

کەموسوڵمانانیش نەتوانن دابڕێن و دوورە پەرێز بژین، ناچارن بەو شتانە پڕچەکبن کەکەسانی دیکەی پێ پڕچەکە، گەورەترین چەکیش لەدونیادا زانستە)). [١٥]

---

[١٥] الاخبار - ٢٧/ ٢/ ١٩٧٣. مقال الشیخ أحمد حسن الباقوري. هذا الرجل لماذا یظل هدفا للمهاجمین؟

ئەوەی لەم هەموو شتەدا بەلای ئێمەوە گرنگە، ئەوەیە کە هەوڵبدەین لایەنێك لەو شێوەی کەشە ئەقڵی و فیکریە بخەینە ڕوو کە حەسەن ئەحمەد عەبدولرەحمان ئەلبەننای ((سەعاتچی)) هەرزەکاری تێدا پەروەردە بووە.

... لەکاتێکدا کەمیسر هەوڵیدەدا خۆی بدۆزێتەوە .. کە هاواری ((بژی میسر))و دروشمی ((دروشمی میسر بۆ میسرییەکان)) بەرز دەبۆوە، شتێکی سەیرە کەلەم کاتەدا هەندێك لەئاییندارەکان و پیاوانی ئایین بەڕق و تورەییەوە پێشوازی لەم دروشم و هاوارانە بکەن. چونکە وای بۆدەچون کە ((میسرگەری)) پێچەوانەی ((ئیسلامگەری))ەو، سەربەخۆیی میسریش تەنها پیلانێکی بێئاییانەیە دژی (بابی عالی عوسمانی ی پارێزەری ئیسلام و موسوڵمانان).

تەنانەت لەڕیزەکانی حیزبی نیشتمانیشدا، کەڕادیکالترین کۆمەڵەکانی میسربوون، مەسەلەی ((خەلافەتی ئیسلامی))و دژبوونی لەگەڵ ((میسرگەری)) دا مەسەلەیەکی زەق و .. کاریگەر بوو، بگرە خەریك بوو خودی حیزبەکەشی دابەش دەکرد.

لەسەرەتاشدا موستەفا کامل خەریکی پێچو پەناگرتنەبەر بوو، لەنێوان سوڵتانی عوسمانی و ئینگلیزداو هەوڵیدەدا قازانج بۆ نیشتمانەکەی بەدەست بێنێت .. دووپاتیشی دەکردەوە کە ((تا دەوڵەتی عوسمانی ساغو

بەهێزبێت هیوای میسرییەکانیش لەڕزگاربووندا گەورەو بەهێزتر دەبێت)) (١٦)

بەلام هێندەی پێنەچوو، زۆر بەئاشکرا پێیزانی کە سەربەخۆبوونی میسر مانای دەرکێشانی ئازادیو چارەنووسیەتی لەدەستی هەردوو خەلیفەی عوسمانیو ئینگلیزیش، بۆیە بە بەرزترین دەنگی هاواریکرد ((تانەو تەشەربازەکان بەوە تاوانبارمان دەکەن گوایا ئێمە دەمانەوێت میسر لەئینگلیز بسەنینەوە تاییدەینەوە تورکیا، ئەم تاوانبار کردنەش مانای ئەوەیە کەزانیاریی ئێمە لەبارەی مافو ئەرکەکانی میللەتانەوە تەنها بۆئەوەی داناوین کۆیلەو دەستبەسەر بین، دەبا دوژمنانی میسر بزانن کەئێمە پڕ بەدەم داوای سەربەخۆیی میسر دەکەینو بەگوێی هەموو میللەتێکیشدا دەدەین)). (١٧)

بەلام شێخ (عبدالعزیز جاویش) کەیەکێك بوو لەسەرکردەکانی حیزبو ماوەیەکی زۆریش سەرنوسەری گۆڤارەکەی بوو، بۆچونێکی دیکەی هەبوو، زۆر بەتوندیش جەختی لەسەرئەوە دەکرد کە ((هیچ نیشتمان پەروەرییەك لەئیسلامدا نیە))، پابەندیش بوو بەدروشمی ((الجامعة الاسلامیة))ەوە، ئەمیش ئاراستەیەکە بانگەشەی ماف ئازادیو دەستورو بلندیی میللەتی میسر دەکات، لەژێر سایەی یەکێتیی جیهانی ئیسلامییدا، کە لەدەولەتی

[16] Kamal, M. Egyptiens et Anglais – Paris, 2 em edition (1906) pp. 181.

(١٧) علي فهمي كامل – سير مصطفى كامل. الجزء الاول . ص ٣٧٨.

عوسمانیدا خۆی دەنوێنێت‌و، پێویستە پارێزگاریی یەکێتیەکەی‌و ڕێگری لێکهەڵوەشانی بکرێت، چونکە هەڵوەشاندنی دەبێتە لەدەستچوونی نیشتمان)). [18]

حیزبی نیشتمانی بەدەست ئەم لێکترازانەوە دەینالاند .. بەڵکو ئەم بانگەوازەی شێخ جاویش وایدەکرد کەحیزب پشتگیریی زۆربەی دەزگاو لایەنەان لەدەستبدات. [19]

محەمەد فەریدی جێنشینی مستەفا کاملیش زۆر بەتوندی بەرەنگاری ئەم بانگەوازە دەبۆوەو ڕەخنەیەکی زۆریشی لێدەگرت، لەیاداشتەکانیشیدا ئاماژە بەشێخ جاویش دەکات‌ودەڵێت ((خۆشەویستی جاویش بۆ دەوڵەتی عوسمانی میسرو بەرژەوەندییەکانی لەبیر بردبۆوە، وای لێهاتوبوو دەیگوت میسر بۆ موسوڵمانەکانە نەك میسرییەکان، تەنانەت شێخ گەیشتبووە ئاستێك ئامۆژگاری دەکردم ئەو گوڵەیەخەیە هەڵنەگرم کە لەجنێف دروستمانکردبوو و لەسەری نووسرابوو ((میسر بۆ میسریەکان))و بڕیارمان دا، بوو ببێتە دروشمی میسرییە دڵسۆزەکان، دەیگوت دیمەنی ئەو گوڵە

---

[18] انور الجندي – عبدالعزيز جاويش. ص ٨٣.

[19] Ahmed J. The Intellectual Origins of Egyptian Nationalism, Oxford. (1960) P. 78.

یەخەیە بەسنگی خۆمو برادەرەکانمەوە عوسمانیەکان نیگەران دەکات، هەروەك چۆن پارێزگاری کردنم لەنەتەوەی میسر نیگەرانیان دەکات)). [20]

محەمەد فەرید لەشوێنێکی دیکەشیدا دەڵێت ((جاویش هێشتا دژایەتی بیرۆکەی نیشتمانپەروەری لەئیسلامدا دەکات، لەم دواییەشدا لەبەرلین بە ئەحمەد بەگی گوتبوو کەواز لەبیرۆکەی نیشتمان پەروەری یا ڕەگەزی میسری بهێنێتو گوتبووی هیچ نیشتمان پەروەریەك لەئیسلامدا بوونی نییە)). [21]

بۆچوونەکانی شێخ (جاویش)یش وادەرناکەوێت دووربێت لەو وشانەوە کە شێخ حەسەن ئەلبەننا پاش نزیکەی چارەسەدەیەك نوسیبووی .. ((هەر پارچە زەویەك ئالآی ئیسلامی تێدا بەرزکرابێتەوە، نیشتمانی هەموو موسوڵمانێکە کە پارێزگاریی بکاتو، کاری بۆبکات لەپێناویدا جیهاد بکات)). [22]

کاتێك کەمال ئەتاتورك شۆڕشەکەیکرد، نەك هەر تەختو تاراجی سوڵتانە گەندەڵەکەی ڕاوەشاند، بەڵکو ناخی زۆر لەو کەسانەشی لەرزاند کەچاوو هیوایان بڕیبووە خەلافەتی عوسمانی، وەکو شورایەکی سەرەتاو کۆتایی بۆ موسوڵمانان.

---

[20] محمد صبيح. مواقف حاسمة في تأريخ القومية العربية – ص ٣٨٩.

[21] المرجع السابق.

[22] حسن البنا – قومية الاسلام (مقال).

گەرچی هەندێك لەنووسەرەكانیش ئاماژەیان بەوەكرد، كەكۆتایی هاتنی خەلافەتی عوسمانی ڕێگای بۆ زۆر لەبانگەشەكەرانی نوێگەری و چاكسازی خۆشكرد، تا هەوڵ بۆ پێشكەشكردنی تێگەیشتنێكی ئیسلامیانەی چاكسازخواز بدەن و، بواری بۆ هەندێك لەپیاوانی ئاینیش ڕەخساند كە ((باوەڕی ئایینی و بیرۆكەی نیشتمان پەروەری تێكەڵ بكەن و، بەچەند دەستەواژەیەكی ڕوون وئاشكراتریش لەجاران دەربڕین لەبانگەشەی چاكسازییەكان بكەن)) [٢٣]، وەیەكێكی دیكەش ئاماژەی بەوەكرد كە ڕووخانی خەلافەتی عوسمانی ((بنەماو واقیعی و جوگرافیەكانی جامیعەی ئیسلامی هەڵتەكاندو نیشتمان پەروەری و نەتەوەخوازیشی هان دا)) [٢٤]

بگرە تائاستێك و تا قۆناغێكی دیاری كراویش هانی عیلمانیەتخوازیی داو بەرەو سەرەوە پاڵیپێوەنا [٢٥]

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕووخانی خەلافەت وای لەهەندێكی تر كرد كە بە ئومێدی سەلەنوێ گێڕانەوەی بەردەوام بانگەشەی بۆ بكەن و كاری بۆ بكەن.

چەند گومانێكی مەوزوعیش دەوری ئەم بانگەشەی خەلافەتەیان دابوو، گومانەكانیش پەیوەستبوون بەئاواتەكانی شافوئادو شێخە ئەزهەریەكانی دەستەو دایەرەیەوە .. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی كە یەكێك لەگەورە

---

[23]Kladduri, M. political Trends in the Arab World, London (1972) P. 55

[24]Berger, M. the Arab World Today, New York (1964). 318.

[25]Khadduri, Ibib- P- 70.

شێخەکانی ئەزهەر، کەشێخ ئەحمەد ئەلزەواهیری بوی بڵێت ((ڕێخۆشکردن بــۆ بەســتنی کۆنگــرەی خەلافــەت لــەقاهیرە کەنوێنــەری هــەموو نەتــەوە ئیسلامەکان ئامادەی بن، مەسـەلەیەکی هێندە ئاسان نـەبوو، وەك ئـەوەی لەسەرەتادا زاناکانی ئەزهەر تێیگەیشتبوون.

مـاوەی بانگـەواز بۆکردنەکـەی لەســاڵی (١٩٢٤)ەوە بـۆ سـاڵی (١٩٢٦) درێژەی کێشا .. هۆی درەنگ کەوتنەکەشی دەگەڕێتەوەبۆ ئەوەی کەهەندێك لەگـەورە سـەرکردەو ئـەمیرە ئیسـلامەکانی میللەتـە موسـوڵمانەکان، چـەند گومـانێك لـە دەرونیـاندا سـەبارەت بـە میسـر دروسـت ببـوو، وایـاندەزانی زاناکـانی ئەزهـەر مەبەسـتێکی شـاردراوەیان لـەم کۆنگرەیـە هەیـە جیـاوازە لەوەی بەڕوکـەش دیارە مەسەلکەش لەپێناوی ئـەوەدا نیـە کەلەخەلافـەتو پایەی ئیسـلام بترسـنو وەك خۆیـان دەیڵێـن بیانـەوێت پارێزگـاری بکـەن، بـەڵکو مەبەسـتێکی تایبـەتی خۆیـان هەیـە، ئـەویش ئەوەیەکـە خەلافـەت لەکـەناری بۆسفۆڕەوە بگوازرێتـەوە بـۆ کـەناری نیـلو کورسـی خەلافـەتیش بخرێتە ئامێزی کورسی شاوە لە عابدین)) [٢٦]

هـەروەها شـێخ زەواهیری بـەردەوام دەبێتو دەڵێت ((لەبەرئـەوە وەڵامـی دەوڵەتـە موســوڵمانەکان بــۆ بانگــەوازی زاناکــانی ئەزهــەر کەکۆنگرەیــەك لەقاهیرە ببەسترێت، تەنـها بریتیـی بـوو لـە چـەند وەڵامێکـی سـاردو سـڕ،

[٢٦] من مذكرات شيخ الاسلام الظواهري – السياسة والازهر – مطبعة الاعتماد (١٩٤٥) ص ١١.

زۆربەشی دواکردنی ڕوونکردنەوە بوو لەسەر مەبەستو ئامانجەکانی کۆنگرەکەو، پرسیارکردن بوو سەبارەت بەوەی کە دەبێت کێ بکرێتە خەلیفە لەجیاتی خەلیفە لادراوەکە)) [٢٧]. کۆنگرەکەش دەبەسترێت بۆ ئەوەی شکست بەدەست بێنێتو .. ئامادەبووانیش بڕیاربدەن لە تواناياندا نییە (( کەتەنها کەمایەتیەکن لەناو گەلە موسوڵمانەکاندا، بڕیارێك بدەن کە بەلای هەموو موسوڵمانانەوە گرنگە)). [٢٨]

چیرۆکی خەلافەتیش دەبێتە هۆی جەنگێکی زەرەرمەند، کەچەند شێخێکی ئەزهەر دژی یەکێك لەشێخەکانی ئەزهەر دایانگیرساند. لەنیسانی ساڵی ١٩٢٥ دا، شێخ عەلی عەبدولرەزاقی قازی شەرعی دادگای ئەلمەنسورە کتێبە بەناوبانگەکەی بڵاوکردەوە ((الاسلام وأصول الحكم))و تێیدا جەختی لەسەر ئەوە کرد کە بیرۆکەی جیاکردنەوەی ئایین لەدەوڵەت لەگەڵ ڕێنماییەکانی قورئانو سونەتدا دەگونجێن، ئایینیش لەناوەڕۆکدا شتێکی ڕۆحی پوختەو هیچ پەیوەندیەکیشی بەدەسەلاتی سیاسییەوە نییە، دابڕاویشە لەدەسەلاتی جێبەجێکردنی زەمەنی. هەروەها بۆچوونی وابوو کەبنەمای خەلافەت نەپشت ئەستوورە بەقورئان، کەبەهیچ شێوەیەك باسی نەکردووە، نە بەکۆمەڵی هاوەڵەکانی پێغەمبەریش. پەیامەکەی محەمەدیش

---

[٢٧] المرجع السابق ص ١٢٣ .

[٢٨] لبمرجع السابق ص ٢١٧.

پێش هەموو شتێك ئاینی بووەو، دووریش بورە لەهەر شێوەیەك لەشێوەكانی حوكمڕانی و هەر دەسەلاتێكی جێبەجێكردن [٢٩]

ئەو بەشەش كەشێخ بەریكەوت سەبارەت بەوەلامدانەوەی كتێبەكەی، ئەوەیە كەهەمووومان وابزانین هەر نوێخوازێك چۆن تاوانبار دەكرێت و كەمترین تاوانباركردنیش كافرێتی و بێباوەڕیو لەدین دەرچوونە .. بڕیارێكیشە لەدەستەی گەورە زانایانەوە: ((ئێمەی شێخەكانی ئەزهەر بەكۆی دەنگی بیست و چوار زانا لەدەستەی زانایان لەگەڵماندا، بڕیارمان دا شێخ عەلی عەبدولرازق كەیەكێكە لەزاناكانی ئەزهەرو قازی شەرعیو .. نووسەری كتێبی (الاسلام واصول الحكم)ە لەدەستەی زانایان دەركەین، هۆكارەكانیشی لەپاشاندا دوای ئامادەكردن بلاودەكەینەوە)) [٣٠]

... بیرۆكەی خەلافەتیش دەبێتە خەون و ئاواتێك كەخەیاڵی زۆر كەسان دەبزوێنێت، نەك هەر بەتەنها ئەو پاشا گێلەی كەلەژێر سایەی داگیركەراندا لەكۆشكی عابدین خۆی مەلاس دا بوو، وە شێخە ئەزهەرییە شوێنكەوتوەكانی كە خەونەكانی پاشایان سەبارەت بەمیراتیی تاراجی خەلافەتی پتەو خۆشتر دەكرد. بەڵكو هەندێك لە بانگەشەكەرە دڵسۆزەكانی ئیسلامەتیش و، هەروەها ئەوانەش كەچاویان بڕیبووە بیرۆكەی ((خەلافەت))

---

[٢٩] علي عبدالرازق – الاسلام واصول الحكم – القاهرة (١٩٢٥).

[٣٠] اخر الساعة. مجموعة عام ١٩٧٠ مقال محمود عوض: اتهام ملكي للشيخ بالالحاد.

و ((جامیعــەی ئیســلامی))و باوەڕیــان وابــوو ئیســلام خــۆی نیشــتمانەو موسوڵمانانیش ڕزگاریان نابێ ئەگەر هەموویان یەك خەلیفەیان نەبێت.

ئەمەش لەبەرئــەوەی کەئیســلام وەکو عەقیدەیــەك بــەبۆچوونی هــەندێك کەس ((نـاوەڕۆکێکی سیاسـی))ەو ((کۆمەڵگـەی ئیسـلامیش خـۆی لـەخۆیدا کۆمۆنوێڵسـی ئیسـلامییە ( واتـا کۆمـەڵی گەلـە موسـوڵمانەکان)، نەتـەوەی ئیسلامیش بەهەمان شێوە پێکهاتەیەکی سیاسی کامڵو پڕە)) [٣١]

.. ئەم ململانێیانەش - بەزەرورەت - دەبنە یـەکێك لەپێکهێنـەرەکانی ئەو کەشە فیکرییەی کە حەسەن ئەلبەننای لاوی تێدا ژیابوو.

هەروەها لەو دەمەدا مزگێنی دان ((تبشیر)) و گروپەکانیشی هەبوون، کە لەزۆر شوێنی میسردا بلاّو ببوونەوە ..

.. زۆریش سەبارەت بەم مەسەلەیە گوتراوە، ڕەنگە لەهەمووشیان ڕاستتر ئەوەبێت کە دەگوتـرا تەبشـیر تەنـها گەمەیـەکی ئیسـتعمارانە بـوو دەیویسـت هەسـتو سـۆزە ئیسـلامیەکان قوشـقی بکـاتو لەڕێچکـەکانی خـەباتی سروشـتی ڕزگـار کردنـی نیشـتمان لایـانبدات، بـۆ چـەند ڕێچکەیـەك کـە تواناکانیـان لـەململانێ ناوخۆییـەکاندا بـەکاربێننو جەنگەکـە لەڕێچکـەی سروشتی خۆی لەدژی داگیرکەر دوور بخەنەوە.

---

[31] Von Grunebaum, Modern Islam the Search For Cultural Identity, New York, P. 65.

بەهـەرحالْ ((لـەكۆتايى بيسـتەكاندا چـالاكى تەبشـيريى هەسـتى موسـوڵمانەكانى ميسرى قوشقى كـردو ڕووداوەكـانى گومڕابـوون لـەئايين و ڕەخنـەگرتن لەئيسلام لەوانـەو كتێبى هـەندێك لـەمزگێنيدەر (مبشـر)ەكـاندا، توندوتيژييـەكى سـەختى لێكەوتـەوە)) [٣٢] هـەروەها هەوڵـەكانى نـێردراوە تەبشيريەكانيش شلۆقبوو سـەبارەت بـە ((پێكهێنانى كەمايەتيـەكى ئـاينى دەسـكرد. داگيركـەريش دەيويسـت ئـەم كەمايەتيـە ئايينيـە بكاتـە نوكـى خەنجـەرێك و ڕووى بكاتــە بزووتنــەوە جەماوەريەكــە، لاى زۆرينــەش كاردانەوەيـەكى ئـايينى تونـدڕەو دروسـت بكـات كەبزووتنەوەكـەى پـێ بگێڕێتەوە بۆ هەڵوێستە كۆنە پەرستييەكان، بزووتنەوەى نيشتمانيش دژى داگيركەر بگێڕێتەوە بۆ چەند بزووتنەوەيەكى تايەفەگەرى و دەمارگيرى)) [٣٣] ڕوويشى دا ...

بەوەى كاردانـەوەكان بەئاڕاستەيەكى تايەفەگەرى و دەمارگيرى دووبـارە بوونــەوەو هەســت و ســۆزى زۆر كەســانيش شــلۆقبوو، دەرەنجــامى چالاكيەكانى تەبشيريش زياد لە پێويست قەبەبوون، ئەمەش مانـاى ئەوەيە كە ئامـانجى ڕاستەقينەى تەبشير بەديهات. بـاوەڕيش ناكـەين كـەس هێنـدە ساويلكە بووبێت وايزانيبێت تەبشـير پيلانێكـى كرداريـى يـان مەنتيقيـەو

---

[٣٢] طارق البشري - الحركة السياسية في مصر ١٩٤٥ - ١٩٥٢ الهيئة المصرية العمة للكتاب (١٩٧٢) ص ٢٣٦.

[٣٣] المرجع السابق ص ٢٥٠.

ئامانجی ڕاکێشان و جەمسەرگیرکردنی کەسانێکی موسوڵمانە بەرەو ئایینی مەسیحی.

چونکە نەئەزموونی کرداری و، نەواقیعی بابەتی و، نەژمارە ڕاستەقینەکان، هیچ شتێك لەمانە تەنها ئاماژەیەکیشیان بەهیچ ئەگەرێکی سەرکەوتنی شاڵاوە تەبشیرییەکان نەدەدا لەم گۆشەیەوە - ڕاکێشانی خەڵکی بەرەو ئایینی مەسیحی ...

ڕەنگە پێویستیش بێت لێرەدا دووپاتی بکەینەوە کە زۆربەی کارە تەبشیرییەکان تەواو دووربوون لەکەنیسەی میسرییەوە، بەڵکو لەبنەڕەتدا بەچەند کۆمەڵێکی پرۆتستانتەکانەوە بەسترابوون کەپەیوەندییەکی گوماناوییان بەهێزە بیانیەکانەوە هەبوو.

بەهەرحاڵ شاڵاوە تەبشیرییەکان و کاردانەوەکانیش، کەدەتوانرێت ناوببنرێت (دژە تەبشیر)، سیمایەکی ئەم سەردەمە بوو، لەفیکری چەند گروپێکی ئیسلامیی توندڕەویش پێکهاتبوو. گەر هەندێکی وەك حیزبی وەفدو چەند گروپێکی دیکەش لەڕەهەندەکانی گەمەکە تێگەیشتبوون و خستبوویانەوە پاڵ خاوەنە سروشتیەکەی خۆی کەداگیرکەرە، ((زۆر لێهاتووانەش بە بانگەواز کردن بۆ یەکێتی دوو ڕەگەزیی نەتەوە)) [٣٤]. پەنایان بردیوە بەر ڕێگری لێکردنی. کەچی هەندەکەی تر کردبوویانە

---

[٣٤] المرجع السابق ٢٥١.

بیانوویەك بۆ هێرشكردنە سەر مەسیحیەت، ئەمەش ململانێكەی قوڵترو درزەكەی فراوانتر دەكردو كەشوهەوای پێویستیشی بۆ دەمارگیرییە ئایینیەكە دەخوڵقاند..

بەم شێوەیەش ئەم هەندەی كە كەوتبوونە داوی دژەتەبشیرەكەوە – خۆیان لەڕاستیدا ئامانجیان هەرچیەك بووبێت – ئاواتەكانی داگیركەریان بەدیهێنا.

لەگەرمەی هەموو ئەم شتانەدا فیكرەی لێكدژی نێوان هەردوو شارستانیەتی خۆرهەلاتی و خۆرئاوایی گەشەی دەكرد. هەندێك لە ڕوانگەیەكی نیشتمانیەوە ئەم لێك دژیەیان دەجولاند، هەندێكی تریش لەڕوانگەیەكی ئیسلامیەوە.

((میكادۆ)) بەم شێوەیە فێریكردووین.

كەنیشتمانەكان بكەینە دایك و باوك.

.. ئەمە تێگەیشتنی تەوژمە نیشتمانیەكەیە كە ((خۆرئاوا)) ڕەتدەكاتەوەو ڕوو لەخۆرهەلات دەكات بەرەو شارستانێتیەك كەئاواتە نیشتمانیەكان لەڕێی چەند دەرهاویشتەیەكی خۆرهەلاتیەوە بەدی بهێنێت،هەروەها بزووتنەوەی ((مصر الفتاة))لەسەرەتای سیەكاندا ڕابوونی یابانی وەكوو نموونەیەك دەهێنایەوە بۆ ئەو ڕابوونە خۆرهەلاتییەی كەبەهیوای بوون، بەگشتیش لەڕوانگەیەكی دژ بە داگیركەرەوە.

بەلآم تەوژمە ئیسلامیەکان ((خۆرهەلآتگەری)) یان وەکو بانگەشەیەکی سروشتو پێگە ئایینی دەبینی، کە ئامانجی کۆکردنەوەی هەوڵەکانی موسوڵمانانی خۆرهەلآت بێت دژی بانگەشەی خۆرئاواییەکانو سیما شارستانیەکانی خۆرئاوا ... (( ئیسلامیەت بەلای شێخ حەسەن ئەلبەنناوە ڕێگایەکبوو بۆ گەیشتن بەنەتەوە موسوڵمانەکانی ئاسیاو، گوتەکەی (کبلنج)یشی بەرجەستە دەکرد (خۆرهەلآت خۆرهەلآتەو خۆرئاواش خۆرئاوایەو هەرگیز بەیەکناگەن)) [٣٥]

((خۆرهەلآتگەری))ش بەلای تەوژمەئیسلامیەکانەوە دەروازەیەك بوو بۆ هێرش کردنە سەر خۆرئاواو هەموو شتێکی خۆرئاوایی، چ لەبوارەکانی هزر یان شارستانیەت یان ڕۆشنبیری یان بوارەکانی دیکەدا.

ئەم تەوژمانەش ئەوەیان دەبینی ((کە عەرەبو موسوڵمانەکان دەربازیان نابێتو خۆرهەلآتیش ناتوانێت ڕێزی خۆر بگرێت، ئەگەر خۆی لەهەموو دەرهاویشتەکانی شارستانیەتی خۆرئاوا ڕزگار نەکاتو پشت بەخودی خۆیو ڕەحمەتی خوا نەبەستێت، بەمەش دەبێت موسوڵمانان ڕێگری فیکرە خۆرئاواییەکان بکەن چونکە پێویستیان پێی نیە)) [٣٦]

---

[٣٥] محمد شوقي زكي – الاخوان المسلمون والمجتمع المصري – القاهرة (١٩٥٤) ص ٦٠.

[36] Metchell, R- The Society of Muslim Borters – Oxford – london (1964) P. 99.

حەسەن ئەلبەنناش شانبەشانی ئەم تەوژمە دەڕوات و دەڵێت: (( ئەو مەدەنیەتە خۆرئاواییەی کەخۆی بەزانیاریەکانیەوە هەڵدەکێشێت و توانیوێتی کۆنترۆڵی جیهان بکات، ئێستا بەدەست ئیفلاسی و داڕمانەوە دەناڵێنێت، ئەمەش لەبەرئەوەی کەبنەما سیاسییەکانی لەژێر فشاری دیکتاتۆریەتدا ڕوخاو، سیستمە ئابووریەکانی بەهۆی قەیرانەوە لەداڕوخاندایەو، قەوارە کۆمەلآیەتیەکەشی لەداخوراندایە. خەڵکیش لەوێ چاوچنۆکی و خەم بەسەریاندا زاڵبووە)).. حەسەن ئەلبەننا دووپاتیشی دەکاتەوە ((سەرۆکایەتی جیهان خۆرهەلآتیبووە، پاشان بووەتە خۆرئاوایی، کاتی ئەوەش هاتووە کەسەرلەنوێ خۆرهەلآت هەستێتەوە)) [٣٧]

بەم شێوەیە وەکو ڕێچکەیەك بۆ هێرشکردنە سەر خۆرئاوا لەپێگەیەکی نادروست و ناڕاستەوە، فیکرەی (خۆرهەلآتگەری)تێکەڵ بەئیسلامگەری دەبێت - کە ڕەنگە بەئەنقەستیش بێت - .. ئەم هێرشەش لە تێگەیشتنێکی دروستی واتای ئیستیعمارەوە سەرچاوە ناگرێت و، ڕێگایەکیش دیاری ناکات بۆ بەرەنگار بوونەوەی .. ئیستعمار تەنها ((خاچ پەرستانەیە - ئەوروپییە)) [٣٨]، و((ئیستیعمارێکی مەسیحی))شە.بەڵکو نووسەرێکی ئیسلامیی بەناوبانگ دووپاتی دەکاتەوە کە جەوهەری ململانێ لەگەڵ

---

[٣٧] حسن لبنا –الرسائل الثلاث، ص ٨٧ ومابعدها.

[٣٨] الشهاب – ١٤ نوفمبر ١٩٤٧.

ئیستعماردا ململانێیەکی ((حاچ پەرستانەیە، نەك ئابووری یا  ماڵی، یاخود سیاسییانە بێت)) [٣٩]

لەپاشانیشدا هێرشکردنەسەر خۆرئاوا ئاراستەیەکی سەیری وەرگرت، ئەویش بەوەی کە گۆڕرا بۆ هێرشکردنە  سەر هەر کەسێك کەلەڕۆشنبیریی و زانیاری خۆرئاوا وەرگرێت یان بەسود وەرگرتن لەدەرهاویشتەکانی بزووتنەوەی ڕۆشنگەریی خۆرئاوایی بانگەشەی ڕۆشنگەری بکات. تیرە جەرگبڕەکانیش ڕووایانکردە چەند کەسایەتیەکی موسوڵمانی وەك تەها حوسێن شێخ عەلی عەبدولرازق و شێخ خالید محەمەد خالیدو تاوانباریان دەکردن بەوەی کە ((ئاگایانە یان نائاگایانە ملکەچی گومڕایەتیی ڕۆشنبیریی داگیرکەرانەی خۆرئاوا بوون)) [٤٠]

بەم شێوەیە (خۆرهەڵاتگەری) دوو تێگەیشتەی هەبوو، وەکو چەکێکی دوو دەمیش بەکارهێنرا. بەڵام لەوکاتەدا توخمێکی کاریگەربوو لەپێکهێنانی کەشتی فیکری گشتیدا، بەڕادەیەك کەبێگومان بتوانێت کار لە ویژدان و هەستو ڕوانگەکانی گەنجێکی سیاسی و ئاییندار ی وەك حەسەن ئەلبەننا بکات.

---

(٣٩) سید قطب – العدالة الاجتماعیة في الاسلام، الطبعة الثالثة.

(٤٠) سید قطب – من هنا نعلم. الطبعة الرابعة ١٩٥٤.

سەلەفیەت و نوێگەریش چیرۆکێکیان هەیە کەئەویش شایانی هەڵوێستە کردنــە .. چــیرۆکێك کەتەوەرەکــەی بریتیــی بــوو لــەناوەڕۆکی ئــایین و ململانێکانی سەردەم.

ئـەم مەسـەلەیە میسـری سـەرقاڵ کردبـوو .. نوێگـەرو سـەلەفیەکانی، شۆڕشــگێڕو میــانڕەوو کۆنەپەرســتەکانی، زانــاو بیرمــەندو پیــاوە ئایینەکانیشی. ئەمەش بەدرێژایی ماوەی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهـەم و سەرەتای سەدەی بیستەم.

پەیوەندییە ئاڵۆزو حەتمیەکانی نێوان ئایین و رکەبەرایەتیەکانی سـەردەم - زۆربەی کات - لەدوو بابەتدا گەڵاڵـە دەبـوون ... یەکسـانی کۆمەڵایـەتی، هەڵوێست بەرامبەر عەقڵ و دەستکەوتەکانی زانستی نوێ.

لەڕاستیشدا ئیسلام بەو سروشتەی کەخۆی هەیەتی و، بەسروشتی باری چینایەتیشێخەکانی توانیبووی چارەسەرێك بۆ مەسەلەی پەیوەندیی نێوان ئایین و یەکسانی کۆمەڵایەتی بدۆزێتەوە.

(رفاعـة الطـهطاوي، الافغـاني، الكواكـبي)ش لەپێشـەنگەکانی ئـەم جەنگەبوون لەسەر زەوی میسر.

تەهتاوی لەکتێبە ناوازەکەیدا ((مناهج الألباب المصرية في مباهج الآداب العصرية)) بە بەرزترین دەنگی هاواری دەکرد ((زەوی بۆ جووتیارەکان)) و دەیگـوت ((چاکـەکان هـەموویان دەگەڕێنـەوە بـۆ یـەك بنـەڕەت، ئـەویش

یەکسانی گشتیو دادپەروەری هاوبەشە)). [٤١] ڕەخنەش لەخاوەن موڵکەکان دەگرێت چونکە ((بەگشتی بەروبوومی کارەکان بۆ ئەوان دەبێت، لەبەرامبەریشدا بڕێکی زۆر کەم بەکرێکارەکان دەدەن کەشایانی ئەو ماندووبوونو کارە گرانە نییە)) [٤٢]. پاش ئەمیش ئەفغانی دێت تا هاوارەکەی زیاترو زیاتر بەرزبکاتەوەو بەرگێکی تەواو ئاشکراپۆشێت ((بەلام سۆشیالیستی لەئیسلامدا، ئەوا یەکانگیرە لەگەڵ ئایینی ئیسلام)) و ((یەکەمین کەس کەکاری بەسۆشیالیستی کردبێت پاش هاتنی ئایینی ئیسلام گەورە خەلیفەکانی ئەسحابەکان بوون))، پێناسەیەکی گشتگیرو پێشکەوتووش بۆ سۆشیالیستی پێشکەش دەکات ((سۆشیالیستیە کەمافێکی خواروی زۆرینەی گەلی کرێکار دەدات)).

هاوارەکەی شێخی کەواکیبیش بەهەمان شێوە هەر بڵندە .. ((یاسای سروشتی نێو هەموو ئاژەڵەکان ئەوەیە کە ئەو ئاژەڵانەی لەیەکجۆرن یەکتری ناخۆنو رۆزیی خۆیان لەخواوە وەردەگرن، واتا لەو سەرچاوە سروشتیانەوە کەهەیانە. بەلام مرۆڤەکان یەکتری دەخۆنو مرۆڤ سوورە

---

[٤١] رفاعة الطهطاوي. مناهج الالباب المصرية في مباهج الاداب العصرية – الطبعة الثانية – ص ١٣١.

[٤٢] المرجع السابق ص ٩٣.

لەسەرئەوەی کەبژێوی و ڕۆزیی خۆی لەبراکەی بسێنێت)) [٤٣]. پاشان کەواکیبی زانست و زانستە ئەقلّیەکان پایەبەرز دەکات ((زۆردار لەو زانستە ئایینیانە ناترسێت کەباس لە ڕۆژی میعاد دەکەن، چونکە پێی وایە ئەو زانستە چاوی خەڵکی ناکەنەوەو هۆشیاریان ناکەن، تەنها ئارەزومەندەکانیش خۆیان بەم زانستانەوە خەریکدەکەن .. بەڵام زۆردار لەزانستەکانی ژیان دەترسێت، وەك حیکمەی تیۆری و فەلسەفەی ئەقلّی و ماف میللەتان یان سیاسەتی مەدەنی و چەندەهای دیکەش لەو زانستانەی کەهەورەکان پەرتەوازە دەکەن و خۆرەکان دەردەخەن تاسەری زۆرداران بسوتێنێت)) [٤٤]. پاشان هێرشیش دەکاتەسەر دەوڵەمەندەکان و دەڵێت ئەوان ((بەستراوەی زۆردارن، کۆیلەیان دەکەن و دەنرکێنن، پاشەوپاش دەگەڕێنەوەو سەریان بۆ دادەنەوێنن، لەبەرئەمە سەرشۆڕی لەو میللەتانەدا جێگیر دەبێت کەدەوڵەمەندەکانیان ڕوولەزیادبوونن. بەڵام هەژارەکان، ئەوا حوشتر چەند لەگورگ دەترسێت، زۆردارەکانیش هێندە لێیان دەترسن)) [٤٥]. بەڕاشکاوی بانگەشە بۆ سۆشیالیستی دەکات بەوەی کە ((تاکە نهێنی

---

[٤٣] عبدالرحمن الكواكبي. طبائع الاستبداد في مصارع الاستعباد – مطبعة الدستور العثماني (١٣١٨)ص ٥٩.

[٤٤] المرجع السابق ص ٣٣.

[٤٥] المرجع السابق ص ٥٠.

سـەرکەوتنی گەلـە مەدەنیەکانــە)) [٤٦]. هــەروەها دەشـڵێت ((هــەژاری دەردوبــەڵای هەموانــە، لەگــەورەترین هۆکارەکــانی هــەژارییش ئەوەیــە شەریعەتەکەمان لەسەرئەوە بنیاتنراوە کەلەمولٌکی دەوڵەمەندەکاندا مافێکی زانراوی نەدارو لێقەوماوان هەیە، لەدەوڵەمەندەکان دەسێنرێت و دەدرێتە هەژارەکان. بەڵام حکومەتە ئیسلامیەکان مەسەلەکەیان هەڵگێڕاوەتەوە، پارە لەفەقیرو هەژارەکان کۆدەکەنەوەو بۆ دەوڵەمەندەکانی خەرج دەکەن و خۆیانی پێ خۆشەویست دەکەن)). [٤٧]

ئینجا مەسەلەکەی تر دەمێنێت ...

ڕەنگە ئەفغانی لەمەشدا بەهەمان شێوە هەر پێشەنگ بووبێت. چونکە پاش کتێبەکەی ((الرد علی الدهریین)) کەتێیدا هێرشی کردبووەسەر ((ناتورالیستەکان (سروشتخوازەکان)و ماددیەکان، بەتایبەتیش هێرش و نیگەرانی و ڕەتکردنەوەکانی سەبارەت بە تیۆری پەرەسەندن بوو و دەیگوت (( ئەگەر بۆچوونەکەی داروین ڕاست بێت لەپێشدا مەیمون بووەو پاشان گەشەی سەندووەو گۆڕاوە .. بەپێی ئەم بۆچوونە بەتێپەڕبوونی چاخ و سەردەمەکان کێچ ببێت بەفیل و هەروەها هەڵیشبگەڕێتەوەو فیل ببێت

---

[٤٦] المرجع السابق ص ٦٩.

[٤٧] عبدالرحمن الكواكبي: ام القرى. طبعة محمود افندي طاهر صاحب جريدة العرب ص ٤١.

بەکێچ)) [٤٨]. بەڵام دەبینین پاش ئەمە لەکتێبەکەی دیکەدا ((خاطرات جمال الدین))بەخۆیدا بەم دێڕە شیعرەی (المعري):-

والذي حارت البريه فيه        حيوان مستحدث من جماد

لەئەفغانییان پرسی، ئایا مەبەستی لەوەیەکە داروین مەبەستیەتی لەتیۆری دروستبوون و پەرەسەندندا، ئەویش گوتی:

زیادەڕۆیی ناکەم گەر بڵێم، هیچ شتێك لەسەر ڕووی زەوی نیە کە جەوهەرو بنەڕەتێکی نوێی هەبێت. مەبەستی ئەبولعەلاء ئەلمعەڕیش ئاشکرایەو هیچ شتێکی شاردراوەی تێدا نییە، مەبەستیش تیۆری پەرەسەندنە..

لەسەر ڕۆشنایی گوتەی عەرەبەکانیش سەبارەت بەم مەسەلەیە ئەمەی گوتوە چونکە ئەبوبەکر ئیبن بەشرون لەنامەکەیدا بۆ ئەبی سەمح کەباسێکە لەسەر توێژینەوەی کیمیا گوتویەتی ((خۆڵ دەگۆڕرێت بۆ ڕووەك، ڕووەکیش دەگۆڕرێت بۆ گیاندار، بالاترین لەدایکبووەکانی خۆڵیش (کە کانزاکانیش دەگرێتەوە) ڕووەکە،ئەمیش نزمترین ئەڵقەی گیاندارە لە زنجیرەیەك کەلای مرۆڤ تەواو دەبێت و بالاترینیانە)). [٤٩]

---

[٤٨] جمال الدين الافغاني - الرد على الدهرين- ترجمة محمد عبده وعارف ابي تراب. الطبعةر الرابعة (١٩١٤).

[٤٩] جمال الدين الافغاني - خاطرات جمال الدين - أملاه على محمود باشا المخرومي - بيروت (١٩٣).

ڕەنگیشە ئەفغانی لەم هەڵوێستەیدا تا ڕاددەیەك كاریگەریی نامەكانی (اخوان الصفا)و بۆچوونەكانیانی لەسەر بووبێت. ڕەنگە بەپێی چوارچێوەی ركەبەرایەتیەكانی ئەو زەمانەش لەمەزیاتری لەسەر نەبووبێت كەپێشكەشی بكات.

بەڵام ئەو بەروبومە ڕاستەقینەیەی لەئەفغانی كەوتەوە مەحەمەد عەبدەی قوتابی بوو. مارسیل كولومب دەڵێت ((هەروا ئاسان نیە كاریگەری ئەم دوو پێشەنگە (ئەفغانی و محەمەد عەبدە) لەسەر نەوەكانی دوای خۆیان ڕوونبكەنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا شتێكی لەسەدا سەد هەیە، ئەویش ئەوەیە كاتێك هەوڵدەدرێت ئایین لەگەڵ زانستی نوێدا بگونجێنرێتو، كاتێك فیكرەی چاوخشاندنەوە بەشەریعەتی ئیسلامیدا وەكو پێویستیەك قبوڵ دەكرێت، تا لەگەڵ ڕووەكانی سەردەمدا بگونجێت. بەناچاری دەبێت ئەوە ڕەچاو بكەین كەئەفغانی و محەمەد عەبدە، پلە بەپلە دەروونی خەڵكیان لەباركردووە بۆئەوەی حەقێك بۆ ئایینو دەوڵەت وەربگرن كەجیاوازە لەچەمكی سەدەی ڕابردوو))[٥٠]. بەڵام محەمەد عەبدە جیاواز بوو لەمامۆستاكەی لەدوو مەسەلە گرنگەكەدا، یەكسانی كۆمەڵایەتی، هەڵوێست بەرامبەر ئەقڵو دەسكەوتەكانی زانستی نوێ.

---

[٥٠] مارسیل كولومب – المرجع السابق ص ١٥٧.

لەمەسەلەی یەکەمیاندا عەبدە کۆنەپەرستتر بوو .. لەدووهەمیشیاندا پێشکەوتوو تر بوو، ڕەنگە هۆیەکەشی ئاشکرا بێت.

چونکە پاش ئەوەی ئەفغانی لەمیسر دەرکرا، ململانێ کۆمەڵایەتیەکە توندو تیژتربوو، هەموو بیرمەندێکیش دەبوایە ئەو شوێنە کۆمەڵایەتی و چینایەتیەی هەڵبژاردایە کەخۆی لایەنگری بوو .. زۆر سەختیشە کەڕۆشنبیرێکی ووردەبۆرژوا سەنگەری بەرگریکردن لەزەحمەتکێشان هەڵبژێرێت.

شێخ محەمەد عەبدە هێرشیدەکردە سەر توندڕەویی شۆڕشگێڕە عەرابیەکان، بەڕاشکاویش گلەیی لێدەکردن لەبەرئەوەی لەگەڵ گەل و هەژارەکاندا بوون. بەڵکو دووپاتیشی دەکاتەوە کەڕەخنەی لەحکومەتی ریازو ڕێبازی (خدێوی تۆفیق)ش گرتووە ((بەلام من دژی شۆڕش بووم، پێم وابوو هێندە بەسە کەلەماوەی پێنج ساڵدا دەستورێك بەدەستبهێنین. نەیاری دەرکردنی ریاز پاشاو، خۆپیشاندانەکەی عابیدینیش بووم. سلێمان پاشا ئەبازەو شەریعی پاشاش لەدژی شۆڕش هاوبۆچوونی من بوون، هەمووشمان داوای دەستورماندەکرد)) [٥١]

... بەلام شۆڕش هەڵگیرسا، گڕەکەشی پەڕەی دڵی هەموو میسرییەکی گرتەوە، جوتیارەکانیش چووبوونە هێڵی سوپایەکی دزداشە لەبەرەوە

[51] Blunt, W. Secret History of Egypt – London (1907), P. 493.

کەبەهەرشتێك چەکدراببوون و بەکاریان دەهێنا، هاواریشیاندەکرد ((عەرابی خوا سەرکەوتووت بکات))

شێخ محەمەد عەبدەش هیچ شتێکی لەبەردەمدا نەمابوو تەنها ئەوەنەبێت کە شانبەشانی شۆڕشەکە ڕابوەستێت و هەوڵبدات - بەپێی توانا - لەگوڕی شۆڕشەکە کەم بکاتەوە .. لە ١٣ی شوباتی (١٨٨٣)شدا کۆمەڵەی مەبەستە خێرخوازیەکان هەستا بەگێڕانی ئاهەنگێکی گەورە بەبۆنەی دامەزراندنی وەزارەتی عەرابییەکانەوە بەسەرۆکایەتی (مەحمود پاشا) ئەلباروودی، لەناو کۆمەڵێك پیاوماقوڵانی زۆریشدا محەمەد عەبدە هەستا بەئاگادارکردنەوەی ((شۆڕشگێڕەکان)) لە ((شۆڕشگێڕێتییان)) و ((پیاوماقوڵان))یشی وریاکردەوە کەخۆ بۆ ئەم ((شۆڕشگێڕی))یە شلنەکەن یان پشت گوێی نەخەن ... محەمەد عەبدە گوتی ((لەناو هیچ نەتەوەیەك لەنەتەوەکانی سەرزەویدا نەبووە بەناو کەسایەتی و دەوڵەمەندو پیاوەکانی دەوڵەت داوای ئەوە بکەن کەلەگەڵ خەڵکی ئاساییدا یەکسانبن، دەست لە تایبەتمەندی و ناوبانگی وەزیفی و سەروەت و سامانیان بەردەن و خەڵکی چینە نزمەکانی تێدا بەشداربکەن. ئەم جارە چۆن ئەمە ڕوویدا، خەڵکی ئەم کۆمەڵگەیە کێن؟ بڵێی سووننەتی خوا لەبوونەوەراندا گۆڕدرابێت و بەڕێوەچوونی جیهانی مرۆیی هەڵگەڕابێتەوە؟ یان چاکیی لەناو ئێوەدا گەیشتۆتە ئاستێك کەتائێستاش هیچ کەسێك لەجیهانەکاندا پێینەگەیوە، بەڕاددەیەك کەقایلبوون و ئەوەتان هەڵبژاردووە بەئاشکرا گشت نەتەوەکەتان

لەسەروەری و ناوداریتان هاوبەشبن. ئایا لەخۆشەویستی و عەدالەت و مرۆڤایەتیدایە خۆتان بەڕووتەڵەکان یەکسان دەکەن؟ یان خۆشتان نازانن بەرەوکوێ دەچن و چی دەکەن؟)) [٥٢]

سەرەڕای ئەم هەڵوێستە کۆنەپەرستانەیەشی سەبارەت بەمەسەلە کۆمەلایەتیەکە، پاش چەند ساڵێك محەمەد عەبدە وەکو پێشەنگێك لە پێشەنگەکانی نوێگەری و یەکێك لەبانگەشەکەرەکانی سەری هەڵدا.

جەنگی ئەقڵ و ڕۆشنگەری پەرەی دەسەند، دەسکەوتەکانی زانستی نوێش بەتوندی خۆیان بەسەر ژیانی کۆمەڵگەو تاکەکاندا دەسەپاندو، داوای وەلامێکی ڕاشکاوانەو ((فەتوایەکی شەرعی)) یان بۆ هەموو شتێکی نوێ دەکرد، فەتواکانی محەمەد عەبدەش هەمیشە بەئاراستەیەکی پێشکەوتوانە دەدرەوشانەوە.

عەبدە جەنگەکەی بەداماڵینی ئەو دەسەلاتە کەهەنوتیە دەست پێدەکات کەپیاوە ئایینیەکان هەڵ دەدەن بەسەر مرۆڤدا بیسەپێنن.

دەڵێت ((لەئیسلامدا هیچ دەسەلاتێکی ئایینی بوونی نییە جگە لەدەسەلاتی ئامۆژگاریی باشەو بانگەوازکردن بۆ چاکەو دوورکەوتنەوە لەخراپە. ئەمەش دەسەلاتێکە خوا داوێتیە نزمترین موسوڵمان کەبیدات لەلوتی بەرزترینیان، هەروەها داوێتییە بەرزترینیشیان تا نزمەکانی

(٥٢) د. الحديدي – عبدالله النديم. ص ١٧٧.

پێئاگاداربکاتەوە)). لەڕاستیشدا محەمەد عەبدە ڕووبەڕووی ئەرکێکی سەخت دەبۆوە. چونکە لەگەڵ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا کۆمەڵی یاسا نوێیەکان دانرا، کەلەیاسا فەرەنسییەکانەوە وەرگیرابوون و هەموو مامەڵە مەدەنییەکان و یاساکانی سزادانیشی دەگرتەخۆی. هەیکەلێکی قەزائی نوێش بنیاتنرا. هەروەها خوێندنی نوێش بڵاوبووەوە. بەم شێوەیە میسر کە خەریك بوو لەروحی سەردەم نزیك دەبۆوە .. لەگەڵ مەدەنیەتی نوێدا لێکەوت دەبوو، دووجۆر کەسایەتی و لەزۆربەی بوارە گرنگەکانیشدا دووجۆر دامەزراوەی تێدا جیادەکرایەوە. دوو دامەزراوە بۆ قەزا و دوو دامەزراوە بۆ خوێندن و .. هتد ((ئەمەش لایەنێکی لە ئەزهەر جیاکردەوە، لەگرنگترین لایەنی ئەرکە کۆمەڵاتییەکانی بوو)).. (( لەگەڵ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمیشدا ئەم درزە لەبەردەم هەمواندا ئاشکرابوو، بیناو نابیناکانیش .. درزێکی دیکەی هاوشێوەی لەدامەزراوە کۆمەڵایەتی و هزرییەکاندا دروست کرا، هەروەها لەبونیادە ئەخلاقی و ڕەفتارییەکانی تاکەکانیشدا بەهەمان شێوە.

بانگەشەی عەبدە لەبەردەم ئەم کێشەیەدا هەوڵی دەدا ئەو درزە بەیەکەوە بنوسێنێتەوە کەلەگەورە بووندابوو. بانگەوازیشی بۆئەوە دەکرد کەهزری ئیسلامی کراوە بێت، تابتوانێت پێویستیە مەدەنیەکانی کۆمەڵگە وەرگرێت و بنەمای ئەخلاقی و مەعنەوی و ئەم ژیانە نوێیە پێشکەش بکات. وەکو ئامرازێکیش بۆ ئەم مەبەستە بانگەشەی دەکرد کەئەزهەر پێش

بخرێت و پرۆگرامی خوێندنی بژار بکرێت و، دەرگای ئیجتیهاد والآبکرێت)).
(٥٣)

بەلآم ئەزهەر ئەم جوڵەیەی محەمەد عەبدەی ڕەتکردەوە، لەگەڵ ئەمەشدا تەوژمە ئەقلانیەکە بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی کۆنخوازەکان (دعاة التقليد)* ئەم جوڵەیەیان قۆستەوەو بەرگریان لێکرد. بەم شێوەیە بۆشاییەکەی نێوان بزووتنەوەی نوێگەری و .. ئەزهەر فراوانتر بوو.

لەڕاستیشدا محەمەد عەبدە سوودێکی زۆری لەوە وەرگرتبوو کەماوەیەك لەئەوروپا مابۆوە. ڕەنگە ئەم مانەوەیەش نەك هەر تەنها ئاسۆفراوانی کردبێت و حەزی لادروستکردبێت کەبەرگری لەئەقڵ و زانست بکات، بەڵکو ڕەنگە جۆرە ڕەوشت و ژیانێکیشی نیشان دابێت کەجیاوازییەکی بنەڕەتی هەیە لەو ژیانەی لەسەر خاکی نیشتمانەکەی دەیبینێت، لەوانەیە هەر ئەوەش پاڵی پێوەنابێت سەرسوڕمانی خۆی دەربڕێت و بڵێت ((کافران وەکو موسوڵمان هەمیشە هەڵسوکەوت دەکەن، کەچی موسوڵمانەکان بەشێوەیەك هەڵسوکەوت دەکەن وەك ئەوەی کەکافرین)) (٥٤)

---

(٥٣) الكاتب – اغسطس ١٩٧٤ – طارق البشر، مقال ((الازهر بين الحركة الوطنية)).

(54) New Middle East, January- Febuary 1975.
Article by Desmond Stewart ((Egypt in Search of Rligious and political Community)).

* لەمەودا لەبری (دعاة التقليد) کۆنخوازی بەکارناهێنین، بەڵکو تەقلیدخوازی.

هەروەها ڕەنگە ئەم هەڵوێستەش بەوە ئاشکراتر دەرکەوێت زۆر سەرسام بوو بەفەیلەسوفی ڕوسی (تۆلستۆی) .. ئەوەتا کاتێك محەمەد عەبدە موفتی میسر بوو بۆ تۆلستۆی نوسیبوو ((ئەی دانای پایەبەرز مسیو تۆلستۆی: شەرەفی ناسینی بەڕێزتمان دەسگیر نەبوو، بەلام لەناسینی ناخو ڕوحت بێبەش نەبووین. ڕووناکیەك لەهزرەکانت بەسەرماندا درەوشایەوە، خۆری بۆچوونەکانیشت لەئاسۆماندا هەلات، ئەمەش خۆشەویستی لەنێوان دەروونی ئاقڵەکانی تۆدا دروست کرد .. هەروەك چۆن بەگوتەکانت ڕێنیشاندەری ئەقڵەکان بوویت و بەزانست و جوڵێنەری ورەو گۆڕەکان بوویت، هەروەك چۆن بۆچوونەکانت ڕووناکیەك بوو گومڕاکانی پێدەهاتنەوە سەر ڕێگا، هەربەو شێوەیەش نموونەی کارەکانت پێشەوایەك بوو ڕابەرەکانی پێدەچوون بەڕێوە)) [٥٥].

موفتی میسر بەم شێوەیە لەگەڵ بیرمەندێکدا قسەی دەکرد کەهەرچی چۆنێك بێت ناموسوڵمانە، بەڵکو لای کەنیسەکەی خۆیان بەبێبڕواو بێدینیش تاوانبارکرابوو .. بەم شێوەیەش ڕێزی شارستانیەتی خۆرئاواو هزرە نوێیەکانی خۆرئاوای دەگرت. پێگەی بنەڕەتی محەمەد عەبدەش سووربوونی بوو لە سەرئەوەی ((کە ئیسلام هەرگیز ناکۆك نەبووەو

---

[٥٥] مجلة الاذاعة والتلفزيون – ١٠/ ٧/ ١٩٧١، د. عثمان امين، مقال ((صفحة مجهولة من تأريخنا الفكري)).

ناشكرێت ناكۆك بێت لەگەڵ زانستدا، زانستیش هەروەكو عەقیدە وایەو نهێنییەكانی سروشت بۆ خەڵكی دەردەخات)) (٥٦)

لەگەڵ ئەوەشدا كە ((سەلەفی))یەكان شارستانیەت و ڕۆشنبیریی خۆرئاوایان - تەنانەت ماوەیەكی زۆریش پاش زەمەنی محەمەد عەبدە - رەتدەكردەوە، بەڵام عەبدە هەر وای بۆ دەچوو كەكلیلی پێشكەوتن، گرتنەبەری زانست و ڕۆشنبیریی خۆرئاوایە. لەیەكێك لەوتارە سەرەتاییەكانیشدا دووپاتی كردبۆوە ((كەنهێنی سەركەوتنی ئەوروپا لەوەدا خۆی حەشارداوە كە ئەوان لەبواری توێژینەوە زانستیەكاندا سەركەوتون، هەروەها یاساكانی خوێندنیشیان پێشكەوتووە)) (٥٧).

پاش ئەوەش كە محەمەد عەبدە جەخت لەسەر زەرورەتی بەیەكگەیشتن دەكات لەگەڵ هێزی خۆرئاوایی نوێدا، هەنگاوێكی دیكەی ئاڵۆزی یەكلاكەرەوانەش دەنێت، داوای نوێكردنەوەی هێزی ئیسلامی دەكات. عەبدە وای بۆدەچوو كەئیسلام ناتوانێت لەگەڵ زەمەنەكاندا پێی خۆی جێگیربكات، ئەگەر بەردەوام بێت لەسەر ((تەقلیدخوازی)). هێرشێكی كردەسەر تەقلیدخوازەكان و دووپاتیشی كردەوە ((كەبەبێ بەكارهێنانی عەقڵ، موسوڵمانەكان ناتوانن هیچ پێشكەوتن و پەرەسەندنێك بەدەست

---

(56) Khadduri – Ibib- p. 63.

(57) Adams 0 Islam and Modernilism in Egypt p. 39 and 135.

بـهێنن)) ـ<sup></sup>[58]. ئەمانەشـی لـەکاتێکدا دەگـوت کەئەوانـەی دیکـە بەدەسـت ((گرێ))ی ترسو ڕەتکردنەوەی هەمووشتێکی خۆرئاواییەوە دەیاننـالاندا، هەروەها بەدەست هەموو بـەکاربردنێکی ئەقڵیشـەوە، چونکـە وایـاندەزانی ئەوە هەڕەشەیە یان لاوازکردنە بۆ سەنگی ئیسلام. ئەمەش ئەو هەستەی لا دروستکردن کـە ((دژەهـێرش))ێـك بکـەن، پەناشـیان بـردە بـەر دروشمـی جامیعەی ئیسلامیو هەمووشتێکی ئەقڵیو زانستی یاخود نوێشیان ئیدانە دەکرد. [59]

لەم کەشە فیکریـەدا، مامۆسـتا ئیمـام محەمـەد عـەبدەی موفتـی میسـر هەڵدەسـتێت بەبڵاوکردنـەوەی زنجیرەیـەك فـەتوای شـەرعیو هـەوڵدەدات ڕووبەڕووبوونەوەو مامەڵەکردن لەگەڵ ژیانی مەدەنی نوێدا بۆ مسـوڵمانەکان ئاسان بکات. لە ڕاستیشدا مامۆستای ئیمام لەسەری بووکە لەبابەت هەندێك مەسـەلەی ئـاڵۆزەوە چـەند فەتوایـەکی شـەرعی دەربکـات، وەك ((قـازانجی پارەی لەبانق دانراو)) ، ((نرخی قازانجەکە))، ((تەئمینی ژیان))، ((کۆمپانیا بەشـدارەکانو قانزانجـەکانیان)).. هـەروەها لەبابـەت هـەندێك مەسـەلەی دیکەشەوە کەئاسان دەردەکەون، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا گرنگـن بـۆ ژیـانی ڕۆژانـەی موسـوڵمانان: ((وێنـەی فۆتۆگـرافی)).. حەڵاڵـە یـان حـەرام؟ بەکارهێنانی ڕادیۆو تەلەفزیۆن حەڵاڵە یان حەرام؟... بەم شێوەیە محەمەد

---

[58] Khadduri – Ibib- P,61.

[59] Khadduri – Ibib- P. 56.

عەبدە بەسینگێکی فراوان و مێشکێکی کراوەوە وەك موفتیەکی ڕوناکبیری تێگەیشتوو بەرامبەر ئەو سەردەمە، هەوڵی دا چەند وەلامێك پێشکەش بکات کەڕێنماییەکانی ئیسلام لەگەڵ پێداویستیەکانی سەردەمدا بگونجێنێت.

تەنانەت لەمەسەلە زۆر ئالۆزەکانیشدا کەڕەنگە شەرمبێت شێخێکی موسوڵمان بەدوای شتێکی نوێدا بگەڕێت بۆی، وەك: ئافرەت و پەیوەندیەکانی بەکۆمەڵگەوەو سەربەخۆبوونی و مەسەلەی حیجاب و ... هتد، پڕوپاگەندەیەکی زۆر بەهێز هەبوو کەمامۆستای ئیمام بەشداریی لەئامادەکردنی کتێبەکەی (قاسم امین)ی هاوڕێی خۆشەویستدا کردبێت کەباس لەئازادبوونی ئافرەت دەکات.

مامۆستای ئیمامیش پاش گەشتێکی نەمر کۆچدەکات و کۆمەڵێك قوتابی لەپاش خۆی جێدەهێڵێت کەجیاوازییەکی زۆریان لەبابەت ڕاڤەکردنی ڕێنماییەکانی ئیمامەوە هەبوو، (مجید خضوري)توێژەر دەڵێت ((هەندێك لەقوتابییەکانی ئیمام هەوڵیان دا پەرە بەڕێنماییەکانی بدەن و بیگەیەننە کۆتاییە مەنتیقیەکەی، واتا ڕۆڵی ئیسلام وەکو عەقیدەیەك لەنێو کۆمەڵگەدا ((نەهێڵن)) بەگشتی و لەچوارچێوەیەکی بدەن کەتەنها پەیوەست بێت بە هۆش و ویژدانی تاکە کەسەکانەوە. بۆچونیشیان وابوو کەئیسلام عەقیدەیەکی زیندووەو پاشانیش پێویستە کە بەبەردەوامی لەپەرەسەندندابێت، کۆتایی لەسەدا سەدیش بۆ ئەم عیلمانیەتی کۆمەڵگەی ئیسلامیە)).

(خضوري) بەردەوام دەبێت و دەڵێت ئەم بۆچونانە زۆربەتوندی لەلایەن ((موریدە پارێزگارەکانی ئیمام))ەوە ڕەتکرانەوە، بەتایبەتیش لای ئەوانەوە کە– سەرەڕای وەلائیشیان بۆ شێخەکەیان – ((وایان دەبینی کە شێخەکەیان چەند تەنازولێکی ناپێویستی بەرامبەر بەرژەوەندیی مەدەنیەت و پێشکەوتنی فەرێ کردووە.

شێخ ڕەشید ڕەزاش یەکێك بوو لەسەرکردەو ناودارەکانی ئەم پارێزگارە توندەڕەوانەی شوێنکەوتووی محەمەد عەبدە)) [٦٠].

لەگەڵ ئەوەشدا کەڕەشید ڕەزا یەکێك بوو لەنزیکترین موریدەکانی ئیمام، بەڵام لەهەمووشیان زیاتر سووربوو لەسەرئەوەی ڕێنماییەکانی تائەوپەڕی سنوور نابەدڵانەو پارێزگارانە ڕاڤە بکات. [٦١]

بەم شێوەیە بوونە سێ قوتابخانە .. نەك تەنها دوان.

- تەقلیدخوازەکان .. ((شێخە موحافیزکارەکانی ئەزهەر)).
- نوێخوازەکان .. ((شێخ محەمەد عەبدەو قوتابییە ڕووناکبیرەکانی)).

---

[60] Ibib- p. 65.

[٦١] لمزيد من التفاصيل حول العلاقة بين تعاليم الشيخ محمد عبده وأفكار رشيد رضا بقلم سامي الدهان: قدامي ومعاصرون – القاهرة (١٩٦١) ص ١٩٧٢ ومابعدها وايضا ابراهيم العدوي، رشيد رضا.

- نوێخوازە موحافیزکارەکان.. ((شێخ رەشید ڕەزاو قوتابییەکانی)).

- کەمێکیش باس لەم قوتابخانەیەی سێهەمیان دەکەین .. چونکە پەیوەندی بە بابەتی توێژینەوەکەمانەوە هەیە.

شێخ ڕەشید ڕەزا بڕیاری دا لەجیاتی جەنگێك دوو جەنگ بەرپا بکات. یەکێکیان دژی زاناکای ئەزهەر، کەدەیویست دووریان خاتەوە لە ڕێبازە ((تەقلیدخوازی)) و ((دەمارگیریی مەزهەبی))یەکەیان..

ئەوی دیکەشیان دژی ((خۆرئاواخوان))ەکان. بە بەردەوامیش ئاماژەی بۆ ترسناکی هەردوو تەوژمەکە دەکرد .. هەردووکیشیانی پێکەوەو بەهەمان توندو تیژی ڕەتدەکردەوە.[٦٢]

لەکتێبەکەشیدا ((الخلافة أو الامامة العظمى)) هێرش دەکاتە سەر ئەو شێخانەی ((کەلەگۆشەی مزگەوتەکان یا ژووری ماڵەکانیاندا پاڵیانداوەتەوە)) و بەوەش تاوانباریان دەکات کەناتوانن ئەرکەکانی خۆیان بەجێبهێننو پارێزگاریی لەبێگەردی پیرۆزترینو مەزنترین نەریت بکەن، لەهەمان کاتیشدا هێرش دەکاتە سەر خۆرئاوا خوازەکانو دەڵێت ئەمە

---

[٦٢] مارسیل کولومب – المرجع السابق ص ١٦٨.

جۆرێکە لەشێتی کە هەوڵبدەین پایە ئایینی و مێژوویەکانی نەتەوەی ئیسلام فڕێدەین و، بیگۆڕین بەهی ئوممەیەکی تر .. [٦٣]

ووردە ووردە ڕەشید ڕەزا لەڕێنماییەکانی ئیمام لایدەداو بەهێرشە توندو تیژەکانیشی دژی بانگەشەی ((نوێگەری)) لە سەربازگەی مامۆستاکەی دووردەکەوتەوە، بەڵکو لەسەربازگەی ((تەقلید خوان))ە نەیارەکانی ئیمامیش نزیك دەبۆوە. بانگەشەی گەڕانەوەی دەکرد بۆسەرچاوە یەکەمییەکان .. بەلای ئەمەوە کارو کۆشش و هیوا لەپێناوی یەك شتدایە ((خەلافەتی ئیسلامی)) .. ((خەلافەت و ئەو حکومەتە نموونەییەیە کەبەبێ ئەو، بارودۆخی مرۆڤایەتی چاك نابێت)) [٦٤]. دەوڵەتی ئیسلامیی ڕاستەقینە لەڕاستیدا باشترین دەوڵەتە، نەك هەر تەنها بۆ موسوڵمانان بەڵکو بۆ هەموو مرۆڤ دەوڵەتی ئیسلامی بارێکی ناوەندییە لەنێوان دۆگمایی و شارستانیەتی خۆرئاوایی ماددیدا کەڕەنگە میکرۆبی گەندەڵی و دەردی کوشندە لەناوی بەرن، بۆیە شارستانیەتی ماددی ئەگەری لەناوچوونی هەیە. [٦٥] کاتێکیش جەخت لەسەرئەوە دەکات سەروەریی ڕەها لەدەوڵەتدا

---

[٦٣] رشيد رضا، الخلافة والامامة العظمى، مطبعة المنار بمصر (١٣٤١ هـ).

[٦٤] المرجع السابق ص ١١٦.

[٦٥] المرجع السابق ص ١٢٨.

بەدەست ((خاوەن ئەمر))ەکانەوەیە کە ((خوا فەرمانی داوە گوێڕایەڵیان بکرێت))[٦٦] ئەوا زیاتر لەڕێبازی مامۆستاکەی دووردەکەوێتەوە.

.. بەم شێوەیە بانگەشەی مامۆستای ئیمام لەسەر دەستی چەند قوتابییەك دەچێت بەرێوە کە لەنوێگەریو لیبرالیەتەکەی تەسك دەکەنەوەو، بەرەو ((تەقلیدخوازی)) و ((پارێزگاری کردن)) دەیگێڕنە دواوە، گەڕانەوەکەش بەردەوام دەبێت .. قوتابی قوتابییەکانیش .. پارێزگاری تر دەبن بەگەڕانەوەوە بۆ تەقلید خوازی. ..

شێخ حەسەن ئەلبەنناش کاریگەریی مامۆستاکەی ئیمامی لەسەر بوو، بەڵام کاریگەری ڕەشید ڕەزا زۆر زیاتربوو لەسەری .. سەبارەت بەکۆمەڵی ئیخوان موسلیمینیش ئەفغانی وەکو ((باوکی روحی))وابوو، ئیخوانەکانیش حەسەن ئەلبەننایان وەکو ((ئەفغانی)) ئەو سەردەمە دەبینی.[٦٧] گەرچی یەکێك لەئیخوانەکانیش گوتبووی ئەفغانی تەنها ((بانگبێژێك یان تەنها هاوارێك)) بووە، رەشید رەزاش تەنها ((مێژوونووس یان مێژوو تۆمارکەرێك)) بووە، مورشیدیش ((بەننا))بوە [٦٨] بەڵام حەسەن ئەلبەننا بەشێوەیەکی سنووردارتر ئەم پێشەنگانەی نرخاندووە ((ئەفغانی کێشەکانی دەبینیو خەڵکی لێ ئاگادار دەکردەوە، محەمەد عەبدە دەیزانی و

---

[٦٦] رشيد رضا – كتاب الوحي – ص ٢٣٩.

[67] Smith, Wilfred Cantwell. Islam in the Modern history (1957) p. 51.

[٦٨] الدعوة– ٢٠/ ٢/ ١٩٥١.

بیری دەکردەوە، رەشید رەزاش توێژینەوەی دەنووسی)). بەڵام هەموویان بەبۆچوونی بەننا تەنها ((چاکسازێکی ئایینیو ئەخلاقی بوون))کەدیدی ئیسلامیی گشتگیریان نەدەزانی[٦٩]. ڕەنگە یەکێك لەقوتابییەکانی شێخیش ڕەوانتر ئەم پێشەنگانەی دەرخستبێت، ئەویش کاتێك کە بانگەشەی محەمەد عەبدە لەبانگەشەکەی حەسەن ئەلبەننا جیادەکاتەوە دەڵێت جیاوازیی نێوان بانگەشەی ئیخوان موسلیمینو ئەوانەی تر ئەوەیە کە ئەم بانگەشەیە واتای جیهادو خەباتو کار دەگەیەنێت .. نەك تەنها پەیامێکی فەلسەفی بێت[٧٠].

لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە لەسەرمان ئەوە لەبیرنەکەین کەشێخ ئەحمەدو عەبدولرەحمان ئەلبەننای باوكو مامۆستای یەکەمی حەسەن ئەلبەننا، یەکێك بووە لەقوتابییەکانی محەمەد عەبدە. حەسەن ئەلبەننای قوتابییش یەکێك بووە لەخوێنەرە چاکەکانی گۆڤاری ((المنار))، ڕەنگە یەکەمین هەوڵەکانیشی بۆ نووسین، بەم گۆڤارە دەستی پێکردبێت.[٧١]

لەبەرئەوەش کەشێخ ڕەشید ڕەزا لەسەر پاشەکشێکەی بەردەوام بوو، سەبارەت بە ((نوێگەری))،بەڕادەیەك کەپابەندبوو بە ((سەلەفیەت))ەوەو دووپاتی دەکردەوە کەتەنها ((سەلەفەکان)) دەتوانن لەناوەڕۆکی

---

[٦٩] مذکرات الدعوة والداعية – المرجع السابق ص ٥٨.

[٧٠] أحمد أنس الحجاجي، الرجل الذي اسعل الثورة (١٩٥٢) ص ٤٣.

[71] Metchell – op: cit – p – 322.

ڕاستەقینەی پڕەنسیپە ئیسلامیەکان تێبگەن وەك ئەوەی لەقورئاندا هاتووەو حەدیس باسیکردووە.[٧٢] بۆیە لەهەموو پێشەنگەکانی تر - کەلەمیش ناودارتر بوون - زیاتر شایستەی ستایش و پیاهەڵدانەکانی حەسەن ئەلبەننایە، کەوەسفی گۆڤاری ئەلمەناری کردبوو گوایا ئەلمەنار گەورەترین خزمەتی پێشکەش بە ئیسلام کردووە لەمیسرو هەموو وڵاتەکانی دیکەشدا.[٧٣] هەروەها بەوەشەوە شانازی دەکرد کە دەیگوت ڕەشید ڕەزا خەریك بوو دەهاتە ناو ئیخوان موسلیمینەوە پێش ئەوەی کۆچیدوایی بکات.[٧٤]

بەم شێوەیە حەسەن ئەلبەننا هەڵوێستی خۆی، وەکو درێژبوونەوەیەکی زیاتر ((سەلەفی)) بۆ ئەو تەوژمە ((سەلەفی))یەی نێوان قوتابییەکانی محەمەد عەبدە، دەستنیشان دەکات.

ئەلبێرت حۆرانی هەموو هەڵوێستەکە لەیەك بڕگەدا کورت دەکاتەوەو دەڵێت ((ئەگەر مێژوو ئەوەبێت کەلەبیرەوەریی مرۆڤدا ماوە سەبارەت بەڕابردوو، ئەوا ئەم ڕابردووە بەلای زۆرکەسەوە هەر وەکو هیوایەك دەمێنێت کەدەبێت بگەڕێنەوە بۆلای، بەلای هەندێك لەموسوڵمانانیشەوە

---

(72) Khadduri – op- cit p. 67.

(٧٣) مذكرات الدعوة والداعية – ص ٢٧٢.

(٧٤) لمزيد من التفاصيل المقارنة بين افكار رشيد رضا و حسن البنا راجع:
Safran, Nadav- Egypt in search of Political Commonity. (1961) p- 291.

چاخی ئیسلامیی یەکەم هێشتا هەر تاکە شێوازە کەدەبێت جیهانی لەسەربێت))[٧٥]

تەنانەت ئاینیش هەندێك کەس میکیاڤیلیانە لێی تێگەیشتبون و بە بەردەوامیش هەوڵیاندەدا وەکو ئامرازێك لەگەمەی سیاسەت و ململانێی سیاسی و کۆمەلایەتیدا بەکاری بهێنن.

سەبارەت بەم بابەتەش بۆچوونێکی تۆماس هۆبزی خاوەنی ((لیڤیاتان))یان ((دڕندە)) هەیە، کەڕەنگە جەستەی هەندێك بێنێتە لەرزین (لێرەدا داوای لێبوردن لەخوێنەر دەکەم، نەك تەنها لەبەرئەوەی بۆچوونەکە دەقاو دەق وەك خۆی دەنووسمەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی داواشی لێدەکەم کەبەردەوام بۆچوونەکە لەیادیدا بێت لەکاتی خوێندنەوەی لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا، چونکە لەوانەیە ئەم بۆچوونە بتوانێت ڕاڤەی زۆر لەو هەڵوێستانە بکات کەڕەنگە - ئەگەر بەنییەت پاکیشەوە بێت - نامەنتیقی و بێ پاساو دەربکەون) تۆماس هۆبز دەڵێت ((ئایین تەنها خاڵی کەرەوەیەکی هەورە بروسکە کۆمەلایەتیەکانە، کەنیسەش جۆرێکی ترە لەهێزەکانی ئاسایش کە دەوڵەت بۆ پاراستنی هێمنی کۆمەلایەتی بەکاری دەهێنێت، لەسروشتیدا جیاوازیەکی ئەتۆی لەگەڵ پۆلیس و سوپادا نییە، بەڵام ئەم کاریگەرترو

---

[75] Hourani, Albert- Thaught in the Liberal Age, 1789 oxford (1970) p-80.

بەرفراوانترە، ڕەنگە کەم خەرجی تریش بێت، لەناخی هەر مرۆڤێکدا پۆلیسێك دادەنێت کە هەمیشە لەگەڵیدایە))[٧٦].

سەبارەت بەڕوونکردنەوەی دەرهاویشتەکانی ئەم بۆچوونە ڕەنگە ناکۆکبین، ڕەنگە هەر بەتەواویش ڕەتی بکەینەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە لەسەرمان لەیادەوەریماندا بیهێڵینەوە، بۆ ڕاڤەکردنی هەڵوێستی زۆر لەهێزە کۆنەپەرستەکان بەرامبەر بەئایین و هەوڵەکانیان بۆ بەکارهێنانی ئایین و هەندێك لەڕێکخراوو پیاوە ئایینیەکان، وەکو ئامرازێك لەململانێ کۆمەڵایەتیەکاندا.

مەسەلەکەش لەمیسردا لەسەرتای سەدەی بیستەمەوە بەم شێوەیە بوو، هەر جارەش لەلایەکەوە هەوڵیاندەدا ئایین بەلای خۆیاندا ڕابکێشن و بەکاری بهێنن .. جارێك لەلایەن داگیرکەری بەریتانییەوە .. جارێك لەلایەن کۆشکی پاشایەتیەوە .. پاشان جارێکی تریش لەلایەن حیزبە کەمایەتیەکانەوە- کەدروستبوون .. هەریەکە لەلای خۆیەوە هەوڵیدەدا کەئایین بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و وەکو ئامرازێکی ((کەمخەرجی تر))یش لەپۆلیس بۆ باشتر گرتنەدەستی جڵەوی مرۆڤی بڕوادار بەکاری بهێنێت .. ((پۆلیسێکیش لەناخیدا دروست بکات)) کەهەمیشە کار بکات بۆئەوەی مرۆڤەکە ملکەچی

---

[٧٦] نقلا عن: د. لويس عوض. تأريخي الفكر المصري الحديث - الجزء الثاني - كتاب الهلال عدد ابريل - ١٩٦٩ ص ٢٨٢.

بەرژەوەندیەکانی لایەنەکە بێت، لەهەموو هەڵوێستو ململانێ سیاسیو کۆمەڵایەتیەکاندا.

ئەزهەریش قەڵای پتەوو هێمای سەرکەشی ئیسلامە لەهەموو جیهاندا، لەبەر ئەوە هەردەبوو ڕووبەڕووی پیلانو هەوڵی ئەم هێزانە ببێتەوەو لەگەرمەی ئەم ململانێیانەشدا ببێتە ئامانجێك کەهەوڵبدەن بەلای خۆیاندا ڕای بکێشن.

فوئادیش لەوکاتەوە کەسوڵتان بوو بەپەرۆشەوە دەیویست جڵەوی ئەزهەر بگرێتە دەست، کاتێکیش لیژنەی سی کەسی دەستوری ساڵی (١٩٢٣)ی دادەڕشت، فوئاد لەبنەڕەتەوە چاوی بڕیبووە یەك بابەت، کەبریتی بوو لە پەیوەندیی نێوان خۆیو بەبایەخترین دوودامەزراوەی ئەو سەردەمە: ئەزهەر وسوپا.

بڕگەکانی پرۆژەی یەکەمی دەستوریش کەدانرا هیچ ئاماژەیەکی تیانەبوو سەبارەت بەدەسەڵاتی شا بەرامبەر بە ئەزهەر، ئەمەش مانای ئەوەیە کەلیژنەی دەستوردانان وای نەبینیوە هیچ دەسەڵاتێکی تایبەت بدرێتە شا لەبارەی ئەزهەرەوە، بەڵکو سەرپەرشتیکردنی ئەزهەری وەکو هەر دامەزراوەیەکی تر دابووە دەست ئەو وەزارەتەی لەبەردەم پەرلەماندا لێی بەرپرسیارە(٧٧)... بەلام پرۆژەی لیژنەی سی کەسی چەند ڕاستکردنەوەیەکی زۆر تێدا کرا، پاش ململانێیەکی زۆر توندوتیژیش

---

(٧٧) دستور ١٩٢٣ - م - ١٥٣.

زۆر تێدا کرا، پاش ململانێیەکی زۆر توندوتیژیش دەقێك هێنرایە کایەوە تا لەپاشاندا بکرێتە یاسایەك‌و بلاوبکرێتەوە، ئەمیش بۆ ڕێکخستنی ((ئەو ڕێبازەی کە شا دەبێت بیگرێتە بەر سەبارەت بە پەیمانگا ئایینیەکان‌و، دەستنیشانکردنی سەرکردە ئایینیەکان‌و، ئەو زەوی‌و زارو موڵکانەی کەوەزارەتی ئەوقاف دەیبرد بەڕێوە. واتا هەموو ئەو مەسەلانەی کەتایبەتن بەئایینە ڕێپێدراوەکانی ولاتەوە بەگشتی))[٧٨]. ئەگەر حوکمە تەشریعیەکانیش دانەنران، ئەوا ئەم دەسەلاتە بەپێی ڕێساو نەریتەکارپێکراوەکانی ئێستا بەردەامدەبێت))[٧٩]. بەم شێوەیە شا بەپێی ئەم دەقە ئیعترافێکی دەستوریی بۆخۆی بەدەست هێنا کە دەسەلاتێکی تایبەتی لەمەسەلە ئایینیەکاندا هەبێت‌و دانپیانانێکی دەستوریشی مسۆگەرکرد کەبارودۆخەکە وەك خۆی بمێنێتەوە تا یاسایەکی نوێ دەردەچێت بۆ ڕێکخستنی ئەم دەسەلاتە.

شێخ زەواهیریش - کە فوئاد کردبوویە شێخی ئەزهەر- دان بەوەدا دەنێت کە شا فوئاد ((زۆر پەرۆشی ئەوەبوو هەمووشتێکی ئەزهەرو پەیمانگا ئایینیەکان بزانێت، چونکە بەڕێزی وای لەقەڵەم دەدا ئەمە یەکێکە لەو لاکاروبارانەی میسر کەتایبەتە بەخۆیەوەو بەڕێزیشی بێ یارمەتی دانی

[٧٨] الكاتب أغسطس ١٩٧٤- طارق البشري، مقال الازهر بين القصر والحركة الوطنية.

[٧٩] من مذكرات شيخ الاسلام الظواهري - المرجع السابق - ص ٧٩.

هیچ یەکێك لەوەزیرەکانی بەڕێوەی دەبات))[٨٠] لە لاپەڕەکانی پێشتردا بینیمان کەچۆن فوئاد هەوڵی دەدا ئەزهەر لەمەسەلەی خەلافەتدا بەکاربهێنێت، ئێستاش دەبینین کەچۆن دەیەوێت بەهەمان شێوە لەمەسەلەی ململانیێ سیاسیەکانیشدا بەکاری بهێنێت .. بەتایبەتیش لە بەربەرەکانی کردنی سەعد زەغلولدا کەزۆر خۆشەویست بوو لەلایەن گەلەکەیەوەو سەنگ و نفوزێکی زۆریشی هەبوو. دیارە بەبێ ڕاکێشان و جەمسەرگیرکردنی دامەزراوەیەکی وەك ئەزهەریش مەحاڵە بەرگری سەنگ و نفوزێکی وا بکرێت کە سەعد هەیەتی.

هەوڵەکانی ((سەرا))ش بۆ کۆکردنەوەی ژمارەیەك لەشێخەکانی ئەزهەر دەستی پێکرد .. پاشان هەندێك لەداواکاریەکانی ئەزهەری خستەژێر دەستی خۆی بۆ ئەوەی جێبەجێیان بکات و واشی نیشاندا کەحکومەتەکەی سەعد ڕەتیان دەکاتەوە .. مەسەلەکەش بەڕادەیەك پەرەی سەند کەهەندێك لەشێخەکانی ئەزهەر داوای ئەوەیان دەکرد پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەنێوان پادشای خاوەن شکۆو شێخەکانی ئەزهەردا هەبێت ((هەر وەك چۆن ئەڵقەی پەیوەندی لەنێوان سەرەك وەزیران و خاوەن شکۆدا نیە، چونکە لەگەورەو بەڕێزتان ناوەشێتەوە کە لە سەردەمی ئێوەدا ڕێگر لەنێوان گەورەپیاوانی ئایین و گەورەپیاوانی دونیادا هەبێت))[٨١] لە ٥ی تشرینی دووەمی (١٩٢٤)

---

[٨٠] الاخبار ٤/ ١١/ ١٩٢٤.

[٨١] الاخبار ١١/١١/ ١٩٢٤.

یشدا دیاردەیەکی نوێ هاتەئاراوە، خۆپیشاندانێك لەلایەن قوتابیەکانی ئەزهەرەوە کرا بۆ پێشوازیکردن لە شافوئاد کاتێك لە هاوینەهەواری ئەسکەندەریەوە گەڕایەوە، هاواریشیاندەکرد ((بڕوخێت سەعد زەغلول)) ((جگە لە شا هیچ سەرۆکێك نیە)). ئەم دیاردەیەش بەردەوام دەبێتو شاو پۆلیسەکانیو شێخەکانی هاوڕێی سەراش هانی دەدەن.

دۆسیەکانی پۆلیسی سیاسی پڕە لە ڕاپۆرتی پێویست سەبارەت بەم بابەتە، با یەکێکیشیان وەکو نمونە بخەینەڕوو:

پارێزگاری قاهیرە.

بەڕێوەبەرایەتی ((الضبط)) لقی ((ب))

بابەت: ڕاپۆرتێك لەبارەی حاڵەتی ئەزهەری شەریفەوە ڕۆژی (٤)ی فێبرایەری (١٩٢٧) (نمرە ١٩٠ سیاسی نهێنی)

تکایە وەلام

بەڕێزی پایەبەرز، گەورە ئەمینداری حەزرەتی پادشای خاوەن شکۆ:

شەرەفێکی گەورەیە بۆ من بەمە عالیتان ڕابگەیەنم کەدوێنێ ژمارەیەکی زۆر گەورە بەبۆنەی نوێژی جومعەوە لەئەزهەر کۆببوونەوە. بەدرێژایی ڕۆژو هەروەها لەشەویشدا خوتبەیەکی زۆری تێدا درا، ناو بەناویش ئەم هوتافانەیان دەکێشا ((بژی پادشای خاوەن شکۆ - بژی حەسەن نەشئەت پاشا - بڕوخێت پەرلەمانو حکومەتو سەعد پاشا)).

پۆلیسیش لەدەورووبەری مزگەوتەکە ڕاوەستابوون، هیچ خۆپیشاندانێکیش ڕووینەدا، هیچ ڕووداوێکیش نەکەوتەوە.

ئەمەش بۆ زانیاری مەعالیتان.

مەعالیشتان بفەرموون بەقبوڵکردنی ڕێزی بێ پایانم.

بەرواری (٥)ی فێبرایەری ١٩٢٧- حوکمداری پۆلیسی میسر.[٨٢]

د. عەبدولعەزیم ڕەمەزان)یش بەدوادا چونێکی لەسەر ئەم پەیوەندیە هەیەو دەڵێت ((پەیوەندی نێوان ئەزهەر بەدرێژایی سەردەمی شافوئاد و تەنانەت تا کۆتایی ژیانیشی هەر بەردەوام بوو. لەبەرئەوەش کەکۆشك پەیوەندییەکی هاوپەیمانیی تری لەگەڵ ئینگلیزدا هەبوو، بۆیە بەناچاری ئەزهەریش کاریگەری ئەم پەیوەندیەی لەسەر بوو. کاتێکیش سیاسەتی بەریتانی لەبەهاری (١٩٣٥) دا لەژێر فشاری بزوتنەوەی نیشتمانیدا ڕووی کردە ئەوەی کەمێك ڕەزامەندیی جەماوەری میسر ڕابگرێت، بەسەر شایدا سەپاند کەشێخ زەواهیری لەپلەی شێخی ئەزهەر دەربکاتو شێخ محەمەد مستەفا ئەلمەراغی بخاتە جێگای، پادشاش بەناچاری داواکاریەکەی بۆ بردنەسەر. شێخ محەمەد مستەفاش هەرلەو کاتەوە کەفەرمانبەرێکی گەورەبوو لەسودان پەیوەندی بە هێزە بەریتانیەکانەوە هەبوو، کاتێکیش گوازرایەوە بۆ میسر پەیوەندی کردبە لۆرد جۆرج لویدەوە کەمەندوبی

---

(٨٢) جمال سليم – البوليس السياسي يحكم مصر – دار القاهرة للثقافة العربية – ص ٣١٥.

سامی بەریتانی بوو، پەیوەندیەکەشیان زۆر توندوتۆڵ بوو، بەرادەیەك کەوەك محەمەد شەفیقی سەرۆکی بەشی عەرەبی خانەی مەندوبی سامی باسی دەکرد هیچ هەفتەیەك تێپەڕنەدەبوو بیٚ ئەوەی شێخ بانگ بکریٚ یان خۆی سەردانی خانەی مەندوبی سامی بکات))[٨٣]

بەم شێوەیە دەستێوەردانی کاروباری ئەزهەرو مەسەلە ئایینیەکان .. لەشایەکی بێدەسەلاتەوە بۆ حیزبە کەمایەتیە سەرنەکەوتوەکان، بۆ ئینگلیزی داگیرکەر، درێژبووەوە)).

تەنها .. با ئەم دێڕانەی پێشوومان لەیاد بێت کاتێك لەپەڕەکانی داهاتودا شوێن پەیوەندیەکانی شێخ حەسەن ئەلبەننا دەکەوین کە لەگەڵ کۆشك و، شێخ مەراغیدا هەیبوو .. کاتێکیش شوێن هەڵوێستە توندڕەوەکانی دەکەوین بەرامبەر بەوەفدو، هەڵوێستە نەرمو بگرە دڵسۆزانەکانیشی بەرامبەر بەحیزبە کەمایەتیەکان.

ئایا یاریەکە دووبارە دەبێتەوە؟

وەڵامێکی خێرامان ناوێت، با چاوەڕوانی زنجیرەی ڕووداوەکان بکەین و، حوکم و بڕیاریش بدەینە دەست باسکردنی زانستییانە نەك سۆز.

.. بەم شێوەیە شانۆکە ئامادە دەبێت تا ((پاڵەوانەکە)) دەرکەوێت.

---

[٨٣] صباح الخير – ١٩٧٧ /٣/٣١. د. عبدالعظيم رمضان – مقال: الدين في الصراع السياسي.

بەبێ ئەم پەڕانەش کەتێپەڕین، قسەکردن لەسەر حەسەن ئەلبەننا مەحاڵەببێتە قسەیەکی زانستی و بابەتیی .. ڕەنگە هەندێك کەسیش وابزانن .. بەڵکو زۆریشیان هەوڵدابێت کەشێوازی ژیاننامە (السیرة الذاتیة)ی ڕووت بکەنە پێناسەکردنی سەرکردە سیاسیەکان و بۆ حەسەن ئەلبەنناش بەکاری بهێنن، بەبۆچونی ئێمەش ئەم شێوازە هەرچەندە ئاسانترین ڕێگاشە، بەڵام لەهەموو ئەوانیتر دوورترە لەشێوازی زانستیەوە بۆ مێژوو.

باسکردنی مێژووی سەرکردەیەکی سیاسی، بەبێ پێشکەش کردنی ((پانۆراما))یەکی فراوان و قووڵ دەربارەی پێکهاتەی هزری و کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی ئەو کەسایەتییەو میتۆدو ڕەوشتی، دەستەبەر نابێت.

کەواتە حەسەن ئەلبەننا کێیە؟

**باسی ئەو ململانێیانەمان کرد کە لەوسەردەمەدا ڕوویاندەدا:**

- ململانێی نێوان زانست و بزوتنەوەی ڕۆشنگەری بەگشتی و نێوان هێزە کۆن خوازەکان،
- ململانێی نێوان نیشتمان پەروەرێتی میسری و بانگەشەکەرانی خەلافەتی ئیسلامی.
- تەبشیرو .. دژە تەبشیر.
- ناکۆکی نێوان بانگەشەکەرانی شارستانێتی خۆرئاوایی و ناوچەی دەریای سپی خوازەکان لەگەڵ ڕەتکردنەوەکانیدا.

- پێکدادان لەنێوان ((نوێگەری)) و ((لاسایی کردنەوە))دا.
- ڕۆڵی ئایین و دامەزراوەکانی لەگەمەی سیاسەتدا.
- لەم ململانێ و لێک دژیانەوەو لەقوڵاییانەوە، کەسایەتی حەسەن ئەلبەننا هەڵقوڵاو کارلێکی کردو هەڵوێستی خۆی وەرگرت .. لەبەرئەوە بێ ئەو توێژینەوەیەی کەکردمان لەسەر ئەم ململانێیانە قسەکردن لەسەر حەسەن ئەلبەننا وای لێدێت کەڕووکەش بێت و قوڵایی نەبێت و ببێتە تەنها گێڕانەوەیەکی ژیانی تایبەتی حەسەن ئەلبەننا بەدەر لە ڕووداوەکانی کۆمەڵگەکەی.

بەکورتیش .. پەڕەکانی پێشوو باسێك بوو لەجەرگەی بابەتەکەمان، نەك تەنها پێشەکیەك بێت بۆی .. چەند وشەیەکی کەمیش نەبێت سەبارەت بە ((بەننا)) هیچ شتێکی ترمان لەبەردەمدا نەماوە تا مەبدەئیانە بیناسین[٨٤].

- ناو: حەسەن ئەحمەد عەبدولرەحمان لبەننا ((سەعاتچی)).
- مێژووی لەدایك بوون: تشرینی یەکەمی ١٩٠٦.
- شوێنی لەدایك بوون: مەحمودیە بوحەیرە.

---

[٨٤] للمزيد من التفاصيل عن حياة حسن البنا راجع: مذكرات الدعوة والداعية.

- موسى اسحق الحسيني، الاخوان المسلمون كبرى الحركات الاسلامية الحديثة.
- أعداد مجلة (الدعوة) الصادرة في ذكرى وفاته في ١٣ فبراير ١٩٥١، ١٢ فبراير ١٩٥٢، ١٠ فبراير ١٩٥٣، ١٦ فبراير ١٩٥٤.

- پیشەی باوك: مەلای ناحیە و ئیمامی مزگەوتی گوند،
- پیشەی سەعات سازیشی کردبوو، ئەم نازناوی ((سەعاتچی))ەش لەوەوە هاتووە.

شێخ ئەحمەد عەبدولرەحمان بەنناش یەکێك بو لەقوتابییەکانی ئەزهەری سەردەمی محەمەد عەبدەو یەکێکیشە لەو ئەزهەریانەی کەبەدرێژایی ژیانیان بەردەوام بوون لەسەر لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەکتێبە فیقهیەکاندا.

شێخ ئەحمەد پێنج کوڕی بووە، گەورەترینیان ((حەسەن))ە کەهەمیشە باوکی لە پاشاندا دووپاتی دەکردەوە چەندەها خەرمانە لەکەرامات و ڕووداوی نائاسایی دەوری لەدایکبوون و منداڵیەکەیان دابوو. کاتێکیش منداڵەکە گەیشتە تەمەنی هەشتساڵی باوکی ناردیە حوجرەی گوندەکە تا لەسەر دەستی ئەزهەریەکی زۆر ئاییندار فێرببێت کە شێخ ((محمد زهران))ە.

باوکیشی - پاش مردنی کوڕەکەی - هەوڵدەدات ئەو شێوە جوان و نایابەی کەلەئەندێشەی موریدەکانیدا هەیبوو زیاتر نایاب بکات و وردەکاری زیاتریش بدات لەسەری..

منداڵە هەشت ساڵانەکە ڕۆژێك لەدیمەنی پەیکەرێك بێزار دەبێت کە بەسەر یەکێك لەبەلەمەکانی ڕوباری گوندەکەیەوەیە، پەیکەرەکەش ئافرەتێکی نیمچەڕووتە، بۆیە پەنا دەباتە بەر پۆلیس و سووردەبێت لەسەر

لابردنی پەیکەرەکە، پاشانیش لەکارەکەیدا سەرکەوتوو دەبێت[٨٥].
لەمەکتەبەوە بۆ قوتابخانەی سەرەتایی لەتەمەنی دوانزەساڵیدا، لەوێش چاوی بە مامۆستایەکی ئاییندار تر کەوت کەخستیە کۆمەڵێکەوە لەقوتابخانەکە ناوی ((کۆمەڵی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی))بوو، ئەمیش کۆمەڵێك بوو ئامانجی ڕاهێنانی دەروونی ئەندامە قوتابیەکان و پابەندکردنیان بەوەوە کە ڕەفتاریان جوان بێت لەڕەوشتی ڕۆژانەیانداو بێگەردبن لەجنێودان یان لادان لەڕێنماییە ئایینیەکان، سزادانیش بەپارەیەکی زۆر، چەکێك بوو بەدەست کۆمەڵەکەوە سەبارەت بە قوتابیە هەژارەکان.

هێندەشی پێنەچوو منداڵە ئاییندارەکەی کوڕی شێخە ئاییندارەکەی قوتابی مامۆستا ئاییندارەکەی حوجرەکە بوو بەسەرۆکی کۆمەڵەکە، هێندەشی پێنەچوو لاوازی پێگەکانی کۆمەڵەکەی زانی و لەگەڵ ژمارەیەك لەهاوەڵە زیاتر بەجۆشەکانیدا ((کۆمەڵی نەهی کردن لەخراپە))ی دامەزراند، ئامانجی کۆمەڵەکەش بریتی بوو لەسەپاندنی پەیوەست بوون بەڕێنماییە ئایینیەکانەوە، ئەمیش لەڕێی ناردنی چەند هەڕەشە نامەیەکەوە بۆ ئەوانەی وایدەبینی کەپابەندنین بەم ڕێنماییانەوە لەخەڵکی شارەکە.

هەنگاوەکەی تریش بەپەلەدێت .. لەکۆمەڵی نەهی کردن لەخراپەوە بۆ کۆمەڵی ((اخوان الحصافیه)).. بەم شێوەیەش منداڵە قوتابیەکەی قوتابخانە

---

[٨٥] المصور ٢٩/ ٨/ ١٩٥٢ – الشيخ احمد عبدالرحمن البنا– مقال اوردفيه الكثير القصص المماثلة.

سەرەتاییەکە بوو بە (سۆق)ەك کە ئامادەی ئەڵقەکانی زیکر کردن دەبوو و لەڕیزەکانیدا لەگەڵ کۆمەڵێك پیاوی لەخۆی بەتەمەنتر دا خۆی ڕادەوەشاند. لەئەڵقەکانی زیکرکردندا چاوی بەقوتابیەکی تەمەن منداڵی وەك خۆی دەکەوێت کە ئەحمەد ئەلسوکەریە، پێدەچێت ئەم دوو قوتابیەش لەگەڵ تەمەن کەمیشیاندا بۆچوونیان وابووبێت کەتەنها ((بەهیلاکچوون)) لەکۆڕەکانی زیکردا بەس نییە پێویستە کارێك بکرێت بۆ پارێزگاریکردن لەڕێنماییە ئایینیەکانو بەرگریکردنی ئەو چالاکیە تەبشیریەی کەدەکرا شارۆچکە بچکۆلەکەو بەم شێوەیە زۆر لە هەستەکانی جووڵاندبوو .. ئەم دوو قوتابیەکە لەگەڵ دەستەیەك لەهاوەڵەکانیاندا کۆمەڵەیەکی نوێیان پێکەوەنا بەناوی کۆمەڵەی حەسافیە ((جمعیة الحصافیة))ەوە، ئەم کۆمەڵەیەش هەرخۆی بەلقێك لەکۆمەڵە سۆفیگەرە گەورەکە دەزانی، بەلام جیاوازی لەگەڵیاندا ئەوەبوو کە ئەمان ((کاری جدی))ان دەکرد بۆ پارێزگاری کردنی ڕێنماییە ئایینیەکانو ڕێگری کردن لەنێردراوە تەبشیریەکان ..

((حەسەن))یش بووە سکرتێری کۆمەڵەکەو هێشتا هەر لەتەمەنی سیازدە ساڵیشدا بوو.

- کەواتە - لاوە بچکۆلەکە بەیەك ساڵ یان دووان لە ((کۆمەڵی ڕەوشتی کۆمەڵایەتی))ەوە بازیدا بۆ ((نەهی کردن لەخراپە)) بۆ ئەڵقە زیکرەکانی حەسافیە .. بۆ ((کاری جدی)) بەرگری کردن لەئیسلام.

ساڵێکی تر .. هەرزەکارە چواردە ساڵەکە پەیوەندی دەکات بە قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتاییەوە لە دەمەنهور، تابێت زیاتریش ڕۆدەچێتە ناو چالاکی ئایینیو ئەڵقە زیکریەکانی حەسافیەکانەوە، ئەمەش وایکرد کەبتوانێت لەساڵی (١٩٢٢)دا ببێتە ئەندامێکی چالاك لەڕیزەکانیدا .. بەجۆشێکەیشی گەیشتبووە ڕادیەك کەهەندێك کات عەبایەکی سپی لەبەردەکردو عەمامەیەکی دەبەست .. لاوەکە دەستیکرد بە خوێندنەوەی کتێبەکانی فیقهی ئیسلامی، لەو ڕۆژانەشدا کتێبەکەی ئەبو حامدئەلغەزالی بەردەست دەکەوێت ((إحیاء علوم الدین))و گووتەکەی غەزالی دەبینێت کەدەڵێت خوێندن دەبیت تەنها پەیوەست بێت بەبابەتە پێویستەکانەوە ((بۆ بەدیهێنانی ئەرکە ئاینیەکانو پەیداکردنی ((رزق و رۆزی))، بەمەش بەسەرسامیەوە لەخۆی دەپرسێت کەبەردەوام بوونی لەقوتابخانەی مامۆستایان کەڵکی چیە .. پاش ڕاڕاییو دوودڵیەکی زۆریش بڕیار دەدات کەلەسەر خوێندنەکەی بەردەوام بێت تا لەساڵی (١٩٢٣) دا وازی لێدەهێنێت بۆئەوەی پەیوەندی بکات پەیمانگای (دارالعلوم)ەوە)).

بەم شێوەیە گەنجە سەر بە حەسافییە .. هەڵسوکەوت گەیشتە قاهیرەی بیستەکان[٨٦]. لەوکاتەشدا قاهیرە لەململانێ حیزبیە ئاڵۆزەکانو تەوژمە عیلمانیە توندەکاندا جمەی دەهات، هەروەها ئاڕاستەیەکی بەهێزیش هەبوو

---

[٨٦] محمد حبیب أحمد. نهضة الشعوب الاسلامیة في العصر الحدیث ص ١٠٥.

ڕووەو مەدەنیەتی نوێ.. جگە لەهەموو ئەمانەش لەو کاتەدا شۆڕشی کەمالی - کەمال ئەتاتورك - ئازایەتی و هەڵپەیەکی زیاتری دەبەخشی بە لیبرالی و نوێگەری خوازەکان و توڕەیی و توندڕەویەکی زیاتریش بەکۆنخوازان و داواکارانی خەلافەت .. گەنجەکەش بەچاوی گومانەوە سەیری چواردەوری خۆی دەکردو هەموو ئەم شتانەشی بە ((لاوازکردنی لایەنی ئایین))[٨٧] دەبینی. بەهۆی ئەم ئالۆزی و بەیەکداچوونەشەوەو لەناویشیدا گەنجەکەو هاوڕێکانی سڵەمینەوە .. ((خوا خۆی دەزانێت چەند شەوگارمان بەتوێژینەوەی باری میللەتەوە بەسەربرد، هۆکارەکانمان شیکار دەکردو بەدوای ئامرازی چارەسەرکردنی گونجاودا دەگەڕاین، دوودڵی و ڕاڕایی گەیاندبووینیە ئاستی گریان))[٨٨]. گەنجێکی لادێیی زۆر ئایینداریش هەست بەنامۆییەکی کوشندە بکات لەشاری قاهیرەدا جگە لە ((سۆفیگەری))هیچ پەناگەیەکی دیکە نیە.. بۆیە سەرلەنوێ گەنجەکە دەگەڕێتەوە بۆئەوەی پەیوەندی بکاتەوە بەکۆمەڵەی حەسافیەوە، هەروەها جگە لەمەش دەچێتە کۆمەڵەیەکی دیکەشەوە کەوانە ئیسلامیەکانی تێدا دەگوترێتەوە، ئەویش ((جمعية المكارم الاخلاق الاسلامية))یە[٨٩].

---

[٨٧] انور الجندي - قاعدة الدعوة: حياة رجل وتأريخ مدرسة، ص ١٣٧.

[٨٨] المؤتمر الخامس ص ٧.

[٨٩] المرجع السابق ص ٧.

کەواتە گەنجەکە (سۆفیەکە) هەروەکو کەسەکانی دیکەی کۆمەڵەکەی جدییە لەعیبادەتکردندا .. هەروەها بەدوای مەعریفەی ئیسلامیشدا دەگەڕێت و گوێ بۆ وانەکانی دەگرێت .. بەڵام ئەمە بارودۆخی قاهیرە چاك ناکات کە بەبەرچاویەوەیە یاخیبووە، ئەوشارەی کە بەرامبەری هەست بەنامۆییەکی کوشندە دەکات و ڕەفتارەکانی جەماوەرەکەشی بەتەواوی ڕەت دەکاتەوە .. لێرەدا ئەو قەناعەتە بنەڕەتیە لای گەنجەکە دروست دەبێت کەبەدرێژایی ئەو ماوەیەی لەژیانیدا مابووی و ویژدانی دەهەژاند ((مزگەوت بەتەنها بەس نیە)) پێویستە پیاوانێك هەبن کە ژیانیان بەخت بکەن بۆ ((ئەمر کردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە)) .. بۆیە لەخۆی و لەژمارەیەك هاوڕێی کە لەگەڵ خۆیدا قوتابی بوون لە(دار العلوم) ئەزهەر .. چەند کۆمەڵێك دروست بوون بۆئەوەی ئامۆژگاری و ڕێنمایی خەڵك بکەن لەچایخانەو مزگەوت و ئەو شوێنانەی تردا کەخەڵکی تێدا کۆدەبنەوە .. ئامانجی دیاریکراوی بەنناش ئەوەبوو کەئەو بۆشاییەی نێوان ژیانی کرداریی مرۆڤی موسوڵمان و ڕێنماییە ئیسلامیەکان نەهێڵێت، ئەمەش لەڕێی ئەوەوە کە موسوڵمانەکە هان بدرێت ژیانی لەچوارچێوەی ئەم ڕێنماییانەدا بێت و لەگەڵیدا بیگونجێنێت .. ئەم گەنجانەش، کەدەتوانرێت

بەناوکی یەکەمی کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین لەقەڵەم بدرێن، لەقاهیرەوە بەرەو گوندەکان کەوتنەرێ(٩٠).

لەم کاتانەشدا گەنجە شێخەکە بەسەرسامیەوە لای پیاوە ئاینیە بەتەمەنەکان بەدوای ڕاوێژو پرسدا دەگەڕا .. لە(کتێبخانەی سەلەفی)ش (محي الدين الخطيب)ی ناسی کەبەڕێوەبەری کتێبخانەکە بوو، پاشان شێخ ڕەشید ڕەزاشی ناسی .. هەروەها فەرید وەجدی‌و ئەحمەد تەیمورپاشایشی ناسی‌و هەوڵی دەدا لەوانەوە ڕێگایەکی نوێ وەربگرێت بۆ کارکردن لەپێناوی ئیسلامدا.(٩١)

هەروەها چاوی بە شێخەکانی ئەزهەریش کەوت، بەڵام پێی خۆش نەبوو کەلەبەردەم تەوژمە نائاینیەکاندا خۆیان بەدەستەوە دابوو .. پەیوەندیەکانیشی بەم دەستەیەوە وەك خۆی ناوی نابوون ((فەرمانبەرە ئاینیەکان)) خەوی لەچاوی زڕاندبوو .. ئەگەر شێخەکانی ئەزهەریش بەم شێوەیە خۆیان بەدەستەوە دابێت .. ئەوا ڕێگا چارە چیە؟

گەنجەکە دەیزانی بەناچاری هەر دەبێت کارێك بکرێت .. دەبێت هەر ڕێگاچارەیەك بدۆزێتەوە بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەشەی ئیسلامی‌و بەرگریکردنی تەوژمەکانی مەدەنیەتی نوێ‌و بانگەشە زانستی‌و عیلمانیەکان.

---

(90) Mitchell, IBid . p. 5.

(٩١) مذكرات الدعوة والداعية ص ٤٩.

بەڵام هیچ یەکێك لەوانەی چاوی پێیان کەوت نەئامۆژگاریەکی پێویستو نەوەڵامێکی بەکەڵکیان پێنەدا.

لەساڵی کۆتایی خوێندنیشیدا (دار العلوم)، داوای ئەوەی لێکرا وتارێکی قوتابخانەیی بنوسێت سەبارەت بەم بابەتە ((لەسەر ئەو ئاواتە گەورانە بدوێ کەپاش تەواوکردنی خوێندنەکەت لەئەندێشەتدایە، روونیشی بکەرەوە چۆن خۆت ئامادە دەکەیت بۆ بەدیهێنانی))، گەنجەکەش دەربڕینی لەهەموو هەستو حەزەکانی کرد ((چاکترین خەڵك ئەوانەن، کە لەڕێگای ئامادەکردنی هۆکارەکانی ئاسوودەییەوە بۆکەسانی دیکەو لەڕێگای لەخۆبوردنەوە بەکاری راستەقینە بۆخزمەتی مرۆڤایەتی، ئاسودەیی خۆیان بەدەست دێنن)) یان ((لەڕێگای فێرکردنو ئامۆژگاری پێدانەوە)).

گەنجەکەش چی تاڵاو لەدەروونیدایە دەیڕێژێتە سەر کاغەز .. ((من پێم وایە گەلەکەم دوورکەوتۆتەوە لەئامانجەکانی ئایینەکەی، ئەمەش دەرئەنجامی ئەو قۆناغە سیاسیانەی کەپێیدا تێپەڕبووەو ئەو کاریگەریە کۆمەڵایەتیانەی تووشیبووەو هەروەها کاریگەری شارستانیەتی خۆرئاواییو .. فەلسەفەی ماددیو دابو نەریتە بیانیەکان.

بەم شێوەیەش باوەڕی گەنجەکان گەندەڵبووەو لەناویاندا هەستی گومانو سەرسامی تەشەنەی کردووە، لەجیاتی باوەڕیش بێ باوەڕیی بڵاوبۆتەوە..))

پاش ئەم هەموو رەخنەیەش لەکۆمەڵگەکەی، گەنجە شێخەکە بڕیاری چوارچێوەی ئایندەی خۆی دەدات ((کەببێتە مامۆستاو ئامۆژگاریکەرێك))و خۆی تەرخان بکات کەبەڕۆژ منداڵان فێربکاتو بەشەویش باوکیان، ئامانجەکانی ئاینو سەرچاوە بنەڕەتیەکانی ئاسوودەییو شادمانی ژیانیشیان نیشان بدات، پەیمانیش دەدات کەهەرچەندی لەتوانادا بێت لەتێکۆشانو لەخۆبوردوییو تێگەیشتنو لێکۆڵینەوە لەپێناوی ئەم ئەرکەدا

پێشکەشی بکات، جەستەیەکیش لەم پێناوەدا ببەخشێت کەئارەزوی هەیە ڕووبەڕووی سەختیەکان ببێتەوەو روحێکیش کەبۆ خوا نەزر کراوە.

پاشان ووتارەکەی بەم دەستەواژەیە کۆتایی پێ دێنێت ((ئەمە پەیمانە لەنێوان منو خوای خۆمدا)) [٩٢].

بەم هەستو سۆزانەوە گەنجەکە خوێندن تەواو دەکات .. شێخ حەسەن لبەننا لەکۆلیژی (دار العلوم) ساڵی ١٩٢٧ .. لەقوتابخانەیەکی سەرەتایی شاری ((ئیسماعیلیەش کرا بەمامۆستای زمانی عەرەبی)).

بەم شێوەیەش شانۆکە پێکهێنرا، پاڵەوانەکەش خۆی ئامادە کرد.

هیچیش لەبەر دەممان‌دا نەماوە تەنها ئەوە نەبێت کەدوای ڕووداوەکان بکەوین□□

---

[92] احمد انس الحجاجی –روح وريحان– ص ٨٥.

# بەشی دووەم

## پیرەکە ... وەك ڕابەرێك

ئێستا ئێمە لەکۆتایی بیستەکان نزیکدەبینەوە .. شێخی بەنناش لەوەسفی ئەم ماوەیەدا قەڵەمەکەی بەدەستەوە دەگرێت و دەڵێ ((ئەمە ئەوکاتەیە کە میللەتی میسری لەژیانە کۆمەڵایەتیەکەیدا لەنێوان دوو بەرەدا جۆلانەی دەکرد، یەکێکیان ئیسلامی ئازیزو خۆشەویستەکە بۆی بەجێماوەو پارێزگاری کردووەو لەگەڵیدا ڕاهاتووە، چواردە سەدەی تەواویش پێی ژیاوەو شانازی پێوە کردووە، ئەوی دیکەشیان ئەم هێرشە خۆرئاواییە توندو تیژەیە کەبەهەموو چەکێکی کاریگەرو کوشندە لەدارایی و دەوڵەمەندی و ڕواڵەت و خۆشگوزەرانی و ئامرازەکانی پروپاگەندە، پڕچەك بووە))[1]

هەوڵەکانی قوشقیکردنی هەست و سۆزە ئسلامیەکانیش هەر بەردەوام بوو، چەند توخمێکی گوماناویش تێکەڵ ببوو. ڕۆژنامەی ((ئیسرائیل))، کە ئەلبێرت مۆسێری خاوەنی بوو ڕۆژنامەیەکی زایۆنی پوخت بوو، زایۆنستیەتی خۆی نیشاندەداو[2] چەندەها شالاویشی دەکرە سەر

---

[1] مذكرات الدعوة والداعية – ص ٤٩.

[2] طارق البشري – المرجع السابق – ص ٢٣٨.

مەسـەلەی ((تەبشـیر))، زنجـیرە گوتارێکیشـی لـەژێر ناو نیشـانی ((چـۆن هەوڵیاندا بمکەنە نەسرانی))بڵاوکردەوەو تیایدا باسی ئەو هەوڵانەی دەکرد کە لەقوتابخانە کاسۆلیکەکاندا دەدرا بۆ نەسرانی کردنی قوتابیە جولەکەو موسوڵمانەکان[٣] لەهەمان کاتیشدا ئاوازێکی هاوئاهەنگ لەلاکەی ترەوە بەرز دەبویەوە، ئەویش بەوەی.

کەچەند کۆمەڵێکی گومانلێکراو خەریکی هەوڵەکانیان بوون بۆ تەبشیرو، بگرە بۆ کۆکردنەوەو کۆکردنەوەی ژمارەیەك لەمەسیحیەکانیش ڕووەو چەند مەزهەبێك کەلەمیسردا نەناسراوو نەبیستراو بوون.

ئەزمونە دەستوریەکەو هـەروەها بنیاتـە سـەرمایەداریەکەش لـەداڕماندا بـوو، قەیرانـە ئابورییـە جیهانیەکەش ڕەنگدانـەوەکانی لەسـەر میسـر قوڵـتر دەبوو تاهەمووان توشـی نائومێدی بکاتو هـەندێك کەسیش هـەوڵیان دەدا کەلـە ((ئیسـلامگەری))دا دەروازەیـەك بدۆزنـەوە بـۆ دەربازبوون لـەم قەیرانـە یەك لەدوای یەکانە[٤].

---

[٣] ((اسرائیل)) ١٩٣١/٧/٣١.

[٤] تێبینـی دەکرێت کە هـەرەس هێنانی ئەزمونـە دەستوریەکە لـەناوخۆداو هەڵاوسـانی قەیرانـە ئابوریەکـە لەسـەر هـەموو ئاسـتی ئۆردوگـای سـەرمایەداریو سـوربونی زۆر لەبیرمـەندەکان تەنانـەت لیبرالیـەکانیش – لەسـەر ڕەتکردنـەوەی سۆشیالیسـتی .. هیـچ هیواو ڕێگایەکی بۆ چونەدەرەوە لەبەردەمیاندا نەهێشتبوو جگە لـە ((ئیسلامگەری)) .. ئەمەش لەوەوە دەردەکەوێت کەزۆر کەسی وەك (د. محمد حسین هیکل و عباس العقاد و د. طه حسین و توفیق الحکیم)) ڕوویانکردبووە نوسینو توێژینەوە ئیسلامیەکان.

لـە (١٩)ی كـانونی یەكـەمی (١٩٢٧)یشـدا سـاڵی نوێـی خوێنـدن دەسـتپێدەكات، مامۆسـتا گەنجەكـەش دەبێـت بچێـت بـۆ شـارێك كەبـەلای ئەمەوە زۆر تازەیە، خۆشی دان بەوەدا دەنێت كەتەنانەت شوێنی شـارەكەی لەسەر نەخشـەش نـەدەزانی، هـەموو ئـەو زانیاریانـەش كەلەسـەر شـارەكە هەیبوو، تەنها ئەوەبوو كەسەربە نۆكەندی (سوێس)ەو ..چەند ئۆردوگایەكی ئینگلیزی داگیركەریشی تێدایە.

لە (ئیسماعیلیە)ش گەنجەكە ژیانی خۆی تـەرخاندەكات بـۆ جێ بەجێ كردنـی ئـەو بیرۆكەیـەی بـاوەڕی پێـی هـەبوو، ئـەوەی كەلەبابـەتی توێژینەوەكەیدا لە(دار العلوم) نوسیبووی‌و لەپێشتردا ئاماژەمان بۆ كرد .. بەڕۆژ منداڵانی فێر دەكرد، بەشـەویش باوكیـان، زۆربـەی ئـەو باوكانـەش كرێكارو فەرمانبەری بچوك‌و بازرگانی سادە بوون[٥]. لەقوتابخانەشـەوە بۆ مزگـەوت‌و خوتبـەدان، لەمزگەوتیشـەوە بۆ چایخانـەكان تا قسە بۆ خـەڵكی بكات‌و گفتو گۆیان لەگەڵدا بكات‌و وتاریان پێشكەش بكات، لەڕێی هـەموو ئەم شتانەشـەوە ئەو خەڵكانـەی هـەڵدەبژارد كـەزۆر بایـەخیان بەمەسـەلەكە دەدا، بۆئـەوەی چـەند كۆمـەڵێكی تایبـەتیان لێ دروسـت بكـات كـەكات‌و كۆششێكی زیاتریان تەرخان بكەن بۆئەوەی ئەو دەیەوێ.

---

(٥) فتحي العسال - حسن البنا كما عرفته ص ٥٤.

مامۆستا گەنجەکەش ئاراستەکانی خۆی دەستنیشان دەکات .. پێویستە سەرچاوەکانی نفوزو دەسەلات لەشارەکەدا بەلای خۆیدا ڕابکێشێت، ئەم سەرچاوانەشی دیاریکرد:

١- زاناکان.

٢- شێخانی تەریقەتە سۆفیگەریەکان.

٣- گەورە پیاوان.

٤- یانەکان.[٦]

شارەکەش بەدەست ئەوەوە دەینالاند کەبەتەواوی لەژێر ڕکێفی بیانیدا بوو .. هەموو شتێك بەدەست داگیرکەرو کۆمپانیای سوێسەوە بوو، تەنانەت لافیتەی شەقامەکانیش بەئینگلیزی نووسرابوون .. بەلام تەنها شت کەلەم شارەدا بۆ میسریەکان مابۆوە، بریتی بوو لە ((کلۆڵی)). بەهەرحاڵ بانگەشەی حەسەن ئەلبەننا ((بۆ فەرمانبەرە گەورەکانی کۆمپانیای نۆکەندی سوێس نەبوو، بەڵکو بۆ کرێکارە زەحمەتکێشەکان و بۆ هەژارەکان بوو. ئەمانیش کەزۆر بەنەبوونی لەبەردەم ئیمتیازاتە زۆرەکانی ئەوروپیەکانی شارەکەدا دەژیان، ئامادەیی تەواویان تێدابوو کە گوێ لەبانگەشەکەی بەننا بگرن))[٧]

---

[٦] مذكرات الدعوة والداعية ص ٢٢.

[7] Kladdri – Tbib, p. 74.

لەگەڵ ئەوەشدا کە حەسەن ئەلبەننا سەرقاڵی کارەنوێیەکەی بوو لەئیسماعیلیە، سەرەڕای ئەوەش کەهەستی دەکرد زەویەکەی لەئیسماعیلیە زۆر بەپیتەو بەروبومی خێراشی هەیە، بەڵام هەر پەیوەندیەکانی بەقاهیرەوە نەپچڕاند .. ئەو شارەی کەهەرگیز بەننا ((گوناهەکانی)) لەبیر ناکات.

هەر لەساڵی (١٩٢٧)داو .. بەهۆی هەمان ئەو هۆکارانەشەوە کەویژدانی شێخە گەنجەکەی لەئیسماعیلیە جوڵاندبوو .. لەقاهیرەش بزوتنەوەیەکی گەرموگوڕ لەنێوان هەندێك لەئیسلام خوازەکاندا هەبوو، ئەم بزوتنەوەیەش لەوەدا ڕەنگیدابووەوە ((چەند کۆمەڵەیەکی ئایینی پێکهێنرا بوو کەسروشتێکی کۆمەڵایەتیان هەبوو، بۆئەوەش کاریان دەکرد کەنەوەی نوێ بەپێی ڕێنمایی و ڕەوشتە ئیسلامیەکان پەروەردە بکەن، بێ ئەوەی باس لەئەرکە ئایینیەکان بکەن بەرامبەر کۆمەڵگە بەگشتی. (کۆمەڵەی لاوە موسوڵمانەکان)یش یەکێك بوو لەگرنگترینی ئەم کۆمەڵانە))[8]. زۆریش لەکەسایەتیە ئیسلامیەکان بەشداری دامەزراندنی ئەم کۆمەڵەیەیان کردبوو، هەندێکیان سەر بەحیزبی نیشتمانی بوون (عەبدولحەمید بەگ سەعید و شێخ عەبدولعەزیز جاویش)، هەندێکی تریشیان قوتابیەکانی شێخ محەمەد عەبدە بوون(ئەحمەد تەیمور پاشاو موحیبەدین ئەلخەتیب و محەمەد الخرز حسێن)[9]..

---

[8] المرجع السابق ص ٧.

[9] المزيد من التفاصيل حول جماعة الشبان المسلمين راجع:

لەڕاستیشدا کۆمەڵەی لاوە موسوڵمانەکان، لەگەڵ ئەوەشدا کە ((چەند دروشمێکی ئیسلامیی ئاشکرایان بەرزکردبۆوە، بەڵام لەچالاکییە کردارییەکانیاندا هیچ بایەخێکیان بەقوڵکردنەوەی ڕێنماییەئیسلامیەکان نەدەدا، هەروەها لەبنەڕەیشەوە ڕوویان کردبووە لاوەکان و بازنەی خوێندەواران، بەهیچ شێوەیەکیش هەوڵیاننەدەدا ڕووبکەنە جەماوەر. لەناو بازنە ئیسلامیەکانیشدا پێویستیەکی زۆر هەبوو کەبایەخ بەکاری ئایینی بدرێت بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی تەوژمە علمانیەکان .. بەم شێوەیە چەندەها کۆمەڵ پەیدابوون کە ڕواڵەتێکی توندڕەوانەیان هەبوو، بەڵام هیچیان نەیانتوانی ڕەگ دابکوتن و هێندەی کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین پشتگیری بەدەست بهێنن))[10].

بەم شێوەیە حەسەن ئەلبەننا سەرەڕای ئەوەش کە پەیوەندی بەکۆمەڵی لاوە موسوڵمانەکانەوە هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لەئیسماعیلیە پەیامنێری گۆڤاری ((الفتح)) بوو کە موحیبەدین ئەلخەتیب سەرنووسەری بوو - ئەمیش یەکێك بوو لەسەرکردەکانی لاوە موسوڵمانەکان - بەڵام هەر هەستی دەکرد کەپێویستە کۆمەڵەیەك لەجۆرێکی نوێ دابمەزرێنرێت.

---

Heyworth – Dumme, J- Religious and political Trands in Egypt, (1950) pp.11-14.

(10) Khadduri – Ibib, p. 70.

پەیوەندیەکانیشی لەئیسماعیلیە لەگەڵ چەند کەسێکی دیاریکراودا گەڵاڵە دەبوو. سەرەڕای هەوڵە چڕوپڕو پەیوەندیە بەرفراوانەکانیشی، مەسەلەکە لەسەرەتادا بەشەش کرێکاری سەربازگە بەریتانیەکان دەستیپێکرد.

ئەمەش لەئازاری (١٩٢٨) دا بوو .. کاتێك بەننا کۆبوونەوەی بەشەش پیاوەکە کرد. بەنناش سوورە لەسەرئەوەی کەچیرۆکی یەکەم کۆبوونەوەمان بۆ بگێڕێتەوە، هەروەها شێوازێکی درامیش کەوا دەربخات بانگەوازەکە لەدەروونی شوێن کەوتووەکانیەوە هەڵقولاوەو ئەم بەسەر هیچ یەکێکدا نەی سەپاندوە .. شەش پیاوەکە کۆبوونەوەو .. ڕوویانکردە حەسەن ئەلبەننا، پاش ئەوەیش سوپاسی ئەو ئەرك‌و ماندووبوونەیان کرد کەکێشابووی بۆ فێرکردنیان‌و پێناساندنی کاروباری ئاینەکەیان، گوتیان .. ((بیستمان‌و هوشیار بووینەوەو کارمان تێکرا، بەڵام ئێمە ڕێگای گەیشتن بە سەرفرازی ئیسلام‌و خزمەت‌و خۆشگوزەرانی موسوڵمانان نازانین. بێزاربووین لەم ژیانی کۆیلەیی‌و پێوەند کراوییە .. جێگای سەرشۆڕیشە بۆ ئێمە ئاوا عەرەب‌و موسوڵمانەکان بێ پایەو بێ سەربەرزی ببینین کەهەروا بەکرێ گرتەو شوێنکەوتەی بیانی بن. ئێمە هیچ شتێك شك نابەین جگە لەخوێن‌و ڕوحمان .. کەمێکیش پارە، ناشزانین وەك جەنابت ڕێگا چارە بدۆزینەوە بۆ کارکردن، وەك جەنابیشت ڕێگای خزمەتکردنی نیشتمان‌و ئایین نازانین. ئەوەیش کەئێستا ئێمە حەزی پێدەکەین، ئەوەیە کەهەرچیمان هەیە

پێشکەشی تۆی بکەین تا سبەینێ لەبەردەم خوادا ئێمە بەرپرسیار نەبین و تۆ بەرپرسیاربیت لەوەی ئێمە دەیکەین. ئەگەر کۆمەڵێکیش لەبەردەم خواداو بەدڵسۆزیەوە پەیمانی ئەوەبدەن کەلەرێی ئاییندا بژین و لەپێناو خوادا بمرن و تەنها کار بۆ ئەوەش بکەن کەخوا ڕەزامەندی لەسەرە، ئەوا هەرچەندە ژمارەشیان کەم بێت بردنەوەو سەرکەوتنیان مسۆگەرە))[11].

شێوە درامیەکەش لەبەپێزی شێوازی نوسینەکەو قوڵیی بیرۆکەکەوە دەردەکەوێت، هەروەها ڕەنگە لەوەشەوە دەربکەوێت کەشێخی بەننا بە پەرۆشەوە دووپاتی دەکردەوە، دەعوەکە خۆی بۆی هاتوەو ئەم داوای نەکردووە، بەیعەکەش خۆی بەرەوپیری هاتووەو ئەم نەچووە بۆلای، لێپرسراوێتی سەرکردەییشی - بێ ئەوەی داوای بکات - لەسەرشانی هەڵگرتووە.

لەکاتێکیشدا شێوە درامیەکە بەتەواوی کامڵ دەبێت، کەبەننا باسی ئەوە دەکات قسەکانی شەش پیاوەکە چەند کاریگەریان هەبوو. لەسەری و ئەو لێپرسراویەتیەی خراوەتە ئەستۆی چەند ترساندوێتی و چۆن هەموویان سوێندیان بۆ خواردووە کەببنە ((سەربازێك بۆ پەیامی ئیسلام)).

---

[11] مذكرات الدعوة والداعية، ص ٧٣ – ٧٤.

کاتێکیش کە بۆ ناوێك دەگەڕان بۆ کۆمەڵەکە، بەننا گوتی ((ئێمە براین لەخزمەتکردنی ئیسلامدا، لەبەرئەوە ئێمە برایانی موسوڵمانین (الاخوان المسلمون) ))[١٢].

سەرەڕای ئەو جیاوازیەش کەشێخی بەننا لەگەڵ کۆمەڵە ئاینییەکانی پێشتردا هەیبوو، بەڵام لەسەرەتادا خۆی وەکو کۆمەڵێکی ئاینی پوخت ڕاگەیاند، کەئامانجی ((ئەمرکردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە))[١٣]یە.

تێبینیش دەکرێت کەبەننا جەختی لەسەرئەوە دەکرد کۆمەڵەکەی لەسەرەتادا تەنها درێژکراوەیەکی کۆمەڵەی حەسافیەی خێرخواز بووە کە بانگەشەی بۆ ڕەوشت و ئەخلاقی جوان دەکردو ڕێگری لەخراپەو شاڵاوەکانی تەبشیر دەکرد ((کۆمەڵەکەش لەپێناوی پەیامەکەیدا خەباتێکی کردبوو کە شایانی سوپاسە، لەم خەباتەشیدا ئیخوان موسلیمین پشتگیرییان دەکرد))[١٤]

بەنناش لەسەرەتادا دووپاتی دەکردەوە کە ئامانجی کۆمەڵەکەی ((تەنها بریتییە لە گەڕانەوە بۆ کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی،وە

---

[١٢] موسى اسحق الحسيني – المرجع السابق ص ١٧.

[١٣] د. يونان لبيب رزق – الاحزاب المصرية قبل ثورة ١٩٥٢ -- مركز الدراسات السياسية و الاستراتيجية (الاهرام) (١٩٧٧) – ص ٨٨.

[١٤] مذكرات الدعوة والداعية، ص ١٦.

پاککردنەوەی ئەقڵەکان لەئەفسانەو خەیاڵ و گێڕانەوەی خەڵکی بۆ ڕێگای ئیسلامی بێگەرد))[١٥].

یەکێك لەتوێژەرەوەکانیش تێبینی دەکات کەئەم ئامانجانە بەهیچ شێوەیەك جیاوازنەبووە لەئامانجی هەر یەکێك لەکۆمەڵە ئیسلامیە خێرخوازەکانی تر[١٦]. ئەم تێبینیەشی بەبۆچونی یەکێك لەدامەزرێنەرەکانی کۆمەڵەکە (د. عبدالرحمن حسب الله)پشتبەست دەکات کە لەیادەوەریەکانیدا دووپاتی کردبۆوە گوایا کۆمەڵەکە لەسەرتادا بریتی بووە لەکۆمەڵەیەکی خێرخواز[١٧]. بەلاّم بەننا دەگەڕێتەوەو دووپاتی دەکاتەوە ((برایان: ئێوە نەکۆمەڵەیەکی خێرخوازن و نە حیزبێکی سیاسین، نەدامەزراوەیەکیشن کەئامانجەکانی بابەتی بێت و مەبەستەکانی دیاری کراوبێت، بەڵکو ئێوە رۆحێکی نوێن لەدڵی ئەم نەتەوەیەدا کەبەقورئان ڕزگاری دەکات، ڕووناکیەکی نوێشن کەهەڵدێت و بەناسینی خوا تاریکی مادده لەناو دەبات))[١٨].

توێژەرێکی دیکەش دەڵێت، بەننا تێکەڵەیەکی لە ((نەریتە سۆفیگەریە پوختەکان و هزری عەقیدەیی)) پێشکەش بە شوێنکەوتووەکانی دەکرد،

---

[١٥] المرجع السابق، ص ١٤٢.

[١٦] السيد محمد عشماوي – تأريخ الفكر السياسي المصري ١٩٤٥ – ١٩٥٢.

[١٧] السيد محمد عشماوي – تأريخ الفكر السياسي المصري ١٩٤٥ – ١٩٥٢.

[١٨] حسن البنا – بين الامس واليوم ص ٢١.

((بەلام بەبێ ناوەڕۆکێکی تیۆری، کەتەنانەت ئەگەر بەتەواوەتی لەچوارچێوەیەکی ئیسلامیشدا بێت))[19].

ڕەنگە ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووبێت کەبەننا بەپەرۆشەوە نەیدەویست کۆمەڵەکەی وادەربخات کەسەر بەڕێبازێکی تایبەتە .. واتا دەیویست ئەوە ڕانەگەیەنێت کەکۆمەڵەیکەی سەر بە یەکێك لەچوار مەزهەبەکەیە، یان یەکێکیانی پێ باشترە لەوانی تر، یاخود سەر بە هەر قوتابخانەیەك یان بزوتنەوەیەکە لەوانەی بەدرێژایی مێژووی کاری ئیسلامی سەریان هەڵداوە..

چوار مەزهەبەکە پێویستە ڕێزیان بگیرێت و جیاوازیەکانی نێوانیشیان پێویستە بەچاوی خۆشەویستی و برایەتیەوە سەیری بکرێت .. بەننا بەپەرۆشەوە دەیویست هیچ بوارێك بۆ ناکۆکی لەنێو موسوڵماناندا نەهێڵێت بەرامبەر بەبانگەشەکەی خۆی[20].

بەهەرحاڵ ((کۆمەڵی ئیخوان لەوەدا سەرکەوت کەخۆی وەکو بزوتنەوەیەکی ئاینی پێشکەش بکات، خۆیشی وا لەقەڵەمدا کە ئەلتەرناتیڤی هەرەسهێنانی ئاڕاستە عیلمانیەکان و جۆرو ڕێکخراوەکانی حوکم و نەریتە ئەورووپیە (هێنراو)ەکانە. خۆشی واڕادەگەیاند کەدەتوانێت چارەسەر بۆ مەسەلە ئایدۆلۆژیەکان و ناکۆکییە کۆمەڵایەتیەکان پێشکەش

(19) Gibb, W.A . R , Modern Trends in Islam (1947) p. 7.

(٢٠) حسن البنا – بين الامي واليوم، ص ٩.

بكات کەلەو کاتەدا ڕووبەڕووی میسر دەبوونەوە، ئەمەش بەوەی؟ جەختی لەسەرئەوە دەکرد قورئان بنەمای پتەوی بنیاتنانی (مدينة فاضلة)یە))[٢١].

پێش ئەوەیش هەوڵبدەین بەوردی ئەم گوتەیە بپشکنین، تێبینیەك خۆی دەسەپێنێت کەئافرەتێکی توێژەر لەمێژووی هزری سیاسی میسردا باسی کردووە، ئەم ئافرەتە تێبینی ئەوەی کردووە کەڕۆژنامەیەکی وەکو ئەهرام بەجۆشێکی نائاساییەوە پێشوازی کردووە لە .. کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین. هەر لەسەرەتای دروست بوونی کۆمەڵەکەوە ئەهرام بەشێوەیەکی سەیر دوای چالاکی کۆمەڵەکە دەکەوێت و پشتگیری لێدەکات و ستایشی دەکات .. لە کانونی دووەمی (١٩٢٩) دا وێنەیەکی دامەزرێنەرەکان کەژمارەیان دوانزە ئەندام بوو .بڵاوکردەوە لە شوباتی (١٩٢٩)دا هەواڵێك لەبارەی دامەزراندنی لقێکی کۆمەڵەکەوە لەئەسیوت. پاشان هەواڵێك لەبارەی کردنەوەی لقی قاهیرەوە لەشەقامی ئەلقەسرلعەینی، پاش ئەمیش چەندەها هەواڵ لەبارەی دامەزراندنی چەند لقێکەوە لەنەجع حەمادی و بەنهاو.... هتد.[٢٢]

پاشان ڕۆژنامەی ئەهرام کەبەناوبانگ بوو بەوەی کەبەردەوام خۆی دوور ئەگرێ بەرامبەر کۆمەڵە ئاینیەکان، بەتایبەتیش ئیسلامیەکانیان، دەست دەکاتەوە بە بایەخدان و بگرە پروپاگەندە کردنیش بۆ کۆمەڵەکە ((ئیخوان

---

[٢١] السيد محمد عشماوي -- المرجع السابق ص ٤٠٠.

[٢٢] أمال محمد كامل بيومي – التيارات السياسية في مصر ١٩٤٥ – ١٩٥٢. رسالة ماجستير غير منشورة. ص ٢٥.

پەیمانگایەکی زانستی کامڵ پیشکەش بە کۆمەلگەی میسری دەکەن، ئەمەش بەوەی کە بەشیکیان بۆ خویندنی زمانە زیندوەکان بەشەو کردۆتەوەو بەشیکی دیکەش بۆ هونەرە جوانەکان کەمۆسیقای خۆرهەلاتی یەکیکە لەبابەتەکانی، هونەری نواندنیش لەلایەنە ئەخلاقیەکەوە، هەروەها بەشیکی دیکەش بۆ هەلکۆلین - ئەمانەش جگە لەبەشی وەرزشی، سەرەرای ئەم بانگەشانەش کۆمەلەکە بایەخیداوە بەبنیاتنانی کتیبخانەیەك کەپرە لەکتیبی بەنرخ و چاپەمەنی کەدەبیتە سەرچاوەیەکی تیروتەسەل بۆ پێداویستی ئەندامەکان))[٢٣].

...ئەم تێبینیەش جێدەهێڵین و .. وەکو نیشانەیەکی پرسیار وازی لێ دێنین. هەوڵیش دەدەین لەتوێژینەوەکەماندا پێشڕەوی بکەین .. دوو هەنگاوی گرنگیش لە بەردەمماندایە کە ئەمانەن:

سەرنجێك بدەین لە .. کەسەکە.

... یەکێکی دیکەش لە .. کۆمەڵەکە.

بەڵام پێویستە لەسەرمان وریابین، کەتەنها هەوڵدان بۆ جیاکردنەوەی کەسەکە لەکۆمەڵەکە، وەك ئەوە وایە نەشتەرگەرێك هەوڵبدات نەشتەرێك بخاتە نێوان دوو ماسولکەی یەك ئەندامەوە.

[٢٣] الاهرام ٢٠ يناير ١٩٣٠.

## کەسەکە...

کاتێك شوێنکەوتنی سۆفی بۆ شێخەکەی و بەیعەی مورید بۆ ئیمامەکەی لەگەڵ ئەمەکی سیاسی بۆ پێشەوایەکەی لەیەك دەفردا دەتوێنەوە، ڕەنگە چی دەرچێت؟

وەڵامەکە .. ئەو جۆرە سەیرەی خۆشەویستی دەردەچێت کەهەموو ئیخوانیەکی بەشێخ حەسەنئەلبەنناوە بەستبۆوە .. ((هەڵماندەرە ئەو شوێنەی خۆت پێتخۆشە، بەخودا ئەگەر بمانخەیتە ئەو دەریایەوە لەگەڵتدا دێین))[٢٤] یەکێك لەشەوێنکەوتووەکانی ئاوای پێگوتووە.

(((هەڵوێستی مورید چۆنە بەرامبەر شێخەکەی، هەڵوێستی هەریەکێك لەئێمەش وابوو بەرامبەری، هەر یەکەشمان جڵەوی خۆی دابووە دەستی تا ببیات بۆلای خوا))[٢٥] یەکێك لە گەورە سەرکردەکانی ئیخوان بەو شێوەیە باسی کردووە.

پێشەوایەکی ئیخوانی دیکەش بەم شێوەیە وەسفی کردووە ((ئەگەر کۆڕەکە لەسەر زەوی بووایە ئەوا لەسەر حەسیرێك دادەنیشت، ئەگەر کورسیش ڕیزکرایە ئەوا لەڕیزی کۆتاییدا دادەنیشت، خۆی گرمۆڵە دەکرد بەشێوەیەك کەخەریك بوو نەدەبینرا، هەێندەش سادە بوو خەریك بوو

[٢٤] مؤتمر طلبة الاخوان المسلمين (١٣٥٧ هـ ) ((من خطاب لمحمود الجندي جمة عضو مكتب الارشاد العام)).

[٢٥] الدعوة، ١٥/ ٢/ ١٩٥٥، حسن العشماوي مقال: ماذا اقول عن حسن البنا؟

هەستی پێنەدەکرا، زۆربەی کات دزداشەیەکی لەهەرزانترین قوماش لەبەردەکرد))[٢٦].

نووسەرێکی ئەمەریکاییش باسی بەننا دەکاتو دەڵێت: ((لەم هەفتەیەدا سەردانی پیاوێکم کرد کەڕەنگە ببێتە یەکێك لەدەرکەوتووترینی پیاوەکان لەمێژووی هاوچەرخدا، ئەگەر ڕووداوەکانیش لەو گەورەتربن ئەوا ڕەنگە دیار نەمێنێت، ئەویش شێخ حەسەن ئەلبەننای پێشەوای ئیخوانە)) هەروەها دەڵێت ((کابرا ڕواڵەتێکی دڵگیری هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەهیچ زمانێکی بیانی نەدەزانی بەڵام لەبزێکی شیرنی هەبوو، شوێنکەوتوەکانی کەقسەکانیان بۆ وەردەگێڕام هەوڵیان دەدا ئامانجەکانی ئەم بانگەشەیەم تێ بگەیەنن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش کەزۆر درێژەیان پێدا هەر قەناعەتیان پێ نەکردم، کابراش هەربێدەنگ بوو هەتا ئەوکاتەی سەرسامی بەڕوخسارمەوە دەرکەوت، ئێنجا پێی گوتن: یەك شتی پێ بڵێن: ئایا هیچت لەسەر محەمەد خوێندۆتەوە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی زانیت چی کردووەو بانگەوازی بۆچی کردووە؟ گوتم: بەڵێ، گوتی ئێمەش ئەوەمان دەوێت. سەیری ئەم کابرایەمان کرد.. سیما سادەکەی، ڕواڵەتە ئاساییەکەی، ئەو متمانە بێ سنوورەی کە هەیبوو بەخۆی، ئەو باوەڕە سەرسوڕهێنەری کەهەیبوو دەفیکرەکەی باوەڕیشم وابوو کە ئەو ڕۆژە دێت کەئەم کابرایە پێشەوایەکی

[٢٦] المغوق. ١٥. ٢. ١٩٥٥. عبدالرحمن البنا مقال الرجل لم يحمل ضغفنا.

جـەماوەریی بگرێتــە دەســت. نــەك بەتەنــها لەمیســردا. بــەڵکو لەهــەموو خۆرهەڵاتدا))[٢٧].

نووســەرە ئەمریکیەکــە بــەردەوام دەبێــت: ((حەســەن ئەلبــەننا قورئــانی هەڵگرتو لەپێناو قورئانیشدا لەسەر ڕێی پیاوانی هزری نوێدا وەستا))و .. ((پیــاوە قورئانیەکــەش بــاوەڕی وابــوو کــە ئیســلام هــێزێکی دەروونیــە لەویژدانی خۆرهەڵاتداو دەشتوانێت ئەو گوڕەی پێ بدات کە باڵادەست بێت لەسەر زەوی)).

.. بــەم شــێوەیە دەتوانــین دەیــەهاو دەیــەها لەوبۆچونانــە بدۆزینــەوە کەخوێنــەر سەرسام دەکـات بـەهۆی ئـەو زیادەڕۆییانـەوە کەتیایاندایـە .. سەیریش ئەوەیە کە ئەو هەموو خۆشەویستیەی شوێنکەوتوەکان هـەیانبوو بۆ شـێخ. نـەیارەکانی هێنـدەی ئـەوە ڕەنگـە زیـاتریش دژایـەتیو ڕەت کردنەوەیان بۆی هەبوو.

ئەمە چ پیاوێکە...؟

سەرلەنوێ دەگەڕێینەوە .. بۆ پشکنینی دۆسییەکەی.

مامۆستای زمانی عەرەبی قوتابخانەیەکی سەرەتایی لەئیسماعیلیەدا .. کاتێکیش چالاکیە چڕەکـەی لـەڕیزەکانی کرێکارو پیشـەگەرەکاندا دەسـتی پێکرد. بەجۆشێکە چووە گەرمەی چالاکیەوە کە وەسف ناکرێت ئەم

(٢٧) الهلال العربي ١٩٧٧ مقال لكاتب امريكي حسن البنا بقلم روبير جاكسون ترجمة انور الجندي.

بەجۆشیەشی لایەنگرو نەیارەکانیشی سەرسام دەکرد .. بێئومێدیو ماندووبوونی نەدەزانی .. خۆی دەکرد بە کۆڕو کۆمەڵەکاندا – هەچ کۆمەڵێك بووایە – و بانگەشەی قورئانو ئایین یاوەری بوون.

ڕۆژێك بڕیاریدا لقێك بۆ کۆمەڵەکەی لە (أبوصویر) بکاتەوە. بەتەنیا سەفەری کردبۆ ئەویو کەسیشی تێدا نەدەناسی، بەشەقامەکاندا دەستی کرد بەگەڕانو لەڕێگاو چاخانەو دوکانەکاندا سەرنجی ڕوخساری خەڵکی دەدا، تا خاوەن دوکانێکی بینی کە ((بەویقارو سیما پیاوانەو سینگ فراوان بوو، چاوەڕێی چاکەشی لێدەکراو زمانێکی پاراوی هەبوو بینیم شتی دەفرۆشتو قسەی لەگەڵ کڕیارەکانیدا دەکرد، سیمای جوامێری پێوەدیار بوو، سڵاوم لێکردو لای خۆیو ئەوانەی لەدوکانەکە لەگەڵیدابوون دانیشتم، ئینجا خۆمم پێناساندو ئەو ئامانجەشم پێگوت کە لەپێناویدا هاتووم بۆ ئەبوسوێر، هێندە چاکیش دەهاتە بەرچاوم کە ئەرکی ئەم بانگەشەیە بگرێتە سەرشان. لەقسەکانیشمدا سەرنجی دانیشتوەکانم بۆ چەند خاڵێکی بنەڕەتی ڕادەکێشا: بۆ مەزنیی مەبەستەکانی ئیسلامو بڵندی حوکمەکانیو بۆ ئەوخراپەکارییو گەندەڵییەی لەکۆمەڵگەدا هەیە، بەهۆی ئەوەوەی پشتمان لەحوکمەکانی ئیسلام کردووە. هەروەها سەرنجیشیانم ڕادەکێشا بەلای ئەوەدا کە بانگەواز بۆ چاککردنەوەی ئەم بارودۆخە بکرێت دەنا تاوانبار دەبین چوونکە ئەمرکردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپەو ئامۆژگاری

کردن فەرزێکی پێویستە. هەروەها سەرنجیانم بۆ ئەوەش ڕادەکێشا کەڕێگای تاکەکەسی بەتەنها بەس نییە))[٢٨].

دەشتوانرێت بگوترێت کەئەم گەشتی ئەبو سوێرە سەدان و بەڵکو هەزاران جاردووبارە بووەوە. شێخە گەنجەکەش جانتایەکی بچوکی هەڵدەگرت کەجلەکانی تێدابوو و گونداو گوند دەگەڕا، ڕووشی دەکردە پیاوماقوڵانی گوندو لە میوانداریاندا دادەنیشت، قسەو گفتوگۆو بانگەشەی دەکرد، ئەگەر بەسینەیەکی فراوانیشەوە پێشوازیی نەکرایە، مزگەوت هەبوو پشووی تێدا دەداو تێیدا دەنووست و بانگەوازی خەڵکی دەکرد.

((سەیرترین شتی ئەم کابرایە ئەو سەبرو خۆڕاگرییە بوو کەلە گەشتەکانی (صعید)دا هەیبوو .. ئەو گەشتانەی تەنها لەوەرزی هاویندا دەستی پێدەکرد کەئەو ناوچەیە لەگەرمادا دەکولا .. لەم ناوچانەشدا کابرا بەئوتومۆبێل و شەمەندەفەرو ولاخ و بەلەم و بەپێ هات و چۆی دەکردو دەگەڕا. لەوێش زۆر بەتاقەت و هێزو گوڕەوە دەبینی .. نەخۆری بەتین و نەماندوبوونی سەفەرکاریان تێنەدەکردو پێی بێتاقەت نەدەبوو)) .. ((ماوەی پانزە ساڵ خەریکی ئەم گەشتانە بوو، لەم ساڵانەشدا سەردانی زیاتر لەدووهەزار گوندی کردبوو و هەر گوندەش چەند جارێك .. بەهۆی ئەم گەشتانەشەوە زانیاری و تێگەیشتنێکی زۆری پەیداکردبوو سەبارەت بە

---

(٢٨) مذكرات الدعوة والداعية، ص ١٠٠.

مێـــژووی نزیـــك و دووری خـــێزان و ماڵـــەكان و ڕووداوو بـــەرەوەریەكانی گوندەكەو هیچ شتێكیش كەلەگوندەكەوە بەرز یان نزم  بووبێتـەوە، هـەروەها سەبارەت بەو  ئاراستە سیاسیانەش كەلەگوندەكاندا هەبوو كاریگەریشیان لەسەر گوندەكان و ڕەزامـەندی و كینـە خەڵكەكـەش بەرامبـەریان، هـەروەها سەبارەت بەو ناكۆكی ناخۆشیانەش كەلە نێوان حیزب و دامەزراوەو تایەفەو تاكە كەسەكانیشدا هەبوو .. جاری واش هەبوو سەردانی ناوچەیەكی دەكرد كەناخۆشیەكی توند لەنێوان دوو خێزانیدا هەبوو، هەر خێزانەش دەیویست ئـەم بـەلای خۆیـدا ڕابكێشـێت تـا بەهۆیـەوە بەسـەر خێزانەكـەی تـردا سەركەوێت، بەڵام ئـەم یان ڕاستەوخۆ ڕووی دەكردە مزگەوت، یان ڕێگای سەفەرەكەی دەگۆڕی، هەتا نەشچوایەتە ماڵی كرێكارێكی هەژاری ناوچەكە، كەس بەهاتنی نەدەزانی .. بۆ نموونە ئەگەر پێشت بگوتایە  فلانـی حوسنی یان حەدیدی یان حومسانی،  پێـی دەگوتیت .. پێـنج یان چوار خێزان بەم ناوەوە هەیە، یەكێكیان لەقاهیرەیە، یەكێكی تریان لەدەمەنهورە، یـەكێكی تریان لەزەقازیقە، یـەكێكی تریـان لـە .. مەبەستت كامیانـە؟ .. قسەشـی بـۆ كردبـووم كـە هـەندێك جـار دەچـووە ناوچەیـەك لەناوچـەكان، كەسـی لێ نەدەناسی، دەچووە مزگەوت و لەگـەڵ خەڵكەكـەدا نوێـژی دەكـردو پاشـان دوای نوێژ باسی ئیسلامی بۆ دەكردن .. هەندێك جاریش خەڵكەكە بەجێیان

دەهێشت، ئەمیش لەسەر حەسیری مزگەوتەکە دەخەوت و جانتاکەی دەنایە ژێرسەری و بە عەباکەی خۆی دادەپۆشی))[٢٩].

ئەم تۆڕی پەیوەندییە شەخسییە زۆر فراوانە، سەرچاوەی پێشەوایی و باڵادەستی حەسەن ئەلبەننا بوو لەسەر کۆمەڵەکە .. دەیەها هەزار لەئەندامەکانی کۆمەڵەکە شانازیان بەوەوە دەکرد کەهاوڕێی خودی بەنناى مورشیدن[٣٠].. لەم هاوڕێیەتیانەوەو بەهۆشیانەوە مورشید کۆمەڵەکەی دروست کردو دەسەڵاتی خۆی بەسەردا سەپاند .. کاتێکیش کۆمەڵەکە خەریکی کڕینی ئەو تەلارەبوو کەلەپاشاندا بووە مەڵبەندی گشتی، هەندێکیان لەگرانی نرخەکەی سڵەمینەوە، بەڵام بەننا بەشێوازە سادەکەی خۆی گوتی ((من خودی خۆم دە هەزار ئیخوان دەناسم، هەریەکەیان ئامادەیە هەچ شتێکی لێ داوابکەم بمداتێ .. پارە داواکراوەکەشی لەماوەی یەك هەفتەدا پەیدا کرد)).

ئەگەر بەنناش بەسادەیی خۆی و بەپەیوەندییە تایبەتییەکانی موریدەکانی بۆلای خۆی ڕاکێشابێت، ئەوا شوێنکەوتووەکانی زیادەڕۆییەکی زۆریان دەکردو چەندەها خەرمانەی پێشەواییان بەدەوریدا دروست کردبوو .. ئەگەر خۆیشی نازناوی (مرشد)ی بۆ خۆی هەڵبژاردبێت، ئەوا شوێنکەوتوەکانی چەندەهاناویان بۆ دانابوو وەك -پیاوی سەردەم-

---

[٢٩] الهلال -- إبريل ١٩٧٧ – (رأي كاتب أمريكي في حسن البنا: المرجع السابق).

[٣٠] الرسالة، ٢٨/ ٤/ ١٩٥٢.

سەرکردەی ئیسلامی - برای روحی - خەباتگێڕی عەرەبی - چاکسازی کۆمەڵایەتی - بڕواداری بەهێز[٣١]. ئەگەر چەندەها لێکۆڵینەوەش باسی هۆکارو فاکتەرەکانی بەهێزیی کۆمەڵی ئیخوانیان کردبێت، ئەوا نووسەرو بیرمەندەکانی کۆمەڵەکە خۆیان زیاتر لەجارێك دووپاتیان کردۆتەوە ((کەنهێنی سەرکەوتنی بزوتنەوەکە لەکەسایەتی حەسەن ئەلبەننادا بوو))[٣٢]. بەڵکو نووسەرێکی دیکەش لەمێژوو نووسەکانی ئیخوان دەڵێت ((کۆنترۆڵکردنی شوێنکەوتوەکان لەلایەن بەنناوە زۆر ڕەهاو کامڵ بوو، بەڕاددەیەك کەدەگەیشتە ئەفسون))[٣٣].

ڕۆژنامەیەکی میسریش بەگاڵتەجاڕیەکی ئاشکراوە وەسفی سروشتی پەیوەندیی نێوان مورشیدو شوێنکەوتووەکانی کردووەو گوتویەتی ((ئەگەر مورشید لەقاهیرە بپژمیایە ئیخوانەکان لە ئەسوان پێیان دەگوت (ڕەحمەتی خواتان لێ بێت))[٣٤].

.. کاتێکیش بەننا مرد یەکێك لە شوێنکەوتووەکانی نووسی ((لەسەر وەلائم بۆ تۆ دەژیم و دەمرم))[٣٥].

---

[31] Mitchell – Ibid .p. 297.

[٣٢] فتحي العسال، حين البنا كما عرفته. المرجع السابق.

[٣٣] موسى اسحق الحسيني، المرجع السابق، ص ٥٤.

[٣٤] ابو الحسن الندوي، مذكرات سائح في الشرق العربي (١٩٥٤)ص ٤.

[٣٥] أحمد أنس الحجاجي، الرجل الذي اشعل الثورة (١٩٥٢) ص ٤.

بەننا پێشەوایەکی ڕاستەقینە بوو، ئەمە هیچ پێویستیی بەقسە لەسەر کردن نیە .. لەسەرەتاشەوە خۆی بۆ ئەوە ئامادەکردبوو کەوابێت .. دەڵێت ((پێویستە پێشەوا وا پەروەردە کرابێت کەوا دەرچێت، نەك پێشەوایەك بێت کەتەنها پێویستی خەڵقی کردبێت و ڕووداوەکان کردبێتیانە پێشەوا، یان لەبێ پێشەواییدا ببێتە پێشەوا .. ئەو پێشەوایانەی بارودۆخ خەڵقی کردن، دەیانویست پەلە لەدەرەنجامەکان بکەن پێش پێناوەکان، فریو خواردنیشیان بەسەرۆکایەتی کردنی گەلان و تەڵەکەی سیاسەت هەڵیخەڵەتاندن و تراویلکە (سەراب)یان لێ بووە ئاو))[٣٦].

لەسەرەتاشەوە مورشید سووربوو لەسەر ئەوەی شوێنکەوتووەکانی بەگوێڕایەڵی ڕەها ڕابێنێت .. ئایا ئەمە ((بەیعە لەهەموو کارێکدا کەبەدڵیان نییە بێت یان نا)). کاتێکیش مورشید خۆی ئامادە دەکرد کەئیسماعیلیە جێ بهێڵێت بەرەو قاهیرە، پاش گواستنەوەی بۆئەوێ تا ببێتە مامۆستا لەقوتابخانەی عەباس لە سەبیتە، لەگەڵ هەندێك ئەندامانی کۆمەڵەکە ناکۆك بوو لەسەرئەوەی کێ جێگای بگرێتەوە لەسەرۆکایەتی کردنی لقەکەی ئەوێدا .. بەنناش نەرم بوو لەگەڵ ناکۆکیەکانیدا، بەڵام ئەوان هەر سووربوون لەسەر ناکۆکیەکان و لای جێگری گشتی ((دادگا))ش شکاتیان لێکرد گوایا پارەو ماڵی کۆمەڵەکەی بەفیڕۆ داوە .. کاتێکیش لەلێکۆڵینەوەدا

---

(٣٦) مذكرات الدعوة والداعية، ص ١٤٦.

بێ تاوان دەرچوو، هەوڵیان دا لای بەڕێوەبەری قوتابخانەکەی قاهیرە تاوانبارکردنەکە بخەنەدواى .. ئالێرەدا بۆ یەکەم جار هێزی بەرپەرچدانەوەی جەستەیی کۆمەڵەکە دەرکەوت، بەوەی کەژمارەیەك لەهاوڕێیانی مورشید کۆبوونەوە و((دەست درێژییان کردە سەرئەوانەی جیابوونەوەو لێیان دان، پاشان دەست گیرکران و درانە دادگا))[٣٧].

سەیریش ئەوەیە بەننا ئەم ڕووداوە دەگێڕێتەوە بێئەوەی شەرمو نکوڵی لەشێوازی ((دەست درێژی کردن))ە سەر نەیارەسیاسییەکان بکات .. پاش ئەم ڕووداوەی قوتابخانەی عەباسی سەرەتاییش لەسەبتیە .. لێدان و دەست درێژی کردنەسەر نەیارەکانی کۆمەڵەکە، بووە شێوازێك کەئیخوانەکان گرتبوویانە بەر.

بەنناش باسی ئەم ناکۆکییە دەکات و دەڵێت ((لەڕاستیدا ئەم ڕواڵەتە شتێکی نوێ و نامۆ بوو سەبارەت بە بارودۆخی ئیخوان، کە جگە لەیەکێتی تەواوو گونجان هیچ شتێکی دیکەی بەخۆیەوە نەدیبوو، بیروڕای یەکێکیشیان هی هەموویان بوو....)) بەڵکو جەختیش لەسەرئەوە دەکات کەئەوانەی لایاندابوو، شەیتان چووبووە ناویانەوەو ئیشەکەی بۆ ڕازاندبوونەوە .. پاشان هێندەی پێناچێت بەیاخی بووەکان (الخوارج)*ناویان دەبات و جەختیش دەکات کە زۆر بەتوندی ڕەفتاریان لە

(٣٧) المرجع السابق، ص ١٦٦.

گەڵدا بکەن حسابیان بۆ بکرێت ((ئەوەی دووبەرەکی دەخاتەوە بەشمشێر لێیدەن هەرکەسێك بێت)). بەڵام بەننا داخ هەڵدەکێشێت ((چونکە ئێمە بەڕاددەیەکی زۆر ئەو ڕژێمە تواوانە کاریان تێکردووین کەبەوشەی دیموکراسیەت و ئازادیی تاکەکەس پەردەپۆش کراون))[٣٨].

با سەرنجی ئەم دەستەواژەیەش بدەین و لێی ڕابمێنین، چوونکە هەموو فەلسەفەی شێخی سەبارەت بەکاری ڕێکخراوەیی و مافی ئەوانەی لەبیروڕا لەگەڵیدا ناکۆکن تێدا کورت بۆتەوە.. ئەم دەستەواژەیە شەرعیەت بەئیخوانەکان دەدات بە ((بەشمشێر))لەوانە بدەن لەبیروباوەڕدا کە لەگەڵیاندا ناکۆکن.. پێدەچێت ئیخوانەکانیش گوێرایەڵی شێخەکەیان بووبن لەم مەسەلەیەدا.

بەهەرحاڵ مورشید باڵادەستی رەهای خۆی بەسەر کۆمەڵەکەدا نەدەشاردەوەو بەڵکو بەپەرۆشیشەوە دەیویست ئاشکرای بکات، دەڵێت ((دوو لقی کۆمەڵەی ئیخوان لەمەحمودیەو شبراخیت زۆر بەکەڵك نین، چونکە بەشێوازی خۆم بنیات نەنراون، هەرچیەکیش بەکۆششی خۆم ئیخوانە ڕاستەقینەکان، کەخۆیان بەهاوبەشم دەزانن لە چاکسازیو

---

[٣٨] المرجع السابق، ص ١٢٤.

(*) (الخوارج) لەباش کوشتنی خەلیفەی سێیەم موسڵمانی کوڕی عەفان، هەریەك لەعەلی و مەعاویە خۆیان وەکو خەلیفەی موسوڵمانان ڕاگەیاند - عەلی لەعێراق و مەعاویە لەشام -

فێرکردندا و ژمارەیان کەمە، بنیات نەنرابێت، بەکەڵکی دروست کردنی بانگەشەکە نایەت))[٣٩].

برای نموونەیش بەبۆچوونی مورشید ئەوکەسەیە کەڕایەکی سەربەخۆی نییە، بەننا دەڵێت ((برا شێخەکەش .. شێوازی تایبەتی خۆی هەیە، وەکو براو هاوڕێیەکیش سەیری من دەکاتو زۆر بەکەمیش گوێ بۆ بۆچوونەکانم دەگرێت، لەم لایەنەشەوە یەکانگیرکردنی هزر دەبێتە ئەرکێکی گران، بۆیە پشت پێ بەستنیشی بەهەمان شێوە مەترسیدارە))[٤٠]، بەننا گلەیی دەکات.. لەحاڵی پیاوەکانی خۆی دەکات، من ئاواتەخوازم پیاوانێك لەگەڵمدا بن کەتێبگەنو کارامەبن، ئەم کارە بدەمە دەستیانو کەمێك پێیان بحەوێمەوەو دڵنیابم لە تواناییان .. بەڵام ئەوانە لەکوێن (!)[٤١].

بەڵام سەیرترین شت کەبەننا لەم بارەیەوە نووسیبێتی، دەستەواژەیەکە شایانی تێڕامانە، چونکە ئەو سروشتە ڕووندەکاتەوە کە بەننا پیاوەکانی خۆی پێ هەڵدەسەنگاند، بەننا گلەیی لەحاڵی خۆی دەکات لەبەرئەوەی خۆی لەنێوان ((لاوازی پاکەکانو ناپاکی بەهێزەکاندا دەبینێتەوە، لەم

---

بەمەش ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە، بەڵام بەهۆی ئەمەوە کۆمەڵێك لەژێر دەسەڵاتی عەلی دەرچوون. ئەمانە پێیان دەگوترا (الخوارج).

[٣٩] المرجع السابق ص ١٥١.

[٤٠] المرجع السابق ص ١٤٢.

[٤١] المرجع السابق ص ١٤٣.

دەستەواژەیەش ڕادەمێنین و جگە لەسەرسووڕمانیش، هیچ شتێکی ترمان بەدەستەوە نامێنێت)).

بەنناش خۆی ڕێکخەری بنەڕەتی کۆمەڵەکە بوو، خاوەنی تیۆری ڕێکخستنەکەشی بوو، ((فیکرو ڕێکخستن))ێکیشی بۆ کۆمەڵەکە دارشتبوو ((کە وای لێ بکات پەیوەست بێت بەخودی خۆیەوەو هەرخۆیشی تاکە باڵادەست بێت بەسەریداو جڵەوی بگرێتە دەست و چالاکیەکانی دیاری بکات، بۆ ئەمەش دوو فاکتەری قۆستبۆوە، یەکەمیان: ئەو لێڵیەی دووری ئامانج و سروشت و میتۆدە کردیارییەکانی کۆمەڵەکەی دابوو وەکو بانگەشەیەکی سیاسی، دووەمیشیان: بنیاتنانی ڕێکخستنی کۆمەڵەکە بەشێوازێك کە تەنها خۆی خاوەنی فەرمانکردن بێت و هەموو دەزگاو ئاست و لیژنەکانی ڕێکخستنیش بکاتە چەند قەوارەیەکی ڕاوێژکاری کەدەسەڵاتی بەسەریاندا هەبێت و ئەوانیش گوێڕایەڵ و ملکەچ بن))[٤٢].

کاتێکیش کۆنگرەی سێهەمی ئیخوان بەسترا، بۆئەوەی هەیکەلی ڕێکخراوەیی کۆمەڵەکە دیاری بکەن و دەستە جۆراو جۆرەکانی پێك بهێنن، گەیشتنە بڕگەیەك کەدەڵێت ((ئامادەبووان دیاری کردنی ئەرکی هەر یەکێك لەم دەستانەیان بەجێ هێشت بۆ بەڕێز ڕابەری گشتی و هەروەها دانانی بەیاننامەی ڕونکردنەوەشیان))[٤٣]. بەم شێوەیەش کۆنگرەکە ڕێپێدراوێتی

---

[٤٢] طارق البشري، المرجع السابق ص ٣٦٧.

[٤٣] مذكرات الدعوة والداعية، ص ٢٠٦.

گشتگیری بەمورشید بەخشی، تا دەسەڵاتی بەسەر هەموو دەزگاو دامەزراوەکانی کۆمەڵەکەدا هەبێت.

دەستەی دامەزرێنەی ئیخوانیش لە (١٥٠) ئەندام پێك هاتبوو ((ئەمیش لەجێی ئەنجومەنی شورای گشتی و کۆمەڵەی گشتی مەکتەبی ئیرشادەو ئەوانەش دەگرێتەخۆ کەلەسەرەتاوە کاریان بۆ بانگەشەکە کردووە .. هەرخۆیشی ئەندامێتی دەدات بەخۆی، بەواتا لەسەرەتاوە بەهەڵبژاردن پێك هێنراوە، پاشان خۆی ئەندامەکانی هەڵدەبژێرێت .. هەیکەلی بنەڕەتی ڕێکخستنەکەش لەسەر بنەمای هەڵبژاردن لەسەرەوە دادەمەزرێنرێت))[٤٤].

مەکتەبی ئیرشادیش لە (١٢) ئەندام پێك هاتبوو، (٩)ئەندام لەقاهیرەو، (٣) ئەندامیش لەهەرێمەکانەوە[٤٥]. هەندێك لەنەیارەکانی بەنناش ئاماژە بەوە دەکەن کەلەسەرەتادا، مەکتەبی ئیرشاد لەبیست ئەندام پێك هاتبوو، کاتێکیش کێشەکەی (عبدالحکیم عابدین)ی زاوای ڕوویداو تاوانە ئەخلاقیەکان درانەپاڵی، بەننا دەسەڵاتی خۆی لەکەم کردنەوەی ژمارەی ئەندامەکانی مەکتەبی ئیرشاددا بەکارهێناو کردیە (١٢) ئەندام، ئەمەش لەپێناوی ئەوەدا کە بەئاسانی بتوانێت کۆنترۆڵی مەکتەبی ئیرشاد بکات،

---

[٤٤] محمد شوقي زكي: الاخوان المسلمون والمجتمع المصري – دار العهد الجديد للطباعة (١٩٥٤).

[٤٥] قانون النظام الاساسي لهيئة الاخوان المسلمين العامة: م ١٩، ص ١٦.

پاش ئەوەی لەنەیارەکانی زاواکەی دەربازی دەبێت[٤٦]. بەهەرحاڵ هەموو مێژووی کۆمەڵەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە دەسەڵاتەکانی مورشید ڕەهابووە.

کاتێکیش عەبدولمەجید حەسەن (بکوژی نەقراشی) دانپێدانانەکانی ڕاگەیاند گووتی ((عەبدولسەمیع ئەلغەنیمی کەوازی هێنابوو لەکۆمەڵانی ئیخوان، پێی ڕاگەیاندم هۆی وازهێنانی لەکۆمەڵەکە ئەوەبووە کە مامۆستا حەسەن ئەلبەننا ویستەکانی خۆی بەسەر مەکتەبی ئیرشادی گشتیدا دەسەپاند))[٤٧].

شایەتێکی تریش کەساڵح عەشماویە دەڵێت ((سەرەتای ئەندامێتیم لەمەکتەبی ئیرشاد، باسێك دروست بوو کەئایا شورا لەئیسلامدا سەپێنراوە یان نا؟ واتا ئایا بەڕێز مورشیدی گشتی پەیوەست دەبێت بەڕاوبۆچونی مەکتەبی ئیرشادەوە، یان مەکتەبی ئیرشاد تەنها دەستەیکی ڕاوێژکاری مورشیدەو ئەویش بۆی هەیە بەئارەزوی خۆی ڕاوبۆچونەکانیان وەرگرێت یان لێیان لابدات. بۆچونی ئیمامی مورشیدیش وابووکە شورا سەپێنراو نیەو مورشیدیش بۆی هەیە کەڕای مەکتەبی ئیرشاد پەیڕەوی بکات یان لابدات لێی))[٤٨]. سەیریش ئەوەیە عەشماوی ئەم مەسەلەیە وەکو ستایشێك

---

[٤٦] الجمهورية، ٢٣/ ٩/ ١٩٥٤.

[٤٧] لطفي عثمان: قضية مقتل النقراشي باشا – القاهرة (١٩٥٠) ص ٣٧.

[٤٨] الدعوة، ٢/٢/ ١٩٥٢ . مقال صالح العشماوي.

بۆ مورشیدی بەڕێز باس دەکات کە هەرگیز بێزارنەبووە لەوەی هەندێکیان داوای دیموکراسیەتیان دەکرد .. هەرچەندە کە زۆر بەتوندیش بێبەشی کردبوون لەدیموکراسیەت.

بەلام شایەتێکی سێیەم هەیە کەیەکێکە لەکادیرەکانی ئیخوان، بەڕاشکاویەکی ناوازەوە نەیاریی و بەڵکو گاڵتەجاڕی خۆی تۆمارکردووە سەبارەت بەشێوازیی مورشید لە کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵەکەدا .. هنداوی دویر کە یەکێکە لەسەرکردەکانی دەزگای نهێنی ئیخوان، لەشایەتیەکەیدا لەبەردەم دادگای گەلدا دەڵێت ((مامۆستا بەننا ڕێگای بە (١٠٠) کەس یان زیاتر دابوو کە هەموویان وەکو یەك بوونو وەلائیشیان بۆ کەس نەبوو .. مامۆستا بەنناش زۆرحەزی لەپێشانگە دەکرد .. واتا بۆ نموونە دوکانەکەی شەقامی زاهیرو پێشانگاکەی شەقامی فوئاد .. ئەمەش واتای ئەوەیە بەننا چەند کەسێکی نابووە ناو کۆمەڵەی دامەزرێنەرەوە کەهیچ پەیوەندیەکیان بەئیخوان موسلیمینەوە نەبوو، بۆ نموونە یەکێك بە بەرتیل لەدادگا دەرچوو بوو، سەرنجمان دا دەبینین ئەندامە لەکۆمەڵەی دامەزرێنەردا، لەڕاستیشدا شێخ حەسەن ئەلبەننا ئەمانەی لەسێبەردا دادەنا، چونکە پیاوێکی گەورەیە. سەرەڕای ئەم شێوازەی مامۆستا

بـەنناش، دەسـتەی دامەزرێنـەر هیـچ هـێزێکی ئـیرادەیی یـان ڕۆڵێکیـان نەبوو))[٤٩].

ئەمەش سـەبارەت بـە مـەنتیقی ئیخـوان شـتێکی نـامۆ نـەبوو.. وێـژەو ئەدەبیاتەکانیان جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە ((برای ئیخوانی پێویستە لەسەری خۆی بەتەواوەتی ئامادە بکات بۆ بەجێهێنانی فەرمانی سەرکردە لەهەمولایەنێکەوە، بانگەشەکەش ئەوەمان داوا لێدەکات کە سەربازێکی گوێڕایەڵی سەرکردایەتیەکی یەکگرتوو بین، مافی ئەوەمان لەسەری هەبێت، گـوێ بـۆ ئامۆژگـاری بگرێـت، ئـەویش مـافی ئـەوەی لەسـەرمان هـەبێت کەبەتەواوی گوێڕایەڵی بین لەهەموو کارێکدا کەبەدڵمان بێت یان نا))[٥٠].

لە پەیامی ((ڕێنماییەکان))یشدا کەمورشید دایڕشتبوو، ئـەوە هـاتووە کەهەر ئەندامێك، ئەم شتانە پێویستە لەسەری ((متمانە کردن بەسەرۆك، دڵسۆزی گوێڕایەڵی لەخۆشی و ناخۆشی و هەموو کارێکدا کەبەدڵی بێت یان نا))[٥١]. یەکێك لەسەرکردەکانی ئیخوانیش بۆ مورشیدی نوسیبوو ((ئێمە

[٤٩] محكمة الشعب – الجزء الاول – المحاكمات التي تمت من ٩-١٣ نوفمبر ١٩٥٤، محاكمة محمود عبداللطيف، شهادة هنداوي دوير ص ٢٣.

[٥٠] الاخوان المسلمون (الاسبوعية) ٢٦/ ١٠/ ١٩٤٦ حديث الاسبوع.

[٥١] حسن البنا رسالة التعليم.

گوێڕایەڵیمان لەسەرە، لەسەر ئەمەش بەیعەو پەیمانمان داوە، متمانەی تەواویشمان پێتەو تۆش دڵنیایی گشتگیرت لەلایە))[٥٢].

بەڵام مافی ئیخوانیشە لەسەرمان کەمەسەلەکە بگەڕێنینەوە بۆ ڕەگە بنەڕەتیەکانی .. جەوهەری هەموو ئەم شتانەش بیرۆکەی بەیعەکەیە. سوێندی بەیعەی ئیخوانیش دەڵێت ((پەیمان بەخوای باڵادەستو مەزن دەدەم کەپەیوەستبم بە بانگەشەی ئیخوان موسلیمینەوەو لەپێناویدا جیهاد بکەمو مەرجەکانی ئەندامێتی بەدی بهێنمو متمانەی تەواو بکەم بە سەرکردایەتیەکەی هەبێتو گوێڕایەڵ بم لەهەموو کارێکدا کەبەدڵم بێت یان نا. لەسەر ئەمەش سوێند بەخوای باڵادەست دەخۆمو بەیعە دەدەم، خواش وەکیلە لەسەرئەمەی دەیڵێم))[٥٣]. بەیعەش بەپێی بۆچوونی بیرمەندی ئیسلامی (ئیبن خەلدون) ((بریتیە لە پەیمانی گوێڕایەڵی، بەیعەدەر پەیمانی بەئەمیرەکەی دەدا کە تاوتوێ کردنی مەسەلەی موسوڵمانانو خۆیشی بداتە دەست ئەو، ململانێی لەگەڵدا نەکات لەسەر هیچ شتێك لەمانەو هەرکارێکیشی پێ بسپێرێت کەبەدڵی بێت یان نا گوێڕایەڵ بێت))[٥٤].

---

[٥٢] انور الجندي، الاخوان المسلمون في ميزان الحق – ص ٦٩.

[٥٣] قانون النظام الاساسي لهيئة الاخوان المسلمين وشعبها طبقا للتعديل الذي اقرته الجمعية باجتماعها غير العادي (٣٠ يناير ١٩٤٨) ص ٧.

[٥٤] د. حسين فوزي النجار، الاسلام والسياسة. دار الشعب – القاهرة (١٩٧٧) ص ١٧٤.

بیرۆکەی بەیعەش پشت بەدوو فەرموودەی پیرۆز دەبەستێت، یەکەمیان دەڵێت ((من مات وليس في عنقه بيعه فقد مات ميتة جاهلية))واتا هەچ کەسێك مردو بەیعەیەکی لەئەستۆدا نەبوو ئەوا مردنێکی جاهیلیانە مردووە، دووەمیشیان دەڵێت ((من بايع إماما فأعطاه صفقة يده وثمرة قلبه فليطعه إن استطاع فأن جاء آخر ونازعه فاضربوا عنق الآخر)) واتا ئەوەی بەیعەی دا بەئیمامێك و دەستی نایەناو دەستی و بەروبوومی دڵی خۆی دایە، ئەوا ئەگەر توانی با گوێڕایەڵی بکات، ئەگەر کەسێکی دیکەش هاتو ململانێی لەگەڵدا کرد، ئەوا لەملی ئەوەی دیکە بدەن.

(أبو الأعلى المودودی)ش، کەبەبۆچونی ئیخوان موسلیمین یەکێکە لەبەناوبانگترینی بیرمەندە ئیسلامیەکان، هەوڵدەدات چوارچێوەیەکی تیۆری بۆ (ملکەچ بوونی ڕەها بۆ مورشید)دانێت، دەڵێت ((تەنها ئەو کەسە بۆئەمیریی هەڵدەبژێردرێت کەموسوڵمانان متمانەیان بەخۆی و ژیاننامەی و ڕەوشت و هەڵس و کەوتی هەبێت، ئەگەر هەڵیشیان بژارد ئەوا خاوەنی ئەمرەو پێویستە گوێڕایەڵی حوکمەکانی بکرێت و لەفرمانەکانی لانەدرێت و نەهی نەکرێت، لەجێبەجێکردنی فەرمانەکانیشدا بەتەواوی پشتی پێ ببەسترێت)).

مەودودیش حساب بۆ ڕاوبۆچونی زۆرینە ناکات ((ئیسلام زۆرینەی دەنگ ناکاتە تەرازوی حەق و باتڵ .. چونکە بەدیدی ئیسلام ڕەنگە تاکە پیاوێك لەهەموو ئەندامانی ئەنجومەن ڕاوبۆچوونی ڕاستتربێت و

چاوتیژتریش بێت لە مەسەلەیەك لەمەسەلەكاندا، ئەگەر مەسەلەكەش وابێت كەواتە شتێكی ڕاست نیە كە ڕاوبۆچونی كابرا فڕێدرێتەلاوە لەبەرئەوەی كۆمەڵێكی زۆر پشتگیریی ناكەن، ئەمیریش مافی ئەوەی هەیە كەلەگەڵ ڕای زۆرینە یان كەمینەدا بێت، هەروەها مافی ئەوەشی هەیە كەلەڕای هەموو ئەندامانی ئەنجومەن لابدات و بەڕای خۆیەوە پەیوەست بێت))[٥٥].

بەنناش جگە لەوەی لەسەر ئەم ڕێبازە ڕۆیشتبوو هیچی تری نەكردوە.

بەم شێوەیە بەننا هێزە باڵادەستەكەی خۆی بەسەر كۆمەڵەكەدا هەڵێنجابوو .. لەو تیۆرەوە كەبەرگی ملكەچی ڕەها دەكاتەبەر بیرۆكەی بەیعەكە .. هەروەها لەوەشەوە كەجڵەوی هەموو مەسەلەكانی كۆمەڵەكەی گرتبووە دەست، بەئاشكراو نائاشكراكانیشیەوە .. ئەوەش لەبارەی مورشیدەوە زانراوەكە چەند سەرچاوەو كەساتیەكی بۆ خودی خۆی بەتەنها دەشاردەوە .. كە هەركاتێك بیویستایە یارمەتی لێوە وەردەگرتن، ((شاردنەوەی هەندێك لەپەیوەندیەكانیشی، شاردنەوەی هەندێك لایەنەكانی كەسایەتیەتی لەئەوانەی دیكەو هەروەها شاردنەوەی هەندێك لەسەرچاوەكانی توانایی و زانیاریشیەتی))[٥٦].. (سادات)یش باسی ئەوە دەكات كە بەننا لەكاتی جەنگدا چەكی كۆدەكردەوەو عەمباری دەكرد، بێ ئەوەی بەنزیكترین گەورەپیاوانی ئیخوان بڵێت .. هەروەها دەشڵێت

---

(٥٥) ابو الاعلى المودودي، نظرية الاسلام السياسية – القاهرة (١٩٧٧) ص ٢٩– ٣٠.

(٥٦) اسحق الموسى الحسيني، المرجع السابق ص ١١٤.

((حەسەن ئەلبەننا بەتەنها خۆی پێداویستی بۆ بزووتنەوەی ئیخوان ئامادە دەکردو نەخشەی سیاسەتەکەی دەکێشا، پاشان بۆ خۆیشی دەیپاراست، نزیکترین کەسانیشی هیچیان لەنەخشەو ئامانجەکانی نەدەزانی))[٥٧].

دەزگای نهێنی (الجهاز السری)و.. چەکیش دووسەرچاوەی نوێ بوون لەسەرچاوەکانی هێزە بالاکەی شێخ .. هەروەها لەڕێکخستنێکی وەك کۆمەڵی ئیخوان موسلیمینیشدا .. غەیبەتیش دەبێتە چەکێك بۆ مەزن کردنی ئیمام یان شێخ.

(طارق البشري) لە ئاماژەیەکیدا بۆ ئەم مەسەلەیە دەڵێت ((کاتێکیش تێگەیشتن لای کەسێك بزر دەبێت و وێنەکانی ڕابردوو دەبنە تەنها شت بەدەستیەوە .. ئەگەر ئامانجەکەش نائاشکرا بێت، ئەوا کارێکی لەڕادەبەدەرو ناباو کەپشت ئەستور نەبێت .. بەواقیع دەبێتە ئامرازی کەسەکە. چاوەکانیش ڕوودەکەنە بیرۆکە دێرینەکە، بیرۆکەی مەهدی و ئەو ئیمامەی کەزەوی پڕدەکات لەدادوەری و ڕووناکی، پاش ئەوەی پڕبووە لەزۆرداری و ستەم، هیواو ئومێدی ڕزگاربوونیش لەواقیع جیادەبێتەوە .. ئامانجی مرۆڤیش لێرەدا ئەوە نابێت کەبەشداری لەدروست کردنی ئایندەی خۆیدا بکات، بەڵکو ئەوە دەبێت کە کەسێکی دیکە بکاتە بریکار بۆ دروست کردن و وێنەکێشانی ئایندەکە، لەبەرئەوەی پەیمان و بەیعەی دەداتێ کە

[٥٧] انور السادات، اسرار الثورة المصرية – ص ٦٦.

گوێڕایەڵو ملکەچ بێت، خۆیشی مەشق پێدەکات کە گوێڕایەڵی فەرمانو نەهی کردنەکانی بێت، بەدیهێنانی خۆیشی لەم گوێڕایەڵیەدا دەبینێتەوە))[٥٨].

ئەم باڵادەستیەش بەسەر تاکەکەسەکاندا لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە کۆمەڵەکەو عەقیدەیەکی دەست وەردەدەنە کاروباری تاکەکانەوەو ڕۆدەچنە هەموو کارەکانیانەوە، کۆمەڵەکە سەدەها ئەمرو نەهی دادەنێت کەجووڵەو ڕەفتارەکانی تاکەکە لەژیانی ڕۆژانەیدا کۆنترۆڵ دەکات، پابەندی دەکات بەچەند ڕێنماییەکی دیاری کراوەوە کەپەیوەستە بەتەندروستی کەسەکەوە (هەوا گۆڕکێ، جگەرەکێشان، پاکو خاوێنی، وەرزش، خواردن)و بەڕۆشنبیریی کەسەکەوە (چی دەخوێنێتەوەو کەیو چۆن؟). هەروەها چەند ڕێنماییەکیش سەبارەت بە مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکدا (شەرمو شکۆ - کارتێکەری - ئازایەتی ڕاستگۆیی - وەفاو ئەمەك .... هتد)، هەروەها سەبارەت بەمامەڵەی پارەو داراییەوە، چەند ڕێنماییەکیش لەبابەت پەیوەندییەوە بەخواوەو یەکێکی دیکەش لەمەڕ پەیوەندییەوە بەبانگەشەکەوەو ڕێنماییەکی تریش کەواجباتەکانی پێش خەوتنی بۆ دیاری دەکاتو دانەیەکی کەش کەواجباتەکانی ساتەکانی لەخەوهەستانی ،بۆ دەستنیشان دەکات.

---

[٥٨] طارق البشري، المرجع السابق، ص ٦٩.

... بەم شێوەیەش کۆمەڵەکە گەمارۆی تاکەکە دەدات‌و بەڕێنماییەکانی پەرژینێك دروست دەکات کەبەتەواوی لەچوارچێوەیەکدا کەسەکە ئابلۆقە دەدرێت‌و کۆمەڵەکە بەسەر هەموو وردەکارییەکانی ژیانیدا بالادەست دەبێت، ورده وردەش کەسەکە وا هەست دەکات کەبوونی ماددی خۆی لەکۆمەڵەکەو .. لەئیمامەکەیەوە وەردەگرێت.

کۆمەڵەکەش بەسەر ئەندامەکانیدا دەسەپێنێت ((کە واز لەهەموو پەیوەندیەك بێنن لەگەڵ ئەو دەستە یان کۆمەڵانەدا کەپەیوەندی پێوەکرندیان لەبەرژەوەندی بانگەشەکە نییە))[٥٩].

هەموو ئەم شتانەش لەکەشێکدا ڕوو دەدات کە پڕە لەبۆن‌و بەرامەیەکی سەلەفیانەو وەنەوزو خەوەنوچکەی غەیبەت کەدەوری ئیمام‌و کۆمەڵەکەو کۆمپانیاو تاکەکانی داوە .. حەسەن ئەلبەنناش دەگێڕێتەوە کەچۆن یەکێك لەشێخەکان ئامۆژگاری کردووە بۆن‌و بەرامەی لەسەلەفیەت بەناو کۆمەڵەکەیدا بلاوبکاتەوە ((برام ناوبنێ، دەلێم چی ناو بنێم سەید محەمەد؟ دەڵێت: برایان‌و هاوەڵان‌و کۆمپانیاکانت ناوبنێ، بەمیان بڵێ تۆ لەئەبو بەکر دەچیت، بەویان بڵێ تۆ لەعومەر دەچیت، چونکە ئەمانە گورو تینیان تیا دروست دەکات... کۆمپانیاکانیشت ناوبنێ کۆمپانیای (حراء) بۆ کوڕان، قوتابخانەی (امهات المؤمنین)ی کچان، یانەی (خندق) ))[٦٠]. شێخ بەنناش

---

[٥٩] أنور الجندي، الاخوان المسلمون في ميزان الحق، ص ٦٩.

[٦٠] مذكرات الدعوة والداعية، ص ٨٩.

لەهونەری ناوناندا کارامەبوو، بەشێوەیەك شانازی لەدەروونی ئەو پیاوانەدا دروست دەکرد کەناوی نابوون ((ڕاهیبانی شەوو سوارچاکانی ڕۆژ)).

لەسەر هەموو ئەمانەشەوە، کابرا وتاربێژێکی بەتوانا بوو، بۆئەوەی کە بەشیرینی و سادەیی و بەپێزی قسەکانی دڵی شوێنکەوتووەکانی ڕابکێشێت، هەروەها بێگەردییەکی ئیسلامیانەش بەدەوری خۆی و قسەکانیدا دروست بکات کە کار بکاتە سەر دەروونی ئەو شوێنکەوتوانە.

((وتاری سێ شەممان))یش ئامرازێك بوو بۆ بالادەستی ڕاستەوخۆ بەسەر دڵی شوێنکەوتووەکانیدا..

لەساڵی (١٩٣٩)شەوە حەسەن ئەلبەننا ئێوارەی هەموو سێ شەممەیەك لەمەڵبەندی گشتیدا دیدارێکی لەگەڵ ئەندامەکانی کۆمەڵەکەدا دەبەست[٦١]، بۆئەوەی قسەیان لەسەر بابەتەکانی بانگەشەکەو .. مێژووی ئیسلام بۆ بکات، هەروەها لەڕوانگەی ئیسلامیانەشەوە قسەیان لەسەر گیروگرفتە ئابووری و کۆمەلایەتییەکان بۆ بکات.[٦٢] هەمیشە بەتواناش بوو لەدروست کردنی بەستەرێکی روحی لەنێوان خۆی و گوێگرەکانیدا.[٦٣] بەم وتاری سێ

(٦١) عبدالباسط البنا تاج الاسلام وملحمة الامام، القاهرة (١٩٥٢) ص ٢.

(٦٢) عبدالخبير الخولي قائد الدعوة الاسلامية، حسن البنا (١٩٥٢) ص ٢١.

(٦٣) محمد لبيب البوهي، الايمان والرجل - القاهرة (١٩٥٠) ص ٥٩.

شەممانەش کەبەننا بەردەوام بوو لەسەری .. خودی خۆی ببووە بەهێزترین ئامرازی پێناوی ڕووناکبیریو ڕاگەیاندن لەکۆمەڵەکەدا.[٦٤]

سێ شەممەش وای لێ هاتبوو کاریگەرییەکی تایبەتی لەدەروونی هەمو ئەندامانی کۆمەڵەکەدا هەبوو .. هەزارەها کەس لەنێو مەڵبەندی گشتیدا کۆدەبوونەوە، پاشان ئیمام ((بە دزداشەو عەبا سپییەکەیو مێزەرە پڕ شکۆکەیەوە دەهاتەلایان، لەم کاتەشدا هەموویان هاواریان دەکرد .. ((الله اکبر ولله الحمد) ))[٦٥].

بەنناش لەوتارەکانیدا، چەند وەڵامێکی پێشکەش دەکردن کەبەڕواڵەت سادەو ئاسان دەردەکەوتن، بەڵام ئامانجی زیاتر قوڵکردنەوەی کەشە سەلەفیەکە بوو. بەڵکو مەسەلەکە دەگەییە ڕاددەیەکیش کەهەندێك جار خۆی بە پێغەمبەر دەچواند .. ڕۆژێك یەکێك لە ئامادەبووان لێی پرسی - ڕەنگە هەوڵیشی دابێت شەرمەزاری بکات - کەپارەی خەرجی لەکوێوە دێنێت؟ لەوکاتەشدا وەزیفە حکومیەکەی بەجێ هێشتبوو - ئەمیش بەهێمنی گوتی ((محەمەد لەماڵی خەدیجەی دەخوارد، منیش لەماڵی ((براکەی خەدیجە)) دەخۆم، مەبەستی لەژنبراکەی بوو))[٦٦].

---

[64] Mitchell – Ibid, p, 189.

[٦٥] الهلال، ابریل ١٩٧٧ – راي كاتب امريكي .. المرجع السابق.

[٦٦] المرجع السابق.

بـەلای بەنناشـەوە وتـاربیژیی چـەکیکی گرنـگ بـوو .. بگـرە پیدەچیـت یەکیك بووبیت لەو مەرجانەش کـە وەکو پیویسـتیەك دەستنیشـانی کردبـوو تا لەهـەموو کادیرەکـانی کۆمەڵەکـەدا هـەبیت. بـەڵکو خۆیشـی سـەرپەرشـتی فیرکردنی ئەم کادیرانەی دەکرد سـەبارەت بەهونـەری وتـاربیژیی ئیسـلامی. لەساڵی (١٩٣٨)یشدا بەننا خۆی سەرپەرشتی یەکەم ((قوتابخانەی کادر))ی دەکـرد، کـە کۆمەڵەکـە پیکـی هینـابوو بۆئـەوەی وانـەی ((بانگەشـەو ئیرشاد))[٦٧] بدریتە کادیران.

... با لەپشکنینی دۆسییەکەی شیخیشدا بەردەوام بین و، بەدوای لایەنە جۆراو جۆرەکانی کەسایەتیەکەیدا بگەڕیین .. ئەوانەی دوای ژیانی سیاسی شیخ کەوتبوون، دەزانن چۆن شیخ پیچ و پەناگرتنەبەری وەکو شیوازیك بۆ مامەڵـە سیاسـیەکانی بـەکاردەهیناو .. چۆنیـش لـەژیانی سیاسـی تیگەیشتبوو، گوایا بریتییە لەپیچ و پـەناو فیـڵ و تەڵەکـەو پیویسـتە هـەچ کەسیك کەبچیتە ناو سیاسەتەوە لەم شتانەدا کارامەبیت و بەکاریان بـەریت، بەڵکو پیویستیشە کە لەم بوارەدا سەرکەوتوو بیت بەسەر کەسانی دیکەدا.

ڕەنگە ئەمەش بووبیتە هۆی هەندیك ((نامەبدەئی)) و هەموو ئەوانـەش هەسـتی پـیَ بکـەن کـەدوای هـەنگاوی هاوپەیمانییـە سیاسـییەکانی و

[٦٧] Mitchell Ibid, P. 190.

هەڵگەڕانەوەکانی کەوتبوون، کە جگە لە بەرژەوەندیی تایبەتی هیچ پاساوێکی گونجاوی دیکەیان نییە.

((نامەبدەئی))ش لەخشتەبەرەو پیاوی سیاسی بەرەو ئاسانترین و نزیکترین ڕادەکێشێت، بەڵام لەکۆتاییدا بەرەو شوێنێکی مەترسیداری دەبات ..لەخشتە بەریشە بەومانایەی ئەوەیە کاتێك مرۆڤ بەکاری دەبات، ئەوا ئەم نامەبدەئیە کەمرۆڤ لەخۆی دەگرێت و ڕێبەرێتی هەموو ڕەفتارەکانی ژیانی دەکات، هەر لەپەیوەندیەکانیەوە لەگەڵ دەسەڵات و سەرکردەکاندا تا بچوکترین وردەکارییەکانی ژیان.

ساڵح عەشماوی کەیەکێکە لەهاوەڵە نزیکەکانی مورشید، دەگێڕێتەوە کەجارێك هێرشی کردۆتەسەر یەکێك لەدامەزراوە ڕەسمیەکان، حکومەتیش داوای لێکردووە واز لەقسەکانی بهێنێت و پاشگەز بێتەوە، دەنا دەیداتە دادگا، ئەمیش واز هێنانەکەی ڕەتکردۆتەوە، بەڵام شێخ بەننا ئامۆژگاری کردوەو پێی گوتوە ((ساڵح چیان لێ داوا کردویت ئەوە بنووسە)).

هەروەها ساڵح لەسەر قسەکانی بەردەوام دەبێت ((ئیمام دەیگوت: ئامۆژگاریی ئەوکەسانە دەکەم کە خۆیان لەقەرەی کارێکی گشتی دەدەن و پێیان وایە بەوە ڕووبەڕووی کاربەدەستان دەبنەوە، هەتابۆیان دەکرێت ئەوکارە بەنووسین نەکەن، چونکە ئەمە بۆ خۆیان و بۆ خەڵکیش ئیسراحەت

ترەو لێکدانەوەی خراپ و نابەخشی کەمتر بۆ دەکرێت))[٦٨].ئەمەیە ((لێلی))
وەك قوتابخانەو پیلانێك لەکاری سیاسیدا، لەپەڕەکانی داهاتووشدا
ئاسەوارەکانی دەبینین. هەروەها ئەم گوتەیەش کەبەسالّح عەشماوی
گوتووە ((سالّح چیت لیّ داوا دەکەن ئەوە بنووسە)) دەمانگەیەنێتە یەکێك
لەکلیلەکانی کەسایەتی شێخ ئەمەشمان وەبیردێنێتەوە کەخۆی ڕۆژێك
لەڕۆژان چی داوالێکراوە ئەوەی نووسیوە .. ئیدانەکردنی پیاوەکانی
نووسیوە لەکاتێکدا کەئەوان دەست بەسەربوون و وەسفی کردوون بەوەی
((نەئیخوانن و نەموسولّمانن))، ئەمەش بەهیوای ئەوەی کەبە هەڵوێستێکی
((نامەبدەئی)) وەها، هەندێك لەبەرماوەکانی کۆمەڵەکە لەنەهامەتیەکەی
(١٩٤٨)دا دەرباز بکات .. بەلاّم واقیع ئەوەی سەلماند کەنەیارەکانی لەو
زیرەکتربوون و دەیانزانی کەیەك هەنگاو گەڕانەوەی سەرکردە بۆدواوە
هەموو سوپاکە تێکدەشکێنیّ و پالّ بەزیندانیەکانیشەوە دەنێت بۆئەوەی
ورەیان بڕوخێت و .. دان بەهەموو شتێکدا بنێن. ڕویشی دا.

جارێکی تریش دەگەڕێینەوە بۆلای دۆسێیەکەی شێخ.

کۆمەڵەکە لەڕۆژەکانی یەکەمیدا کەلە ئیسماعیلیە بوو هەوڵیدەدا پارەو
یارمەتی کۆبکاتەوە، بۆ دروست کردنی یەکەم بارەگای خۆی .. یەکەم
یارمەتیش کەهات لەکۆمپانیای نۆکەندی سوێسەوە بوو، پێنج سەد جونەی

---

[٦٨] الدعوة ١٩٥٢/٤/٢٢.

(ئەمەش نیشانەیەکی پرسیارە تۆماری دەکەین و جێی دەهێڵین) هەندێکیش لەشوێنکەوتووە دڵسۆزەکانی سڵەمینەوەو پرسیاریان دەکرد کە ئایا دەبێت یارمەتی لەکۆمپانیایەکی ئیستعماریی وەك کۆمپانیای نۆکەندی سوێس قبوڵ بکرێت و ئایا جائیزە بارەگایەك بۆ کۆمەڵەکەو مزگەوتێك بەم پارەیە دروست بکرێت، شێخیش ڕێگا چارە ئاسانەکە دەبینێتەوە ((ئەمە پارەی خۆمانەو هی ئەوان نیە، نۆکەندەکەش نۆکەندی خۆمانەو دەریاکەش دەریای خۆمانە، خاك و زەویەکەش خاکی خۆمانەو ئەمانەش تەنها داگیرکەرێکن بەحوکمی ڕۆژگار))[٦٩].

بەنناش هەندێك جار چەند ڕێبازێکی بۆ قەناعەت پێکردن بەکار دەهێنا کەهەر هەمان (ڕێبازی) دەگەیاند .. هەڵوێستی سلبی شێخەکانی ئەزهەر بەرامبەر کۆمەڵەکەی و بانگەشەکەی شێخی تووڕەکرد. ئەمیش بەم شێوەیە بەرامبەریان بووەوە ((ئەگەر ناتانەوێت بۆ خوا کار بکەن ئەوا بۆ دونیاو بۆ ئەو پارووە نانە کاربکەن کەدەیخۆن، چونکە ئەگەر ئیسلام تیابچێت لەم نەتەوەیەدا، ئەوا ئەزهەرو زانایانیش تیادەچن، ئێوەش هیچ نابیننەوە کەبیخۆن و خەرجی بکەن، ئەگەر بەرگری لەقەوارەی ئیسلامیش ناکەن ئەوا بەرگری لەقەوارەی خۆتان بکەن)).. لەم وشانەش ڕادەمێنین و جگە لە سەرسوڕمانیش هیچمان بۆ نامێنێتەوە.

---

[٦٩] مذكرات الدعوة والداعية، ص ٦٩.

شـێخیش هەڵوێسـتێکی زۆر ((سـەلەفی))یانـە لـەخوێندنی نـوێ وەردەگرێـت، بـەڵکو ئـەم هەڵوێستەشـی دەگەڕێتـەوە بۆچـەند هەڵوێسـتێك کەتەنانـەت سـەلەفیەکان خۆیشـیان بیریـان چۆتـەوە. لـەوتاری یەکەمیشـدا لەمزگەوتی ئیخوان لە ئیسماعیلیە، جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کەبانگەشـە بۆ ڕۆڵی خوێندنی ئاییني بکرێت، هێرشی کردەسەر خوێندنی نوێ‌و بەوە وەسفی دەکرد کە ئەم قوتابخانانە بیدعەن‌و منداڵانی لێوە دەردەچن پاش ئەوەی کە ((ئەقڵیان بەفیکرە گەندەڵ‌و بیانیەکان ژەهـراوی بـووەو مێشکیان بەبۆچونە کافرانـەو بـێ باوەڕییـەکان ئـاخنراوەو بـە بـەرەڵڵایی‌و لاسـایی‌و کردنەوە پڕکراون))[٧٠]

سەرسام بوونیش بەمورشید دەگۆڕێت بۆ چەند زیادەڕەوییەك کەتوێژەر لەبەردەمیدا ڕادەوەستێت، نەك تەنها بۆ ئەوەی پرسیاری ئەوە بکات داخوا ئەم زیادەڕەوییانە تا چ ڕاددەیەك ڕاستن، بەڵکو بۆئەوەی پرسیار لەبارەی ئەم جۆشـەوە بکات کە لەزیادەڕەوییەکاندا هەیە کاتێك باس لەسەر شێخ دەکرێت .. نووسەرێکی ئەمریکی - بۆ نموونە - دەڵێت، کەسایەتی حەسەن ئەلبەننا بەلای خەڵکەوە نوێ بوو، هەر کەسێکیش ئەم کەسایەتیەی دیبێت یـان پێـی گەیشـتبێت پێـی سەرسـام بـووە .. ئـەم کابرایـە خسـڵەتی ساسـەتمەدارانی تێدابـوو، هـێزی سـەرکردەو بەڵگـەی زانایـانی تێدابـوو،

---

[٧٠] المرجع السابق ص ١٣٨.

ئیمانی سۆفیگەرو جۆشی وەرزشەوانی تێدابوو، پێودانگەی فەیلەسوفان و قسەزانی وتاربێژان و زۆرزانیی نووسەرانی تێدابوو. پاشان لەسەر هەموو ئەم شتانەشەوە ((زمانی ئەزهەرییەکان و زانکۆییەکان و ئەندازیاران و سۆفی و ئەهلی سووننەشی دەزانی، دیالێکتی هەرێمەکانی دەلتاو بیابان و میسری ناوەندی و سەروشی دەزانی و هەروەها شارەزای داب و نەریتەکانیشیان بوو. بەڵکو زمانی قەساب و لاوچاك و خەڵکی هەندێك لەگەڕەکەکانی قاهیرەشی دەزانی، کاتێکیش قسەی لەگەڵدا دەکردن ئەو شتانەی بۆ باس دەکردن کە لەگەڵ زەوق و ئەقڵیەتی ئەواندا دەگونجا، بەڵکو زمانی دزو ڕێگرو پیاوکوژەکانیشی دەزانی و جاریکیش وتاریکی بۆ خوێندبوونەوە(!)))[٧١] ئەگەرچی بەننا زمان و بەلگەی ئەزهەرییەکان و ئیمانی سۆفیەکانیشی وەرگرتبێت، بەڵام ڕزای نەبوو نەئەوان و نەکەسانی دیکەش هاوبەشی خۆی و کۆمەڵەکەی بکات، بەو پێیەی کە ((کۆمەڵی موسوڵمانان))ە، واتا ماف ئەوەی هەیە ببێتە نوێنەری بەرژەوەندییەکانی هەموو موسوڵمانان .. ئەزهەرییەکان بەجەماوەرو سەرکردەکانیشیانەوە، بەبۆچونی شێخ تەنها ((ئایینییەکی ڕەسمی))بوون، شێوزای قسەکردنیشی بەرامبەر پیاوانی ئەزهەر هەمیشە شێوازێکی دوژمنکارانە بووە .. بەشێك لە لێپرسراوێتی ((شلۆق بوونی بارودۆخی ئوممەی ئیسلامی)) شی دابووەپاڵ

---

[٧١] الهلال مايو ١٩٧٧. مقال: حسن البنا في رأي كاتب امريكي.

ئەوەی کەبەڕاستەقینە خزمەتی ئیسلام ناکەن.[٧٢] بەڵام شێخ حەزی نەدەکرد جەنگێکی زەق و ئاشکرا دژی زانایانی ئەزهەر هەڵگیرسێنێت، هەرچەندە کەهەندێك لەشوێنکەوتووەکانیشی ویستیان ئەم ململانێیە بتەقێننەوەو ڕایاندەگەیاند کەلەمیسردا دووکۆمەڵی ئیسلامی هەیە: کۆمەڵە ڕەسمیەکە کەپێکهاتووە لەپیاوانی ئەزهەرو کۆمەڵی ((کۆمەڵە ئیسلامیەکان))، ئەم دووکۆمەڵەش هەرگیز بەیەك ناگەن[٧٣]. (محمدالغزالی)ش کەیەکێکە لەسەرکردەکانی ئیخوان، دەڵێت ((زانایانی ئەزهەر نووستن و کۆمەڵگەی ئیسلامییش دوایان کەوتن))[٧٤].

بەڵکو شێخی غەزالی هێرشەکەی بۆسەر زانایان توندتر دەکات و دەڵێت ((ئیسلامی ئەزهەر ئەو ئیسلامەیە کەئیستیعماریەکان پشتگیری دەکەن))[٧٥].

ئەگەر شێخی بەنناش بۆچونی وابێت کەسەرنەکەوتنی ئەزهەر لەگەیاندنی پەیامەکەیدا دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئەزهەر بایەخ دەدات بەپێگەیاندنی زانایانێك کەماددەکانی عەقیدەیان بەنابەدڵیەوە

---

[٧٢] مجلة الشباب، ١٤/ ١١/ ١٩٤٧، ص ٣. وراجع ايضا احمد انس الحجاجي، رسالة من المريخ، ص ٥٦.

[٧٣] محمد الغزالي، الاسلام المفتري عليه بين الشيوعين والرأسماليين (الطبعة الثالثة ١٩٥٣) ص ٢٦.

[٧٤] محمد الغزالي، في موكب الدعوة- (١٩٥٠)- ص١٢.

[٧٥] محمد الغزالي، الاسلام والاستبداد السياسي - القاهرة (١٩٥٠) - ص١٢.

لەبەرکردووەو بەشێوەیەکی ڕوحی تێی نەگەیشتون[٧٦]، ئەوا محەمەدلغەزالی بۆچوونی بەڕاددەیەك توندڕەوبوو کەدەڵێت خودی خۆی ((چەند پیاوانێك لەشێخەکانی ئەزهەر دەناسێت کەوەکو کرمی بەلهارزیاو ئەنگلستۆما لەسەر خوێنی جوتیارو نەدارەکان دەژین))[٧٧] بەلام سەبارەت بە ((سۆفیگەران))، ئەوا شێخی بەننا نەرم بوو لەگەڵیاندا .. چونکە سەرلەبەر، خۆیشی و ژمارەیەکی زۆر لەموریدەکانیشی هەرلەوانن، ئەگەرچی بەنهێنییش کۆمەڵەکەی لێ وریا دەکردنەوە.. شێخی غەزالیش هات بۆئەوەی وەك عادەتی خۆی ئەڵقەی هێرشەکە تەواوبکات.. سۆفیگەری بەبۆچوونی ئەوو بەبۆچوونی کۆمەڵی ئیخوان موسلیمینیش ((پاشماوەی سەردەمی دەرەبەگایەتیەو بۆ بەنج کردنی جەماوەر بەکار دەهێنرێت))[٧٨].

وەك ئەوەیش کەشێخ ئەو هەموو سەنگ و دەسەلاتەی بەسەر دەروونی شوێنکەوتوەکانیدا هەیبوو بەسی نەبوو بێت، هەستا لەسەرو هەمووشتانەشەوە کەباسکران پەنای بردەبەر دروست کردن و تەنینی چەندەها خەرمانە لەلێڵی و پیرۆزی و ڕاددەبەدەری و بان ئاسایی بەدەوری خۆیدا ..مورشیدیش لەوجۆرە پیاوانە نەبوو کەشێوازێکی کاڵ و کرچ بۆ ئەم

---

[٧٦] عبدالمجید الباجوري، حسن البنا– القاهرة– (١٩٥٢) –ص١٢– وراجع ایضا: عبدالقادر عودة، الاسلام بین جهل ابنائه وعجز علمائه (١٩٥٢)ص٢٢.

[٧٧] محمد الغزالي، الاسلام المفتري علیه بین الشیوعیین والرأسمالیین – المرجع السابق ص ٢٧.

مەسەلەیە بەکاربهێنێت و دواییش دەرەنجامەکانی بەپێچەوانەی ئەوەوەبێت کەچاوەڕوانکراوە. بەڵکو زۆر لێزانانەو بەبێ هیچ خۆسەغڵەت کردنێك باسی ئەم مەسەلانەی دەکرد .. لەبەرئەوە کاریگەری هەبوو لەدەروونی شوێنکەوتووەکانیداو چەندەها خەرمانەشی لەپیرۆزی بەدەوریدا دروست دەکرد..

هەموو مەسەلەکان هەرچەند ئالۆزیش بن زۆر بەئاسانی و خۆشی چارەسەر دەکرێن، چارەسەری کێشەکانیش لەخۆوە بەئیلهامێکی ئاسمانی بۆم دێت .. تەنانەت ناوی کۆمەڵەکەش بەجۆرێك لەئیلهام بۆی دێت .. زۆرجاریش دەتوانێت ئایندەو داهاتوو ببینێت .. ((جارێك کەقوتابی بوو، شەو لەخەونیدا ۰۰۰ چەند پەڕەیەکی دەخوێندەوە، کەچی سبەینێ ڕێك پرسیار لەو پەڕانەدا هاتبۆوە)). بەڵکو چەند چیرۆکێك لەسەرخۆی دەگێڕێتەوە سەبارەت بەو چاودێریە نەبینراوەی کەهەمیشە لەگەڵیدا بووەو فریای کەوتووەو دەربازی کردووەو ئاگاداری بووە، کەئەقڵ قبوڵی ناکات .. ((خانویەك بەسەر خۆی و براکەیدا ڕووخا، بەڵام محاجەرەی قادرمەکە دەربازی کردن و سەقفەکەی پێوە گیرسایەوە. لەبەرزایی هەشت مەترەوە کەوتەخوارەوە،بەڵام کەوت بەسەر ڕاخەرو شتەکانداو[*] هیچی لێ نەهات. بەمناڵیی ئاگری تێبەربوو و جلەکانی گڕی گرت، پیاوانی ئاگرکوژێنەوە

---

[٧٨] المرجع السابق ص٤٧.

وەفریای کەوتن. بەسواری ئەسپەوە بوو، ئەسپەکە لەژێر نێرگەیەکدا هەستایە سەرپێ‌و خەریك بوو سەری بدات بەنێرگەکەدا، بەڵام خوا نایە دڵیەوەو بەسەر پشتی ئەسپەکەدا ڕاکشا تالێی تێپەڕبوو))[٧٩].

ئەگەر توێژەریش مافی ئەوەی نەبێت بپرسێت ئەم هەموو چیرۆك‌و موعجیزانە تاچ ڕاددەیەك ڕاستن، ئەوا مافی خۆیەتی کەبپرسێت شێخی بەننا بەچ مەبەستێك ئەم هەموو چیرۆکانەی بۆ شوێنکەوتووەکانی دەگێڕایەوە..؟ ئەمەش پرسیارێکی گرنگە، چونکە جۆری ئەو پەیوەندیە دەستنیشان دەکات کەشێخ دەیویست لەنێوان خۆی‌و شوێنکەوتوەکانیدا دروستی بکات ئەگەر ئەوەش نەبێت کەشێخ دەیویست چەند خەرمانەیەك لەپیرۆزی بەم چیرۆکانە بەدەوری خۆیدا دروست بکات، ئەی چی بووە؟

ئەی ئەم نەبوو، وەك عەبدولڕەحمانی برای دەیگوت. ((کەژیاننامەی پێغەمبەری خوای لەخۆیدا بەدی دەهێنا))[٨٠]. بەتەنها شێخ حەسەن‌و عەبدولڕەحمانی براشی نەبووکەهەوڵیان بۆ ئەوە دەدا، بەڵکو هەروەها باوکیشیان چەند چیرۆکێکی خەیاڵی دەربارەی کەراماتی کوڕەکەی دەگێڕایەوە. جارێك شەش مانگی تەمەن بوو، شیرەخۆرە بوو، لەتەنیشت

---

[٧٩] الاخوان المسلمون – العدد الممتاز الصادر في (١٩٤٨) بمناسبة مرور عشرون عاما على تأسيس الجماعة.

[٨٠] فتحي العسال، المرجع السابق، ص ١٢٠.

دایکیەوە خەوتبوو، ماریکیش لەپەنایەوە گرمۆڵە ببوو وسەری بۆلای سەریەوە درێژ کردبوو ((کوڕی خۆم خوا لەزیان و شەڕی دەربازت دەکات، لەپێناوی ویستێکدا کەخۆی پێشتر زانیاری لەسەری هەیەو بڕیاری لەسەرداوە، کارێکیش کەبەتۆ دەگاتە ئەنجام))[٨١].

هیچ توێژەرێکیش ناتوانێت هەموو ئەم شتانە بەڕێکەوت لەقەڵەم بدات.

پێش ئەوەیش کەلەپشکنینی دۆسییەکەی تەواوبین .. پێمان وایە ماڤ خۆیەتی لەسەرمان جەخت لەسەر ئەوەبکەین، کەخۆی لەسەرەتاوە دەیزانی خۆی و شوێنکەوتوەکانیشی بەسەر درك و داڵدا دەڕۆن، ئەوانەش کەلەگەڵیاندا نەرم بووەو لەگەڵیاندا نەرم بوون ڕۆژێك دێت کەلەدژی خۆی و بانگەشەکەی ڕیز دەبەستن. ڕەنگە بەئاگابوونیشی دەربارەی ئەم حەقیقەتە حساب بکرێت و بکەوێت لەسەری، هەروەها ڕەنگە هەندێك هۆکاری ئەوەشمان بۆ ڕاڤە بکات کەبۆچ لەسەر لێڵی و تەم و مژ لەکارەکانیداو.. شاردنەوەی نهێنی و چەك و .. توندکردنی دەسەلاتیشی بەسەر کۆمەڵەکەدا، سووربوو.

حەسەن ئەلبەننا لەوتارێکیدا بۆ شوێنکەوتوەکانی دەڵێت ((نەزانینی گەل بەحەقیقەتی ئیسلام دەبێتە ئاستەنگ و ڕێگر لەسەر ڕێگاتان. هەندێك لەزانا

---

(*) لەعەرەبیەکەدا (ملطم المونة)ی بەکارهێناوە، کەبریتییە لەپێستەی خۆشکراوو لەعەمبارو گەنجینەکاندا ڕادەخرێن.

[٨١] المرجع السابق ص ١٢٧.

ئایینیە ڕەسمیەکانیش دەبینن کەتێگەیشتنی ئێوەیان بۆ ئیسلام بەلاوە سەیردەبێت و ئەو جیهادەش ڕەت دەکەنەوە کەئێوە لەپێناویدا دەیکەن. سەرکردەو پێشەواو دەوڵەمەندو بالادەستەکانیش کینەیان بەرامبەرتان دەبێت.هەموو حکومەتەکانیش وەکویەك بەڕووتاندا دەوەستن، بەمەش بێ گومان دەچنە خولی تاقیکردنەوەو ئەزموونەوە، زیندانی دەکرێن، دەست بەسەردەکرێن، دوور دەخرێنەوە، ئاوارە دەکرێن، بەرژەوەندیەکانتان دەستی بەسەردا دەگیرێت و خانوو ماڵەکانیشتان توشی پشکنین دەبێت))[٨٢].

... ڕوشی دا

تەنانەت پاش کوژرانیشی هەر تارمایی و شەبەنگەکەی بەسەر کۆمەڵەکەدا دەمێنێتەوە، هەروەها بەسەر هاوەڵان و نەیارانیشیدا. هەڵوێست و بۆچونیش لەسەر خودی کەسەکە هەرپێودانگەیەك دەبێت بۆ هەڵوێست لەسەر هەموو بزووتنەوەکە.

کاتێکیش شۆڕشی تەمموز ڕوویداو لەماوەی ئەو ((مانگی هەنگوینی (شهر العسل) ))ەشدا کەلەنێوان شۆڕش و ئیخواندا هەبوو- تاڕادەیەکیش کاتێکی درێژی خایاند- هەڵوێست وەرگرتن لەسەر حەسەن ئەلبەننا هەر بەڵگەو دەلیل بوو.

---

[٨٢] حسن البنا. بين الامس واليوم.

لەرۆژەکانی سەرەتای شۆڕشیشدا، لیوا محەمەد نەجیب سەردانی گۆڕی ئیمامی شەهیدی کردو لەبەردەمیدا بەگریانەوە وەستا.

هەروەها شۆڕش بڕیاری ئەوەشی‌دا کەدۆسێیەی قەزییەی کوژرانی بەننا بکرێتەوە .. لەدادگاشدا (بکباشي محمد التابعي)ی جێگری ئەحکام هەستا بەشکۆدار کردنی ئیمامی شەهیدو داوای سەری بکوژانی کرد: ((خوالێخۆشبوو شێخ حەسەن ئەلبەننا خاوەنی بانگەشەیەك بوو لەپێناویدا شەهید بوو، بانگەشەکەی داوای چاکسازی دەکردو ئامانجی ڕزگار بوون بوو لەئیستعمارو واشی لەقەڵەم دەدا کەئیستعمار سەرچاوەو بنەمای گەندەڵییە))[٨٣]...

بەڵام ماوەیەکی کەمی بەسەردا تێپەڕ دەبێت‌و هەمان هۆڵ دادگایی کردنی ئیخوان‌و هێرشەکانی داواکاری گشتی دژی بانگەشەو دامەزرێنەرەکەی بەخۆیەوە دەبینێت.

کاتێك ((شەهرلعەسەل))یش بەرەو تەواوبوون دەچێت، جەمال عەبدولناسر دەست دەکات بەهەوڵدان بۆ بەکارهێنانی ((شێخ)) دژی ((کۆمەڵەکە)). لەنێو چەندەها شالاوی ڕاگەیاندنی توندیشدا، دژی مورشیدی نوێ ((الهضيبي))و کۆمەڵەکە بەگشتی، جەمال عەبدولناسر بەیاوەری ژمارەیەك لەئەندامانی لیژنەی شۆڕش‌و ژمارەیەك لەئیخوان

---

[٨٣] محاكمات الثورة – الكتاب الاول – محاكمة ابراهيم عبدالهادي، ص١٧٩.

موسلیمینەکانی سەر بەخۆی، سەردانی گۆڕی ((ئیمامی شەهید))دەکات و ڕەحمەتی بۆ دەنێرێت و ستایشی ئیمام و کارەکانیشی دەکات..[٨٤]

کەسایەتی ئیمامیش، سەرەڕای ئەوەی تۆژینەوەی زۆر وردو قوڵیشی لەسەرکراوە، بەڵام هەر جێگای چەندەها پرسیارە کەبۆ وەڵامدانەوە دەگەڕێن.

## ... کۆمەڵەکە

.. بارودۆخیش بەتەواوی لەبارو پێگەیشتوو بوو، بۆئەوەی ئەم کۆمەڵە بچکۆلەیە هەستێت و دەستبەکاربێت و ببێتە یەکێك لەگەورەترینی بزووتنەئیسلامیەکان لەچاخی نوێدا، وەك ئەوەی کەبەڕاستی ناوی نرابوو.

میسر بێزار ببوو، دەسەڵاتی حوکمڕانیی (ئۆتۆکراتی)شی ڕەت دەکردەوە، چەند حکومەتێکی تەواو بەکرێ گیراویش بەهۆی هێزی سەراو داگیرکەرەوە مافەکانی حیزبی زۆرینەیان لادەبردو هەڕەشەیان لەودەستورەش دەکرد کەهێنرابووەکایەوە، تەنانەت هەروەها ئەم حیزبی زۆرینەیەش ملکەچی شێوازی هودنەو ڕاڕایی دەبو ، قەیرانە ئابورییەکەش توندتر دەکرا، مەسەلە نیشتمانیەکەش بێ چارەسەر مابۆوە.. خەڵکیش هەموویان هەستیان بەڕەت کردنەوەو سەرسامی دەکرد پێکەوە .. ((چنگ گیر کردنی سیاسەتمەدارە کارامەکانیش لەکورسی دەسەڵات بەهەچ نرخێك

[٨٤] الجمهورية، ١٩٥٤/٢/١٣.

بێت و ڕق و کینەی زۆربەی خەڵکیش بەرامبەر ئەو دەستورەی کەلەئارادابوو، هەلێك بوو لەبەردەمی ئیخوان موسلیمیندا، بۆئەوەی سەدەها هەزار لەشوێنکەوتووان بۆ ڕیزەکانیان ڕابکێشن))[٨٥]

لەم هەست بەرەتکردنە توندڕەوەو لەم ناڕازی بوونەشەوە بەرامبەر ئەوەی کەلەئارادایە، بانگەشەی ئیخوان موسلمین سەرکەوتنی بەدەست هێنا.[٨٦]

جەنگی نێوان سەراو حکومەتیش لەسەر ئەزهەر بەهێزتر دەبوو ((بۆماوەیەکی کورتیش (١٩٢٩-١٩٣٠) وەزارەت پایەی شێخی ئەزهەری لەسەرا سەند))[٨٧]. پاشان کۆشك دێتەوەو بالادەستی بەسەر ئەزهەردا بۆخۆی دەپچڕێت .. هەروەها داگیرکەریش دەست وەردەداتە مەسەلەکەوە، بەم شێوەیەش پیاوە ئایینیە باوەکان لەڕواڵەتی بێ دەسەلاتدا دەردەکەون .. ئەمەش پاڵ بەمسوڵمانی بەجۆشەوە دەنێت کەبەدوای شتێکی نوێدا بگەڕێت.

((لەڕاستیشدا کۆمەڵگەو دەوڵەتی نوێ، مسوڵمانی ئایینداریان لەنێو کۆمەڵێك لێکدڕیی زۆردا داناوە))[٨٨] ئەمە وتەی یەکێك لەتوێژەرەکانەو

---

(85) Vatikotis- The Modern Historn History of Egypt – op. Cit. P. 323.

(86) Khadduri – op – cit . p. 73.

(87) Grunidoun – op – cit . p. 186.

(88) Ibid . p. 247.

لەمەشەوە هۆیەك لەهۆكارەكانی سەركەوتن و بڵاوبوونەوەی بانگەشەی ئیخوان هەڵدەهێنجێنێت.

((لەوانەشە كۆمەڵی ئیخوان، یەكەمینی دەستە ڕێكخراوەییەكان بێت كە بۆچوونێكی پێشكەش كردووە ئامانجی گۆڕینی ڕژێمی سیاسی باوە لەمیسردا بەشێوەیەكی گشتی))[89] توێژەرێكی دیكەش بەم شێوەیە دووپاتی كردۆتەوەو .. هەروەها یەكێك لەهۆكارەكانی بڵاوبوونەوەیشی هەلێنجاوە.

بەڵام ئیخوان موسلیمین لەهەوڵی ئەوەدا نەبوون كەتەنها ڕاستكردنەوەیك، یان چاكسازییەك لەڕژێمدا بكەن ((بەڵكو وا خۆیان پێشكەش كرد ئەلتەرناتیڤێكن و دەتوانن ڕۆڵی ئەوانە ببینن كەدەتوانرێت پێیان بووترێت سیاسییە عیلمانییەكان، پاشانیش وەكو ئەلتەرناتیڤێك بۆ هەموو ئەو نموونانەی كەلە ئەوروپاوە (هێنراون) بۆ ڕێكخستنی كۆمەڵگەو حكومەت بەشێوەیەكی سەرتاسەریش هەموو دامەزراوەو دەسكەوتەكانی ئەوروپایان ڕەت كردەوە))[90]. ڕەنگە ئەمەش كۆسپ و تەگەرەیەكی زۆری لەبەردەمیاندا دروست كردبێت.

... پاش ئەم دێڕانەش كەڕاوبۆچوونی ژمارەیەك لەتوێژەرەكانی سەبارەت بەبارودۆخی ئیخوان موسلمین خستەڕوو، دەگەڕێینەوە بۆلای ئەو كۆمەڵە

[89] Wheellock, Keith – Nasser New Egypt. Loudou (1960) – p.3.

[90] Vaticotis – op. Cit .p. 323.

پیاوە کەمەی کەدەوری شێخیان دابوو لەئیسماعیلیە .. هەوڵیش دەدەین کەهەنگاو بەهەنگاو لەگەڵیدا بڕۆین.

وەك گوتمان سەرەتاکەی لەمانگی (ذی القعدة)ی ساڵی ١٣٤٧ك (ئازاری ١٩٢٨)[٩١] دا بوو، کۆمەڵەکەش خانوویەکی کۆنی لەئیسماعیلیە کردبووە بارەگای خۆی. کاتێکیش بڕیاریان دا بارەگایەکی نوێ بکەنەوە، کەوتنە کۆکردنەوەی پارەو یارمەتی ، دەشتوانرێت بگوترێت گرنگترین یارمەتی کەدەستیان کەوتبێت لەکۆمپانیای نۆکەندی سوێسەوە بوو، کەپێنج سەد جونەی پێشکەشکردن (!).

هەروەها کۆمەڵەکە هەندێك پارەی لەچەند بازرگانێکیش بەقەرز وەرگرت، بەمەش توانی مزگەوتێك بنیات بنێت کەبارەگای کۆمەڵەکەی دەگرتەخۆی، پاشان لەدواییشدا قوتابخانەیەکی کوڕان و قوتابخانەیەکی کچان و

---

(٩١) شێخی بەننا بەم شێوەیە نووسیویەتی، هەردوو مێژووەکە پێکەوە، بەڵام یەکێك لەتوێژەرەکانی مێژووی کۆمەڵەکە کە (روزنتاڵ)ە، لەوتارەکەیدا ((الاخوان المسلمون ڤ مصر)) کەلەگۆڤاری ((عالم الاسلام))دا بڵاوبووە (ژمارەی تشرینی یەکەمی ١٩٤٧)، لەکاتی بەراوردکردنی ڕۆژمێری کۆچی و زایینیدا بۆی دەرکەوتبوو (ذی القعدة)ی ساڵی (١٣٤٧ك) بەرامبەر بەمانگی (نیسان - ئایاری ١٩٢٩)دەوەستێت هەروەها سەرنجیش دەدەین کۆمەڵەکە دەیەمین ئاهەنگی دامەزراندنی لەکانونی دووەمی ١٩٣٩ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەمێژووی دامەزراندنی ساڵی ١٩٢٩یە، بەڵام کۆمەڵەکە ئاهەنگی بیستەمی لەئەیلولی (١٩٤٨) دا گێڕا ئەمەش وای لێکردین کەساڵی (١٩٢٨) هەڵبژێرین، بەتایبەتیش لەبەرئەوەی هەمان ئەم مێژووە لەمادەی یەکەمی یاسای بنەڕەتی دەستەی گشتی ئیخواندا هاتووە، لەلاپەڕە (٥)دا.

یانەیەکیشی بۆ زیادکرا[٩٢]. ئەمەش بووە جۆرو شێوازێکی بنەڕەتیی بۆ بارەگاکانی کۆمەڵەکە.. مزگەوت و بارەگایەك قوتابخانەو یانەیەك، پێدەچێت برۆژەیەکی ئابوریشی لەگەڵدا بووبێت بۆخزمەتکردنی دەوروبەر.

مەسەلەکەش پێویستی بەچوارساڵ کارو گەشتی بەردەوام هەیە بەنێو ئەو شارو گوندانەدا کەلەئیسماعیلیەوە نزیکن، ئەمەش لەپێناوی ئەوەدا کەچەند هۆبە (شعبة)یەك بۆ کۆمەڵەکە، بەدرێژایی بەشی خۆرهەڵاتی دەلتا (پۆرسەعید - سوێس- ئەبوسوێر)و بەشی خۆرئاوایشی هەتا شبراخیت، دروست بکرێت .. هەروەها چەند پەیوەندییەکی دیاری کراویش لەگەڵ قاهیرەدا هەبوو.[٩٣]

بەڵام ئەم چالاکیانە بەدوور نەبوون لەچاوی پۆلیس و ئەوکەسانەی گومانیان لێی هەبوو. ڕاپۆرتەکانیش بەتاوانبارکردن داباریینە سەر شێخ، جارێك بەیەکرێ گیراوێکی شیوعی لەقەڵەمیان دەدا، جارێك بەوەفدیەکی دژبەحکومەتی (صدقی)، جارێکی تر بەکۆمارییەکی نەیار بەشا فوئادو جارێکی تریش بەفەرمانبەرێك کەڕێنماییەکانی حکومەتی پێ شێل کردووە .. ئەم شکایەتانەش سەرنجی ئیسماعیل سدقی دیکتاتۆر ڕادەکێشن و فەرمانێك دەردەکات بۆ وەزارەتی مەعاریف کەلێکۆڵینەوە لەگەڵ شێخدا بکەن، لەلێکۆڵینەوەشدا بێ تاوان دەردەچێت. بەڵام ئەوشتەی کەلەبێ

[٩٢] مذكرات الدعوة والداعية ، ص ٩٦-١١٠.

[٩٣] المرجع السابق، ص ٨٤- ١٠٨.

تاوانیەکە گرنگترە، ئەوەیە کە ئیسماعیل سدقی بایەخیدا بەکۆمەڵەکەو بیری لەوەکردەوە چەند پەیوەندیەکی لەگەڵیاندا دروست بکات .. دژی نەیارەکانی[٩٤].

هەندێك لەتوێژەرەکانیش لەبەردەم ساڵی (١٩٣٠)و دیکتاتۆریەتەکەی سدقیدا، وەکو نیشانەیەکی سەرڕێگا لەمێژووی کۆمەڵەکەدا دەوەستن. لەلایەکەوە لەباربردنی ئەزموونە دەستووریەکە لەسەر دەستی سدقی ((هۆکار بوو بۆ دروست بوونی هێڵە سیاسییە توندڕەوەکان کەسیاسەتی پەیڕەوکراوی ئەو سەردەمەیان ڕەت دەکردەوە بەگشتی))[٩٥]، لەلایەکی تریشەوە بیرۆکەکەی سدقی زۆرزان بۆ هاندانی کۆمەڵەکە، تا هاوکاری خۆیو سەرا بکەن لەڕووبەڕوو بوونەوەیاندا لەگەڵ حیزبی وەفددا.

گەرچی سدقیش گفتی دابوو بەشێخی بەننا، لەڕێی عەبدولڕەحمانی برایەوە، کەیارمەتیەکی ماددی زۆر گەورەی بداتێ ئەگەر ئیخوان موسلیمین پشتگیریی خۆیان بۆ سدقیو دژایەتی خۆیان بۆ حیزبی وەفد ڕابگەیەنن، بەنناش دووپاتی دەکردەوە کەئەمەی ڕەت کردۆتەوە، بەڵام بەننا ئەو پەیوەندیە تایبەتەی هەر کەم نەدەکردەوە کەلەنێوان خۆیو سدقیدا دروست ببوو.[٩٦]

---

[94] Mitcell – op. Cit. P. 9.

[95] Vatikiotis – op- cit. P. 262.

[٩٦] مذكرات الدعوة والداعية، ص ١٠٩.

- ئەوەی لێرەشدا بەلای توێژەرەکانەوە گرنگە، ئەوەیە کەسدقی زۆرزان سەری داوەکەی دۆزیبوۆوە، ئیتر ئەگەر سەرکەوتووش بووبێت لەپەیوەندیەکەیدا لەگەڵ ئیخوان یان نا.

سەرکەوتنە ڕاستەقینەکەشی تەنها لەو بیرۆکەیەدا خۆی دەنوانند کەلەپاشاندا بووە جێگای بایەخ و جێ بەجێ کردن لەلایەن دەزگا دەسەڵاتدارە جۆراو جۆرەکانەوە.

پاش مۆڵەتی ساڵی خوێندنی ١٩٣٢یش، حەسەن ئەلبەننا لەسەر داواکاری خۆی گوازرایەوە بۆ قاهیرە .. لەوێش دەبینێت کۆمەڵێك ئەندامی هەیە کەئەوانیش بەهەمان شێوە لەهەوڵدان چالاك بن، عەبدولڕەحمانی برابچوکیشی دەبینێت سەرۆکایەتی کۆمەڵێکی بچوك دەکات بەناوی کۆمەڵی ڕۆشنبیریی ئیسلامی))ەوە، دووکۆمەڵەکەش پێکەوە یەکدەگرن بۆئەوەی یەکەم لقی ئیخوان موسلیمین لەقاهیرە دابمەزرێنن.

بەم شێوەیەش ژیانێکی نوێ بەبەر ڕیزەکانی کۆمەڵەکەدا دەچێت، ئەمەش بەوەی کەلەدڵی بزووتنەوە سیاسیو ئیسلامیەکەی پایتەختدا بوونیان هەیە.

زۆربەی دامەزرێنەرانی ئەم لقەیش بوونە سەرکردە لەکۆمەڵی ئیخوانداو کۆمەڵەکەش کەوتە فراوانکردنی چالاکیەکانی.[٩٧]

---

[٩٧] المرجع السابق الدعوه والداعيه. ص ١٠٩.

ئەگەر ئەوکێشە بچکۆلەیەش کەلەلقی ئیسماعیلیە ڕوویداو پێشتر باسمان کرد، هەر کاریگەریەکی هەبووبێت، ئەوا ئەوەبووە کەوانەیەکی داوتە شێخ تا نزیکترین کەسەکانی خۆی بۆسەرۆکایەتی کردنی کۆمەڵەکە هەڵبژێرێت، هەروەها مەسەلەکانی ئامادەکردنی دارایی و سەرچاوەکانی و پەیوەندییە سیاسییە گرنگەکانیش بەتەنها لەدەستی خۆی و لەژێر ڕکێفی خۆیدا بێت.

لقەکەی ئیسماعیلیەش - پاش ئەوەی لەیاخی بووەکان ڕزگاری بوو - ڕایگەیاند مەڵبەندی گشتی کۆمەڵەکە گوازراوەتەوە بۆقاهیرە کەئیمامی لێیە .. بارەگا سادەو بچکۆلەکەی قاهیرەش چالاکییەکی گەورە بەخۆیەوە دەبینێ کەتەوەرەو بڕبڕەکەی شێخ بەننایە شێخ و کۆمەڵەکەش ڕۆژەکانیان بەم شێوەیە بەڕێوە دەچوو: بەیانیان زوو شێخ دەچوو بۆ مەڵبەندی گشتی، پاشان دەچووە قوتابخانە بۆئەوەی ئەرکە وەزیفیەکەی خۆی بەئەنجام بگەیەنێت، پاشان لەقوتابخانەوە دەگەڕایەوە بۆ مەڵبەندی گشتی پاشانیش کەمێك لەماڵەوە پشووی دەداو سەرلەنوێ دەگەڕایەوە بۆ مەڵبەند.. بەدرێژایی ئەم کاتانەش شێخ ڕێنمایی لەبابەت ڕێکخستن و بەڕێوەبردن و ڕۆشنبیریەوە بۆ کارەکانی کۆمەڵەکە دادەنا، وانەشی بەئەندامان دەگوتەوە، هەروەها باس و خواسیشی لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکرد کەبەئامانج و حەزی ناسین، یاخود تەنها وەکو حەزێکی خۆتێهەڵقورتاندن سەردانی بارەگاکەیان دەکرد. شێخ ماوەی نێوان نوێژی شێوان (مغرب) و خەوتنان (العشاء)یشی

تەرخان كردبوو بۆ گوتنەوەی وانەی تەفسیری قورئان، زۆربەی گوێگرانیشی خەڵكی سادەو پیشەوەرو بازرگانە بچكۆلەكانی گەڕەك بوون، كەیەكێك لەسەركردەكانی ئیخوان بەم شێوەیە وەسفی كردوون ((ئەمانە نەخوێندەواربوون‌و حەزیشیان لەخوێندن نەدەكرد))[٩٨]. بەڵام ئەمانە زوو بەدەم بانگەشەكەی شێخەوە هاتن‌و دەفری بنەڕەتیی ئەندامێتی ئیخوان موسلیمینیان لێ پێك هات.

یەكەمین كەسان كەكۆمەڵەكە بۆلای خۆی ڕاكێشابن ((دانیشتوانی ناوچە هەژارەكان بوون كەبەدەست نامۆیی‌و تەنهاییەوە لەشاری قاهیرە دەیانناڵاند هەروەها ئەو كەسانەش بوون كە كۆچیان كردبوو هاتبوونە قاهیرەو لەكۆبوونەوەكان‌و نوێژە بەكۆمەڵەكانیدا پشووی دەروونییان بەدی دەكرد. لقەكانی كۆمەڵەكەش سەبارەت بەم كەسانە لەجێگەی كۆبوونەوە سۆفیگەریەكان‌و گروپە كرێكارییە كۆنەكان بوون))[٩٩].

دەشتوانرێت بگوترێت كەبناغەی بنەڕەتیی كۆمەڵەكە لەم قۆناغەدا ((لەو پیشەگەرانەی كەسەربەچینی ناوەندی‌و نزمی كۆمەڵگەبوون‌و هەروەها لەبازرگانە بچوكەكانیش))[١٠٠] پێكهاتبوو.

---

[٩٨] لبيب البوهي، الايمان والرجل – ص ١٠.

[99] N. Safran, Egypt in Search of Political Community – (1961) P. 202.

[١٠٠] ليوناردو بايندر، الثورة العقائدية في الشرق الاوسط – تعريب خيري حماد، دار القلم بالقاهرة (١٩٦٦). ص٧٨.

یەك ساڵیش پاش گواستنەوەیمەڵبەندی گشتی بۆ قاهیرە، کۆمەڵەکە پەنجا لقی لەجۆرەها ناوچەی میسردا هەبوو.[١٠١]

بەلاّم توێژەرەکانی مێژووی کۆمەڵەکە، تێبینی ئەوە دەکەن کەئەم فراوانبوونە، گۆڕانێکیشی لەپێکهاتەی کۆمەلاّیەتی (چینایەتی)ئەندامانی کۆمەڵەکە لەگەڵدا بووە. چونکە لەکاتی ئەو گەشەسەندنە سیاسیو ئابووریانەدا کەلەسیەکاندا بەسەر کۆمەڵگەی میسردا هات، هەروەها لەوکاتەدا کەڕەفتاری سەرکردایەتی حیزبی وەفد، لەو مەسەلانەدا کەپەیوەستن کێشە نیشتمانیەکەوە - تاڕاددەیەك- ڕووی کردبووە ئاگربڕ (هدنە)[١٠٢]. لەم کاتانەدا چەند هێزێك کەلەبنەڕەتدا لەجەماوەری وەفدبوون، ڕوویان کردە ڕیزی کۆمەڵە توندڕەوەکانی وەك ئیخوان موسلمینو میسر ئەلفەتات.. یەکێك لەتوێژەرەکانیش وەسفی ئەو جەماوەرە دەکات کەلەوتاری سێ شەممەاندا ئامادەبوونو دەڵێت ژمارەیەکی زۆر لەوهێزانەی تێدابوو کەئێستا ئاماژەمان پێکردن، هەروەها دەڵێت ئەمانە بەوە جیادەکرانەوە کەدزداشەیان لەبەردابوو. بەلاّم هەمان توێژەر ئەوەش

---

[١٠١] د. اسحق موسى الحسيني. المرجع السابق ص ٢١.

[١٠٢] لمزيد من التفاصيل، راجع: د. رفعت السعيد، مصطفى الخامس – دار القضايا– بيروت (١٩٧٦).

ڕادەگەیەنێت ((کەزۆربەی زۆری ئامادەبووان قوتابیی و فەرمانبەرو ماموستاو پیشەگەر بوون))[103].

بەم شێوەیە جلو بەرگە باوەکەشیان لە((دزداشە))وە گۆڕرا بۆ ((چاکەتو پانتۆڵ))، ئەمەش بانگێك بوو بۆگەشەسەندنێکی نوێ لەپەیوەندیەکانی کۆمەڵەکەو ڕێبازی کارکردنیدا.

وردە وردەش کۆمەڵەکە جێگیر دەبێت، بەجەماوەرو بارەگاشیەوە لەکۆڵانە تەسکەکانی قاهیرەوە دەگوازرێتەوە بۆ ناو کەشێکی بەربڵاوترو جەماوەرێکی فراوانتر، مەڵبەندی گشتیش پڕدەبێت لەو فەرمانبەرانەی کەپاش نیوەڕوان بەتاڵنو موچە وەرگرن.. ئەمەش فراوانبوونی چالاکی کۆمەڵەکەو زۆربوونی ئەندامانی دەگەیەنێت.

قاهیرەو شارە جیاوازەکانی دیکەی وڵاتیش، پیاوانێك بەخۆیانەوە دەبینن کەبەرگێکی نوێیان لەبەردایەو بریتییەلە ((شاڵ))ێك کەدەیدەن بەشانیانداو ئارم (گوڵەیەخەی)کۆمەڵەکەشی پێوەیە. لەسەرتاشدا ڕەنگی ئارمەکە سەوزبوو، پاشان هێندەی پێنەچوو بووە سپی.زۆرکاتیش ((بانگەشەکەران))لەئەندامانی ئیخوان موسلیمین گیرفانێکی گەورەیان بۆئەم

---

[103] Peters Donald, The Mostem Brotherhood: Yerrorists or Zealots Reporter, VIII (17 Mar. 1953) p.8.

شاڵە لەسەرسنگیان دروست دەکرد، قورئانێکیان بەشێوەیەکی ئاشکرا تێ دەخست و بەسەر سنگیانەوە دەلەریەوە.[104]

گەرچی ئەم بەرگەش کەخەرجییەکی زۆری تێدەچوو، دیمەنێکی بەویقاریشی هەبوو - تەنها بۆئەو ئەندامانەی کۆمەڵەکە بوو کەباری ئابوورییان باش بوو، بەلاّم ڕێنماییەکانی کۆمەڵەکە لەسەرەتای سیەکاندا بەسەر ئەندامەکانیدا دەسەپاند کەهەریەکێکیان مستیلەیەکی زیوی دەلاّ، بکەنە پەنجە توتەی دەستی ڕاستیان کەهێمابوو بۆئەم ئایەتە پیرۆزە ((قل تعالوا اتلوا ما حرم ربكم عليكم الاتشركوا به شيئاً))، هەروەها مستیلەکە وێنەی دووشمشێری یەکتربڕو قورئانێکیشی تێدابوو.[105]

هەندێك لەتوێژەرەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن کەیەکەم جار لەمیسردا ئیخوانیەکان شێوازی (بەرگی حیزبی یەککگرتوو)یان بەکارهێنا، لەناوەڕاستی سیەکانیشدا زۆربەخێرایی ئەم شێوازە لەشێوەی چەند کراسێکی هەمەڕەنگدا بلاّوبۆوە، کەئەمیش درێژبوونەوەیەکە یان لاسایی کردنەوەیەکە بۆ بەرگی ڕێکخستنی فاشی و نازییەکان کەئەوکاتەی لەئەورووپادا بلاّوبوو.

---

[104] عبدالباسط البنا، المرجع السابق.

[105] مذكرات الدعوة والداعية. ص٢١٧.

بەهەرحاڵ، فراوانبوونی ئەندامێتی کۆمەڵەکە وای کرد کەپابەندبوونی هەموو ئەندامان بە بەرگێك یا نیشانەیەکی دیاری کراوەوە ببێتە شتێکی مەحاڵ.. بەم شێوەیەش ئەم شێوازو خووە پشت گوێ خراو لەبیرکرا.

لەگەڵ جێگیربوونی کۆمەڵەکەشدا، یەکەمین کۆنگرە لەئایاری (١٩٣٣)دا دەبەستێت، تەوەرەی کارەکانی کرنگرەکەش بریتیی بوو لەلێکۆڵینەوەی چالاکی نێردراوە تەبشیرییە مەسیحیەکان و چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەیان. کۆنگرەش بڕیاری دا نامەیەك بنێرێت بۆ شافوئادو تێیدا داوای ئەوە بکات کەپێویستە چالاکی ئەم نێردراوە بیانیانە بخرێتە ژێر چاودێریەکی حکومی کاریگەرەوە.[١٠٦]

هەر لەهەمان ساڵیشدا ئیخوان کۆنگرەی دووەمی خۆی دەبەستێت و تەرخانی دەکات بۆ لێکۆڵینەوەی بابەتەکانی بانگەشەکردن و ڕۆشنبیرکردنەوە، کۆنگرەکەش بڕیاریدا کەکۆمپانیایەکی بچکۆلە، بۆ بنیاتنانی چاپخانەیەکی تایبەت بەئیخوان موسلیمین[١٠٧]دابمەزرێنێت. بەنناش خۆی خاوەنی بیرۆکەکە بوو، هەرخۆیشی بزوێنەرو ڕێکخەری جێبەجێکردنی بوو .. بەهەوڵ و کۆششێکی زۆری بەنناش، ئەنجامی کۆنگرەی دووەم بریتی بوولەدەرکردنی گۆڤاری هەفتانە بەناوی ((الاخوان المسلمون))، بەڵام ئەم گۆڤارە زۆر بەردەوام نەبوو .. پاشان

---

(١٠٦) عبدالباسط البنا، المرجع السابق. ص ٢٦.

(١٠٧) مذكرات الدعوة والداعية، ص١٤٠.

((النذیر))دەرچوو، وەکو زمانحاڵی کۆمەڵەکە.. هەروەها ئەمیش هێندەی پێنەچوو لەکۆمەڵەکە جیابۆوە. بەڵام گرنگترین شت کەلەم هەوڵی بانگەشەو ڕاگەیاندنەوە کەوتەوە، بریتی بوو لەو زنجیرە پەیامەی کەحەسەن ئەلبەننا نووسی و تیایدا هەموو ئامانج و ڕێبازەکانی کۆمەڵەکەی شیکردەوەو، هەروەها دیدوبۆچوونی کۆمەڵەکەشی بەرامبەر کۆمەڵگەی میسری و گرفتەکانی و بانگەوازی ئیسلامی و ڕێیەکانی پتەوکردنیشی خستەڕوو. ئەم ((پەیام))انەش بۆماوەیەکی دوورو درێژ - ڕەنگە هەتا ئێستاش- بنەمای تیۆری و فیکریی کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین بوو.

بەم شێوەیەش بەننا یەکەم قەڵەمبازی بەکۆمەڵەکەدا ڕووەو سەرکەوتن.. قەڵەمبازەکەش بریتییە لەفراوانکردنی بواری بانگەشەو ڕاگەیاندن و چالاك کردنی هێڵەکانی پەیوەندی لەنێوان جەماوەرو بزووتنەوەی ئیخواندا.

پاش ڕاگەیاندنیش ڕێکخستن دێت، شێخیش بیرکردنەوەیەکی ئەوا مەنتیقی هەبوو .. بەم شێوەیەش ئەرکەکانی کۆنگرەی سێهەم کەلەئازاری (١٩٣٥)دا بەسترا، دەست نیشان کرا. ئەویش بەوەی کەمورشید دەستی کرد بەدانانی یاساکانی کاری ڕێکخستن. چونکە پاش فراوان کردنی بواری بانگەشەو ڕاگەیاندن و پەیوەندی کردن، دەبێت ڕێسایەك بۆ ئەندامێتی دابنرێت و پێویستە بنیاتێکی حیزبی پتەو دابڕێژرێت، دەنا کۆمەڵەکە وەك هەردەستەو حیزبێکی دیکەی لێدێت کەلەوکاتە لەساحەکەدا هەبوون و تەنها

بریتیی بوون لەلافیتەو جەماوەرێك -كەم بووبن یا زۆر- و ڕێكخستنێكی لاوازی ڕێبازی دیاری نەكراو.

شێخیش مەرجەكانی ئەندامێتیو پلەكانیو ڕۆڵی ئەندامەكانی لەهەر پلەیەكدا دیاری كرد، لەمەش گرنگتر ناوكی یەكەمی بۆ ڕێكخستنی ((گەڕۆكەكان (الجوالة))دەست نیشان كرد، كەلەپاشاندا ڕۆڵێكی یەكلاكەرەوەیان لەمێژووی كۆمەڵەكەدا بینی.

مورشیدیش بەنووسینو بەشێوەیەكی ئاشكراو توندیش مەرجەكانی ئەندامێتیو پلەكانی دیاری دەكات: ((هەر ئەندامێك كە حەزدەكات پەیوەندیمان پێوەبكات، پێویستە ئاكارو ناوبانگێكی باشی هەبێتو خورەوشتیشی بەرزبێت هەروەها دەبێت ئامادەباشی تەواوی تێدا هەبێت بۆ گوێڕایەڵیو بەجێ گەیاندنی ئەو ئەركو فرمانانەی پێ ڕادەسپێردرێت، لەم قۆناغەشدا ئەگەر ئامادەباشی ڕاگەیاندو فۆرمی ئەندامێتی ئیمزاكردوو پەیمانی دا ئابوونە بدات، ئەوا دەبێتە برایەكی یاریدەدەر.. پاشان ئەگەر سەلماندی كەئەركەكانی، دەرخ كردنی عەقیدە، پابەندبوون بەخواپەرستیو تاعەتەوە، وازهێنان لەشتە حەرامەكانو ئامادەبوونی كۆبوونەوەی هەفتانە، باش جێ بەجێ دەكات، ئەوا دەبێتە برایەكی ئەندام .. دوای ئەمەش سەردەخرێت بۆئەوەی ببێتە برایەكی كارا، ئەمەش لەحاڵەتێكدا ئەگەر جگە لەوئەركانەی پێشوو، توانی دیراسەی عەقیدەی ئیخوان بكات، ڕاهات بەویردی قورئانی، ئامادەی كۆبوونەوە قورئانیە هەفتانەكان بوو، بەشداریی

لەسنوقی حەج و لیژنەی زەکاتدا کرد، ئەگەر تەمەنیشی ڕێگای پێدا بچێتە ناو تیمی گەشتەکانەوە، پێویستە لەسەریشی کەلەم قۆناغەدا بەپێی توانا بەزمانی عەرەبی پاراو قسەبکات و بەردەوامیش کاربکات بۆئەوەی لەبابەتە کۆمەڵایەتیە گشتیەکاندا خۆی ڕۆشنبیربکات، چل حەدیسی پێغەمبەریشی لەبەر بێت .. بەڵام بەرزترین پلە چوارەمیانە کەپلەی جیهادە، ئەمیش بەتەنها مافی برای کارایە، ئەویش لەکاتێکدا بۆ مەکتەبی ئیرشادی بسەلمێنێت کەهەموو ئەرك و واجباتەکانی پێشووی پەیڕەو کردووەو پاراستوە، بەمەش دەبێتە بانگەشەکەرێکی موجاهید. بانگەشەکەریش پلەیەکی بەرزەو خاوەنەکەی پێویستە باوەڕی بەفیکرەیەك هەبێت کەبەنووسین و وتارو قەسکردنی ئاسایی بانگەوازی بۆ بکات و.. کاری جدیش لەژیانی گشتی و تایبەتی ڕۆژانەیدا بکات لەپێناوی ئەم بانگەوازەداو هەرچەند بۆشی دەکرێت ئامرازەکانی پڕوپاگەندەی بۆ بەکاربهێنێت، هەروەها پێویستە کەسەکە ڕەوانبێژی چاك بێت، خەڵکی بدوێنێت و پێشەواییان بکات و بەقسەو کردارەکانی کاریگەری لەسەریان هەبێت))[١٠٨].

بەم شێوەیەش بەننا بنەمای ڕێکخستنێکی پۆڵاینی پتەوی داناو توانی بەهۆیەوە بچێتەناو ئەو ئەزموونەوە کەدەمێك بوو خەونی پێوەدەبینی.

---

[١٠٨] حسن البنا تذكرة الداعي - مقال منشور بمجلة الاخوان الشهرية. العدد التاسع- بدون تأريخ.

گەڕۆکـەکانیش بیرۆکـەی بـەننابوو لەدروسـت کردنـی هـێزێکی لێـدەرو کاریگەردا بۆ ڕێکخستنەکە. لەگەڕۆکەکانیشەوە بیرۆکەی کەتیبەکان لەساڵی (١٩٣٧)دا سەرچاوەی گرت، کەبریتیی بوو لەڕێکخستنێك بۆ گەورەپیاوان یان کادێرە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵەکە.. لەوانەشە ئەمان و گەڕۆکەکان تۆوی یەکەمی بیرۆکەی دەزگای نهێنی (الجهاز السری)بووبن.

هـەروەها کۆنگرەی سێهەم لەسـەر ((عـەقیدەی کۆمەڵەکـە))ڕەزامـەندبوو کەدەڵێت:

١-((باوەڕم وایە کەهەمووشتێك بەدەست خوایە، محەمـەدی سەروەریشمان (درودی خـوای لەسـەر بێت)دواهـەمین پێغەمبـەری خوایـە بۆهـەموو خـەڵك، پاداشـت وەرگرتنـەوە حەقـە، قورئـان کتێـبی خوایــە، ئیسـلام یاسـایەکی گشتگیرە بۆ ڕێسای دونیاو ئاخیرەت، پەیمانیش دەدەم کەبەشێك لەقورئانی پـیرۆز تـەواو بکـەم و پابـەندبم بەسـوننەتی بێگـەردو پاکـەوەو ژیاننامـەی پێغەمبەرو یاوەرەکانیشی بخوێنم.

٢- بـاوەڕم وایـە کەڕاسـتیی و چاکـەو زانسـت لەڕوکنـەکانی ئیسـلامن. پـەیمانیش دەدەم کەڕاست بم و عیبادەتـەکان بـەجێ بـهێنم و دوورکەومـەوە لەخراپەکاریەکان. چاك بم و ئەخلاق و ڕەوشتم باش بێت، وازبێنم لەڕەوشتە خراپـەکان، هــەتابتوانم شــوێن داب و نەریتــە ئیســلامیەکان بکــەوم، خۆشەویستی و برایـەتی لەمەحکەمـەو مەحکەمـەکاری بـەگونجاوتر بزانم و، هـەتا ناچـاریش نـەبم پەنابەمەبـەر دادگـا، شـانازی بکـەم بەدروشمـەکانی

ئیسلام و زمانەکەیەوەو کاریش بکەم بۆ بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاریە سودبەخشەکان بەنێو هەموو چینەکانی نەتەوەدا.

٣- باوەڕم وایە کەموسڵمان پێویستە لەسەری کاروکاسبی بکات، ئەو پارەیەش کەدەستی دەکەوێت مافێکی سەپێنراوی نەدارو موحتاجەکانی تێدایە، پەیمانیش دەدەم کەبۆ پەیداکردنی بژێوی خۆم کاربکەم، دواڕۆژی خۆم ڕەچاوبکەم و دەست بڵاونەبم، زەکاتی خۆم بدەم، بەشێك لەدەسکەوتم تەرخان بکەم بۆخێروچاکە، پشتگیریی هەموو پرۆژەیەکی ئابووری سوودمەند بکەم و هانی بدەم، بەرهەمی وڵات و هاوئایین و نیشتمانیەکانی خۆم پێش بخەم، لەهیچ کاروبارێکمدا سووسەلەم بەکار نەهێنم و هێندەش لەبابەتی ڕازاندنەوەو کەمالیاتەوە نەگلێم و بەڕاددەیەك کەلەتوانای خۆمدا نەبێت.

٤-باوەڕم وایە کەموسوڵمان لەخێزانی خۆی لێپرسراوەو ئەرکی خۆشیەتی کەپارێزگاریی تەندروستی و بڕواو ڕەوشتی بکات. پەیمانیش دەدەم کەبەهەموو هەوڵ و توانام کار بۆئەمە بکەم و ڕێنماییەکانی ئیسلام بەنێو ئەندامانی خێزانەکەمدا بڵاوبکەمەوە، منداڵەکانیشم نەخەمە قوتابخانەیەك کەعەقیدەو ڕەوشتیان نەپارێزێت، دادەبڕێم لەهەموو ڕۆژنامەو بڵاوکراوەو کتێب و دەستەوتیم و یانەیەکیش کەپێچەوانەی ڕێنماییەکانی ئیسلام بن.

٥-باوەڕم وایە کەموسوڵمان واجبە لەسەری سەرورەری ئیسلام زیندووبکاتەوە، ئەویش بە هەستاندنەوەی گەلە مسوڵمانەکان‌و گەڕاندنەوەی شەریعەتی ئیسلامی. ئاڵای ئیسلامیش پێویستە بەسەرهەموو مرۆڤدا بشەکێتەوەو ئەرکی هەموو مسوڵمانێکیشە کەجیهان لەسەر یاسا ئیسلامیەکان پەروەردە بکات. پەیمانیش دەدەم کەهەتا ژیانم مابێت، لەپێناوی بەجێگەیاندنی ئەم پەیامەدا، جیهاد دەکەم‌و خاوەنی هەرچیەکیش بم لەپێناویدا دەیبەخشم))[١٠٩]

بەمەبەست دەقەکەم وەك خۆی نووسیوەتەوە .. توێژەریش هیچی بەدەستەوە نامێنێت تەنها ئەوەنەبێت کەیەك تێبینی تۆماربکات، ئەویش ئەوەیە کەدەقەکە دەقێکی ڕەوشتی پوختە، ئەمەش قەیدی ناکات، بەڵام نە یەك وشەی تێدایە سەبارەت بەئیستیعمارو نەلەسەر کێشە نیشتمانیەکەش، ئەمەش لەوڵاتێکدا کەداگیرکەر باڵادەستە بەسەرچارەنووس‌و ئایندەیدا .. هەروەها یەك وشەشی تێدا نییە کەبەرگریی لەفەقیرو هەژار بکات، یەك چارەسەریشی بۆ هیچ کێشەیەك لەکێشەکانی میسر یان گەلەکەی تێدانییە. بەکورتیش ئەم دەقە تەنها شتێکی ئەخلاقییە کەدەشێت ببێتە چەند ئامانجێك بۆ هەر موسوڵمانێك لەهەر وڵات‌و زەمانێکدا.

---

[١٠٩] د. یونان رزق، المرجع السابق، ص ١٠٧.

بەڵام ترسناكترین شت كەلە بابەتەكەدایە، بڕیاری كۆنگرەیەكە كەدەڵێت ((پێویستە هەموو موسوڵمانێك بڕوای وابێت كەئەم پەیڕەوو پرۆگرامە هەمووی لەئاینی ئیسلامەوە وەرگیراوەو هەر كەموكوڕێكیشی تێدابێت كەموكوڕیە لەفیكرە ئیسلامیە ڕاستەقینەكەدا)) [110] یەكێك لەتوێژەرەكانیش تێبینی ترسناكی ئەم پرانسیپە دەكات‌و وای بۆ دەچێت ((كە كۆمەڵەكە ئایین قۆرخ دەكات‌و بۆ بەرژەوەندییەكانی خۆی، بەمەش لەو چوارچێوەیە دەردەچێت كەتەنها كۆمەڵەیەك بێت‌و هەوڵبدات ئایین پراكتیزە بكات وەك كۆمەڵەكانی تر، بەڵكو جەخت لەسەر ئەوە دەكات كەتەنها پرۆگرامەكەی خۆی ئیسلامی ڕاستە، پاشان هەركەسیش وەكو كۆمەڵەیەك لەدژی بوەستێت، ئەوا لەخودی ئیسلام لایداوە .. ئەمە پرانسیپێكە كاربۆئەوە دەكات ئیسلام كۆنترۆڵ بكات، نەك تەنها بیكاتە سیمایەك بۆخۆی)) [111]

بەمەش دەتوانین ئەو شاڵاوی كوشتن‌و تیرۆرانە ڕاڤە بكەین كەئەندامانی كۆمەڵەكە لەدژی نەیارەكانیان ڕێكیان خستبوو، چونكە نەیارانی كۆمەڵەكە، زۆربەئاسانی نەیاری خودی ئیسلامن، ئەوانەش كەلەكۆمەڵەكە دەردەچن‌و ڕەتی دەكەنەوە ئەوا ((كۆمەڵی مسوڵمانان))ڕەت دەكەنەوە، ئەوكەسەش كەكۆمەڵی مسوڵمانان ڕەت بكاتەوە پاداشتی كوشتنە.

---

[110] مذكرات الدعوة والداعية، ص ١٨٣.

[111] طارق البشري، المرجع السابق، ص ٥٢.

بەبڕواو عەقیدەو، لەڕووی فیکرەوە بەزانستو ڕۆشنبیریو، لەڕووی جەستەوە بەوەرزشو مەشق، ئامادە دەکرێت. ئالەم کاتەدا داوای ئەوەی لێ بکەن کەبەگژ کەشکەلانی فەلەكو پانتایی دەریاکاندا بچینو پەلاماری هەموو کەللەڕەقێکی بەهێز بدەین، ئینشائەڵلا بەئەنجامیشی دەگەیەنم))[١١٤].

بەم شێوەیەش سوپاکە ئامادە دەبێت.

ڕەنگە خوێنەریش تێبینی ئەوەبکات کەهیچ ئاماژەیەکمان بەکۆنگرەی چوارەمی کۆمەڵەکە نەکرد.. ئەم کۆنگرەیەش لەساڵی (١٩٣٦)دا بەستراو تەرخانیش کرا بۆ ئاهەنگی چوونە سەرتەختی شافاروق، ئەمەش چیرۆکێکی دیکەی هەیەو پێدەچێت لەبەشێکی داهاتوودا باسی بکەین.

## ئێستا ئێمە پەڕەیەکی نوێ دەکەینەوە..

پەڕەی دوای کۆنگرەی پێنجەم...

هەموو ئەوشتانەی پێش ئەمە خۆسازدانو ئامادەکردن بوو.. بەڵام ئەمڕۆ ڕۆژی یەکلایی کردنەوەیە .. سەرەتای ((جێ بەجێ کردن))ە، تەنها ئامادەکردنی سێ سەد کتێبەکە خۆسازدانێك بوو بۆ بەگژداچوونی کەشکەلانی فەلەكو قولایی دەریاکان.

---

[١١٤] المرجع السابق ص ٢٤.

ڕەنگە لێرشدا پێویست بێت سەیرێکی ئەو بنیاتە ڕێکخراوەییە بکەین کەشێخ حەسەن ئەلبەننا دروستی کردبوو و زۆر بەسەرکەوتنێکی تەواویشەوە بنەماکانی دارشتبوو.

گەڕۆکەکان یەکەم کاری ڕێکخراوەیی تایبەت بوو کە پێکی هێنابوو، لەوانەشە لەسەرەتاوە هەوڵێك بووبێت ((بۆ گەلاڵەکردن))ی ئەو چالاکیە وەرزشیو کۆمەڵایەتییەی کەشێخ بایەخێکی زۆر گەورەی پێدەدا، وەکو پەیرەویکردنێکی ئەم فەرموودە پیرۆزە ((المؤمن القوي خير من المؤمن الضعيف)) (واتا بڕواداری بەهێز لەبڕواداری لاواز باشترە))

وە ئەم پەندە پڕمانایە ((العقل السليم في الجسم السليم (واتا ئەقڵی ساغ لەجەستەی ساغدایە))[١١٥].

دوابەدوای کۆنگرەی سێهەمی کۆمەڵەکەش (١٩٣٥)، بەشێوەیەکی چڕ بایەخ دان بەتیمە گەڕۆکەکان زیادی کرد .. وەکو ڕێکخستنێکی سەربەخۆش لەقەڵەم درا کەهەیکەلێکی سەربەخۆی هەبێتو ڕاستەوخۆ سەر بەمەڵبەندی گشتی بێت .. ڕەنگە لەوکاتەشدا جێگای بایەخ پێدانێکی زیاتربووبێت لەلایەن شێخەوە، چونکە کراسە هەمەڕەنگەکان - سەوز ((میسر ئەلفەتات))و شین (وەفد)- شەقامەکانی قاهیرەو شارەکانی

---

[١١٥] محمد شوقي زكي، المرجع السابق، ص١٢١.

دیکەشیان پڕکردبوو، ئەمەش ڕقەبەریایەتی و بەرپەرچدانەوەیەکی سیاسی بوو بەکار دەهێنرا.

کۆمەڵی ئیخوانیش بێ گومان دەبووا تیمێکی بەرپەرچدانەوەی تایبەت بەخۆی هەبووایە .. پێدەچێت شێخیش لەم مەسەلەیەدا لەهەموو سەرکردە سیاسییە میسریەکانی دیکە کارامەتر بووبێت.

لەساڵی (١٩٣٩)شدا شێخ یەکێك لەدڵسۆزترین پیاوەکانی - کە مەحمود لەبیب بوو (پێشتر ئەفسەربوو لەسوپادا)- کردە سەرکردەی گشتیی تیمی گەڕۆکەکان و ئەنجوومەنێکی سەرکردایەتیشی لەحەوت کەس بۆ پێك هێنا.

بەکورتی تیمە گەڕۆکەکان ئەو دەفرە بوو کەدڵسۆزترین و بەئەمەکترین گەنجەکانی کۆمەڵەکەی دەگرتەخۆی.. خۆشەی دەکردن و مەشقی پێ دەکردن، بەگوێڕایەڵیی تەواوو دڵسۆزیی ڕەهاش ڕایدەهێنان .. پێدەچێت شێخیش لەو کاتەدا کەلایەکانی ئەم دەفرەی دادەڕشت، زانیبێتی هەنگاوێکی دیکەی لەپێشەوەیە، ئەویش هەڵبژاردنی دڵسۆزترینی ئەم دڵسۆزانەو.. چالاکترینی ئەم چالاکانەیە لەدەفرێکی تەواو نهێنیدا کەبریتییەلە ((دەزگای تایبەت (الجهاز الخاص))).. بەڵام ئەمە چیرۆکێکی دیکەی هەیە.

گرنگ ئەوەیە تیمە گەڕۆکەکان چالاك بوون، هەروەها کارەکانیشیان درێژبووە وە بۆناو چەندەها بوار لەشارو گوندەکاندا، هەر لەنەهێشتنی نەخوێندەواری و کۆلێراو خزمەتکردنی ژینگەوە هەتا بەرپەرچدانەوەی

نەیارە سیاسییەکان، تا بەشداری کردن لەئاهەنگە گشتیەکاندا وەکو سوپایەکی تایبەت بەئیخوان موسلیمین .. لەساڵی (١٩٤٨)یشدا ژمارەی ئەندامانی تیمی گەڕۆکەکانی ئیخوان موسلیمین چل هەزار ئەندام بوو.

ئەم تیمانەش بووەهۆی دروست بوونی گفتوگۆو دەمبەدەمەیەکی زۆر.. دەستەی گشتی (الکشافة)لەسەرەتادا ڕێگری لەچالاکییەکانیان دەکرد، بەوەی یاسای کەشافە جەخت لەسەر ئەوەدەکات کە ئەو کەسەی ((کەشافە))یە پەیوەندیی نیە بەسیاسەتەوەو خۆی لێ نادات.. حیزبەکانی دیکەش ڕێگریان لێ دەکردو لەڕووی ڕێکخستنیشەوە وەکو پەیڕەوو پرۆگرامێکی ((فاشیست))لەقەڵەمیان دەدا.

بەڵام سەرەڕای ئەمەش، ئیمام سەرکەوتنی لەوەدا بەدەست هێنا کەگەنجەکانی کۆمەڵەکەی لەشێوەو وێنەیەکی جواندا بخاتەڕوو، بەردەوامیش ئەمانە پەرۆشی خزمەت کردنی جەماوەر بوون. بەشێوەیەکی کرداریش لەکاتی نەهامەتیو بەڵا گشتیەکاندا، وەك بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کۆلێراو مەلاریا، خزمەتێکی بەبایەخو تایبەتیان پێشکەش بەخەڵك کرد.

لەگەڵ ((گەڕۆکەکان))یشدا ((کەتیبەکان))یش هەبوون.. ((کتائب انصار الله)). گەڕۆکەکان بۆ وەرزشو لاوانو خزمەتی گشتی، بەڵام ((کەتیبەکان))ئەوا چەند کۆمەڵێکنو هەریەکەشیان چل ئەندامی چالاکی کۆمەڵەکە دەگرێتەخۆی.. هەفتەی شەوێکیش کۆدەبنەوەو زۆربەی کاتی شەوەکەش بەعیبادەتو خوێندنەوەی قورئانو.. تەفسیرکردنیو ویردو

دوعا خوێندن بەسەر دەبەن. ئەو ئامانجە بنەڕەتیەش کەشێخ لەم کەتیبانەدا هەیبوو، ئەوەبوو کەئەندامەکە بەکۆمەڵەکەوە ببەستێتەوەو پەیوەندیەکەشی لە ((ئینتیما))وە بۆ پەیوەندی ((ئیمان))پەرەپێبدات، بەوەی کە کەسەکە لەناویانداو لەڕیزەکانیاندا عیبادەتو خواپەرستی بکات.. ڕەنگە بیرۆکەی ئەم شەوکۆبوونەوە ئایینیانەش، کەپڕبوو لەخواپەرستیی چڕ، لەوەوە بۆ شێخ هاتبێت کەخۆی لەپێشدا سەربە سۆفییەکان بوو.. هەروەها کەتیبەکان دەفرێك بوو کەشێخ پیاوەکانی خۆی تێدا تاقی کردنەوە.. لەنێوانیشیاندا ئەوانەی جیادەکردەوە کەلەهەموو ئەوانەی دیکە دڵسۆزترو بەئەمەکترن.. دروشمی کەتیبەکانیش ئەمەبوو ((کار - گوێڕایەڵی - بێدەنگی))[116].. بەڵام بۆ ((بێدەنگی))...؟ چ پێویست بەبێدەنگی دەکات لەشەوانێکدا کەتەنها پەرستنو زیکری خوای تێدایە.. پێدەچێت کابرا خەریکی هەڵبژاردنی پیاوانێك بووبێت لەدڵسۆزترین دڵسۆزەکانی بۆ کارێکی نوێ، کە ڕەنگە ((دەزگای تایبەت)) بێت.

پاش ماوەیەکیش.. مەبەستی (کتائب انصارالله) سەبارەت بەڕێکخەرە کارامەکەی تەواو بوو، کەوای هەست دەکرد چەند کەسی ویستبێت هەڵیبژاردووە و.. کاتی ئەوەش هاتووە یاسایەك دابنێت کەهەموو

---

[116] الدعوة، ١٩٥١/٤/١٥.

ئەندامانی کۆمەڵەکە بگرێتەوە.. ژمارەشیان گەیشتبووە چەند سەد هەزارێك، یاساکەش ((یاسای خێزانەکان (نظام الاسر) ))بوو.

جێ بەجێ کردنی ئەم یاسایەش لەساڵی (١٩٤٣)دا دەستی پێکرد، ئەویش لەسایەی زۆربوونی ئەندامانی کۆمەڵەکەو ئەو فشارانەی لەکاتی جەنگی جیهانیدا کەوتەسەری.[١١٧] لەسەرەتاشدا ناوی نرا ((نظام الاسر التعاوني))پاشان ناوەکەی بووە ((نظام الاسر)). ئەم بیرۆکەیەش کەبەننا دایناوە، لەسەر بنەمایەکە دەوەستێت کەبریتیە لەکۆکردنەوەی ئەندامە چالاکەکانی هەر شوعبەیەكو کردنیان بۆ چەند کۆمەڵێك کەهەرکۆمەڵەی لەپێنج ئەندام زیاتر نەبێت لەپاشان بووە بەدە)[١١٨] و پێی دەوترێت ((خێزان))، هەرخێزانەش سەرۆکێك هەڵدەبژێرێت کەپێی دەوترێت ((نەقیب))و هەڵدەستێت بەنوێنەرایەتی کردنی کۆمەڵەکەی لەبەردەم سەرکردایەتی لقدا.

خێزانیش بەیەکەیەکی کامڵ لەقەڵەم دەدرێتو بەشێوەیەکی کۆمەڵیش بەرپرسیارن لەو ئەرکەی کەپێیان ڕادەسپێردرێت. بەچوار خێزانیش ((عشیرة))یێك پێك دەهێنن کە ((نەقیب))ی خێزانی یەکەم خێزانەکانی

---

(117) Mitchell- op. P. 196.

(١١٨) نظام الاسر انشأته واهدافه، ص١٨.

عەشیرەتەکە سەرکردایەتیان دەکات. هەر پێنج عەشیرەتیش ((رهط))ێك پێك دەهێنن و ((کەتیبە))ش پێنج ((رهط))دەگرێتەخۆی[119].

بەم شێوەیەش بەننا گەیشتە ئەو ئاواتە ڕێکخراوەییەی کەدەیویست و.. خەوی پێوەدەبینی، چونکە یاسای خێزانەکان لەوەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا کەهەموو کۆمەڵەکە بکاتە تۆڕێك کەئەڵقەکانی بەیەکگەیشتبن و کاروکاردانەوەکانی توندوتۆڵ بن، توانای ئەوەشی هەبێت کە - ڕاستەوخۆو بەپەلە- وەڵامی ئیرشادات و ڕێنماییەکانی سەرۆك بداتەوە .. لەمەڵبەندی گشتیشدا ((بەشی خێزانەکان)) لەژێر چاودێری ڕاستەوخۆی ((مورشید))دابوو، بزووتنەوەی ((خێزانەکان))یش بەهێزترین دەزگای کۆمەڵەکە بوو .. بەڵکو بەهێزترین دەزگای سیاسی ڕێکخراویش بوو لەهەموو میسردا.

خێزانیش هەفتانە کۆبوونەوە دەبەستن و پێکەوە عیبادەت دەکەن و قورئان و دوعا دەخوێنن، هەر ئەندامەش حسابی چالاکی و کارو پارەو دارایی خۆی پێشکەش دەکات. بەنناش هانی ئیخوانی دەدا ((کەپەیوەندیی برایەتیەکەیان لەچوارچێوەی خێزانە ئیخوانیەکەدا بەهێزبکەن))، بەوەی کەکۆبوونەوە هەفتانەکانی ((خێزان))لەدەرەوەی لقەکە ببەسترێت و باشتریش وایە کەبەنۆرە هەرجارە لەماڵی یەکێك لەئەندامانی خێزانەکەدا

(119) المرجع السابق، ص ١٨.

ببەسترێت. بەپێچەوانەی کۆبوونەوە هەفتانەکانیشەوە خێزان پێویست بوو لەسەری کەهەموو مانگێك شەو کۆبوونەوەیەکی ئیسلامیانە ڕێکبخات.. وا باشتریش بوو کەلەشوێنێکی چۆڵدا بەسەری ببات، هەر لەوێ بخەون و ویردو دوعا بخوێنن و پێکەوە نوێژبکەن و نان و خواردن بخۆن. خێزانیش نوێژی هەینی بەیەکەوە بکەن و کێشەو گرفتە پارەو ماددیەکانیشیان لەناو خۆیاندا چارەسەربکەن، لەسەر بنەمای یاسای ((التکافل))*ی ئیسلامی، ئەویش بەوەی خێزانەکە سندوقێکی هەرەوەزی هەبێت بۆ لەخۆگرتنی ئەو یارمەتی و بەخشینانەی کەئەندامەکان پێشکەشی دەکەن، خێزانەکەش (پێنج یەکی)ی دەسکەوتەکانی بنێرێت بۆ لقەکە، تا پرۆژە کۆمەڵایەتیەکانی لقی پێ بەڕێوەببرێت.

((بەننا))ش زۆر بەپەرۆشی بەهێزکردنی یاسای ((خێزانەکان))بوو، وەکو شێوازێك بۆ بەستنەوەی ئەندامەکە بەکۆمەڵەکەوە، نەك تەنها لەڕووی سیاسیەوە، بەڵکو لەڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووریشەوە.. چونکە ((بەننا))دەیویست کۆمەڵەکە ببێتە پشت و پەناو قەڵغان و هیواو ئاواتی ئەندامەکەو خێزانەکەشی. هەمیشە ئەوەشی دەگێڕایەوە کەچۆن یەکێك لەئەندامەکانی کۆمەڵەکە سەرچاوەی بژێویەکەی لەدەست داو یەکێك لەبراکانی ((خێزان))ەکە ((نیوەی مووچەکەی خۆی دایە، کاتێکیش لێیان پرسی: چۆن بەنیو مووچە دەژیت؟ وەڵامی دایەوە: ئەی چۆن براکەم بێ کارو بژێوی دەژی؟)).

بەنناش ئامۆژگـاریی ئیخوانـی دەکـرد کەیاسـای ((خێزانـەکان))لەسـەر بنـەمای سـێ کۆمەڵەکـە دروسـت بکـەن: یەکترناسـین- گونجـان و لەیـەك گەیشتن- تەکافول- وەکو پەیڕەویکردنێکی ئەم ئایەتە پیرۆزە ((واعتصموا بحبـل الله جمیعـا ولا تفرقـوا)) و ئـەم فـەرموودە پـیرۆزە ((المؤمـن للمؤمـن کالبنیان یشد بعضه بعضا))[١٢٠].

لێهاتوویی بـەنناش، وەکـو ڕێکخـەرێك، لـەوەدا دەردەکـەوێت کەهـەموو ئـەندامێکی بەکۆمەڵەکـەو ئامانجەکانیـەوە بەسـتبۆوەو .. تواناشـی پـێ بەخشیبوون کەلەچوارچێوەی کۆمەڵەکەدا کاربکـەن.(ئیخوانگـەری)ش ببـووە شێوازێك بۆ ژیان.[١٢١]

بەم شێوەیە سوپاکە ئامـادە دەبێـت .. ئەندامـەکان لـە((خێزانـەکان))دا ڕێکخراون و بەستەرێکی توندیش بەمورشیدەوە دەیانبەستێتەوە، لاوە زیاتر چوسـت و چالاکـەکان و زیـاتر دڵسـۆزەکانیش لەتیمـە ((گەڕۆکـەکان))دا ڕێکخـراون، مەشـق دەکـەن و فـێری گوێڕایـەڵی تـەواوو فیداکـاری دەبـن لەبەیعەکەیاندا بۆ مورشید، لەسەر ئەمانەشەوە ((دەزگای تایبەت))ی مەشق پێکـراوو پڕچـەك هـەبوو کـەزۆر چـاك ئامـادەکرابوو، تـا ببێتـە ئـامرازێکی

---

[١٢٠] المرجع السابق، ص ١٥.

[١٢١] رضوان محمد رضوان، المأثورات.

بەرپەرچدانەوە، کەسیش هیچی لەبارەی ئەم دەزگایەوە نەدەزانی جگە لەخودی مورشید خۆی.. بەمەش مورشید بەتەواوەتی دەست بەسەر هەموو کۆمەڵەکەدا دەگرێت.

.. هەرچەندە کەهەندێك کەس بەگاڵتەجارییەوە دەیانگوت .. ((ئەگەر ئیمام لەقاهیرە بپژمیایە .. ئیخوانەکان لەهەموو میسردا دەیانگوت .. (یرحمکم الله)))... بەڵام گاڵتەکە ڕاست دەرچوو.

ئینجا ئەرك‌و بایەخدانەکانی بەننا گەیشتە ئەو بوارەی کەبەلای هەر مسوڵمانێکی ((سەلەفی))ەوە قورسە .. ئەویش بریتییە لەکارکردنی نێو ئافرەتان‌و ڕێکخستنیان. هەر لەسەرەتاوە لەئیسماعیلیە بەننا بایەخی دەدا بەکارکردن لەنێو ((خوشکان))دا. لەگەڵ ئەوەشدا کە سووربوو لەسەر ((حیجاب))و بەزەروریشی دەزانی کە ((ئافرەت لەماڵەوە جێگیربێت))، بەڵام هەر هەوڵی دەدا کەجێ پێیەك بۆ کۆمەڵەکەی لەنێو بزووتنەوەی ژناندا بکاتەوە. چونکە بەننا بەبەردەوامی جەختی لەسەر گرنگی ئەو ڕۆڵە دەکرد کە ((خێزانی مسوڵمان))لەپەروەردەکردنی نەوەیەکی مسوڵماندا دەیبینێت،

---

((التكافل)) واتە (زامن کردن – گرتنە ئەستۆ – ئۆباڵداری) لە (منجد في اللغه ((الاعلام)) دا بەم شێوەیە هاتووە کفل: عاله اتفق علیه وقام بأمره.. تکافل القوم، کفل بعضهم بعضا.(وەرگێڕی کوردی).

ئەی چۆن تەسەوری ((خێزانێکی مسولْمان))دەکرێت بەبێ ((خوشکانی مسولْمان))؟.

بەم شێوەیەش لەکاتێکدا کەهێشتا هەر لەئیسماعیلیە بوو،یەکێك لەپرۆژە سەرەتاییەکانی بریتی بوو لەدامەزراندنی ((مدرسة امهات المسلمین))، لە نیسانی (١٩٣٣)شدا ئەم قوتابخانەیە بووە یەکەمین لقی ڕەسمی بۆ خوشکانی مسولْمان)).[١٢٢]

ئاراستە سەلەفیەکانی کۆمەڵەکەش بەرامبەر مەسەلەی سەربەخۆیی ئافرەتو مافی کارکردنیانو بەرامبەر حیجابو مەسەلەی ئەحواڵی شەخسی، بەبەردەوامی ئاستەنگ بوو لەبەردەم زانستو خوێندنی ژناندا. هەروەها بەرگری کردنو بێزاری هەندێك ئەندامانی کۆمەڵەکەش، سەبارەت بە کارکردن لەنێو ((ژنان))دا، بەهەمان شێوە هەر ئاستەنگ بوو. بەم شێوەیە دە ساڵی تەواو بەسەر دەمەزراندنی لقی یەکەمی خوشکانی مسولْماندا تێپەڕی لەئیسماعیلیە، بێ ئەوەی سەرکردایەتیەکی ناوەندی ((بۆخوشکانی مسولْمان))لەمەڵبەندی گشتیدا دروست بکرێت .. پاڵنانێکی تایبەتیش لەلایەن شێخ بەنناوە، خوشکانی مسولْمان سەرکەوتنێکیان بەدەست هێنا کەبەپێی پێودانگەکانی چلەکانو پێودانگەکانی کاری ژنان بەگەورەتر لەگەورە لەقەڵەم دەدرێت .. چونکە ژمارەی خوشکانی مسولْمان لەساڵی

---

[١٢٢] احمد انس الحجاجي، روح وريحان – المرجع السابق ص ٢٠٠.

(١٩٤٨)دا گەیشتە نمرەیەکی زۆر بەرز کەپێنج هەزار ئەندام بوو[١٢٣]. بەڵام تێبینیەکی گرنگ هەیە، ئەویش ئەوەیە کەلەگەڵ ئەوەشدا ئیخون لەچلەکاندا سەرکەوتنێکی زۆر گەورە یان لەنێوان قوتابیانی زانکۆکاندا بەدەست هێنابوو، بەلام ژمارەی قوتابیە موحەجەبەکان لەزانکۆدا بەڕادەیەکی سەرنج ڕاکێش کەم بوو .. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ((کچە خوێندەوارەکان بۆچوونیان وابووە کەبانگەشەی ئیخوان بانگەشەیەکی سەلەفیەو ئافرەت دەگێڕێتەوە بۆ سەردەمی (الحریم)*))[١٢٤].

لەڕۆژەکانی ((نەهامەتیەکەی یەکەم))یشدا (١٩٤٨-١٩٥٠)، خوشکانی مسوڵمان ڕۆڵێکی بەبایەخیان بینی، لەسەرپەرشتی کردنی خێزانی گیراوو دەستبەسەرەکانداو لەدابین کردنی پەیوەندیی لەنێوان زیندانیەکانی ئیخوان لەزیندانە جیاجیاکانداو خێزانەکانیاندا، هەروەها لەدابین کردنی نێوان زیندانیەکان و ئەو ئیخوانیانەی دیکەدا کەلەدەرەوە بوون.

لەڕیزەکانی خوشکانی مسوڵمانیشدا چەند ناوێك درەوشانەوە .. یەکێك لەم ناوانەش (زەینەب ئەلغەزالی)بەدەرکەوت.. تالەترۆپکی سەرکردایەتی بانگەشەکەدا بدرەوشێتەوە.

---

[١٢٣] لمزيد من التفاصيل راجع: الاخوات المسلمات، الرسالة الاولى - القاهرة- ١٩٥١.

[124] Mitchell –op. Cit. P. 137.

لەو سەردەمەدا کەئافرەت بە (الحریم)ناوبراوە، ئافرەت وەکو موڵکێکی تایبەت بەپیاو سەیرکراوە، ئەوەش کەمکردنەوەیەکە بۆ بەها مرۆییەکان.

کاتێکیش سوپا خۆی بۆقۆناغی ((جێ بەجێ کردن))ئامادە دەکات، پێویستە دەزگایەکی ڕاگەیاندنی بەهێزی هەبێت تا ڕێگای بۆ خۆش بکات ئەرکەکەی بەجێ بگەیەنێت .. ئەو بەننایەش کەخۆرئاواو شارستانیەتو دەسکەوتەکانیشی ڕەت دەکردەوە، بەپەرۆشەوە ئیخوانەکانی ئامۆژگاری دەکرد کە((هونەرەکانی پڕوپاگەندە لەخۆرئاواوە فێربن)).[١٢٥]

ئەو چاپخانە بچکۆلەیەش کە بەننا پێش کۆنگرەی دووەم دایمەزراندبوو، هەر بەردەوام بوو لەسەر چاپکردنی پەیامەکانی بەننا بۆ ئیخوان. ئەمەش ببووە چەکێکی ئیعلامی، کەبالادەستیی فیکریی بەسەر کۆمەڵەکەدا بۆ شێخ بەدی دەهێناو .. هەروەها بالادەستیی فیکریی کۆمەڵەکەشی بەسەر چەندکەرتێکی گەورە لەتەوژمە ئیسلامیەکاندا بەدی دەهێنا .. وردە وردەش چاپخانە بچکۆلەکە، بەهۆی گرنگی پێدانی بەردەوامی مورشیدەوە پێشدەکەوێت، تا ببێتە یەکێك لەبەبایەخترین پڕۆژە ئابوریەکانی کۆمەڵەکە.[١٢٦]

لەگەڵ ئەوەشدا کەلەسەرەتاوە زۆر سادەبوو، بەڵام بەننا هەر سەرکەوت لەوەدا یەکەم گۆڤاری ئیخوانی دەربکاتو بانگەشەی بگەیەنێتە جەماوەر.. ئەویش گۆڤاری ((الاخوان المسلمون))ی هەفتانە بوو، کەبۆ ئەوە دەرچوو تا ڕایبگەیەنێت دەنگی بانگەشەو حەقو هێزو ئازادییە. گۆڤارەکەش هی

[١٢٥] حسن البنا، الرسائل الثلاث. ص ١١.

[١٢٦] الدعوة، ١٩٥٢/٢/١٢.

یەکێك لەو گەورە سەلەفیانە بوو کەکاریگەریەکی زۆر گەورەیان لەسەر شێخ هەبوو کاتێك قوتابی بوو.. ئەویش (شێخ موحیبەدین ئەلخەتیب)ی خاوەنی کتێبخانەی (سەلەفی)یە. شێخ حەسەن ئەلبەنناش تەنها بەو دوو جونەیەی لەگیرفانیدا بوو، توانی شێخ موحیبەدین ئەلخەتیب فریو بدات تا بەشداری لەدەرکردنی ئەم گۆڤارەدا بکات بەناوی ((کۆمەڵەکە))وە.. یەکەم ژمارەشی لەئاياری (١٩٣٣)دا دەرچوو، ئەمەش یەکەم گۆڤاری کۆمەڵەکە بوو، چوار ساڵی تەواویش بەردەوام بوو.[١٢٧]

لەگەڵ قۆناغی ((جێ بەجێ کردن))یشدا کۆمەڵەکە پێویستی بەچەکێکی ئیعلامی نوێ هەبوو .. ئەویش (النذیر)بوو کەتەنها ناوەکەی خۆی لەخۆیدا زۆری دەگەیاند، ئەمەش ((ڕاگەیاندن))ێکی ئاشکراو توندبوو لەشێخەوە بۆ هەموو سیاسیەکانی میسر، کە((ئیخوان موسلیمین))هاتووەتە گۆڕەپانی سیاسەتەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوانەدا کە لەکۆمەڵەکە جیادەبنەوە، ((ئەلنەزیر))یش خۆیو سەرنووسەرو خاوەن ئیمتیازیشی جیادەبێتەوە، تا لەساڵی (١٩٣٩)دا ببێتە زمان حاڵی ئەم کۆمەڵەی کە جیابوونەتەوەو ناوی خۆیان ناوە ((گەنجانی محەمەدی سەروەرمان)) (شباب سیدنا محمد)[١٢٨]. بەنناش ئەو پەیوەندییە توندوتۆڵە بەکار دەهێنێت کەلەگەڵ شێخ ڕەشید ڕەزاو

---

[127] Mitchell – op. Cit. P. 185.

[١٢٨] مذكرات الدعوة والداعية، ص ١٤٩.

خێزانەکەیدا هەیبوو، بۆئەوەی گۆڤاری ((ئەلمەنار))ی دەسکەوێت کەپاش مردنــی شــێخ ڕەشــید لەســاڵی (١٩٣٥)دا لــەکار کــەوتبوو. لەســاڵی (١٩٣٩)شەوە بەننا ئەو گۆڤارەی بەناوی کۆمەڵەکەیەوە بڵاوکردەوەو شەش ژمارەشی لێ دەرچوو.. تا حکومەت مۆڵەتی گۆڤارەکەی وەکو فشارێك بۆسەر کۆمــەڵی ئیخــوان هەڵوەشــاندنەوە، هــەروەها لەهــەمان کاتیشــدا حکومــەت گۆڤارێکی هەرێمیی دیکەشی هەڵوەشاندەوە کەبەناوی ((ئەلتەعاروف))ەوە بۆ کۆمەڵەکە دەردەچوو.[129]

بەڵام مانگی هەنگوینی بەپەلە دەگەڕێتەوە .. مورشیدیش ڕێچکەیەك بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ دەسەلاتدارانددا دەدۆزێتەوە.. لەساڵی (١٩٤٢)شداو وەکو بەشێکیش لەڕێکەوتنە گشتیەکەو وەکو دەربڕینێکیش لەڕێکەوتنێکی نوێ لەنێوان وەفدو ئیخواندا، سەرلەنوێ کۆمەڵەکە هەڵدەستێتەوە، تا لەئابی (١٩٤٢)دا گۆڤــارە هەفتانەکــەی ((ئیخــوان موســلیمون))دەربکاتــەوە، لەسەرەتاشدا هەموو دووهەفتە جارێك دەردەچوو .. لەئایاری (١٩٤٦)شدا ((ئیخوان موسلیمون))ڕۆژانە دەردەچوو .. دەرچوونیشی بەردەوام بوو تا کۆمەڵەکە لەکانونی دووەمی (١٩٤٨)دا هەڵوەشایەوە.

لەتشرینی دووەمــی (١٩٤٧)یشــدا، کۆمەڵەکــە گۆڤــارێکی مانگانــەی بــۆ لێکۆڵینــەوە ئیســلامیەکان بــەناوی ((ئەلشــیهاب))ەوە دەرکــرد، کــەزۆر لــە

[129] Heywarth – Dunne – Ibid. p. 57.

((مەنار))ەکەی شێخ ڕەشید ڕەزا دەچوو .. هەروەها کۆمەڵەکە گۆڤارێکی بۆ قوتابیانیش دەرکرد کەلەبنەڕەتدا بەسەر قوتابیانی زانکۆکاندا دابەش دەکرا.[١٣٠]

دیارە بەننا خوێندنی نوێی ڕەت دەکردەوەو بەرەنگدانەوەیەکی خۆرئاواییانەی ڕەتکراوەشی لەقەڵەم دەدا، کەقوتابیان فێری گومڕایی و عیلمانیەت دەکات. هەروەها خوێندنی ئەزهەریشی ڕەت دەکردەوە، بەوەی کەتەنها بریتیە لەدەرخ کردنی چەند بابەتێکی ئاینی، بەدەر لەبایەخ پێدانی ڕوحی و ویژدانی .. بۆیە خەونی بەجۆرێکی نوێی خوێندنەوە دەبینی. وەکو عادەتی خۆیشی لەکاتێکدا کەدەچێتە هەر بوارێکەوە، لەپێشدا بەپرۆژەیەکی بچکۆلە دەست پێدەکات، پاشان هێندە هەوڵ و کۆشش دەکات بەڕاددەیەك کەهەموو بچکۆلەیەك گەورەبکات.

دامەزراوە فێرکاریەکەی ئیخوانیش، لەڕۆژەکانی سەرەتای ئیسماعیلیەوە، نموونەیەك بوو بۆ جۆرێکی نوێی خوێندن کە ((ئیمام)) هێنابوویە کایەوە. ئامانجی ئەم جۆرە خوێندنەش بریتیە لەڕابوونی ئیسلام و .. ڕەخنەگرتن لەخوێندنی نوێ و هەڵوەشاندنەوەی گوایا ((خوێندنێکی عیلمانیە))[١٣١].

---

(130) Vati Kiotis – op. Cit. P. 361.

(131) Mitchell – op. Cit. P. 284.

لەساڵی (١٩٣٥)یشدا کۆمەڵەکە وەفدێکیان پێك هێنا بۆسەردانی سەرۆك وەزیران و وەزیری مەعاریفی گشتی و نوێنەری حیزبە سیاسیەکان، تا داوای ئەوەبکەن کە ڕاستکردنەوەیەکی بنەڕەتیی لەبنەماڵەکانی خوێندندا بکرێت، بەشێوەیەك کەلەسەر چەند بنەمایەکی ئیسلامیی ڕاستەقینە پێك بهێنرێت. کۆمەڵەکەش زیاتر لەجارێك ڕەخنە توندوتیژەکانی خۆیان بەرامبەر حکومەتی میسری تۆمار کردووە، لەبەرئەوەی حکومەتی وڵاتێکی مسوڵمانەو کەچی لەهەمان کاتیشدا ڕێگا بەنێردراوە مەسیحیەکان دەدات کەقوتابخانە بکەنەوە، هەروەها لەبەرئەوەیش کەقوتابخانە حکومیەکان مێژووی ئەوروپا دەخوێنن، نەك مێژووی ئیسلام.[١٣٢] تێبینی ئەوەش دەکرێت کەلەساڵی(١٩٤٨)دا، ڕۆژنامەکانی کۆمەڵەکەو لقەکانی، شەڕێکی سەختیان لەدژی قوتابخانە کاسۆلیکیەکان بەرپاکرد، (الأب هنري عيروط)یش نامەیەکی وەڵامدانەوەی ئەم هێرشانەی بۆ ڕۆژنامەکەی ئیخوان موسلیمین نارد، بەڵام ڕۆژنامەکە ئەم نامەیەی بڵاونەکردەوە. لەکۆتایشدا (هنری عیروط) توانی دیداری شێخ حەسەن ئەلبەننا بکات، ڕۆژنامەی ((ئیخوان موسلیمون))یش بابەتێکی لەبارەی ئەم دیدارەوە بڵاوکردەوە، کە تەوەرەکەی بریتی بوو لەزەرورەتی یەکگرتنی پیاوانی ئاینەکان دژی بێ باوەڕیو بێ باوەڕەکان.[١٣٣]

---

[١٣٢] حسن البنا، الرسائل الثلاث. ص١١٧.

[١٣٣] الاخوان المسلمون، ١٩٤٨/٨/٥.

لەساڵی (١٩٣٨)یشدا، کاتێك وەزیری مەعاریفی گشتی داوای لەشێخی ئەزهەر کرد کەڕاپۆرتێك لەبارەی یەکانگیرکردنی هەردوو ڕژێمی خوێندنی ((ئەزهەری و نوێ))وە بنووسێت، حەسەن ئەلبەننا بەڕاپۆرتێکی دووردرێژ بەشداریی لەم مەسەلەیەدا کرد.

ڕاپۆرتەکەشی لەشێوەی نامەیەکدا بۆ وەزیر ناردو تیایدا جەختی لەسەرئەوە کرد، کە ((عیلمانیەت))هەرەس ناهێنێت ئەگەر پیاوانی ئایین بەتەواوی شارەزای لقە جۆراجۆرەکانی زانستو زانیاری نەبن. پاشانیش بەننا دووپاتی کردەوە کەخوێندنێکی ئیسلامیانەی پوخت یان عیلمانی پوختی ناوێت، بەڵکو تێکەڵەیەکی لەهەردووکیان دەوێت.[١٣٤]

لە ساڵی (١٩٤٦)یشدا بەننا بایەخێکی تایبەتی دەدا بەتۆڕی خوێندنی ئیخوانی، بەوەی کە((لیژنە))ی دامەزراندنی قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندییەکانی کوڕانو کچان پێك هات، ((پاشان لیژنەی کاروباری ڕۆشنبیریش پێك هات))[١٣٥].

بەنناش کەوتە داواکردنی یارمەتی لەلایەنگرەکانی.. یارمەتیەکانیش داباری.. سەرنجیش دەدرێت کە یەکێك لەلیستەکان یارمەتیەکی تێدایە بەبڕی پێنج هەزار جونەی، لەگەڵ پەیمانێکیشدا کەبریتییە لەهەزار جونەی

[١٣٤] الاخوان المسلمون، ١٩٤٦/٧/١٧.

[١٣٥] الاخوان المسلمون، ١٩٤٦/٧/١٠.

بۆهەر قوتابخانەیەك کەکۆمەڵەکە دایبمەزرێنێت.. لەساڵی (١٩٤٦)یشدا وەزیری مەعاریف (محمد حسن العشماوی)کەهاوڕێیەکی نزیکی شێخ حەسەن ئەلبەننا بوو، نامەیەکی ڕەسمی بۆ کۆمەڵەکە ناردو داوای ئەوەی لێکردن کەبەشداری لەپرۆژەکانی وەزارەتدا بکەن، سەبارەت بەنەهێشتنی نەخوێندەواریو گشتاندنی خوێندن. وەزارەتیش کۆمەکێکی پێشکەش بەکۆمەڵەکە کرد کەبریتی بوو لەبڕی (٧٥)قرش بەرامبەر هەر قوتابییەك کەلەقوتابخانەی کۆمەڵەکەدا بخوێنێت، پاشان کتێبو پێویستیەکانی دیکەی قوتابخانەش بەخۆڕایی پێشکەش کردن. پاش ئەمەش وەزارەت بڕیاریدا کەخەرجی ئەم قوتابخانانە بەتەواوی دەستەبەربکات.. ئەم یارمەتیانەش بووە پشتگیرییەك بۆ بودجەی تۆڕی خوێندنی ئیخوانیو، جگە لەمەش دانپیانانێکی ڕەسمیش بوو. لەپاشاندا بەننا کەوتە دامەزراندنی چەند کۆمپانیایەکی بەشدار بۆ قوتابخانە دامەزراندن، هەروەها ئەم بیرۆکەیەش بەهەمان شێوە سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

تۆڕی قوتابخانە ئیخوانیەکانیش بەڕاددەیەك فراوانبوو کەشێخ حەسەن ئەلبەننا دووپاتی دەکردەوە، هەر لقێك لەدووهەزار لقەکەی، قوتابخانەیەك یان زیاتری دامەزراندبوو.[١٣٦]پێویستە لەسەریشمان بزانین ئەمە چەند

---

[١٣٦] حسن البنا، قول الفصل- ص٣٤.

کاریگەری هەبووە لەسەربڵاوبوونەوەو سەنگی کۆمەڵەکە لەناو ڕیزەکانی قوتابیان و بەخێوکەرەکانیان و مامۆستاکاندا.

... هەروەها کۆمەڵەکە بەشداریی لەبوارە جۆراو جۆرەکانی چالاکیە کۆمەلایەتیەکانیشدا کرد .. باسی ڕۆڵی تیمە گەڕۆکەکانیشمان کرد لەبەرەنگاربوونەوەی مەلاریاو کۆلێرادا. هەروەها لەساڵی (١٩٤٤)دا بەننا ڕێنمایی کۆمەڵەکەی کرد، بۆ دروست کردنی بەشێکی پزیشکی .. پاشان شێخ بەننا عەیادەیەکی پزیشکی و دەرمانخانەیەك و نەخۆشخانەیەکی بچکۆلەشی کردەوە کەژمارەی ئەوانەی سەردانیان کردبوو لەساڵی (١٩٤٧)دا گەیشتبووە (٥١٣٠٠)نەخۆش، بودجەی بەشی پزیشکیش لەساڵی (١٩٤٨)دا گەیشتبووە (٢٣٠٠٠)جونەی.

لەبواری خزمەتگوزاریە کۆمەلایەتیەکانیشدا، کۆمەڵەکە چالاکیەکی بەرچاوی هەبووە.

لەساڵی (١٩٤٦)یشدا (١٠٢)لقیان هەبوو بۆ خزمەتە کۆمەلایەتیەکان و لەساڵی (١٩٤٨)یشدا زیادی کردو بووە (٥٠٠)لق.

بۆئەوەی ئەم لقانەش بتوانن سوود لەو یارمەتییە مادديە گەورانە وەربگرن کەوەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی پێشکەش بەم جۆرە چالاکیانەی

دەكات- كەبەپێی یاسا نابێت سەر بەهیچ كۆمەڵێكی سیاسی بن -، كۆمەڵەكە لقێكی سەربەخۆی كردەوە، بۆسەرپەرشتی كردنی ئەم چالاكیە.

بەم شێوەیەش دەستی كۆمەڵەكە گەیشتە لایەنە جۆراوجۆرەكانی ژیان لەكۆمەڵگەی میسریدا، دامەزراوە فێركاریو تەندروستیو كۆمەڵایەتیەكانیشی بوونە چەند كۆڵەكەیەكی زۆر بەبایەخ، كەپلەوپایەی كۆمەڵەكەیان پتەودەكردو پشتگیریی داراییەكەشیان دەكرد، هەروەها ڕەگەكانی كرمەڵەكەشیان، لەنێو جەماوەردا بەهێزتر دەكرد.

پرسیارە سەر سورهێنەرو گرنگەكەش ئەمەیە: چۆن بەننا دەیتوانی ئەم هەموو پرۆژانە دابین بكات .. چۆن دەیتوانی سەرچاوەی ماددی پێویست بۆ كۆمەڵێك دابین بكات كەلقەكانی هەموو ناوچەكانی میسریان داپۆشیبوو .. هەروەها بۆ تیمە گەڕۆكەكانیش، جلو بەرگو پێداویستیەكانیشیان، بۆ قوتابخانەكانیش، بۆ نەخۆشخانەو كارگەو كۆمپانیاو دامەزراوەكانیش .. هەروەها بۆ ئەم هەموو سیاسەتمەدارو بەڕێوەبەرە بێ كارو بەتاڵانەش .. لەسەرو هەموو ئەمانەشەوە .. بۆ دەزگای نهێنی، بەخۆیو حەشارگەو چەكو ئەندامانیشیەوە.

لەكاتێكیشدا كەبڕیاری هەڵوەشاندنەوەی كۆمەڵەكە دەرچوو، هەموان تێبینی ئەوەیان كرد كەكۆی گشتی موڵكەكانی كۆمەڵەكە .. لەماڵو لقو

کـــەل‌و پـــەل‌و کۆمپانیـــاو قوتابخانـــەو کارگـــەو کێڵگـــەو دوکـــان‌و نەخۆشـخانەکان‌و.. هتـد، گەیشـتبووە ژمارەیـەك کەسـەبارەت بـەحیزبێکی سیاسی - جەماوەری هەرچەندێك بێت - ژمارەیـەکی خەیاڵیـە، بەتایبـەتیش ئەگەر حیزبەکە پێکهاتەی چینایەتی ئەندامەکانی وردەبۆرژوازی (قوتابیـان، جووتیاران،پیشـەگەران، فەرمانبـەرە بچووکـەکان)بێـت، ئەمانـەش هـەموویان لەئاستێکی ماددی وادانین کەئەم خەرجیانەیان پێ دابین بکرێت.

هەر لەسەرەتاشەوە ئێمە سەرنجی زنجیرەیەك نیشانەی پرسیار دەدەین:

* یارمەتیەکەی کۆمپانیای سوێسی ئیستیعماری بۆکۆمەڵەکە (ئەمەش شێخ حەسەن ئەلبەننا خۆی باسی کردووەو دووپاتی کردۆتەوە).

* دانپیانانەکـــەی شـــێخ بـــەننا، کەئیســـماعیل ســـدقی گفتـــی دابوویـــە، یارمەتیەکی ماددی بداتێ بەرامبەر ئەوەی کۆمەڵەکە چەند کارێکی سیاسـی بۆبکات (هەرچەندە کەبەنناش جەختی لەسـەر ئەوەدەکرد ئەم یارمەتیـەی قبوڵ نەکردووە).

* لەزۆربەی ئەو ناکۆکیانەدا کەلەنێو ڕیزەکانی کۆمەڵەکەدا دروست بوون، بابەتی دابین کردنی ماددی‌و سەرچاوەکانی، پێناوێك بوو بۆ هێرش کردنـە سەر شێخی بەننا (هەرلە جیابوونەوەکەی ئیسماعیلیەوە تا جیابوونەوەی

(شباب سيدنا محمد)و پاشان جیابوونەوەی ئەلسوکەری مەسەلە ماددیەکان توخمێکی هاوبەش بوو).

* شێخ بەننا کەبالادەستی خۆی بەسەر هەموو ڕووەکانی چالاکی کۆمەڵەکەدا سەپاندبوو، بەتەواوی و بەشێوەیەکی تایبەت مەسەلەی ماددەو دارایی بەتەنها پەیوەست کردبوو بەخودی خۆیەوە.

* زۆربەی ئەو هەڵمەتی یارمەتی و کۆمەکانەی کەبەننا ڕێکی دەخستن، خێراو بەپەلەدەستەبەر دەبوون .. هەروەها بەتوانابەکیشەوە کەزیاتر بوو لەتوانا ماددیە دیاری کراوەکانی ئەندامەکان، کەزۆربەی زۆریان دەسکەوتێکی سنوورداریان هەبوو.. زۆرلە دەرەبەگو سەرمایەدارەکانیش، چەندەها یارمەتی ماددی و کرداریان پێشکەش بەکۆمەڵەکە کردبوو، ئەمەشیان بەوە پاساو دەدایەوە گوایا هانی کۆمەڵەکە دەدەن بۆدژایەتی کردنی شیوعیەت[١٣٧].

* ژمارەیەکی زۆریش تاوانبارکردن دووبارە دەبوونەوە گوایا دەسگیرۆییەکی تایبەتی، جارێك لەلایەن ئینگلیزەوە، جارێکی تریش لەلایەن ئەمریکیەکانەوە، دراوەتە کۆمەڵەکە.[١٣٨]

---

(137) Mitchell-op. C.t. p. 182.

(138) Ibid –p. 182.

لەگەڵ ئەوەشدا کەلەچەندەها توێژینەوەو سەچاوەدا تاوانبارکردنەکان زۆر باسکراون.. بەڵام توێژەری وردو بەدیقەت ئەگەر وەڵامێکی ڕاستیشمان دەست نەکەوت، ئەوا هێندەی بەسە کەئەم پرسیارانە بکات .. هەروەها ئەم پرسیارەش بەبەردەوامی لەگەڵیدا بخاتەڕوو: کەواتە ئەم هەموو دابین کردن و پارە هەڵقولاوە لەکوێوەیە؟

بۆئەوەیش کەدڵنیابین ئەم پرسیارەی کۆتایی بەتەواوی لەشوێنی خۆیدا، هێندە بەسە کەچەند نموونەیەك لەکۆمپانیا بەرهەم هێنەکانی کۆمەڵی ئیخوان بخەینەڕوو:

ـ کۆمپانیای ڕۆژنامەگەری ئیخوان، کەسەرمایەکەی (٥٠)هەزار جونەی بووە.

ـ کۆمپانیای چاپەمەی ئیخوان، کە سەرمایەکەی (٧٠)هەزار جونەی بووە.

ـ کۆمپانیای ریکلامی عەرەبی، دەگوترێت سەرمایەکەی گەیشتبووە (١٠٠)هەزار جونەی.[١٣٩]

ـ کۆمپانیای مامەڵە ئیسلامیەکان، سەرمایەکەی لەساڵی (١٩٤٦)دا گەیشتبووە (٣٠)هەزار جونەی.[١٤٠]

---

[139] Heyworth – Dunne- Ibide. 57.

[140] Mitchell- op. cit. p. 275.

ـ کۆمپانیای عەرەبی کانگەو کانە بەردەکان، کەسەرمایەکەی (٦٠)هەزار جونەی بووە.

ـ کۆمپانیای ڕستن و چنینی ئیخوان موسلیمین، کەسەرمایەکەی (٨)هەزار جونەی بووە.

ـ کۆمپانیای بازرگانی و کارە ئەندازیارییەکان، کەسەرمایەکەی (١٤)هەزار جونەی بووە.[١٤١]

ـ کۆمپانیای بریکارە بازرگانییەکان لەسوێس (نەگەیشتینە ژمارەی سەرمایەکەی).

ـ کۆمپانیای چێنگەی عەرکی (خاوەنی ٨٠٠ فەدان بوو)[١٤٢]

کۆمەڵەکە ئەم هەموو ملك وماڵەی لەکوێوە هێناوە؟

ئەمە پرسیارێکە خۆی دەسەپێنێت.. ژمارەکان زۆر گەورەن، بەتایبەتی ئەگەر موڵکەکانی دیکەشی بخەینەسەر، وەك قوتابخانەو بارەگاو کارگەکان و... هتد.

وەڵامدانەوەی ڕاستەوخۆش قورسە.. تەنها لەکاتێکدا نەبێت، ئەگەر توێژەر ئەو ئازایەتیەی هەبێت کەچەند حوکمێکی یەکلاکەرەوەیی

(141) Mitcell- op. Cit. P. 275.

(١٤٢) المصور، ١٩٥٥/١١/١١.

دەربكات و بەتەنهاش پشت ئەستوربێت بەشوبهەو گومانە بەهێزەکان.

هیچیشمان لەبەردەم دا نییە تەنیا ئەوە نەبێت کەبەردەوام بین لەسەر توێژینەوەکە.. بەڵکو لەبەشێکی داهاتوودا ڕووناکیەکی زیاتر بدۆزینەوە، تا بیخەینە سەر ئەم ناوچە ((تاریك))ە لەمێژووی کابراو مێژووی کۆمەڵەکەدا.

# بەشی سێیەم

## بەرزبوونەوەکە .. وەکو دابەزینێك ..

لەکاتێکیشدا کەشێخ بەننا ڕیزەکانی کۆمەڵەکەی پتەو دەکردو، بەهێمنی و ئاسانی و بێ چرپە قۆناغ بەقۆناغ دەیگواستەوەو، سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست دەهێنا، نەك تەنها لەدروستکردنی بنیاتێکی ڕێکخراوەیی پتەودا، بەڵکو لەشاردنەوەی ناسنامەکەشیدا لەهەمووان .. بەوەی کەلە هەر بەگژداچوونەوەیەك لایداوەو، دوورەپەرێزیش بوو لەوەی بەرەنگاری کەسێك ببێتەوە یان کەسێك بەرەنگاری بێتەوە.

لەوکاتەشدا شێخ بەسەرکەوتوویی هەردوو قۆناغی بانگەشەو خۆئامادەکردن دەبڕێت و، کەشتیەکەی لەکەناری ((جێ بەجێ کردن))نزیك دەبێتەوە، بەرگێکی نوێ لەبەردەکات و، کۆمەڵەکەشی لەشێوەیەکی تەواو نوێدا دەردەکەوێت.

.. ((برایان، ئێوە تا ئێستا دژایەتی هیچ حیزب و دەستەیەکتان نەکردووە، هەروەها نەشچونەتە ناویان، ڕەنگە خەڵکیش قسەو قسەڵۆکیان بۆ دروست کردبن، هەندێك دەڵێن گوایا ئێوە سەربە وەفدیە نەحاسیەکانن، هەندێکی تر دەڵێن ئێوە سەربە سەعدیە ماهریەکانن، هەندێکی تر دەڵێن ئازادیخوازە دەستوریەکانن، یان پەیوەندیتان بەحیزبی نیشتمانەوە هەیە،

یان سەربە (مصر الفتاة)ن، چە ،ەها قسەی دیکەش. ئێوەش لێیان بێبەرین و سەر بە هیچیان نین، جگە لەپیغەمبەریش شوێن هیچ پێشەوایەکی دیکە نەکەوتوون، جگە لەئیسلامیش هیچ ئامانجێکی ترتان نیە. لەبەرئەوە خەڵکی بخەنەلاوەو تێبکۆشن، ڕۆژگاریش زامنە بۆ دەرخستنی ڕاستیەکان))[1].

ئینجا کاتی ئەوە دێت.. کۆمەڵەکە هەردەبێت ناسنامە سیاسیەکەی بخاتە ڕوو. بەڵام شێخ زۆر وریایە، هەمیشە بەردەوامە لەسەر پەردەپۆش کردنی هەموو هەڵوێستێك و، دروست کردنی پەڵە هەورێك لەلێڵی بەسەر کۆمەڵەکەیدا.

((دەڵێن ئێمە سەرسامین بەدەست ئیخوان موسلیمینەوە، ئایا ئەمانە ڕێبازێکی سۆفیگەرن یان کۆمەڵەیەکی خێرخوازن. یاخود حیزبێکی سیاسین، چ مەبەستێکیان هەیەو، چ ڕێبازێکیان گرتووە. بەڵام ئێمە ئەم ناوو ناتۆرانەمان پشت گوێ خستووەو، ئەو یەکەم ڕێگایەمان گرتووە کەتەنها بەو، بارودۆخی خەڵکی چاك دەبێت.. ئەویش بریتییە لەبانگەشەکردن بۆ کتێبەکەی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی، ڕێبازیشمان پرۆگرامی ئیسلامەو ئامرازیشمان بڕواو خۆشەویستی و کارە))[2].

---

[1] حسن البنا، مذكرات الدعوة والداعية، ص١٥٢.

[2] الاخوان المسلمون – نوفمبر ١٩٤٤– حسن البنا، مقال بعنوان ((نحن)).

شێخیش تەنها بەهۆی چەند دروشمێکی گشتیەوە، کەکەس لاری لێیان نیە.. بەردەوام دەبێت لەسەر فراوانکردنی بنکەو سەنگی کۆمەڵەکەی. لەساڵی (١٩٢٩)دا چوار لقی هەبوو، لەساڵی (١٩٣٠)دا بووە پێنج، پاشان لە(١٩٣١)دا بووبە دە، پاشانیش لە (١٩٣٢)دا بوو بە (٥١)لق.. پاشان قۆناغێك دێت - لەپاشاندا بەدوورودرێژی لێی دەدوێین - کەژمارەی لقەکانی کۆمەڵەکە لە(١٩٣٨)دا دەبێتە (٣٠٠)لق، ئەویش قۆناغی بەیەکگەیشتنی سێ کوچکەی ((عەلی ماهیر - شێخی مەراغی - حەسەن ئەلبەننا))یە لە یەك میحوەردا کەدژ بە حیزبی وەفدو لایەنگری سەرایە. سەرکەوتن‌و بەرزبوونەوەکەش بەردەوام دەبێت .. لەساڵی (١٩٤٠)دا لقەکان دەبنە (٤٠٠).. تا لەساڵی (١٩٤٨)دا ژمارەی لقەکان دەگاتە دوو هەزار.

شێخ بەنناش لەدان پێدانانێکیدا لەبەردەم دادوەردا دەڵێت، ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەکەی لەساڵی (١٩٤٥)دا (بەپێی سەرژمێریی، نیو ملیۆن کەس بووە)[٣]. ماوەیەکی کەمیش تێدەپەڕێت - تەنها چەند مانگێك-و شێخ بەننا لەلێدوانێکیدا بۆ گۆڤاری (آخر ساعة) ڕایدەگەیەنێت ((هەزارو پێنج سەد لق لەمیسردا هەیە کەیەك ملیۆن ئیخوان دەگرنە خۆیان، هەروەها چەندەها لقی تریشمان لەهەموو خۆرهەڵاتدا هەیەو بەمەش دەبینە یەك

---

[٣] محاضر جلسات المحكمة العسكرية العليا في قضية رقم ٣٧٣ لسنة ١٩٤٥ والخاصة بأغتيال احمد ماهر باشا. شهادة الشيخ حسن البنا، ص ١١٥.

ملیۆن و نیو لەئیخوانیە چالاکەکان، ئەمەش جگە لەئیخوانیە لایەنگرەکان کەئەوانیش زۆرن))[٤]. (ڕەنگە لێرەشدا هەست بەو جیاوازیە گەورەیە بکەین کەلەژمارەکاندا هەیە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت شێخ هەندێك زیادەڕەویی کردووەو هەوڵی داوە واخۆی دەربخات کەبەهێزە). بەلام ڕۆژنامەی ئیخوان دەڵێت، ژمارەی لقەکانی ئیخوان (لە دوو هەزارو پێنج سەد تێدەپەڕیٚو ژمارەی ئەندامەکانیشی لەنیو ملیۆن کەس زیاترە)[٥].

بەڵکو شێخ بەننا خۆیشی جارێکی تر هێوری دەکاتەوەو لەشایەتیەکیدا لەبەردەم دادگایەکی دیکەدا دەڵێت ((کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین لەنزیکەی هەزار لق پێك دێت، کەهەر لقێك لەنێوان (٥٠- ٢٠٠)ئەندامدایە، بەمەش کۆی ژمارەیان دەگاتە (٥٠ – ٢٠٠) هەزار کەسێك لەچینە جیاوازەکان. ئەمەش جگە لەقوتابیان، چونکە ئەمان لەبەرئەوەی مافی ئەندامێتیان پیٚ نادرێت، سەرژمێریی نایانگرێتەوە .. ڕەنگیشە بلاوکراوەکانی کۆمەڵەکەیان پیٚ بدرێت، ئەمەش تەنها بۆئەوەی زانیارییان هەبێت))[٦].

جارێکی دیکەش ژمارەی نیوملیۆن لەزاری شێخ بەنناوە دووبارە دەکرێتەوەو، لەدوایین پەیامەکانیدا ((قول فصل))کەپاش دەرچوونی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەکەی نووسراوە دەڵێت .. ژمارەی ئەندامانی

---

[٤] اخر الساعة، ١٩٤٦/٣/١٥.

[٥] الاخوان المسلمون (الاسبوعية)١٩٤٦/٧/٢٧.

کۆمەڵەکە نیو ملیۆن ئەندامەو، هەروەها نیو ملیۆن لایەنگرو هاوڕێی دیکەشمان هەیە.[٧]

بەڵام هەندێك توێژەرەوە، ژمارەیەکی هەڕەمەکی دەخەنەڕوو کەدەگاتە دوو ملیۆن ئەندام.[٨]

بەهەرحاڵ بەننا ژمارەی ئەو ئەندامانەی کەلەدەووری کۆببوونەوە هەرچی چەندێك بووبێت- ئەو مافەی بەخۆی دابوو کەبەناوی (٧٠ ملیۆن عەرەبو ٣٠٠ ملیۆن مسوڵمانەوە)[٩]قسەبکات.

ئەوەیش کەپێویستی بەقسەلەسەرکردن نییە، ئەوەیە کە کۆمەڵی ((ئیخوان موسلیمین))یەکێك بوون لەو هێزە سیاسیانەی کەزۆرترین سەنگو باشترین ڕێکخستنیان هەبوو، هەروەها لەلایەن دۆستو دوژمنیشەوە بەهەند وەردەگیران.

حەسەن ئەلبەنناش شمشێرەکەی بەرز دەکاتەوەو خۆی دەکات بەمەیدانی سیاسەتدا.. وە بەسەنگ دەرپەڕاندنەوە، هەروەها ڕنگە بەگاڵتەجاڕیشەوەبێت، پرسیار دەکات ((ئایا لەکاتی نووستندا دڵەکان ئارام

---

[٦] محضر التحقيق في قضية اغتيال احمد الخازندار بك. اقوال الشيخ حسن البنا.

[٧] حسن البنا، قول الفصل ص٢٣.

[8] Florence Elliot. And michael Summerskill – A Dictionary of politics- 4th ed. (1964) p. 247.

[9] Khadduri – op. Cit. P.75.

بوون؟ ئایا پێڵوەکان لەفرمێسـك وشك بوونەوە؟ ئایا دژایەتی تـاوان کـراو کۆمەڵگـە لەشـەڕی تاوانکـاران ئیسـراحەتی کـردو دەربـازی بـوو؟ ئایـا هـەزارەکان دەوڵەمـەندبوون و ئـەو ملیۆنانـەش کەلـەژماردن نایـەن سـکی برسیەکانیان سواغ دا؟ ئایا ئەو هـەموو جێگایانەی کەبۆ ڕابـواردن و کـات کوشتن و مرۆڤ فریودان کراونەتەوەو ئاسمان و ڕێسمانیان پڕکردووە، دڵـی غەمبارەکانیان داوەتەوە؟)).

وەڵامەکـەش لای شـێخ ئامادەیـەو یەکلاکەرەوەشـە، ئـەویش نـەخێرە .. ((نەتەوە لەدوودڵی و شڵۆقی و سەرسامی و لەرزۆکیدایە، نیگەرانیش بووە لەدەسەلاتداریێتی ئەم پرۆگرامو سستمانە)). پاشان ڕایدەگەیەنێت ((ئەرکی ئێمـە ئەوەیە کەڕێبـەریی ئـەم دەروونـە سەرسامانە بکـەین و ڕێنمـایی ئـەم هەستە هەڵچوانە بکەین)).

... بـەم شـێوەیەش شـێخ بـەننا خـۆی دەکات بەمـەیدانی سیاسـەتداو ڕایدەگەیەنێت کەڕێبـەرێتی ((دەروونـە سەرسـامەکان))دەکـات.. بـەلام ئـەو پرسیارە گەورەو گرنگەی کەپەڕەکانی داهاتوو هەوڵدەدەن وەلامی بدەنەوە، ئەمەیە ... ڕێبەری کێ دەکات؟ و.. بۆ کوێ؟

# سیاسەتێکی .. بێ بەرنامە

هەرگیز ناوەکانیش بێ ناوەڕۆك نەبوون.

ئەو شێخەی کەلەهونەری وشەکاریدا کارامەبوو، دەیزانی چۆن ناوەکان هەڵدەبژێرێت.

((النذیر))* ئەو ناوەبوو کە حەسەن ئەلبەننا بۆ گۆڤارەکەی هەڵبژاردبوو، کەبڕیاری دابوو بەم گۆڤارە بچێتە مەیدانی جەنگی ((جێ بەجێ کردن))ەوەو بەهۆیەوە خۆی وەکو هێزێکی سیاسی نوێ ڕابگەیەنێت.

ژمارەی یەکەمی (ئەلنەزیر)یش لەئایاری (١٩٣٨)دا دەرچوو، لەسەروتارەکەشیدا بەننا ڕایگەیاند کەخۆی و کۆمەڵەکەی لەمەودوا ((بانگەشەکردن تەنها بەقسە)) دەگۆڕن ((بۆ بانگەشەکردن بەقسەو خەبات و کردەوە)). لەکاتێکیشدا کەبەننا ئاماژە بەهێزە سیاسیەکانی میسر دەدات، بۆ شوێنکەوتوەکانی دووپات دەکاتەوە کە لەمەودوا هەڵوێستی سلبیانە وەرناگرن، بەڵکو ((ئەگەر ئەم هێزانە بەدەم بانگەوازەکەتانەوە نەهاتن، ئەوا زۆر بەتوندی و ڕەقی دژایەتی هەموویان بکەن، چ ئەوانەی کەحوکمڕانیشن و چ ئەوانەی دیکەش کەلەدەرەوەی دەسەلاتی حوکمڕانین))(١٠).

---

* (النذیر) واتا: ئاگادارکەرەوە – وریاکەرەوە.

ئێمە سیاسین .. ئەمە هاواری شێخ بەننا بوو کە باوەیەکی دوورودرێژ پێچ و پەنای دەکرد بۆگەڕان بەدوای حەشارگەیەکدا تا کۆمەڵەکەی تێیدا بژی و پەرەبسێنێت .. ((ئەو ئیسلامەی ئیخوان موسلیمین باوەڕیان پێیەتی حکومەت دەکاتە ڕوکنێك لەڕوکنەکانی خۆی .. هەروەك چۆنیش پشت بەڕێنمایی کردن دەبەستێت، هەر بەو شێوەیە پشت بەجێ بەجێ کردنیش دەبەستێت. پێغەمبەریش حوکمڕانیی کردبووە کۆڵەکەیەك لەکۆڵەکەکانی ئیسلام. حوکمڕانیش لەکتێبە فیقهیەکانماندا بەیەکێك لەعەقیدەو بنەماکان دەژمێردرێت، نەك وەکو یەکێك لە لق و فیقهیەکان. ئیسلام هەروەك چۆن شەرع دانانەو فێرکردنەو، یاساو دادوەریە، هیچ کامیان لەوی تر جیانابێتەوە. هەر بەو شێوەیە حوکمڕانی و جێ بەجێ کردنیشە))[11].

ئەوانەش کەوادەزانن ڕێنماییەکانی ((ئیسلام تەنها باس لەلایەنی عیبادەت یان لایەنی ڕوحی دەکات، بەدەرلە لایەنەکانی دیکە، هەڵەن لەم بۆچوونەیاندا. ئیسلام عیبادەت و سەرۆکایەتی و ئایین و دەوڵەتە، ڕۆحانیەت و کارە، نوێژو جیهادە، قورئان و شمشێرە، هیچ یەکێك لەمانە لەوی دیکە جیانابێتەوە)).[12]

---

[10] حسن البنا، الاخوان المسلمون نحن راية القرآن- ص١٢.

[11] حسن البنا مذكرات الدعوة والداعية – ص٢٨٣.

[12] المرجع السابق، ص١٥١.

بەنناش لەم بانگەوازەیدا پشت بەمەنتیقی ژمارەیەك لەبا :گەشەکەرانی ئیسلام دەبەستێت، بەتایبەتیش ئەبولئەعلای مەودودی کەپەیوەندیەکی فیکری و کرداری بەهێزی بەکۆمەڵەکەوە هەبوو.. مەودودی دەڵێت ((ئیسلام سیستمێکی گشتگیری پتەوە، لەسەر چەند مەبدەئێکی دانایانەی ڕۆشنبیرانە دامەزرێنراوە. هەر لەئەرکانە زۆرە گرنگەکانیشیەوە تا وردەکاریە بچوکەکانیشی، هەموویان مەنتیقیانە بەم مەبدەئانەوە بەستراون. هەر شێوازێکیشی تێدایە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی، بەهەموو لقە جیاوازەکانی ڕێساکانیەوە، روح و جەوهەرەکەی لەم بنەڕەتە یەکەمیانە وەرگیراون. لەم بنەڕەت و مەبدەئانەشەوە ژیانی ئیسلامیانە هەڵدەقوڵێت، بەهەموولقەکانیەوە. لەبەرئەوە ئەگەر بمانەوێت بەشێوەیەکی ڕاست و دروست شارەزای لقێك لەلقەکانی ژیانی ئیسلامی بین، ئەوا بەناچاری دەبێت بگەڕێینەوە سەربنەڕەتەکەی، چونکە جگە لەم دەروازەیە لەهیچ شوێنێکی دیکەوە ناتوانین بچینەناوی، ئەگەر لەبنەڕەت و یاساکانیشی ڕانەمێنین، ئەوا لەبەهاو ڕاستیەکەی تێ ناگەین و شارەزا نابین))[١٣].

پاشان مەودودی لەکتێبێکی تریدا دووپاتی دەکاتەوە ((کە وشەی دین لەقورئاندا لەجیاتی یەك سیستمی تەواو دانراوە، کەلەچوار بەش پێك دێت و ئەمانەن:

---

[١٣] ابو الاعلى المودودى، نظرية الاسلام السياسية، المرجع السابق ص ٥٥.

١- حوکمڕانی و دەسەڵاتی باڵا.

٢- گوێڕایەڵی و ملکەچی بۆ ئەو حوکمڕانی و دەسەڵاتە.

٣- ئەو ڕژێمە فیکری و کردارییەی کەلەژێر باڵادەستی ئەو حوکمڕانییەدا پێك دێت.

٤- ئەو پاداشتەی کەدەسەڵاتی باڵا بەشوێنکەوتوان و دڵسۆزانی ئەم ڕژێمەی دەبەخشێت))[١٤].

بەنناش پابەند بوو بەم هەڵوێستەوە، بەڵام سەیرەکە لەوەدایە کەئەم سیفەتی ((حوکمڕانی))یەی کردبووە بەر فارووق پاشای گەندەڵ و تاغوتەکەی کۆشکی پاشایەتی، ئەمەش باڵادەستیەکەی بۆزامن دەکات کەپێویستە ((ملکەچی و گوێڕایەڵی)) بکرێت.

بەهەرحاڵ.. کاتی ئەوە هاتووە کەکۆمەڵەکە ناسنامە سیاسیەکەی خۆی ئاشکرا بکات، دەستیشی کردووە بەبەرپاکردنی جەنگێکی ئیعلامی بۆ پاساودانەوەی ڕێبازە نوێیەکان. ((وادەزانێت ئەو مسوڵمانەی بەژیانی ئەمڕۆمان ڕازی بێت و هەمیشە خەریکی عیبادەت کردن بێت و دونیاو سیاسەت بەجێ بهێڵێت بۆ بێ دەسەڵات و خراپەکارو ئیستعمارەکان، بەمسوڵمان دادەنرێت؟ نەخێر ئەوە مسوڵمان نیە، حەقیقەتی ئیسلام

---

(١٤) ابو الاعلى المودودي، المصطلحات الارعة في القران- تعريب محمد كاظم سياق- الطبعة الخامسة (١٩٧١)دار القلم - الكويت، ص١٢.

جیهادوكارو ئایین‌و دەوڵەتە)).[١٥] ئەمەش پشت بەڕۆڵی پێغەمبەر دەبەستێت لەسەركردایەتی كردنی دەوڵەتی ئیسلامی یەكەمدا.((پێغەمبەری گەورەمان پەیماننامەی ئیمزا دەكردو ڕێكەوتنی پێك دەهێناو نامەی بۆ پاشاكان دەناردو سوپاكانی بەڕێوە دەبرد، ئەمەش لەوكاتەدا كەپیاوێك بوو پێش نوێژی بۆ خەڵكیش دەكردو ئەرك‌و واجباتەكانی ئیسلامیشی بەجێ دەگەیاند، ئایا لەمەشدا پیاوێكی سیاسی بووە؟ بەڵێ، وابووەو ئێمەش لەدوای ئەو لەسەر پرۆگرامەكەی دەڕۆین، بڕواشمان وایە كەسیاسەت كردن لەسەر ڕێساكانی ئیسلام‌و بەرزە بالأكردنی وشەی (الله)لەناخی فیكرەكەمانەوەیە))[١٦].

بەڵكو هەر ئەو شێخ بەننایەش، كەبەدرێژایی دە ساڵی یەكەمی بانگەشەكەی دەیگوت وریابە لەسیاسەت نزیك نەبیتەوە، دەڵێت ((دەتوانم زۆر بەڕاشكاوی بڵێم ئەگەر مسوڵمان لەسیاسەتدا دووربین نەبێت لەكاروباری نەتەوەكەیداو گرنگی پێ نەدات‌و كاری بۆنەكات، ئەو مسوڵمان نیە.. هەموو كۆمەڵەو گروپێكی ئیسلامیش دەبێت بایەخ دان بەكاروبارە

---

[١٥] الاخوان المسلمون (الاسبوعية) ١٩٤٥/٣/٤. حنفي محمود بدير، مقال بين الدين والسياسة.

[١٦] الاخوان المسلمون (الاسبوعية) ١٩٤٥/٣/٤. الصاوي محمد عوض، مقال: هل السياسة من صميم فكرتنا؟

سیاسیەکانی ئەتەوەکەی لەسەرووی هەموو پرۆگرامەکەیەوە دانێت، دەنا پێویستی بەوە دەبێت کەلەمانای ئیسلام تێ بگات))[17].

ئیسلامیش بەلای ئیخوانەوە ((نیشتمان)) و ((ڕەگەزنامە))یە. عەبدولمەجید حەسەن -بکوژی نەقراشی پاشا - لەقسەکانیدا لەبەردەم لێکۆڵەرەوەدا دەڵێت ((ئیسلام عەقیدەو عیبادەتە، نیشتمان و ڕەگەزنامەیە، سیاسەت و هێزە، ڕۆشنبیری و یاسایە، واتا لەسەردەمی مسوڵمانە پێشینەکاندا شتێك نەبوو کەناوی سیاسەت بێت، حوکمڕان خۆی لەیەك کاتدا ئیمام و حوکمڕانیش بوو، هەروەها سەرکردەی سوپاش بوو، ئیش و کاری تەنها سیاسەت و ئایین بوو، بەشێوەیەك کەسیاسەتیش بەشێك بێت لەئایین))[18].

ئەم وشانەش تەنها ڕەنگدانەوەیەکە بۆ ڕێنماییەکانی شێخ بەننا، کەدەڵێت ((خەڵکینە، ئیسلام فیکرەو سیستەم و پرۆگرامە، پەیوەستیش نیە بەتەنها شوێنێکەوە یان تەنها ڕەگەزێکەوە، واتا شتێکی سنووردار نیە. هەتا ڕۆژی قیامەتیش هیچ سنوورو بەربەستێکی جوگرافی ڕێگری لێ ناکات و، هیچ کۆتاییەکیشی بۆ نیە))[19].

---

[17] الاخوان المسلمون، ١٩٤٦/٤/١٦. حسن البنا، مقال: الاسلام سياسة وحكم.

[18] محضر التحقيق في القضية (٥١) لسنة ١٩٤٩ والخاصة بمقتل محمود فمهي النقراشي باشا- اقوال المتهم عبدالمجيد حسن.

[19] حسن البنا، الاخوان المسلمون تحت راية القران- ص ٢٦.

بەلام بەننا وەك ئەوەی کەعادەتیەتی، هەموو دەرگاکان لەخۆی داناخات، بەڵکو ڕێگایەك بۆ دەربازبوون هەر دەهێڵێتەوە .. لەبەر ئەمەشە کەهەمیشە پەنادەباتەبەر لێڵیو چاوبەست لەقسەکانیدا - بەتایبەتیش لەو مەسەلانەدا کەپەیوەندییان بەسیاسەتەوە هەیە بەئەنقەستیش دەستەواژەی فرەماناو چەواشەکەر بەکاردەهێنێت (ئایا ئێمە ڕێبازێکی سۆفیگەرین، کۆمەڵەیەکی خێرخوازین، دامەزراوەیەکی کۆمەلایەتین، حیزبێکی سیاسین. ئێمە بانگەوازی قورئانی حەقی گشتگیری کۆگرین .. ئێمە هەموو چاکەو خێرخوازییەك لەخۆماندا دەکەین). بەلام هێندەی پێ ناچێتو دەڵێت ((ئیخوان بانگەشەیەکی سەلەفیە، ڕێبازێکی سۆفیگەرییە، دەستەیەکی سیاسییە، کۆمەڵێکی وەرزشییە یەککگرتوویەکی زانستی ڕۆشنبیرییە، کۆمپانیایەکی ئابورییەو کۆمەلایەتییە))

پاشان بەننا پاشگەز دەبێتەوەو نکوڵی لەم قسانەی دەکاتو، چەند دەستەواژەیەك بەئاراستەیەکی پێچەوانەدا دەڵێت ((ئەی ئیخوان، ئێوە نەکۆمەڵەیەکی خێرخوازن، نەحیزبێکی سیاسین، نەدەستەیەکیشن کەئامانجێکی بابەتیو مەمەبەستێکی دیاری کراوتان هەبێت، بەڵکو ئێوە روحێکی نوێو ڕووناکیەکی نوێو دەنگێکی بڵندن)).

جارێکی تریش دەگەڕێینەوە بۆلای ئەو دەستەواژانەی کەواتاو ڕۆڵێکی دیاری کراویان نییە ((ڕۆحێکی نوێ)) ((ڕوناکییەکی نوێ)) ((دەنگێکی

بڵند))، توێژەریش جگەلە سەرسوڕمان هیچی بەدەستەوە نامێنێت .. ئایا مەسەلەکە شایانی ئەم هەموو سەر لێ شێوانە بوو، ئەمە نەخشەی بۆ کێشراوەو مەبەستێکی لەپشتەوەیە .. ئەگەر پرسیارە دیاری کراوەکەش یەخە بە((شێخ)) بگرێت، ئەوا بەدەروون پاکییەوە وەڵام دەداتەوە ((هیچ شتێك نیە کەناوی ئایین بێت و شتێکی تریش ناوی سیاسەت بێت، ئەمە هەمووی بیدعەیە، ئەوروپییەکان دروستیان کردووە))[٢٠]. توێژەریش، هەرچەند بێ لایەن بێت، بەناچاری دەبێت و وادابنێت کەشێخ بەئاشکراو بەئەنقەستیش ئاوا پێچ و پەناکردن و چەواشەکاری دەگرتەبەر.. یەکێك لەژنە توێژەرەوە خۆرئاواییەکانیش، ئەم شێوازە بەم شێوەیە وەسف دەکات ((ئەمە شێوازێکی کاریگەرو بەهێزە. ئەگەر زانی سەرۆکی حکومەت بەتوانایە، ئەوا جەخت لەسەرئەوە دەکات کەکۆمەڵەکەی سروشتێکی ئایینی هەیە، ئەگەر زانیشی کەسەرۆکی حکومەت لاوازە، ئەوا یەکسەر خۆی دەکات بەناو ململانێ سیاسیەکاندا))[٢١]. توێژەرێکی میسریش دێت و سەبارەت بەم مەسەلەیە دەڵێت: ((بەم شێوەیەش بەننا توانی بەم دووڕووەی بانگەشەکەی، دەستی بەحکومەتەکان و حیزبەکان و ڕای گشتی بکات. ئەم لێڵیە کێشەیەکی دیکەشی بۆ کۆمەڵەکە چارەسەر دەکرد، ئەویش

---

[٢٠] النذير، العدد العاشر (مجموعة عام ١٩٣٨).

[21] Harris, christina, Nationalism and Revolution in Egypt. The Role of muslim Brotherhood (1964) p. 182.

ئەوەیە کە کۆمەڵەکە خۆی ڕێکخستنێکی سیاسی بوو، واتا حیزبێك بوو هەوڵی دەدا دەسەڵات بگرێتە دەست، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، بانگەوازی بۆ نەهێشتنی حیزبایەتی و هەڵوەشاندنەوەی هەموو حیزبەکان دەکرد.. پاشان هەر بەهۆی ئەم لێڵیەشەوە کۆمەڵەکە بۆی لوابوو کەئامانجە ئاشکراکانی خۆی سەبارەت بەو بابەتە سیاسییە بنەڕەتیانە دەست نیشان نەکات کەڕووبەڕووی نەتەوە دەبوونەوە، وەك مەسەلە نیشتمانیەکەو گیروگرفتەکانی ڕژێمی حوکمی ناوخۆ. هەروەها ئەو بوارەشی بۆ دەرەخسێنێت کەڕاقەی ئەو هەڵوێستە کرداریانە نەکات کەلەهەموو بۆنەیەکدا وەری دەگرێت. واشی لێدەکات کەبتوانێت لەهەر ساتێکدا بابەتێك یان کێشەیەك بخاتەڕوو کەتەواو جیاوازبێت لەو کێشە سیاسیانەی هەمووانی سەرقاڵ کردووە))[٢٢].

ڕەنگە بەسودیش بێت .. کەپێش ئەوەی لەگەڵ شێخ حەسەن ئەلبەنادا بچینە گێژاوی دەریای سیاسەتەوە، ئامارە بەچەند بەرپەرچدانەوەیەکی بەهێز بکەین کەسەنگ و کێشێکی ئیسلامییان هەبوو و، هەوڵیان دەدا فیکرەکەی شێخ و کۆمەڵەکەی لەڕووی ئایینی و سیاسیەوە پوچەڵ بکەنەوە.

توێژەری وردبین (حسین فوزی النجار) دەڵێت ((محەمەد چەند مەبدەئێك بۆ حوکمڕانی و سیاسەت دادەنێت، بەڵام یاساو ڕژێمێك بۆ حوکمڕانی

[٢٢] طارق البشري، المرجع السابق ص ٥٤.

دانانێت و، هەروەها لەسەر هیچ بنەسایەك یان شێوازێکی سیاسیش ناڕوات، تەنها ئەوانە نەبێت کەلەگەڵ مەبدەئەکانی ئەخلاق و ڕێگای پەیامەکەو خێروخۆشی مسولْماناندا دەگونجێن)). هەروەها وەلامی ئەو وتەیەی شێخیش دەداتەوە کەدەڵێت پێغەمبەر لەیەك کاتدا، وەکو پیاوێکی ئاییني و وەکو پیاوێکی دەوڵەتیش ئەرکەکانی بەئەنجام گەیاندووە، دەڵێت ((هەڵەیە ئەگەر بڵێیت محەمەد لەپاڵ ئەوەدا کەکاروباری کۆمەڵی مسولْمانانی بەڕێوەبردووە، مەسەلە ئایینیەکانیشی بەسیاسەت کردووە. ئەگەر مافی ئەوەشمان هەبێت کە بڵێین لەگەڵ هاوەڵەکانیدا مسولْمانانی بەڕێوەبردووە. ئەوا لەمەسەلە ئایینیەکاندا تەنها نێردراوێك بووە کەخوا ناردویێتی تاپەیامەکەی بگەیەنێتە هەموو جیهانەکان))[٢٣]. هەروەها دەڵێت ((کۆمەڵی مسولْمانان لەپاش ئەوەی گەیشتنە مەدینە، بەهۆی بارودۆخی ئەو ژیانە نوێیەوە کەلەوێ ڕووبەڕوویان بۆوە، گۆڕران بۆ کۆمەڵێکی سیاسی. ڕەنگە ئەمەش یەکێك بووبێت لەهۆکارەکانی تێکەڵکردنی بیرۆکەی ئایین و دەوڵەت لەئیسلامدا، پێغەمبەریش هیچ کاتێك ئەم دووشتەی تێکەڵ نەکردووەو کۆنەکردۆتەوە، هیچ شتێکیش لەقورئاندا نەهاتووە کەئاماژە بەئوممەی ئیسلامی دەکات بەواتای بانگەشەکردن بۆ خێرخوازی و فرمان کردن

---

[٢٣] حسين فوزي النجار، المرجع السابق ص٦٧.

بەچاكەو نەهی كردن لەخراپە))[24] جەختیش لەسەر ئەوە دەكات كە ((شەریعەتی ئیسلامی یاسایەكە بۆ ژیان و شارستانیەت، نەك بۆ دەوڵەت))[25].

... تەنها ویستمان ئاماژە بەوە بكەین كەبانگەشەكەی شێخ هەروا تێپەڕ نەبووە، بێ ئەوەی لەلایەن توێژەرە ئیسلامیەكانەوە بەرپەرچ بدرێتەوە .. بابشگەڕێینەوە بۆلای وتەكەی شێخ سەبارەت بەئایین و سیاسەت .. هەروەها با تێبینیەكانیشمان لەسەر هەڵوێستە كرداریەكانی بەخێرایی تۆماربكەین.

بەننا لەكاتێكدا كەخۆی وەكو پێشەوایەكی سیاسی و... كۆمەڵەكەشی وەك دەستەیەكی سیاسی ڕادەگەیەنێت، سڵ لەوەناكاتەوە كەهەموو ئەوانەی دیكە لەماف كاری سیاسی بێ بەش بكات .. ((كاتی ئەوە هاتووە كەهەموو دەنگەكان داوای لەناوبردنی ڕژێمی حیزبایەتی بكەن لەمیسرداو بیگۆڕن بەڕژێمێكی دیكە كەیەك دەنگ بێت، هەروەها هەوڵ و تەقەلاكانی میللەتیش لەدەوری پرۆگرامێكی نەتەوەیی ئیسلامی بەپێزدا كۆببێتەوە))[26].

---

(24) المرجع السابق، ص١٤٨.

(25) المرجع السابق، ص٢٥٠.

(26) الاخوان المسلمون (الاسبوعية) ٩/ ٤/ ١٩٤٦. مقال لحسن البنا.

ئەو شتەش کەڕەنگە بەلای توێژەری بێ لایەنەوە سەرسوڕهێنەر دەربکەوێت، ئەوەیە کە بەننا دووپاتی دەکردەوە حیزبەکان و شێوازی حیزبایەتی پێویست نین بۆ دروست کردنی حکومەتێك کەنوێنەرایەتی گەل بکات، بەوەی کەئەم حکومەتە دەتوانرێت بەبێ حیزبایەتیش دروست بکرێت، چونکە حیزبەکان نەتەوە بەش بەش دەکەن و ئەمەش لەگەڵ پەیڕەوو پرۆگرامی ئیسلامدا ناگونجێت.[٢٧]

لەکاتێکیشدا کەبەننا بەڕاشکاوی بانگەواز دەکات بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو حیزبانەی کەبەرقەرارن، هیچ پێی شەرم نیە داوای ئەوە لەهەمووان بکات ساحەکە بەتەنها بۆخۆی چۆڵ بکەن ((دوای بەدوای هەڵوەشاندنەوەی حیزبە سیاسیەکان، حیزبێك لەسەر بنەمای بەرنامەیەکی ئیسلامیانەی چاکسازخواز دێتەکایەوە))[٢٨] ڕەنگە شتێکی سەیریش بێت کەبەننا هێندە قوڵ بووبێتەوە لەبیرۆکەی هەڵوەشاندنەوەی هەموو حیزبەکاندا، جگە لەحیزبەکەی خۆی، بەڕاددەیەك کەئەزموونی شێوازی تاکە حیزبی تورکیاو ڕوسیای وەکو نموونەیەك هێنابێتەوە، ئەمانیش دوو دەوڵەتن کەکۆمەڵەکە خۆیان لەپەیڕەوو پرۆگرامیان ڕازی نین.[٢٩]

---

[٢٧] حسن البنا مشكلاتنا في ضوء النظام الاسلامي – ص٤١.

[٢٨] حسن البنا، الرسائل الثلاث، ص ١١٢.

[٢٩] الاخوان المسلمون، ١٩٤٦/٧/٢٢. مقال لحسن البنا.

کەڵەکەبوونی نیشانەی پرسیارو سەرسوڕمانەکانیش بەردەوام دەبێت، هیچیشمان بەدەستەوە نیە تەنها ئەوە نەبێت کەلەگەڵ گەشتەکەی شێخی سیاسیدا بڕۆین، بۆئەوەی تێبینیەکانمان تۆمار بکەین.

بەننا خۆی وەکو حیزبێکی سیاسی دەسەڵاتخواز پێشکەش دەکات .. بەڵکو زیاتر لەجارێکیش دووپاتی دەکاتەوە کەئەم هەوڵ نادات بۆ دەسەڵات، بەڵکو دەسەڵات خۆی هەوڵ بۆئەم دەدات ((ئێمە هەوڵ بۆ حوکمڕانی نادەین، بەلاّم بۆچوونمان وایە کەحوکمڕانی خۆی لەمەودوا هەوڵ بۆ ئێمە دەدات .. ئەوکاتەش بیر لەوە دەکەینەوە هەڵوێستمان بەرامبەری دیاری بکەین .. کەئایا قبوڵی دەکەین یان ڕەتی دەکەینەوە!))[٣٠]، بەلاّم بەننا لەگەڵ ئەمەشدا، هیچ بەرنامەیەکی سیاسی ناخاتەڕوو، بەڵکو ڕەنگە زۆر خۆشی دزیبێتەوە لەدەست نیشانکردنی هەر هەڵوێستێکی سیاسی ئاشکرا، سەبارەت بەهەر مەسەلەیەکی نەتەوەیی یان نیشتمانی یاخود کۆمەڵایەتی. ئەگەر وەك هەر پێشەوایەکی سیاسیش لەبارەی بەرنامەکەیەوە پرسیاری لێ کرابێت، ئاوا وەلاّمی دەداتەوە ((ئێمە مسوڵمانین و بەس، پرۆگرامیشمان پرۆگرامەکەی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێت) و بەس، عەقیدەشمان لەکتێبی خواو سوننەتی

---

[٣٠] حسن البنا، مذكرات الدعوة والداعية، ص٥٣.

پێغەمبەرەکەیەوە وەرگیراوەو بەس))[٣١] زیاتریش درێژە بەمەسەلەکە نادات، ئەگەر کەسێکیش گومانی خۆی لەبارەی ئەوەوە دەربڕیایە کە ئایا کاری سیاسی بەبێ بەرنامەی سیاسی دەگونجێت.. ئەوا شێخ بەننا بەوە تاوانباری دەکرد کە((دڵی نەخۆشە، گومانی خراپە، دڵی ناساغە، تانەچیو گوناهکارەو بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت کەعەیبو کەمو کوڕی لەبێگەردی بدۆزێتەوە، ئەمانەش هەمووی بەڵاو گوناهن لەملی خانەکەیان)).

بەڵام مەسەلەکە بەو ئاسانیە نییە.. چونکە سەرکردەی کۆمەڵێکی سیاسی، ناتوانێت بچێتە مەیدانی کاری سیاسییەوەو ڕایبگەیەنێت ئیسلام ((گوێڕایەڵیو حوکمڕانیو قورئانو شمشێرە))، بێ ئەوەی پاڵ بەهەموانەوە بنێت کەبپرسن کێ شمشێرەکە بەکاردەهێنێت؟ دژی کێ؟ ڕەنگە لەکاتێکیشدا کە شمشێر وەکو شێوازێك بۆ مامەڵەکردنی کۆمەڵەکە لەگەڵ نەیارە سیاسیەکانیدا بەکارهێنرا، پرسیارکردنەکان بەتەواوی لەشوێنی خۆیاندا بووبن.

ئیخوانیش نکوڵی لەو ڕاستیە ناکەن کەکۆمەڵێکی سیاسین بەبێ بەرنامەیەکی سیاسی.

-هنداوی دویر-یەکێکە لەسەرکردەکانی ئیخوان موسلیمین لەشایەتیەکەکیدا لەبەردەم دادگادا، کاتێك داواکار ئەم پرسیارەی لێدەکات:

---

[٣١] حسن البنا، مذكرات الدعوة والداعية. ص٥٣.

هیچ توێژینەوەیەکتان دانەناوە لەبارەی چۆنیەتی حوکمڕانیەوە لەئیسلامدا؟ وەلامدەداتەوەو دەڵێت ((لەڕۆژەکانی سەردەمی مامۆستا بەننادا، داوام لێکرد کەلەسەر ئەم مەسەلەیە شتێك بنووسێت، ئەویش پێی وتم .. بەتەواوی لەیادمە کەپێی وتم ئێمە تێربووین لەنووسین و نووسینکاری. (کتێبخانەی ئیسلامی)ش پڕە. ئەرکی ئێمەش ئەوە نییە کەکتێب دروست بکەین، بەڵکو ئەرکی ئێمە ئەوەیە پیاو دروست بکەین)).

((دیسان داواکار لێی دەپرسێتەوە: واتا هیچ دەق و دەست نیشان کردنێك لەئارادا نیە؟ ئەو وەڵام دەداتەوە: لەڕاستیدا ئیخوان ئەم دەستوورەیان ئامادە نەکردووە. منیش بەجەنابتانم گوت کەخۆم بەمامۆستا بەننام گوتبوو ئێمە دەمانوێت ماوەیەك تەرخان بکەیت بۆ نووسینی ئەو شتانەی کەئیخوان دەبێت لەسەری بڕۆین .. لەیادیشمە کەلەبۆنەیەکدا گوتی، خەڵکی لەسەر مەبدەء کۆدەبنەوە نەك لەسەر وردەکاریەکانی .. چونکە ئەگەر بچینە ناو وردەکاریەکانەوە، ئەوا ناکۆك دەبین و بەش بەش دەبین، کۆتاییشمان بەخێر ناگەڕێت .. ئێمەش لەسەر چەند مەبدەئێکی ئیسلامی دەڕۆین، لەبەرئەوە ئەگەر خۆمان لەقەرەی وردەکاریەکان بدەین، لەوانەیە فەقیهێك بێت و جیاوازبێت لەگەڵ بۆچوونەکانی ئیمەدا، ڕەنگە

ئەمەش ببێتەهۆی ئەوەی کەتواناو کاتەکانمان لەچەند مەسەلەیەکی لاوەکیدا بەفیڕۆ بدەین))[٣٢].

یەکێکی تریش لەسەرکردەکانی کۆمەڵەکە، ئەم بیرۆکەیە دووپات دەکاتەوەو جەختیش لەسەر ئەوەدەکات کەنەبوونی بەرنامەی سیاسی شتێکی بەمەبەست بووە (منير الدولة)ی ئەندامی مەکتەبی ئیرشادی گشتی، لەشایەتیەکەیدا لەبەردەم دادگای گەلدا، لەکاتی دادگایی کردنی مامۆستای مورشید (حسن الهضيبي)دا، دەڵێت:

((- بریکاری جێگری گشتی: بانگەشەکەیان لەسەر چ بنەمایەك پێك دێت؟

شایەت: کۆمەڵی ئیخوان بەرنامەیەکی وردی بۆ سیستمی حوکمڕانی نییە.

بریکاری جێگری گشتی: بانگەشەکەیان لەسەر چ بنەمایەك پێك دێت؟

شایەت: کۆمەڵەکە یاخود دەستەکە بانگەشە بۆئایینی ئیسلام دەکات و بانگەواز بۆ فیکرەی گشتی ئیسلامیەتی دەکات، فیکرەی ئیسلامیەتی وەکو فیکرەیەکی گشتی، ڕژێمێك یان سیستمێکی

---

[٣٢] محمكة الشعب – الجزء الاول. محاكمة محمود عبداللطيف. المرجع السابق. شهادة هنداوي دوير، ص ٦٣.

دیاری كراوی وردیش داناندْ ت كەپێی بوترێت سیستمی حوكمڕانی ئیسلامی. بەڵام چەند هێڵێكی سەرەكی دەكێشێت، ئەگەر بەدی هاتن، ئەوا سیستمی حوكمڕانی ئیسلامی دێتە كایەوە، لەوانەشە لەناو ئەم هێڵانەدا، كۆمەڵێك سیستم هەبن كەهەموویان ئیسلامی بن، ئەمەش ئەگەر ئەم كۆمەڵە سیستمە، ئەو مەرجە گشتیانەیان تێدابێت كەئیسلام دایدەنێت. بەڵام سیستمێكی دیاری كراو هەڵبژێردرێت و ناوی بنرێت سیستمی ئیسلامی، ئەوا ئەمە مەسەلەیەكی وردو ئاڵۆزە. ڕەنگە ئەمەش یەكێك بووبێت لەو هۆكارانەی كەوای لەكۆمەڵەكە كردبوو هیچ شێوەیەك دیاری نەكات، تا لەژێرناوی سیستمی حوكمڕانی ئیسلامیدا بیسەپێنێت، وە لەڕووی سیاسییەوە تەنها كاری بڵاوكردنەوەی ئیسلام و بنەما ئیسلامیەكان بێت و داوای ئەوە بكات كەلەژیانی گشتیدا پەیڕەو بكرێن.

- بریكاری جێگری گشتی: ئەی ئایا سیستمی حوكمڕانی میسر پێچەوانەی ئیسلامە؟

- شایەت: ئیسلام بنەما گشتیەكان دادەنێت، سیستمەكەش ئەگەر بەهەر شێوەیەك لەشێوەكان ڕاوێژ - شورا - ی تێدابێت، ئەوا ئیسلامیە، هیچ شێوازێكی دیاری كراویش بوونی نیە. ئەگەریش لەسەر داد پەروەری دامەزرابێت و حوكمڕان بەرپرسیاربێت لەوكارانەی خۆی بەتەنیا دەیكات، ئەگەر ئەم شتانە بوونی هەبوو، ئەوا سیستمەكە ئیسلامیە.. ئەگەر

لەئێستاشدا تەواوكاری بارە دەستوریەكە بكرێت، واتا ئەگەر یاسای شورا بەگێڕانەوەی ژیانی نوێنەرایەتی كردن چاك بكرێت، ئەوا بارە ئیسلامیەكە بەرقەرار دەبێت))[٣٣].

- لەبەردەم زیاتر لە یەك نیشانەی پرسیاریشدا دەوەستین كەلەشایەتیەكەی ئەندامی مەكتەبی ئیرشادی گشتیدا بەدی دەكرێن.

- یەك سیستمی ئیسلامی دیاری كراونییە، بەڵكو ((لەوانەیە لەناوی ئەم هێڵانەدا سیستەم هەبن كەهەموویان ئیسلامیبن.

- سیستمێكی دیاریكراو هەڵبژێردرێت و ناوی بنرێت سیستمی ئیسلامی، مەسەلەیەكی وردو ئاڵۆزە.

- ئەو سیستمی حوكمڕانیەی كەلەساڵی ١٩٥٤ لەمیسردا بەرقەرار بوو، سیستمێكی ئیسلامی بوو، تەنها ((شورا))ی كەم بوو!.

لەوانەشە ماقی كۆمەڵەكە بێت لەسەرمان كەدرۆو ڕاستی ئەم قسانە بپشكنین، چونكە لەوانەیە قسەی دەست بەسەرێكی زیندانی بێت و بیەوێت باری شانی خۆی سوك بكات، وەك ئەوەی كەزۆر لەئیخوانیەكان فێرببوون لەئیعترافەكانیاندا وایان دەكرد... لەبەرئەوە ڕەنگە پێویست بێت

---

[٣٣] محكمة الشعب –الجزء السادس– المحاكمات التي تمت من ٢٢ الى ٢٥ نوفمبر ١٩٥٤– محاكمة حسن الهضيبي– شهادة منير الدلة. ص ١٢٠٨.

* ئەم قسانەی هنداوی لەدەقە عەرەبیەكەدا بەدیالێكیتی میسری نوسراون.

لەحەقیقەتی ئەو ((ڕژێمە ئیسلامیە))تـێ بگەین کەئیخوان موسلیمون بانگەشەیان بۆدەکرد.

شێخ حەسەن ئەلبەننا لەو نامە یەکلاکەرەوەیەیدا کە ساڵی (١٩٣٨) لەژێر ناونیشانی ((بەرەو ڕووناکی (نحو النور) ))دا ناردبووی بۆ پێشەوا میسریەکان، دەڵێت ((پێویستە شتێکی نوێ بۆئەم نەتەوەیە بێتەکایەوە، نوێییەکەش گۆڕینی ئەو ڕژێمە شەق و شڕو پێنەکراوەیە کەنەتەوەکەمان جگە لەلێکترازان و ناکۆکی، هیچی تری لێ دەست نەکەوتووە .. ئەمیش بریتییە لەڕاستکردنەوەی دەستوری میسری بەشێوەیەکی بنەڕەتی، بەجۆرێك کەهەموو دەسەڵاتەکان تێیدا یەکانگیربن)). پاشان بەڵێن دەدات کەئەگەر پێشەواکان، بەدەم ئەم داوای یەکخستنی دەسەڵاتەوە نەهاتن، ((ئەگەر بەرگرییان کرد، جیهادێکی گەورەیان بەسەردا بکەن))[٣٤].

لەپەیامەکەی کۆنگرەی پێنجەمیشدا بەننا دەڵێت ((دەقەکانی دەستوری میسری چەند دەقێکی تێدایە کەئیخوان موسلیمین بەلێڵ و ناڕوون دەیبینن، ئەمەش بوارێکی فراوان بۆ ئەوە دەڕەخسێنێت کەبەپێی ئارەزوو مەبەست ڕاڤەو لێکدانەوەیان بۆبکرێت. ئەم دەقانە پێویستیان بەڕونکردنەوەو دیاری کردن و ئاشکرا کردن هەیە، ئەمە یەك. دووەمیشیان، شێوازێکی جێ بەجێ کردنی دەستورەکە، بەتاقی کردنەوە دەرکەوتووە کەشێوازێکی

---

[٣٤] حسن البنا، نحو النور.

سەرنەکەوتوەو نەتەوەکەشمان لەحیاتی ئەوەی سوودی لێ ببینێ زیانی لێ بینیوە. لەبەرئەوەی ئەمیش پێویستیەکی زۆری بەچاك كردنو جۆرە ڕاستکردنەوەیەك هەیە کە وەکو پێویست بێتو مەبەستەکان بەدی بهێنێت .. پێویستیشە کەئازایەتی تەواویان تێدا بێت، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی مەترسیەکانو کارکردن بۆ ڕاستکردنەوەی.

ئینشائەڵڵا لەپەیامێکی دیکەشدا، نموونەکان بەدوورودرێژیو بەڵگە پێویستەکانو ڕێگا چارەو ڕاستکردنەوەکان، باس دەکەین))[٣٥].

بەڵام بەننا هێندەی پێناچێت، لەترسی ئەوەی نەبا بەدژایەتی کردنی دەستو تاوانبار بکرێت، پاشگەز دەبێتەوەو دەڵێت ((دەستور بەروحو ئامانجە گشتیەکانیەوە، لەڕووی شوراو بڕیاردانی دەسەڵاتی میللەتو دەستەبەرکردنی ئازادییەکانەوە، پێچەوانەی قورئان نییە. ئەو شتانەش کەتێیدایەو پێویستیمان بەڕاست کردنەوە هەیە، دەتوانرێت بەو شێوازە ڕاست بکرێتەوە کەدەستورخۆی نەخشەی کێشاوە))[٣٦].

بەڵکو بەڕاددیەیەك بەردەوام دەبێت لەسەر پاشگەزبوونەوەکەی، کەجێگای سەرسووڕمانە ((ئیخوان موسلیمین بۆی نییە نکۆڵی لەڕێزگرتنی ئەو دەستوورە بکات، کە وەکو ڕژێمێکی حوکمڕانی لەمیسردا بڕیاری لەسەر

---

[٣٥] حسن البنا، رسالة المؤتمر الخامس.

[٣٦] انور الجندي، الاخوان المسلمون في ميزان الحق- ص ٦٢.

دراوە. هەروەها ڕۆشی نیە تانەی لێبدات، یان خەڵکی لەدژی بجولێنێت و هانیان بدات ڕقیان لێی ببێتەوە. ئیخوانیش لەبەرئەوەی کەکۆمەڵێکی ئیماندارو دڵسۆزەو دەزانێت کەجولاندنی خەڵکی واتای شۆڕشە، شۆڕشیش فیتنەیە، فیتنەش لەئاگردایە، بۆی نییە ئەوەبکات))[٣٧].

ئەگەر ڕژێمی بەرقەرارو بالادەست، چ لەسەردەمی ((خاوەنشکۆ)) فاروق پاشای (هاوڕێی ئیخوان)دا، یان لەسەردەمی جەمال عەبدولناسردا (کەدوژمنیان بوو)، لەلایەن ئیخوانەوە پەسەندو قبولْ کراوبێت و .. نکولی لەوەش ناکەن کە ((پێویستە وەکو ڕژێمێکی حوکمڕانیی بڕیاردراو، ڕێزی بگیرێت)) .. ئەی کەواتە ئەم هەموو چەقە چەقەی بۆچییە؟ و ئەم هەموو باسەش لەسەر جیهادو ڕژێمی ئیسلامی و گۆڕانکاریی بنەڕەتی، لەپای چی؟.

شێخی بەننا لەوە دەترسا کەلەگەڵ دەسەلاتدا ڕووبەڕووی یەك ببنەوە، هەروەها لەشۆڕشیش دەترسا، لەبەرئەوە دەستی خۆی خستبووە درزی دەستارەکەوە،دیەوێت و نایەوێت، داوای ڕژێمێکی ئیسلامی دەکردو دەیویست بەجیهادو نوکی شمشێر ئەم ڕژێمە بەدی بهێنرێت، پاشان ئەو ڕژێمەش قبولْ دەکات کەبەرقەرارەو ((هەولێش نادات تانەی لێدات، یان خەڵکی لەدژی بجولێنێت)).

---

[٣٧] النذير – العدد ٣٣– حسن البنا، مقال الاخوان المسلمون والدستور المصري.

تەنها ئێمەش نین کەسەرمان لەم هەڵوێستە لێك دژەی بەننا سوڕماوە.. بەڵکو ڕیچارد میشێلی توێژەری ئەمریکیش سەر سووڕمانی خۆی دەردەبڕێت و دەڵێت ((بەننا داوای ڕژێمی ئیسلامیی دەکرد، بەڵام ئەم دەستەواژەیەی بەشێوەیەکی لاستیکیانە بەکاردەهێناو هەندێك جار بەم دەستەواژەیە مەبەستی لەدەوڵەتی ئیسلامیی بوو. بەهەرحاڵ بەننا خۆی دەیگوت، ئەو ڕژێمە دەستووریە پەرلەمانیەی کەلەمیسردا بەرقەرارە، ئەگەر چەند چاکسازیەکی تێدا بکرێت، دەتوانێت پێداویستیە سیاسییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی دەستەبەر بکات، هەروەها لەپاش بەننا (الهضيبي)ش ئەمەی دووپات دەکردەوە، هەروەها ژمارەیەك لەنووسەرەکانی ئیخوانیش بەهەمان شێوە))، میشێل درێژە بەقسەکانی دەدات و دەڵێت ((ئەگەر ئەمەش ڕاست بێت، ئەوا چالاکی سیاسی ئیخوان موسلیمین ئامانجی شتێکی ترە، ڕووخاندنی ڕژێمی بەرقەرار))[٣٨]. بەڵام توێژەرێکی ئەمریکی دیکە بۆچوونی وایە کەهەموو ئەم قسانە ((تەنها پەردەیەك بوون لە دووکەڵ و هەوڵەکانی ئیخوانیان سەبارەت بەلەناوبردنی ڕژێم دەشاردەوە، چونکە کەس لاریی لەوەنیە کەئەو ڕژێمەی لەمیسردا کاری پێدەکرا، میسری نەکردە دەوڵەتێکی ئیسلامی))[٣٩]. مەسەلەکەش تەنها بەدەستوورەوە ناوەستێت، بەڵکو درێژ دەبێتەوەو دەگاتە ((یاسا))ش. ئیخوان لەچەند

(38) Mitchell – op. Cit. P. 236.

(39) Safran .op. cit. P. 290.

دەبێتەوەو دەگاتە ((یاسا))ش. ئیخوان لەچەند شوێنێکداو لەزاری چەند سەرکردەیەکی ئیخوانیی زاناو لێهاتوشەوە، دووپاتیان کردۆتەوە کەئەو یاسایەی لەمیسردا پەیڕەو دەکرێت - جگە لەچەند دەقێکیان- لەگەڵ دەقەکانی شەریعەتدا دەگونجێنێت و پێچەوانەش نییە لەگەڵ مەبدەئە گشتیەکاندا.[٤٠] مامۆستا حەسەن ئەلهوزەیبیش بەدوورودرێژیی و بەقوڵی لەکاتی دادگایی کردنەکەیدا ئەم هەڵوێستەی دووپات کردۆتەوە، ئەویش لەکاتێکدا کەدەڵێت، ئەو دەمەی خۆی قازی بووەو یاسای مەدەنی پەیڕەو کردووە، لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا پێچەوانە نەبووە.

ریچارد میشیلیش سەرلەنوێ دێتەوەو دەپرسێت - پرسەکەشی بەتەواوی لەجێی خۆیدایە- ((ئەگەر مەسەلەکە بەم شێوەیەیە، ئەی کەواتە ئیخوان بۆ چ سور بوون، لەسەر پراکتیزە کردنی شەریعەتی ئیسلامی؟))[٤١].

ئەگەرچی بەنناش زۆر وریاو دوورەپەرێز بوو لەوەی کەبۆچوونی خۆی لەبابەت پراکتیزە کردنی ڕوون و ئاشکرای شەریعەتی ئیسلامیەوە پێشکەش بکات، ئەمەش لەپێناو ئەوەی کەنەبادا ئەم مەسەلەیە ببێتەهۆی دروست بوونی دووبەرەکی و جیاوازی .. یان ببێتەهۆی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ

---

[٤٠] راجع لمزيد من التفصيل: عبدالقادر عودة، الاسلام بين بنائه وعجز زعمائه (١٩٥٢). ص٢٣.

[٤١] لمزيد من التفاصيل راجع: الاخوان المسلمون، ٢٩، ٧، ١٩٥٤. وأيضا: محمد عبدالله السمان، الاسلا المصحفي (١٩٥٤).

ڕژێمی بالادە ;ـت، یـان تەنانـەت ببێتـەهۆی ئـەوەی کەباسـی ٔەگـەری ئـەم ڕووبەڕوو بوونەوەیەش بکرێت .. کەچی هەندێك لەسەرکردەکانی ئیخوان و بیرمـەندەکانی هـەوڵیان دا ئـەو لێـك دژیانـە نـەهێڵن کەلـەنێوان شـەریعەتی ئیسـلام و ڕژێمـی بەرقـەراردا هـەبوو، ئەمــەش لـەپێناو بـەرژەوەندیی ئـەم ڕژێمـەداو وەکــو پاســاو هێنانەوەیــەك بــۆی .. مەزهەبــەکان تەنـها چـەند ئیجتیهادێکن و لەڕابردووشـدا بەهایەکی مێژوویـان هـەبووە، لـە ئێستاشـدا بەهایەکی ئیرشادین. بـەڵام مسـوڵمانەکان ئازادی تـەواویان لـەوەدا هەیە کە چۆن ڕەفتار دەکەن لەدونیاییەکانی خۆیاندا، بەپێی بارودۆخی خۆیشیان.

(سید قطب)یش– گـەورە بیرمـەندی ئیخوان پاش کۆچی دوای شـێخی بـەننا – دووپاتی دەکاتـەوە کەئـەو دەسـەڵاتانەی دەدرێنـە وەلی ئـەمر، مـافی ئـەوەی دەدەنـیٚ کەلــەژێر ڕۆشــنایی ئــەم دوو مەســەلەدا شــەرع دابنێــت: (المصلحة المرسلة و سد الذرائع)[٤٢] * پێویستیشـە کەسـەرلەنوێ جارێکی تر پرسیارەکەمان دووبارە بکەینەوە .. کەواتە ئـەم هـەموو هـەراو هوریایـەی بۆچیـەو چ پێویسـت بـەم هـەموو باس و خواسـە دەکـات لەسـەر گەڕانـەوە بۆڕژێمـی ئیسـلامی و لەسـەر جاهیلیـەتی ئـەو ڕژێمـەی لەچلەکاندا یان پاش چلەکان لەمیسـردا هـەبووە ئەگـەر ئیخـوان موسلیمین هەمیشـە توانیبێتیـان

[٤٢] سيد قطب، العدالة الاجتماعية في الاسلام.

(*) المصلحة المرسلة وسد الذرائع.

بۆچـون و مەبدەئـەكانيان بگـۆڕن و بيگونجێنـن، جـارێك لەگـەڵ ڕژێمـی بەرقـەراردا دەگونجێـن، جـارێكی تـر داوای چەند ڕاسـتكردنەوەیەكی كـەم دەكـەن تيـايدا، جـارێكی تريـش ڕەتـی دەكەنــەوە لەبەرئـەوەی جـاهيلی و گومڕايە، هـەموو گومڕاييەكيش لەئاگردايـە. هيچ پاساوو پێودانگەيـەكيش نيـە بۆئـەم بازبازێنـەی كۆمەڵەكـە لەهەڵوێسـتێكەوە بـۆ هەڵوێسـتێكی تـر دەيكـەن، جگـە لەبـەرژەوەنديی هەنوكـەيی .. ئەمـەش دەبێتـەهۆی ئـەوەی توێژەر گومان لەڕاددەی ڕاستی و جديەتی ئەو دروشمانەبكات كە كۆمەڵەكە بەرزی دەكاتەوە يان بانگەوازی بۆ دەكات.

تەنانـەت ئـەو ڕاسـتكردنەوانەش كەبـەننا خسـتبوويە ڕوو بۆئـەوەی لەسايەی ڕژێمـی پاشـايەتيدا لەدەستوردا بكرێـت، لـە ((مەسـەلەی شـورا)) تێپـەڕی نەدەكرد .. كەواتـە ڕاوبۆچوونـی بـەننا لەسـەر شـورا چييـە؟ بـەننا بۆچی وايە كەئەهلی شورايان دەبێت لەپياوانی ئايين بن، يان دەبێت لەو پياوانە بن كە بەسەركردايەتی كردن ڕاهـاتوون، وەك سەرۆكی عەشيرەت و تيرەكان .. هەڵبژاردنەكانيش پەسەند نابن و قبوڵ ناكرێن ئەگەر نەبنەهۆی هەڵبژاردنی كەسانێك لەم دوو پۆلە.[٤٣]

بەم شێوەيەش شێخ بەننا بەم ڕاستكردنەوەيەی كەپێشنياری كـردوە، دەگەڕێتـەوە بـۆ ياسـەيەكی خراپـتر لـەو ياسـايەی هەڵبژاردنـەی پـەيڕەوی

---

[٤٣] حسن البنا، مشكلاتنا في ضوء النظام الاسلامي، ص ٦٠.

دەكرێت. دەيگەڕێنێتەوە بۆ چەمكە دەرەبەگايەتى و نيمچە دەرەبەگايەتيە كۆنەپەرستەكان، كەمتمانە بەجەماوەرى هاولاتيان ناكەن، ئەو جەماوەرەى، كەئيسلام جەخت لەسەر ئەوە دەكات كەمافەكانيان لەگەڵ هەبوو ئەوانەى ديكەدا يەكسانن - (سواسية كأسنان المشط) وەكو دانەكانى شانە يەكسانن - بەڵكو ئەمە متمانەو ئاو تەكانى لەسەركردەى خێزانە گەورەكان و سەرەك عەشرەت و هۆزەكان و .... هتد دا كۆدەكاتەوە!.

بەلاى ئيخوان موسليمينيشەوە ((گەل ئازاد نييە لەهەڵبژاردنى ئەو ڕژێمى حوكمڕانيەدا كەدەيەوێت. چونكە هاوولاتييان ئەگەر خۆيان پابەند نەكەن بەحكومەتێكەوە كەلەسەر چەند بنەمايەكى ئاييني پێك هاتبێت، ئەوا ڕەنگە تووشى هەڵەو گوناهكردن ببن))(٤٤) .

ئەمەش شتێكى سەير نييە.. ئەوەتا ئەبولئەعلاى مەودودى بيرۆكەى ديموكراسيەت لەبنەڕتەوە ڕەت دەكاتەوە، بەڵكو واى دادەنێت كەدەسەلات بەخشين بەجەماوەر يان تەنانەت بەزۆرينەى ڕەهاى ئەم جەماوەرەش گومڕايى و گەندەڵيە .. با لەگەڵ قسەكانى ئەم فەيلەسوفە متمانە پێكراوەى ئيخوانيشدا بڕۆين ((مەبدەئى سەرەكى ديموكراسيەتى نوێ ئەوەيە كە خەڵكى، حوكمڕانى و شەرع دانانيان بەدەست خۆيانەوەيە، دەسكارى كردنى ياساكانيش هەربە دەست خۆيانە، چۆنيان پێ خۆش بێت و

[44] Khadduri – op. Cit. P. 74.

ئارەزویان بێت ئاوا دای دەنێن)). کاتێکیش کەمەودودی ئەمە ڕەت دەکاتەوە، ڕاستەوخۆش سووکایەتی بەهەموو گەل دەکات و دەڵێت ((ئەگەر یاساکانی ژیانی کۆمەڵایەتی هەمووی بەدەست ڕای گشتی بێت و حکومەتیش وەکو کۆیلەیەك بێت بۆ خواوەندی ئەم دیموکراسیەتە نوێیە، ئەوا ئاساییە کەدەسەڵاتی یاساو سیاسەت ناتوانێت پارێزگاری کۆمەڵگە بکات لەلێکهەڵوەشانی ئەخلاقی.

چی بڵێم، بەڵکو ئەمە خۆی لەخۆیدا دەبێتە یارمەتیەك بۆ گەندەڵ کردنی کۆمەڵگەو پاڵنەرێك دەبێت بۆ بەهیلاك بردن و وێرانکردنی. هیچ پێوەرێکیش نامێنێت بۆ هەق و خێرو چاکە تەنها زۆرینەی دەنگ نەبێت بۆ یەکێك لەلایەنەکان. پێشنیارێکیش هەرچەند خراپ و پیس و زیان بەخش بێت، ئەگەر هێندە ڕای گشتی لەسەربێت بەڕاددەیەك کە (٥١٪)ی دەنگەکان بەدەست بێنێت، ئەوا هیچ شتێك ڕێگری لێ ناکات کەبەرزبێتەوە بۆ پلەی شەرع))[٤٥].

هیچیشمان بەدەستەوە نیە، تەنها نیشانەیەکی پرسیاری دیکە نەبێت؟

ئەو ((ئەلنەزیر))ەش کەشمشێرەکەی بەرزکردبۆوەو خۆی کردبوو بەمەیدانەکەدا، لەترسی ئەوەی نەبا تووشی ڕووبەڕووبوونەوە بێت، لەسەر پاشگەزبوونەوەکەی بەردەوام دەبێت. لەسەرەتای ساڵی (١٩٤٥)یشدا، بەننا

---

[٤٥] ابو اعلى المودوي، الحجاب. مؤسسة الرسالة (بيروت) ص ٧٢.

کۆمەڵەی گشتی ئیخوان ،وسلیمین بانگ دەکات و بۆ خۆیشی پێشنیار دەکات کەچەند ڕاستکردنەوەیەك لەیاسای ڕژێمی بنەڕەتیدا بکرێت، بەمەش برگەیەك بۆ بەندی چوارەمی بەشی دووەم زیاد دەکرێت، کە ئەمەیە ((ئیخوان هەمیشە حەز بەپێشکەوتن و پەرەپێدان و کاری بەرهەمدارو هاوکاری کردن لەگەڵ هەموو خێرخوازو هەقخوازێکدا دەکەن.حەز بە زیانی هیچ کەسێکیش ناکەن، ئیتر ئاینەکەی یان ڕەگەزەکەی یان نیشتمانەکەی هەرچییەك بێت)).

لەساڵی (١٩٤٨)یشدا کابرا هەنگاوێکی تر بەرەو دواوە دەنێت، ئەمەش بەوەی کەهەرخۆی پێشنیاری ڕاستکردنەوەی بەندی سێیەمی یاسای ڕژێمی بنەڕەتی کرد، ڕاستکردنەوەکەش زیاد کردنی ئەمەبوو ((ئیخوان لەبەدیهێنانی ئامانجەکانیدا پشت بە ئامرازەکانی بانگەشەکردن و پەروەردەو ڕێنمایی و کارو هەموو ئامرازێکی ڕەوای دیکە دەبەستێت))[٤٦].

پێویستە جارێکی تریش هەڵوێستە بکەین و ڕابمێنین .. ئایا پاشگەزبوونەوەکە ڕاست بوو؟ یان شێخ بنەمای ((جەنگ فێڵە))ی پەیڕەو دەکردو، لەوکاتەدا کەخەریکی پڕچەك کردنی سوپا نهێنیە تایبەتەکەی بوو بەقومبەلەو تەقەمەنی و تۆپ، ئامادەی دەکردن بۆ گەورەترین شاڵاوی ئیرهاب کەمێژووی نوێی میسر بەخۆیەوە بینی، دەیویست دڵنیای

(٤٦) السيد محمد عشماوي، المرجع السابق، ص ٢٠٥.

لەدەروونی نەیارەکانیدا دروست بکات؟... ئەگەر بۆشمان هەبێت کەیەکێك لەم دوو ئەگەرە هەڵبژێرین، ئەوا دووەمیان هەڵدەبژێرین.

جارێکی تریش دێینەوەو هەوڵ دەدەین بەنێو مەسەلەی بێ بەرنامەیەکەدا بگەڕێین.

شێخ یەك لەدوای یەك بەڵێن دەدات کە بەرنامەیەك پێشکەش بکاتو بەڵێنەکەشی ناباتەسەر، لەچەند پەڕەیەکی ڕابردووشدا زیاتر لەچەند بەڵێنێکمان خوێندەوە کەنەیبردوونەسەر .. ئەمەش بەڵێنێکی ترە: لەپەیامەکەیدا ((خەڵك بۆ چ شتێك بانگ بکەین))، مورشید بەم شێوەیە ئاماژەی بەمەسەلەکانی سەردەم کرد، جیهانگیریو ناسسیۆنالیستیو سۆشیالیستیو سەرمایەداریو بەلشافیەتو جەنگو دابەشکردنی سەروەتو سامانو پەیوەندی نێوان موڵکدارو بەکارهێنەر، ئیسلام باسی هەموو ئەم مەسەلانەی کردووە. پاشان شێخ هاتەوەو گوتی ((ئێرە شوێنی ئەوە نیە کەبەدرێژی لێی بدوێین، چونکە مەسەلەکە پێویستی بەچەند خولو لێدوانێك هەیە))[٤٧].

پاشان بەڵێنی دا کەبەدرێژی لێی بدویو یەکلایی بکاتەوە .. بەڵام هەرگیز بەڵێنەکەی نەبردە سەر ((ئەمەش لەبەرئەوەی بەننا هەرکاتێك بەدوورو درێژی قسەی لەسەر ئەو پێشنیارانە کردبێت کەپەیوەستن

---

[٤٧] حسن البنا، الى أي شيء تدعوا الناس.

بەحکومەتی ئیسلامیەوە هەمیشە قسەکانی لێڵ و ناڕوون بوون، هەرگیز ڕووشی نەداوە کەبەڕوون و ئاشکرایی نیەت و ئامانجەکانی شی بکاتەوە))[٤٨].

ئەو توێژەرەش کە حەز دەکات بگاتە ڕاستی و سوورە لەسەرئەوەی تەلیسمی لێڵی و ناڕوونیە دروست کراوەکان بشکێنێت، هیچی بەدەستەوە نامێنێت، تەنها ئەوە نەبێت کەلەهەڵوێستە کرداریەکان بکۆڵێتەوە .. ئەمەش لەپێناوی گەڕان بەدوای ئەو بەرنامە کرداریەدا کەبەننا خۆی هەڵیبژاردبوو. ئەگەر بەرنامەکەش وەکو بەڵگەنامەیەکی سیاسی لەلایەن شێخ بەنناوە هەرگیز نەنووسرابێت، ئەوا کۆی هەنگاوە کردارییەکانی شێخ، بەرنامە سیاسیەکەی پێك دەهێنن.

دەبا هەنگاو بەهەنگاو لەگەڵ شێخدا بڕۆین و لەو ڕەفتارو هەڵوێستانە رابمێنین کەسەبارەت بە ڕووداوو چین و مەسەلەکان هەیبوو، بەڵکو ڕاستیی ئەو بەرنامەیە تێبگەین کەبە مەبەست دەیویست بیشارێتەوە، هەروەها زۆر سوریش بوو لەسەرشاردنەوەی.

شێخی بەننا ئامۆژگاریی شوێنکەوتووەکانی دەکات و دەڵێت ((بەفیکرەی ڕاست خەڵکی لەفیکرەی پوچەڵ دووربخەنەوە))[٤٩] ، واتا بەمەبەست ڕەخنە

---

[48] Harris – op. Cit. P. 162.

[٤٩] حسن البنا، مذكرات الدعوة والداعية، ص ١١٥.

لەو هەڵانە ناگرێت کەلەبۆچوونی خەڵکیدا هەیە، بەڵکو لەرێی پێشکەش کردنی ئەلتەرناتیڤێکەوە رەخنەیان لێدەگرێت.

دە با بزانین ئەو ئەلتەرناتیڤەی شێخ پێشکەشی کردبوو چیە؟

وەکو رەتکردنەوەیەك بۆ دەستوری (١٩٢٣)، ئیخوان رایانگەیاند کە ((قورئان دەستورمانە)).

وەکو رەتکردنەوەیەکیش بۆ پێشەوایەتیە سیاسیەکان (بەتایبەت نەحاس پاشا)، رایانگەیاند ((پێغەمبەر پێشەوامانە)).

وەکو رەتکردنەوەیەکیش بۆ میسرگەریو خەباتی میسری، ئالاکانی ((خەلافەتی ئیسلامی))یان بەرز کردەوە.

وەکو رەتکردنەوەیەکیش بۆ خەباتی هاوبەش لەگەڵ گەلانی دیکەدا، بەننا رایدەگەیەنێت ((سەرەی ئێوەیە کەببنە سەرکردەی نەتەوەکانو سەروەری میللەتان، ئەو رۆژانەش لەنێو خەڵکدا تاوتوێ دەکەین))[٥٠].

وەکو رەتکردنەوەیەکیش بۆهەر خەباتێکی کۆمەڵایەتی لەدژی دەوڵەمەندە سەرمایەدارەکان، شێخی بەننا دەڵێت ((بەڵام هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر دەوڵەمەندو خاوەن سەرمایەکان، ئەوا هیچ شتێك لەنێوان ئێمەو ئەواندا نیە تەنها زەکات دان نەبێت))[٥١]

---

[٥٠] انور الجندي، الاخوان المسلمون في ميزان الحق- ص ٢٨.

[٥١] طارق البشري، المرجع السابق ص ٦٩.

لەڕووبەڕووی بوونەوەی دەسیسە ئیستیعماریە زایۆنیەکانیشدا دژی فەلەستین و عەرەب، ئیخوان شەڕەکەیان لەگەرمەو کەف و کوڵیدابادایەوەو گۆڕییان بۆ شەڕی نێوان مسوڵمانان و جولەکە .. چەندەها هێرشیان کردە سەر جولەکە میسریەکان، وەك ئەوەی کە بیانەوێت زۆر بەتوندی هانی کۆچ کردنیان بدەن بۆ ئیسرائیل.(٥٢)

بەم شێوەیە بەرامبەر هەر هەڵوێستێك هەڵوێستێکیان دانابوو.. بڕیاردانیش لەنێوان ئەم دوو هەڵوێستەدا جێ دەهێڵین بۆ کەسانی دیکەو خۆمان هیچ ناڵێین، تا ئەوان بینە حاکم و بڕیاری لسەربدەن. بەڵام ئەو شتەی کە گرنگ و بنەڕەتیە لەوڵاتێکی نیمچە داگیرکراوی وەك میسری چلەکاندا، هەڵوێست وەرگرتنە بەرامبەر بەقەزیە نیشتمانیەکە .. سەبارەت بەم مەسەلەیەش دەبینین ئیخوان هەڵوێستێکی زۆر ((نەرم))یان وەرگرتبوو، بۆیە وشەی ((نەرم))یشمان بەکارهێنا، چونکە شەرمە وشەی تر بەکار بهێنین.

هەروەها لەمەشدا هەر چاوپۆشی لێکردن هەبوو .. چونکە بەبۆچوونی ئەمان ئیستیعمار (لەڕووی مەبدەئەوە) جگە لەهێرشێکی ((خاچ پەرستانە))هیچی دیکە نیە. بەمەش خەبات کردن لەدژی ئیستعمار،

(٥٢) لمزيد من التفاصيل راجع: د. رفعت السعيد – اليسار المصري والقضية الفلسطينية– دار الفارابي بيروت.

لەهــەموو چــەمكێكی نیشــتمانی و نەتــەوەیی و ئــابوری و كۆمەڵایــەتی داماڵرێت و، بەتەنهاش ڕۆدەكرێتە ناو ئاشی دوژمنایەتی ئاینییەوە .. كەجیاوازی دەخاتە نێوان ئەو مسوڵمان و مەسیحیانەی نەوەی یەك نیشتمانن.

زۆر لەنەیارەكانی ئیخوانیش چەندەها چیرۆكیان لەسەر پەیوەندیە بەردەوامەكانی نێوان مورشید (بەننا پاشانیش ئەلهوزەیبی) و باڵوێزخانەی بەریتانیدا خستۆتە ڕوو ... ئێمە نامانەوێت بكەوینە دووبارە كردنەوەی چەند تۆمەتێكی بێ بەڵگە. بەڵام یەكێك لەو توێژەرانەی كەلەلایەن ئیخوانەوە پەسەندكراوە -ئەوەی كەلەدوا دواییدا گۆڤاری ئەلدەعوە چەند پەڕەیەكی تەرخان كردبوو بۆ ستایش كردنی -و ئەویش میشێلی توێژەری ئەمریكیە، دەڵێت ((پاش ئەوەی لەئۆكتۆبەر - تشرینی یەكەمی ١٩٤١ دا بەننا بەربوو، چەند پەیوەندیەك لەنێوان باڵوێزخانەی بەریتانی و ئیخوان موسلیمیندا دروست بوو، كەسیش نازانێت كێ هەستاوە بەم پەیوەندیانەو كەی كراویشن))[٥٣]. بەڵام ئیخوان خۆیان دان بەم پەیوەندیەدا دەنێن و بەوە پاساوی دەدەنەوە كەئەمە پەیوەندیە لەسەر داواكاری ئینگلیز كراوە، كەزۆر لەیەكتر نزیك بوونەوەی ئیخوان و كۆشك دەترسان! ڕۆژنامەی ئیخوان موسلیمینیش بەبێ هیچ هەست بەشەرم كردنێك بەردەوام دەبێت و دەڵێت،

---

[53] Mitchell- op. Cit. 28.

پاش تاوتویٚ کردنی بۆ ڕوون و بەرنامەی کۆمەڵەکە، لایەنی ئینگلیزی ئامادەیی خۆی پیشان دا کە باڵویٚزخانەی بەریتانی ئامادەیە کۆمەکیٚکی ماددی پیٚشکەش بەکۆمەڵەکە بکات، وەکو یارمەتی دانیٚك بۆ بەئەنجام گەیاندنی پەیامەکەیان. ڕۆژنامەی ئیخوانیش جەخت لەسەر ئەوە دەکات کەبەننا ئەم یارمەتیەی ڕەت کردۆتەوە.[٥٤]

بەڵام تویٚژەریٚکی تر (Dunne Heyworth) بەپشت بەستن بەسەرچاوەیەك کەخۆی ناوی نابوو، سەرچاوەیەکی ئیخوانی کەپەیوەندی لەگەڵ باڵویٚزخانەی بەریتانیدا هەبوو، جەخت لەسەرئەوە دەکات کە حەسەن ئەلبەننا لەڕیٚی پەیوەندییەکانەوەو لەڕیٚی چەند توخمیٚکی نیٚوانیانەوە ئاماژەی بەوەداوە ((کەئامادەیە هاوکارییان بکات و مەمنونیش دەبیٚت ئەگەر یارمەتیەکی ماددی پیٚشکەش بکریٚت، هەرهەمان تویٚژەریش دیٚتەوەو دووپاتی دەکاتەوە کەچەند یارمەتیەکی گەورە پیٚشکەش بە ڕۆژنامەی ئیخوان کراوە، بەتایبەتیش لەساڵی (١٩٤٧)دا، ئەم ئەرکەش لەسەر شانی ئەحمەد ئەلسوکەری بوەو ئەو بەڕیٚوەی بردووە، جاریٚکیشیان داوای چل هەزار دۆلارو ئۆتۆمبیلیٚکی کردبوو وەکو بەرامبەریٚك بۆ یارمەتیدانی پیلانی

---

[٥٤] راجع في تحقيق هذه الواقعة: حسن البنا، نظام الاسر، نشأته واهدافه – وايضا الاخوان المسلمون ٣١/٧/ ١٩٤٦ وأيضا الدعوة ٢٩/٥ / ١٩٥٤.

بەریتانیا لەلایەن کۆمەڵەکەوە.[55] توێژەرێکی دیکەش ئاماژە بەهەڵوێستی ئیخوان دەکات بەرامبەر ڕووداوەکانی ساڵی (١٩٤٢)و باسی ئەوە دەکات کەچۆن وازیان لەنزیك بوونەوە لەئەڵمان و هاوپەیمانەکانی هێناو ئەوەیان ڕەت کردەوە بەشداری لەو خۆپیشاندانانەدا بکەن کەهاوارو دروشمەکەیان ئەمە بوو ((ڕۆمل، بۆ پێشەوە))، پاشان دوای ئەمەش جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە ((یارمەتیە مادیەکان پێشکەش کرابوون و قبوڵیش کرابوون))[56].

وەك ئەوەش کەلەم توێژینەوەیەدا پێی ڕاهاتووین، نامانەوێت شتێك باس بکەین و بخەینەڕوو، ئەگەر بەڵگەی مەلموس و لەسەدا سەدی لەگەڵدا نەبێت، کەواتە با باسی ئەو شتانە بکەین کە گومانیان تێدانیە. ئەوەی گومانی تێدانیە ئەوەیە کەشێخی بەننا زیاتر لەجارێك بەنووسین دانی بەوەدا ناوە کەچەندەها لایەن ئامادەیی خۆیان پێ ڕاگەیاندووە کە وەکو یارمەتیەك بۆ جێبەجێکردنی ((بەرنامەکەی)) لەڕووی پارەوە دەسگیرۆیی بکەن .. جارێك خۆی ڕایگەیاندووەو دووپاتی کردۆتەوە کە ئیسماعیل سدقی ستەمکار بەڵێنی پێداوە، جارێکی تریش دووپاتی کردۆتەوە کەباڵوێزخانەی بەریتانیش بەهەمان شێوە ئەو بەڵێنەی پێداوە .. جەختیشی لەسەر ئەوە کردووە کەهەردووکیانی ڕەت کردۆتەوە.

---

(55) Heyworth- Dunne- op. Cit. P. pp. 38- 41.

(56) Behm les Freres Musulmans- pp. 200. 218.

باشە .. باقسەکانی خۆ. وەرگرین و واش دابنێین کەهەردوو بەڵێنەکە ڕەت کراونەتەوە.. بەڵام یەك پرسیاری سەرسوڕهێنەر دەمێنێت کەئەمەیە، بۆچی ستەمکارێکی وەك ئیسماعیل سدقی و باڵوێزخانەیەك کەنوێنەری داگیرکردنێکە بەلای دڵی هەموو میسریەك و ئیمانداریکەوە قێزەونە، هێندە پەرۆشی پێشکەشکردنی چەند کۆمەکێکی مادین بۆ ئیخوان موسلیمین تا لەجێبەجێکردنی ((بەرنامەکەیاندا)) یارمەتیان بدەن؟.

ئەمە چ بەرنامەیەکە؟ و تاچەند لەگەڵ بەرژەوەندی ئیسلام و مسوڵمانان و میسرو میسریەکاندا دەگونجێت! تەنها پرسیارێکەو بێ وەڵام بەجێی دەهێڵین.

بەڵام واقیعە بەرچاوەکان و هەڵوێستە کرداریەکانی کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کەنەسدقی و نەباڵوێزخانەی بەریتانیش گێل نەبوون کاتێك ئەم بەڵێنانەیان پێشکەش کردووەو خستۆتەڕوو.

چونکە کاتێك سدقی دەستی کرد بەگەشتی خیانەتەکەی لەساڵی (١٩٤٦)داو، کاتێکیش هەموو گەلی میسری لەدژی وەستان .. ئیخوان لەهەموو شوێنێکدا پشتگیری خۆیان بۆ سدقی دووپات دەکردەوەو .. بەبێشەرم کردنیش ئەم ئایەتە پیرۆزەیان بەکاردەهێنا ((واذكر في كتاب ابراهيم أنه كان صادق الوعد وكان صديقا نبيا)).

کاتێکیش سدقی هەنگاوێکی نوێی لەسەر خیانەتی نیشتمانی ناو کەوتە مفاوەزات کردن لەسەرئەو پەیماننامەیەی کەشایانی نەفرەتەکانی هەموو گەلی میسربوو (پەیماننامەی سدقی - بیڤن)ئیخوان پشتگیریان لێکردوو ڕووداوی (سولحی حودەیبییە)یان بۆ پاساوکردنی ڕەفتارەکانی بەکارهێنا.[٥٧]

شایەتێکی ئاگاداری تریش کەبەبێ لایەنی و وردبینی ناسراوە، ئەویش (صلاح الشاهد)ە، شتێك دەگێڕێتەوە کەدووپات کردنەوەیەکە بۆ ئەو مەسەلەیە. ئەم شایەتە دەڵێت کاتێك سدقی گەیشتە ڕێکەوتن نامەی سدقی- بیڤن ((وایدەزانی ئیخوان موسلیمین بنکەیەکی میللی خاوەن سەنگ و کێشن، بۆیە دووسەعات پاش گەڕانەوەی لە لەندەنەوە، مورشیدی گشتی بانگ کردو پێش ئەوەی پرۆژەی ڕێکەوتن نامەکە نیشانی نەقراشی و هەیکەلی بەشداربووانی حوکمڕانی بدات، نیشانی مورشیدی دا، ڕەزامەندیی مورشیدیشی سەبارەت بەپرۆژەکە بەدەست هێنا .. کاتێکیش خۆپیشاندانە میللیەکان لەدژی ئەم پەیماننامەیە توندبوون، سدقی پاشا داوای لەمورشیدی گشتی کرد کەسواری ئوتومبیلە سەربە تاڵەکەی سەلیم زەکی پاشای یاریدەدەری حوکمدار ببێت و هەوڵبدات جەماوەر هێورو ئارام

---

[٥٧] محمد جلال، مصريون لا طوائف- النيل للطباعة- القاهرة (١٩٥١) ص٦١.

بكاتەوە، مورشیدی گشتیش ..دەم داواكارییەكەی سدقی پاشاوە هات))[58] لەبەردەم ئەم شایەتیەدا دەوەستین.

- ئەمـــە چ پەیوەندیەكـــە كەســـدقی خـــائین و ســـتەمكار بەمورشـیدی گشــتیەوە دەبەســتێتەوەو، واش دەكـات كەمورشـید بـۆ سدقی نزیكتربێت لەبەشدارانی حوكمڕانی .. نەقراشی و هەیكەلەكەش.

- بەننا لەسەر ئەو پەیماننامەیە ڕەزامەندبوو كە هەموو میسر ڕەتیان كردەوە، ئەو پەیماننامەیـەی كەهـەتا ئێسـتا هێمـای خیانـەتی نیشتمانی و بەرباكردنی مافەكانی نیشتمانە.

- مورشـید ڕێگـەی بـەخۆیدا كەسـواری ئۆتۆمۆبێلـی پۆلیـس بێـت و هـەوڵبدات ئەو خۆپیشـاندەرانە هێمـن بكاتـەوە كـەدژی ڕێكـەوتن نامەی خیانەتەكە بوون.

- سەبارەت بەوەیش مورشید سواری ئۆتومبیلەكەی سەلیم زەكی بووە، ئەوا ئەوە شتێكە هیچ گومانێكی تێدانیەو ڕۆژنامەكانی ئەو سەردەمەش پڕن لەوێنەی ئەم ڕووداوە .. بەڵام دوو ڕووداوەكەی یەكەم، ئەوا لەسەر قسەی ((ئەلشاهد)) گێڕامانەوەو ئەو لێیان بەرپرسیارە.

- بەڵام تێبینی دەكرێت كەمانگە هەنگوینییەكە زۆر بەردەوام نەبوو و.. ئیخوانیش هەوڵیاندا ڕوو لەئەمریكا بكەن. كتێبەكەی مستەفا

---

(٥٨) صلاح الشاهد، ذكرياتي في عهدين - دار المعارف- القاهرة (١٩٧٦) ص ٤٨.

موئمینیش ((صوت مصر))- مستەفا پێشەوایەکی ئیخوانیە- پڕە لەڕووداوو بەڵگەو .. ڕوو وەرگێڕان بەرەو ئەمریکا ((ئەی ئەمریکیەکان .. ئێوەن گەلی ئازادو .. رابەرانی دیموکراسیەت))[59].

- هەموو کتێبەکەش لەسەر ئەو شێوازە دەڕوات.
- مانگی هەنگوینی نێوان ئیخوان و بەریتانیاش لەلایەن هەردوولایەنەکەوە پاساو درابوو. ئیخوان خەباتکردنیان لەدژی داگیرکەری بەریتانی نەکردبووە تەوەرەی کارە سیاسیەکانیان وەك هەر حیزبێکی نیشتمانی دیکە، بەڵکو بەپێچەوانەی ئەمەوە هەمیشە دووپاتیان دەکردەوە جەختیان لەسەرئەوە دەکرد کەتەوەرەی خەباتکردن حکومەتی ئیسلامیە نەك وەدەرنانی ئیستیعمارە.

د.ئیسحاق موسا ئەلحوسەینی توێژەر، کەپەیوەندییەکی توندو تۆڵی بەبزووتنەوەی ئیخوانەوە هەبوو، دەڵێت ((ئازاد کردنی هەموو دۆڵی نیل لەسەنگ و نفوزی بیانی، داواکارییەك بوو کەبەلای ئیخوانەوە گرنگیەکەی پاش داواکاری پێك هێنانی دەوڵەتی ئیسلامی دەهات))[60].

لەکاتێکیشدا کەهەموو میسر لەگەرمەی خەباتکردندا بوو دژی ئیستیعمار، خۆپیشاندانەکانیش هەموو شەقامەکانیان پڕ کردبوو داوای

---

[59] مصطفی مؤمن، صوت مصر- ص ۲۷٦.

[60] د. اسحق موسى الحسينى، المرجع السابق ص ٩٤.

وەدەرنـانی ئیسـتیعماریان دەکـرد، زانکـۆش کلّپـەی دەسـەند لـەکاری شۆڕشگێڕیدا دژی داگیرکەرو بەکرێ گیراوەکـانی، ئـا لـەم کاتـەدا دەبینـین کەکۆنگرەی قوتابیـانی ئیخوان هـەموو مەسەلەکە ڕووەو زەرورەتـی جـەخت کردنە سەر ((گێڕانەوەی خەلافەتی بزربوو))[٦١] بادەدەنەوە.

لەنامەی ((بەرەو ڕووناکی))شدا بەننا باسی ئەوە دەکات کە خۆی ناوی نابوو ((دە گوناهـە فەوتێنەرەکە)).. ئیسـتیعماریش لەسەروو هەموویانـەوە دادەنێت. پاشان پەنجا داواکارییش لەداواکارییە کرداریەکانی بانگەشەکە لەژێر ناونیشـانی ((هـەندێك هـەنگاوی چاكسازیی کردایـی))دا دەخاتـەڕوو، لەناو هـەموو ئەمانەشدا، یـەك داواکاری تێدا نـەبوو کەپـەیوەندی بەکێشـە نیشتمانیەکە یـان وەدەرنـانی داگیرکـەر یـا سـەربەخۆیی یـا ڕێگری کـردن لـە ئیستیعمارەوە هـەبێت. بـەڵکو هـەموو ئـەو شـتانەی کـەتێیدا بـوو بڕگـەیەکـە دەڵێت ((وەکو سەرەتایەك بۆ بیرکردنەوەی جدیی کرداری لەبارەی خەلافەتی لەدەست چووەوە، دەبێت پـەیوەندیو بەسـتەرەکان لـەنێوان هـەموو وڵاتـە ئیسلامیەکاندا بەهێزبکرێت، بەتایبەتیش عەرەبیەکانیان))[٦٢].

لەدەیـەمین یـادی کۆمەڵەکەشـدا (١٩٣٨)، حەسـەن ئەلبـەننا دووپـاتی کـردەوە کەئیخوان گێڕانـەوەی خەلافـەت لـەپێش هـەموو شـتێکەوە دادەنێـن.

---

[٦١] مؤتمر طلبة الاخوان المسلمين، ص ٤٠.

[٦٢] حسن البنا، نحو النور.

لەپەیامەکەشیدا ((خەڵکی بۆ چ شتێك بانگ بکەین)) بەننا باسی نیشتمانی ئیسلامیی کردو گوتی، نیشتمانی ئیسلامی ئەو نیشتمانەیە کەلەسنووری نیشتمانی جوگرافیو نیشتمانی هاوخوێنی بالآتر دەبێت بۆ پارەنسیپە نیشتمانییەکان.[٦٣]

پێدەچێت مافی خۆشمان بێت بپرسین، ئایا ئیخوان بەهەموو ئەو هیواو ئاواتانەوە کەبە فاروق پاشای گەندەڵەوە بەستبوویانەوە، وەك ئەوەی بەننا خۆی دووپاتی کردەوە کاتێك گوتی ((ئێمە هیوامان بەپادشای خاوەن شکۆی مسوڵمانان هەیە خوا پشتگیریی بکات))[٦٤]، وە بەهەموو ئەو پەیوەندیانەشەوە کەلەنێوان ئەوان و کۆشکدا دروست ببوو، لەپەڕەکانی داهاتودا ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین .. ئایا لەوکاتەدا کەباسی خەلافەتە بزربووەکەیان دەکرد، مەبەستیان ئەوەبوو بیدەنە دەست پاشا گەندەڵەکە؟... یان ئایا چ خەلیفەیەکی دیکەیان دەویست؟

ئەوەیش کەپاڵمان پێوەدەنێت بۆ ئەم پرسیارە، سوربوونی ئیخوان و مورشیدەکەیانە، لەسەرئەوەی کەمەسەلە تەوەرەییەکە گێڕانەوەی خەلافەت بووە، هەرگیزیش ڕایاننەگەیاندووە کە چ خەلیفەیەکیان دەوێت، بەڵکو

---

[٦٣] حسن البنا، الى أي شيء ندعو الناس.

[٦٤] النذير- العدد الاول- مايو ١٩٣٨.

هەرگیزیش هەوڵیان بۆ گۆڕانکاریەکی ((ناوخۆیی)) نەداوە کە زەمینە بۆ دروست بوونی خەلیفەیەکی مسوڵمان و چاکی هەق و ڕاست بڕەخسێنێت.

((ناوخۆ)) وەك خۆی بەجێبهێڵێت و.. بگرە بکەوێتە ستایش و پیاهەڵدانی پادشاو چەپڵەی بۆلێدات و بەبۆنەی جەژنی لەدایك بوون و چوونەسەر تەختیەوە، چەندەها ئاهەنگی پڕ لەمەرایی بگێڕێت ... پاشان لەپێشترین ئەرکیشی گێڕانەوەی خەلافەتە لەدەست چووەکە بێت، ئەوا ئەمە مەسەلەیەکی سەیرو سەرسووڕهێنەرەو .. بواری هیچ وەلامدانەوەیەکی دیکەشمان نادات.

ئەگەر دروشمی ((خەلافەتی ئیسلامی))ش لەبەرامبەر ((نیشتمان پەروەری))دا دانرابێت و بەلای ئیخوانەوە پیرۆزتریش بووبێت لێی، ئەوا هەروەها لەبرامبەر نەتەوەخوازیی عەرەبیشدا دانراوە. ئەبولحەسەن ئەلنەدوی دەڵێت ((ئەم بێگەردیەش هەر بەرقەرار بوو و ئەم متمانەیەش هەر بەردەوام بوو و هیچ شتێك لاوازی نەدەکرد، لەبەرئەوەی عەرەب دڵسۆزبوون بۆ ئیسلام و خۆیان بۆ تەرخان کردبوو .. نەتەوەی ئیسلامیان بەهیچ پەیام و بانگەوازێکی تر نەدەگۆڕیەوە، جگە لەئیسلامیش بۆ هیچ ڕێبازێکی دیکە پەرۆش نەبوون. بەلام کە لەم سەردەمەی دواییدا خوو ڕەوشتیان گۆڕراو کەوتنە بانگەوازکردن بۆ نەتەوەخوازیی عەرەبی و چەند بانگەوازو ڕێبازێکی دیکەیان دروست کردو گرتەخۆو بۆی پەرۆش بوون. متمانەی

گەلە ناعەرەبەکان پێیان لەرزۆك بوو، تێڕوانینی ئەم گەلانەو جیهانیش بەرامبەریان گۆڕرا))[٦٥].

حەسەن ئەلبەنناش لەسەر هەمان ڕێباز دەڕوات، بەننا عەرەبایەتی پێ قبوڵە ((وەکو بەستەرێکی شارستانی نەك نەتەوەیی))، هەروەها واش دەبینێت کەعەرەبایەتی ((یەکێتیەکی ڕوحییە بەرۆچوونی ئیسلام بەدەرورونی هەموو نەتەوەکانیدا))[٦٦]

تەنانەت کێشەی فەلەستینیش کۆمەڵەکە لەڕوانگەیەکی ئایینیەوە سەیریان دەکرد نەك لەڕوانگەیەکی نەتەوەییەوە. تاریف ئەلبوشری دەڵێت ((بزووتنەوەی ئیخوان موسلیمین توانیان لەم لایەنەوە هەستی میسریەکان بوروژێنن و کاردانەوەی دژ بەزایۆنیزم بخەنە خزمەت بەرژەوەندیی خۆیانەوە، نەك لەو ڕوانگەیەوە کەجەنگەکە لەنێوان زایۆنیزم و بزووتنەوەی نیشتمانیی عەرەبیدایە، بەڵکو وەکو جەنگێکی نێوان جولەکەو ئیسلام. بەمەش کۆمەڵەکە ئەو بەشەی مەسەلەی خەلافەت و جامیعەی ئیسلامییان بووژاندەوە کەیەکلایی کرابووەوەو کۆتایی پێ هێنرابوو، هەروەها کۆمەڵەیەکیشیان بەرامبەر بزووتنەوە نیشتمانیەکە بەناوی ئایینەوە

---

[٦٥] ابو الحسن الندوي، كيف دخل العرب التأريخ؟ الطبعة الثانية- المختار الاسلامي ١٩٧٥ - ص ٢٠.

[٦٦] أنس صايغ، الفكرة العربية في مصر- ص٢٠٠.

بۆخۆیان دروست کرد، لەژیانی سیاسی میسریشدا جووتەکێکی دەسکرد هاتەگۆڕێ ... جوتەکی ئایین و نیشتمان))[٦٧].

بەلآم هەڵوێستی ئیخوان بەرامبەر جیهان و سیاسەتی دەرەکی، ئەوا هەڵوێستێك بوو جێگای سەرسوڕمان بوو، بەوەی کەمیشێل دەڵێت، ئیخوان لەبەردەوام بوونی شەڕی ساردد‌ا توخمێکی سوودمەندیان بۆ ئیسلام و ئوممەی ئیسلامی دەبینی، چونکە ئەو هەلەیان بۆ دەڕەخسێنێت کە ببنە نێوەند لەنێوان هەردوو سەربازگەی شیوعی و سەرمایە داریدا.[٦٨] هەروەها ئەوەش کەسەید قوتب- یەکێکە لەپێشەواکانی ئیخوان- نوسیبووی هەر جێگای سەرسووڕمانە، دەڵێت مسوڵمانان بەشێوەیەکی کاتی پێویستیان بەسەربازگەی شیوعی هەیە، تا ستەمکارو چەوسێنەرەکانی پێ بترسێنن.[٦٩]

با جارێکی تریش شانبەشانی شێخ و کۆمەڵەکە بڕۆین و هەوڵبدەین ((بەرنامەکە)) لەجەرگەی مامەڵەو هەڵوێستە ڕۆژانەکانەوە هەڵێنجێنین. کۆی هەڵوێستەکانی ئیخوانمان سەبارەت بەکێشە نیشتمانیەکەو نەتەوەخوازیی عەرەبی هەڵێنجا، بەو شێوەیەی کە ((ڕێبازەکەیان)) و ((بەرنامەکەیان)) لەم ڕووەوە دیاری بکات. ئینجا با ڕووبکەینە کێشەو گرفتە ناوخۆییەکانی

میسرو .. مەسەلە کۆمەڵایەتیە بەبایەخەکان.

[٦٧] طارق البشري، المرجع السابق ص ٢٠١.

[68] Mitchell – op. Cit. P. 271.

ئەگەر شێخی بەنناش، لە وتەکانیدا،کۆمەڵێ دوعاو نزای دیاری کردبێ؛ تا ئیخوان دووبارەی بکەنەوە، وەك ((خودایە پەنا بەتۆ دەبەم لەکوفرو هەژاری بمانپارێزێت))[70]، ئەوا بینیمان چۆن مەسەلەکە تەنها لەوەدا کورت کرابۆوە کەئەوەی لەسەر سەرمایەدارەکان پێویست ئەوەیە کەزەکات بدەن.

حەسەن ئەلبەنناش لە((کێشەکانمان لەڕۆشنایی سیستمی ئیسلامیدا)) داوا دەکات ((سەرمایەی ناوخۆیی بخرێتە جێگای سەرمایەی بیانی))، ئەمەش هەنگاوێکی خراپ نییە، بەڵام هەروەها ئەمە داواکاریی ئەو سەرمایەدارانەش بوو کەدەیانویست بازاڕ بەتەنها بۆ خۆیان بێت.. کاتێکیش گیروگرفتەکانی کشتو کاڵ تاوتوێ دەکات، داوای ئەوە دەکات کە بەرزترین سنووری موڵکداریی کشتوکاڵی دیاری بکرێت- ئەم سنوورەش باس ناکاتو دیاری ناکات- بەشێوەیەك کەخاوەن موڵك هەستێت ((بەفرۆشتنی))ئەوەی لەم سنوورە زیاترە بەجووتیارە نەدارو هەژارەکان، بەنرخێکی گونجاوو لەشێوەی چەند قیستێکی ماوەدرێژیشدا پێیان بفرۆشێت.[71]

---

[69] سید قطب، السلام العالمي والاسلام (١٩٥١) ص ١٦٧.

[70] حسن البنا (الامام الشهيد)، المأثورات- الطبعة الثانية- دار الشباب (١٩٧٥) ص ٣٤.

[71] حسن البنا، مشكلاتنا في ضوء النظام الاسلام. ص ٨٣.

ئەمەش قەیدی ناکات، بەڵام تێبینی دەکەین کەبەننا تەنانەت سەبارەت بەو تێڕوانینە چاکسازییانەش کۆنەپەرست بووە کەلەنێو ریزی گەورە خاوەن موڵکەکانی میسری چلەکاندا باوبووە، وەك پرۆژەکانی مریت غالی و محەمەد خەتاب. لەوانەشە کۆمەڵەکە تەنانەت بەرگەی ئەم جۆرە هەڵوێستە ساکارانەشیان نەگرتبێت، ئەوەتا کاتێك دەبێتە ڕاست و شۆڕشی تەمموزی (١٩٥٢) دەکەوێتە جێ بەجێ کردنی پرۆژە چاکسازیە کشتوکاڵیەکان، کۆمەڵەکە لەهەڵوێستە کۆنەکەیان پاشگەز دەبنەوەو چەند پێشنیارێکی کۆنەپەرستانەتر پێشکەش دەکەن.

یەکێك لەتوێژەرەکانیش تێبینی دەکات کە((لێك دژیەك فەرمانڕەوایی هزری ئابووریی بەننا دەکات، بەند ڕێگا بەتاکە کەسەکان دەدات کەخاوەنی سەروەت و سامان (سەرمایە)بن و قۆرخی بکەن، بەڵام لەهەمان کاتیشدا قازانج حەرام دەکات)) لەبەرئەوەی بەننا ((وای بۆ دەچێت کەقازانج وەکو ریباو سوو حەرامە، هەروەك چون کەلەپوسیاش حەرامە))[٧٢].

با ئێستاش بێینە سەر خاڵێکی دیکەی نوێ .. هەڵوێستی بەننا سەبارەت بەچینی کرێکارو کێشەکانیان و ململانێکانیان، چیە؟ بۆ ساتی یەکەم توێژەر لەئەدەبیاتەکانی ئیخواندا تێبینی چەند دەستەواژەیەکی زمانەوانی کاریگەر دەکات، وەك: زۆر لەکرێکاران هاتن بۆ مەڵبەندی گشتی،

(72) Khadduri- op. Cit. P. 271.

فرمێسکی لەکوڵ بەچاویان دەچۆڕاو سەختی ژیان‌و کلۆڵی خۆیان هەڵدەڕشت .. حاڵ‌و گوزەرانیان جەرگی پارەپارە دەکردو دڵی خەڵتانی خوێن دەکرد.[٧٣] بەڵام لەهەمان کاتدا توێژەر تێبینی ئەوەش دەکات کەشێخ بەننا لەوانەیەکدا کەبۆ بەشی کرێکارانی کۆمەڵەکەی ئامادەکردبوو دەڵێت، کرێکاران پێویستە لەسەریان هەمیشە ئەرکەکانیان بەرامبەر ((خواو بەرامبەر خۆیان‌و بەرامبەر خاوەن کار))[٧٤] لەیادبێت.

لەڕاستیشدا بەشی کرێکارانی کۆمەڵەکە، بەڕاددەیەکی زۆر فراوان چالاك ببوو و هەوڵیشی‌دا چەند سەندیکایەکی کرێکاری پێك بهێنێت کە بۆچوون‌و مەبدەئەکانی کۆمەڵەکە بڵاوبکاتەوە. لەناوەڕاستی چلەکانیشدا ئەم هەوڵ‌و کۆششانە سەنگ‌و نورینێکی ئاشکرایان لەڕیزی کرێکارانی گواستنەوەدا لێکەوتەوە، هەر لەو ساڵانەشدا ڕۆژنامەی ئیخوان بڵاوی کردەوە کەکرێکارانی گواستنەوە، بڕیاری دامەزراندنی سەندیکایەکیان داوە کە ((لەسەر ڕۆشنایی پەیامی ئیخوان موسلیمین))[٧٥] کار دەکات. هەروەها

---

[٧٣] الاخوان المسلمون، ١٩٤٦/٥/٧.

[٧٤] الاخوان المسلمون، ٢٤/ ٨/ ١٩٦٤.

[٧٥] الاخوان المسلمون، ١٩/ ٦/ ١٩٤٦.

کۆمەڵەکە لەسویسیش هەندێك نفوزیان لەریزی کرێکارانی نەبێت و کرێکارانی رستن و چنیندا هەبوو.(٧٦)

لەگەڵ ئەوەشدا کەنۆرینی ئیخوان لەنێو چینی کرێکاردا زۆر نەبوو، بەڵام شتێکی سود بەخشە گەرهەندێك رۆشنایی بخەینە سەرچۆنیەتی رێنمایی کردنی شێخ و کۆمەڵەکە بۆ کرێکارە ئیخوانییەکان.

هەر لێکۆڵەرەوەیەکی مێژووی بزووتنەوەی کرێکاریی میسر، راستەوخۆ راستیی ئەم رۆڵە هەست پێ دەکات .. ئەوەی کە ئیخوان و کرێکارەکانیان لەبەرەی دژ بەبزوتنەوەی چینی کرێکاردا بوون.

ئەمان تەنیا بەربەرەکانی مافی ((مانگرتن))یان دەکرد، کەتاکە چەك بوو بەدەست کرێکارەکانەوە، لەکۆمەڵگەیەکدا کەچەوساندنەوەیەکی سەرمایەداریی جەرگبڕو حوکمڕانییەکی بەکرێ گیراو باڵی بەسەردا کێشا بوو، ئەمەش بەوەی کەئەمان وایان لەقەڵەم دەدا مانگرتن و کارنەکردن ((کارێکە تێکدەری پەیوەندیو بەستەرە برایەتیەکانی نێوان مسوڵمانانەو دەبێتەهۆی دابڕان و پشێویی لەنێوان پۆلەکانیاندا))(٧٧)

لە (شبر الخیمة)ش کاتێك کرێکاران مانگرتنە گەورەکەیان رێکخست، کەلەمێژووی خەباتی کرێکاریدا بەخاڵی وەرچەرخان دادەنرێت، کرێکارە

---

(76) Wandley, William. J. The labour movement in Egypt- Middle Eeast Journal iii (Jully 1974) p. 277.

(٧٧) امین عز الدین، تأریخ الطبعة العاملة المصریة ص ١٧٦.

ئێخوانیەکان کەوتنە چەواشەکردن و بەئامانجی ئەوەی مانگرتنەکە لەناوەوە هەرەس پێ بهێنن بەشداریان تێداکرد، بەڵام کاتێك هەوڵەکانیان شکستی هێنا پاشەکشەیان لێکرد، بۆیە ڕۆژنامەی ئیخوان هەوڵیدا پاساو بۆ ئەم هەڵوێستە بهێنێتەوەو گوتی ((کرێکار لەم ناوچەیەدا - شبر الخيمة- پێویستە دوو چەکی بەدەستەوە بێت ، هێزی باوەڕو ڕەوشت جوانی، بەمەش پەیوەندی لەنێوان کرێکارو خاوەنکاردا، لەسەر ڕێزو خۆشەویستی دوولایەنە دروست دەبێت، ئەمەش باشترین و سەرکەوتوترین شێوازو ئامرازە))[78]..گەر هەندێك کەسیش سەریان لەوە سوڕبمێنێ کەچۆن باوەڕو ڕەوشت، وەکو تاکە چەکێك بۆ کرێکاران دادەنرێت لەجەنگەکەیاندا دژی سەرمایەداری، ئەوا ڕۆژنامەی ئیخوان پاساو دەهێنێتەوەو لەخەتەری چەپڕەویی وریایان دەکاتەوە، ((دڵسۆزی چارەسەری یەکالاکەرەوەیە .. ئێمە پەڕاومان بەدەستی ڕاستمانەوەیەو ئەوانیش بەدەستی چەپیانەوە)). لەپاشەکشە کردنیشەوە -لەمانگرتنەکە- بۆ تێکدانی و پاشان بۆ ئاگادارکردنەوەی پۆلیس لەسەرکردایەتیەکەی. ئەم کارەش پاڵی نا بەسەرکردایەتیە کرێکاریە وەفدی و شیوعیەکانەوە کەچەندەها شاڵاوی ئیعلامی لەدژی ئیخوان موسلیمین ڕابگەیەنن و تاوانباریان بکەن بەوەی

---

[78] الاخوان المسلمون، ٢٠/٦/١٩٤٦.

کە((لەخزمـەتی سـەرمایەدارو چەوسێنەرو سدقیی سنتەمکارو حکومـەتی کەمایەتیەکاندا کاردەکەن))[٧٩].

لەڕاستیشـــدا مەســـەلەی ئـــەوەی کـــەئیخوان (بـــەکرێکارانیان و ناکرێکاریشـەوە) دەسـەڵاتدارانیان لـەچالاکی هـێزە نـەیارەکانیان ئاگـادار کردبێتەوەو سیخوڕییان کردبێت، مەسەلەیەکە زۆر دووبارە بۆتەوە، بەڵکو ئیخوان خۆیشیان دانیان پێداناوە.

– سـەلاحەدین عـەلی ئەبولخـەیر- یەکێکـە لەسـەرکردەکانی ئیخـوان لەشـایەتیەکەیدا لەبـەردەم دادگـای گـەلدا دەڵێـت ((بەشـی هەواڵـەکانی کۆمەڵەکـە هەڵدەسـتا بەکۆکردنـەوەی ئـەو هەواڵـە گرنگانـەی کەبـەلای کۆمەڵەکەوە بەبایەخ بوون .. هەروەها بۆ نموونە بەدوای هەر شتێکیشدا دەگەڕان کەگومانی ئەوەی لێ بکرایە شانەیەکی شیوعی تێدابێت .. خۆیشم دەزانم کـەئیخوان چـەندەها شـانەیان دەسـت نیشـان کردبـوو))[٨٠]. بـەڵام هەوڵ و کۆششەکانیان لەم لایەنەوە زیاتر لەبواری چالاکی کرێکاریدا خەست ببۆوە، ئەو بوارەی کەهەروەها دەزگاکانی ئاسایش و سەراو هەموو هـێزە کۆنەپەرسـتەکانیش ڕوانـین و بایەخـەکانی خۆیانیـان تێـدا خەسـت

[79] Boelm- op. Cit. Pp. 218-220.

[٨٠] محكمة الشعب، الجزء الثاني، المرجع السابق، ص٢٩.

کردبۆوە[٨١].. ئەمەش زیانێکی زۆر کاریگەری گەیاندە چالاکیەکانی ئیخوان لەڕیزەکانی کرێکاراندا، بەشێوەیەك کەلەدەوروبەری ساڵی (١٩٤٨)دا چالاکیەکانی ئیخوانی گەیاندە نیمچە پاکتاوکردنێك.[٨٢]

هەروەها تێڕوانینی ئیخوان بۆ ئەو مەسەلانەش کەسەبارەت بەکرێکاران بەبایەخن، تێڕوانینێکی زۆر کۆنەپەرستانەبوو .. لەدوای جەنگی جیهانی دووەم، کەژمارەی کرێکارە بەتاڵەکان گەیشتە چەند سەد هەزار کەسێك، بەشی کرێکارانی ئیخوان لیژنەیەکی تایبەتیان بەناوی ((لیژنەی کاروباری بێ کارەکان))ەوە پێك هێنا. ئەم لیژنەیە مەسەلەکەیان خستەبەر باس و لێکۆڵینەوەو پاشان چەند پێشنیارێکی سەیریان خستەڕوو، لەوەش سەیرتر ئەوەبوو کەڕۆژنامەکانی کۆمەڵەکە، ئەم پێشنیارانەیان لەخۆدەگرت و ستایشیان دەکرد.

پێشنیارەکانیش لەوەدا کورت کرابوونەوە، کەدەبێت ئەو کرێکارانەی لەکاتی جەنگەکاندا لەگوندەکانەوە کۆچیان کردووە تالەشارەکاندا ئیش بکەن، بگەڕێنرێنەوە بۆ شوێن و ناوچەکانی خۆیان[٨٣]. ((پاشان هەوڵ بۆ کۆکردنەوەی دەوڵەمەندەکانی هەرناوچەیەك بدرێت و ژمارەیەك کۆمپانیای

---

(٨١) لمزيد من التفاصيل راجع:
Badaoui, Zaki, les problems du Travail et les organisations ouvriers.
(82) Mitchell. Op- cit. P. 282.

(٨٣) الاخوان المسلمون، ١٨/٨/١٩٤٦.

بەشدار دابمەزرێنرێت بۆ بنیاتنانی چەند کارگەیەك، بەمەرجێك کەبەشێك لەکرێی کرێکارەکان ببڕرێت و بکرێتە چەند بڕەبەشێك بەناوی خۆیانەوە))[٨٤]. ئیخوانیش هەوڵیان دا پرۆژەیەکی لەم جۆرە لە (شبرالخیمة) جێبەجێبکەن، بەڵام سەرکەوتنی لەچارە نەنووسرابوو.

پێویستیشە لەسەرمان ئاماژە بەوە بدەین کەکۆمپانیاو کێڵگەو کارگەو سازگە کانەبەردو دامەزراوەکانی کۆمەڵی ئیخوان، یەکێك لەئامانجەکانیان بریتی بووە، لەپێکهێنانی چەند خاڵێك بۆ چەقگرتن و ڕاکشانی ئەو کرێکارانەی کەتیایاندا کاریان دەکرد.

سەیرو سەمەرە ئەوەیە کەتاوتوێ کردن و قسەکردن لەسەرمافی کارکردنی ژنان، لەڕوانگەی کۆمەڵەکەوە وەلاوە نرابوو، بۆ پاش ((چارەسەرکردنی کێشەی بێکاریی پیاوان)).

... پوختەی قسە، بەننا ئەوەی ڕەت کردبۆوە کەبەرنامەیەك بۆ کۆمەڵەکەی بنووسێت. بەڵام -لەڕاستیدا- لەرێی چالاکییە کردارییەکانەوە بەرنامەیەکی دارشتبوو.. ئەمەش -بەبۆچوونی ئێمە- پڕەلەو شتانەی کەشایانی ڕەخنەلێگرتنەو، بگرە لەڕەخنەش زیاتر.

---

[٨٤] الخوان المسلمون، ١٩٤٦/٧/١٢.

(*)پشك : سهم.

## ئینتیما بۆ کێ...؟

.. (دە بزانە خوا سەرفرازت کات- یەکەم، بانگەشەی ئیخوان بانگەشەیەکی گشتیە. سەر بەهیچ کۆمەڵێکی تایبەت نییەو لایەنی هیچ راوبۆچونێکیش ناگرێت کەلەنێوخەڵکیدا بەرەنگ و ئەرك و پاشکۆیەکی تایبەتی ناسرابێت. بانگەشەی ئیخوان روله کرۆك و ناخی ئایین دەکات، دەشیەوێت تێروانین و تەقەلاکان یەکانگیربن، بۆئەوەی کارەکان بەبرەوتربن و بەرهەمەکانیش گەورەو مەزنتربن. بۆیە بانگەشەی ئیخوان بانگەشەیەکی سپی بێگەردەو بەهیچ رەنگێکیش پیس نەبووە. لەگەڵ هەقیشدایە لەهەچ شوێنێك بێت. حەزیشی لەیەك دەنگییەو رقیشی لەناوازەیی دەبێتەوە. گەورەترین شتیش کەمسوڵمانانی لاوازکردبێت، دووبەرەکی و ناکۆکی بووە، بنچینەی سەرکەوتنیشیان خۆشەویستی و یەکێتی بووە. کۆتایی ئەم نەتەوەیەش چاك نابێت، تەنها بەوە نەبێت کە سەرەتاکەی پێ چاك کراوە. ئەمە رێسایەکی بنەرەتی و ئامانجێکی زانراوە، بۆهەموو برایەکی مسوڵمان، هەروەها عەقیدەیەکی بتەویشە لەدەروونماندا لێوەی بریار دەدەین و بانگەشەی بۆدەکەین))[٨٥]

هەروەها دەڵێت ((هەموو دەنگەکان رێکەوتن لەسەرئەوەی کەحیزبە میسریەکان گەورەترین خراپەی ئەم نیشتمانەن و هەروەها سەرچاوەی ئەو

---

[٨٥] حسن البنا، الرسائل الثلاث، دعوتنا- ص ٢٦.

گەندەڵییە کۆمەڵایەتیەشن کەئێستا بەئاگرەکەی دەبرژێین.. لەبەرئەوەیش کەحیزبەکان خۆیان نوێنەران‌و پیران دەست نیشان دەکەن‌و هەر خۆشیان جڵەوی حوکمڕانیان لەژیانی نوێنەرایەتیدا بەدەستەوەیەو بەڕێوەی دەبەن، بۆیە شتێکی ئاساییە کەمەسەلەی حوکمڕانی ڕاست نەبێتەوە، چونکە بەڕێوەبەران خۆیشیان هەروان.. ئەگەر بەو شێوەیەش بێت، ئەی چی ئەم گروپ‌و دەستانەی بەسەر ئەم گەلە پیرۆزو خەباتگێڕو تێکۆشەرو باشەدا سەپاندووە، ئەم گروپانەی کەخۆیان ناوناوە حیزبە سیاسیەکان. مەسەلەکە ترسناکە.. هیچ چارەیەکیش نییە، جگە لەوەی کەلەمەودوا دەبێت ئەم حیزبانە هەموویان هەڵبوەشێنرێنەوە))[٨٦].

هەروەها دەشڵێت ((حەز دەکەم بەوبرا حیزب خوازانەو پیاوەکانیشیان بڵێم: هێشتا ئەو ڕۆژە نەهاتووە کەئیخوان موسلیمین بۆ ئامانجێکی تری بەدەر لەفیکرە ئیسلامیە پوختەکەیان بەکاربهێنرێن، هەرگیزیش نایەت. ئیخوانیش هیچ دژایەتیەکی تایبەت لەناخیاندا، بەرامبەر هیچ حیزبێك ناشارنەوە، بەڵام لەناخی دەرونیانەوە باوەڕیان وایە کەهیچ شتێك میسر دەرباز ناکات‌و چاك ناکات تەنها ئەوە نەبێت کەهەموو حیزبەکان هەڵبوەشێنرێنەوەو دەستەیەکی نیشتمانیی کارا پێك بێت کەلەسەر ڕێنماییەکانی قورئانی پیرۆز ڕێنمایی نەتەوە بکات بەرەو سەرکەوتنێکی

---

[٨٦] حسن البنا، مشكلاتنا في ضوء الاسلام – ص ٥٨.

مـەزن. هـەر بـەم بۆنەیەشـەوە دەڵێـم ئیخـوان موسـلیمین بۆچوونیـان وایـە کەبیرۆکەی ئیئتلاف نێوان حیزبەکان بیرۆکەیەکی نەزۆکەو باوەڕیشیان وایـە کـە ئەمـە بـەنج و سڕکردنە نـەك چارەسـەر .. چارەسـەری یەکالاکـەرەوەی سەرکەوتووش ئەوەیە کـە زۆر بەسوپاسـەوە ئـەم حیزبانـە لابچـن، چونکـە ئەرکـەکانی خۆیـان بـەجێ گـەیاندووەو ئـەو بارودۆخـەش تـەواو بـوو کەهێنابوونیە کایەوە، وەك گوتراویشە هەر زەمانـەو دەوڵـەت و پیاوی خۆی هەیە))[87].

بەننا بەم شێوەیە دووا .. بەڵام قسەکردن شتێکەو کردەوەش شـتێکی ترە ..

چونکـە بانگەشـەکە ڕووی کـردە کۆشـکی پاشـایەتی، پشـتی کۆشـکی دەگرت و کۆمەکی دەکرد، بەهەموو هێزو توانایـەوەو بێهوودەش هـەوڵیدەدا سیمای پاشا گەندەڵەکە جوان و ڕازاوە بکات. هێرش کردنە سەر حزبایەتی و حیزبەکانیش، هێندەی پێنەچوو هاوپەیمانێتی لەگەڵ کۆنەپەرستترین هێزە سیاسـیەکانی کۆمەڵگـەی میسـر لێکەوتـەوە .. میحـوەری عـەلی ماهـیر- ئەلمـەراغی بۆماوەیـەك، بۆماوەیـەکی تریـش لەگـەڵ ئیسـماعیل سـدقی .. پاشان بۆماوەی سێهەم لەگەڵ حیزبەکانی کەمایەتییەکاندا.

---

[87] حسن البنا، رسالة المؤتمر الخامس- ص ٥٦.

بەڵام .. ئایا واباشتر نیە کەلەگەڵ هاوپەیمانە سیاسییەکانی شێخدا هەنگاو بەهەنگاو بڕۆین؟.. وە ئایا واباشترنیە کەبازنەیەکی بچوك لەڕووناکی بخەینە سەر یەکێك لەنزیکترین و گرنگترین هاوپەیمانەکانی – علی ماهیر پاشا– بەشێوەیەك کەشوێنی خۆی و هاوپەیمانیەکەشیمان لەمەسەلەی نیشتمان و ئیسلامدا بۆ دیاری بکات؟. ئەو وتانەی شێخیش کەلەپێشەوە نووسیمانن، تەنها بۆئەوەبوو کەشێخ ڕووبەڕووی هەڵوێستە کردارییەکانی بکەینەوەو .. پاش ئەوەش ڕادەی ڕاست و دروستی قسەو هەڵوێستەکان بپێوین.

شا فوئاد کۆچی دوایی کردو گەنجێکی تەمەن منداڵی نەشارەزای بێ ئەزمون و ناتوانا حوکمی میسری گرتەدەست. یەکێك لەتوندترین و خۆپەرستترین و بەرزەفڕو بەتەماحترین سیاسییەکانی میسریش، توانی کۆنترۆڵی بکات و بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

## عەلی ماهیر:

- ئەوکەسەی کە(دێڤیدکیلی)پیاوی دێرینی موخابەراتی بەریتانی و ڕاوێژکاری خانەی مەندوبی سامی بەریتانی لەبیرەوەرییەکانیدا لەبارەیەوە دەڵێت ((فاروق لەقۆناغێکی زوی

تەمەنیدا، کەوتەژێر کاریگەریی عەلی ماهیر پاشاوە، ئەو عەلی ماهیرەی کەبووە خاوەنی دەسەلاتی یەکەم لەسەرادا، عەلی ماهیریش پیاوێکی زۆر زیرەك بوو، بەلام بەرزەفرو بەتەماح بوو، ئەم بەرزەفڕیەشی ناخی دەخوارد. لەبەرئەوە خێرا هەردوو چاوی بڕییە ئەوەی کەدەروونی ئەم پاشا نوێیەش پڕبکات لەڕق و کینە بەرامبەر بەوەفد، هەروەك چۆن دەروونی باوکیشی پێ پڕکردبوو))[٨٨].

- ئەوەی کەبالێۆزی بەریتانی لەراپۆرتێکدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی خۆیان لەبارەیەوە دەڵێت ((.. لەگەڵ ئەوەشدا کە ساڵی (١٩٣٧) زۆربەی کات دووربوو لەپلەو پایە حکومیەکان، بەلام شا فاروق زۆرجار بەسیفەتێکی نارەسمی راوێژی پێدەکرد. عەلی ماهیریش پێشتر متمانەی شای بەدەست هێنابوو. بەم شێوەیە، بەکارکردنی لەپشت پەردەوە، توانی سەنگێکی گەورە لەسیاسەتی کۆشکدا بۆ خۆی بەدەست بهێنێت))[٨٩].

---

[٨٨] نقلا عن: محمد عودة، سبعة باشورات وصور اخرى- الكاتب الذهبي- ص ١٥٤.

[٨٩] الأهرام، ٢٠/ ٢/ ١٩٧٠. موضوع: رأي السفير البريطاني منذ ٣٠ سنة في ١٥٠ سياسياَ مصرياَ.

- ئەوەی کەخودی خۆیشی لەبەردەم دادگادا دانی پێدا دەنێت کەهاوڕێی ئینگلیز بووە، ((گوێڕایەڵی تەواویشی هەبووە بۆیان، پەیوەندییە تایبەتیەکانیش تا ئەوپەڕی سنوور بوون...))[٩٠].
- کاتێکیش فاشیزم پەلوپۆی کێشا.. هەندێك کەس پێیان وابوو کە((ئەڵمانیەکان بەڕێوەن))، بۆیە خۆیان ئامادە کرد بۆپێشوازیی کردنی ئەم سەروەرە نوێیە. یەکێك لەمانەش عەلی ماهیر بوو ... دکتۆر ئەلتەیب ئەلناسر لەبیرەوەرییەکاندا دەڵێت، (کۆنت ماتزۆلینی)ی دوا وەزیری ڕێپێدراوی ئیتاڵیای فاشی لەمیسر، پێی ڕاگەیاندووە کە ((خودی خۆی لەگەڵ عەلی ماهیردا، ڕێکەوتوە لەسەرئەوەی کەمیسر لەکاتی پێویستدا بەڕووی ئینگلیزدا ڕاپەڕێت بۆ ڕێخۆشکردن بۆ سوپاکانی میحوەر))[٩١].
- وەکو جێ بەجێ کردنێکیش بۆ ئەم پیلانەو لەدوای ئەو هێرشە توندو تیژەش کەجەنەڕاڵ ڕۆمڵ ڕووەو میسر سەرکردایەتی کردو لەڕۆژی ٢٩ی کانونی دووەمی ١٩٤٢ دا، دەستی بەسەر بەنی غازیدا گرت. لەمیسردا چەندەها خۆپیشاندان ورووژان کەزۆربەیان لەئەزهەرییەکان بوون (شوێنکەوتوەکانی شێخی مەراغیی هاوپەیمانی

---

[٩٠] ملف قضية الاغتيالات السياسية - شهادة علي ماهر باشا.

[٩١] روز اليوسف، ١٩٥١/١/٢٣. مذكرات الدكتور الطيب الناصر- ص ٣٤.

عەلی ماهیری خۆشەویست))، هاواریشیان دەکرد (ڕۆمەل بۆ پێشەوە)، ((عەلی ماهیر پیاوی سەردەم)).

- (جورج کێرک)یش دەڵێت ((موخابەراتی بەریتانی لەبەڵگە نامە ئەڵمانیەکاندا ئەوەیان بۆ ئاشکرا ببوو، کە عەلی ماهیر لەڕێی بانقی (درسدنر)ەوە، چەند بڕە پارەیەکی وەردەگرت))[٩٢].
- ئەمەیە ئەو عەلی ماهیرەی کەشێخ بەننا لەدەرگا تایبەتیەکەیەوە چووەناو سیاسەتەوە، ئەو کەسەی کەیەکەم هاوپەیمانی سیاسیی کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین بوو .. ئەوەی کە بەدەستی خۆی بەنناى ڕووەو پاشکۆیەتی سەراو پاشاو دژایەتی کردنی وەفدو هێزە دیموکراسیەکان پەلکێش کرد.
- ... بەم شێوەیە، عەلی ماهیر پاشا یەکەم کەس بوو - لەلێپرسراوان- کەلە ئامۆژگاریەکەی ئیسماعیل سدقی پاشا تێگەیشت، تا لەگەڵ ئیخوان موسلیمیندا هاوکاری بکەن و بەکاریان بهێنن.

سەرەتاکەش لەوکاتەدا بوو کەخۆئامادە دەکرا بۆئەوەی پاشا گەنجەکە بچێتە سەرتەخت. میر (محەمەد عەلی) پێشنیاری کرد کەئاهەنگێکی ئاینیی سازبکرێت و، ڕێ و ڕەسمی چوونەسەر تەختی تێدا بەئەنجام بگەیەنرێت. لەڕاستیشدا ئەم پێشنیارە بەتەنها بەشێکی نەخشە گشتگیرەکەی عەلی

---

[٩٢] جورج كيرك، موجز تأريخ الشرق الاوسط- ترجمة عمر السكندري- ص٣٤.

ماهیرو شێخ مەراغی بوو، بۆئەوەی پاشا لەشێوەی پاشایەکی پیاوچاکدا پێشکەش بکەن کەبەئایین پڕچەك کرابێت، ئەمەش بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی وەفد کەبەپشتگیری کردنی گەل پڕچەك بوو .. مستەفا ئەلنەحاسی سەرەك وەزیرانیش ئەمەی ڕەت کردەوەو ڕایگەیاندا کەئەمە ((تێکەڵ کردنی ئایینە، بە چەند شتێك کەپەیوەندی پێوەی نییە، هەروەها هێنانەکایەوەی دەسەلاتێکی ئایینی تایبەتیشە کەلەتەنیشت دەسەلاتە مەدەنیەکەوە))[٩٣].

هەروەها ئەلنەحاس لەبەردەم ئەنجوومەنی نوێنەراندا هەستا بە بەربەرەکانی کردنی ئەم نەخشەیەو گوتی ((ئیسلام هیچ دەسەلاتێکی ڕوحی تێدا نییە، لەپاش پێغەمبەرانیش هیچ نێوەندێك لەنێوان خوداو عەبدەکانیدا نییە .. هیچ کەسێکیش هێندەی منو ئەو حکومەتەی کەشەرەفی سەرکردایەتی کردنیم پێ بەخشراوە، بەتەنگ ڕێزو پاراستنی ئیسلامەوە نیە، هەروەها هیچ کەسێکیش هێندەی ئێمە بەئەحکامەکانی دەستوورەوە پابەند نییە. بەلاّم ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی دەست بەکاربوونی پادشای خاوەن شکۆوە لەدەسەلاتە دەستووریەکەیدا، ئەوا ئەمە لایەنێکی ترە، ئەمەلایەنێکی

---

[٩٣] لمزيد من التفاصيل راجع: د. رفعت السعيد: مصطفى النحاس، السياسي والزعيم والمناضل. دار القضايا. بيروت (١٩٧٦) ص ٧٦ ومابعدها.

نیشتمانیەو دەبێت هەموو میسرییەکان بەشداریی تێدا بکەن، بەموسڵمان‌و نامسوڵمانەوە))[٩٤].

ئالێرەشدا – بۆ یەکەمین جار– ڕۆڵی سیاسییانەی شێخ حەسەن ئەلبەناو کۆمەڵەکەی دەردەکەوێت .. کاتی دەرکەوتنەکەش زۆر گرنگە، چونکە هەر وەك چۆن ئەرکەکە دیاری دەکات .. هەر بەو شێوەیە، چوارچێوەو هۆکارەکانی‌و بزوێنەرەکانیشی دەست نیشان دەکات.

ئیخوان کۆنگرەی چوارەمیان لەپێناوی تاکە مەبەستێکدا دەبەستن، ئەویش ئاهەنگ گێڕانە بەبۆنەی چوونەسەر تەخت‌و دەسەڵات گرتنەدەستی پاشاوە! هەروەها بۆ یەکەمین جاریش، گەڕۆکەکانی ئیخوان موسلیمین لەگۆڕەپانەکەدا سەرهەڵدەدەن ((تا وەك هێزێکی سەر بە ڕژێم‌و ئاسایش، یەکەمین ڕۆڵ لەڕۆڵە بەبایەخەکانی خۆیان ببینن))[٩٥]. پاش چەند ئاهەنگێکی درێژخایەن‌و پڕخۆشی‌و شادیش، ئیخوان لەبەردەم دەروازەکانی کۆشکی عابدینداکۆدەبنەوەوهاوار دەکەن ((لەسەر کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی، پەیمان‌و لایەنگری خۆمانت پێ دەبەخشین))[٩٦].

---

[٩٤] ((المصري)) ٢٢/٢/ ١٩٣٧.

[95] Khadduri- op. Cit. P. 16.

[٩٦] حسن البنا، مذكرات الدعوة والداعية. ص ٢٥٢.

لەبۆنەیەکی دیکەشداو .. کاتێکیش نەحاس پاشا لەگەڵ کۆشکدا ناکۆك بوو، جەماوەری وەفد هاتنە سەرشەقامەکانو هاواریان دەکرد ((گەل لەگەڵ نەحاسدایە)). شێخ بەنناش پیاوەکانی خۆی خستەڕێو هاواریان دەکرد ((خوا لەگەڵ شادایە)). ئیخوانیش زۆر شانازییان بەوەوە کرد کەشا شەش جار هاتە باڵەخانەی کۆشکەکەیەوە بۆئەوەی سڵاو لەخۆپیشاندانەکەیان بکات.[٩٧] ڕۆژنامەی (البلاغ)یش دەڵێت ((پاشا زۆر دڵخۆش بوو بەدروشمی خوا لەگەڵ شادایە، خۆیشی دووبارەی دەکردەوەو دەیگوت بەڵێ خوا لەگەڵماندایە))[٩٨].

لەڕاستیشدا بیرۆکەی نیزکبوونەوە لەکۆشکی پاشایەتی بەلای بەنناوە شتێکی نوێ نەبوو .. بەننا خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت، لە (١٩٣٠)دا کاتێك لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کراوە، لە لێکۆڵینەوەکەوە دەرکەوتووە کەهەمیشە لەڕێنووسدا، جۆرە بابەتێکی بەقوتابیەکان نووسیووەتەوە کەستایشکردنی شا فوئادو کارەکانی تێدا ڕەچاو کردبوو .. هەروەها ئەو ڕۆژەش کە شا سەردانی شارەکەی کردووە، ئەم کرێکارەکانی کۆکردۆتەوە بۆ پێشوازیی کردنی ((تا بیانیەکانی ئەم شارە تێ بگەن کەئێمە ڕێزی پاشاکەمان دەگرینو خۆشمان دەوێت)).هەروەها شێخ بەردەوام دەبێتو دەڵێت، یەکێك

---

[٩٧] الاهرام، ١٩٣٧/١٢/٢٢.

[٩٨] البلاغ، ١٩٣٧/١٢/٢٢.

لەپیاوەکانی پۆلیس بەم بۆنەیەوە، ڕاپۆرتێکی نووسیوەو تێیدا ستایشی کاریگەری ڕوحیی کۆمەڵەکەی کردووە لەڕاستکردنەوەو بەرەوشت کردنی ئەوکەسانەدا کەشێوزەکانی لاستکردنەوەی پۆلیسی کەڵکی نەبووە لەگەڵیاندا، وە پێشنیاریشی کردووە ((کەدەوڵەت هانی کۆمەڵەکە بدات و هەوڵ بۆ بڵاوکردنەوەی لقەکانی بدات بەهەموو ولاتدا، بۆ خزمەتکردنی زیاتری ئاسایش و چاکسازی(!)))[٩٩].

ئەگەر شتێکی سەیریش نەبووبێت کەیەکێك لەپیاوەکانی پۆلیس ئەمە لەسەر کۆمەڵی ئیخوان بنووسێت، ئایا سەیربووە کەشێخ بەنووسین و بەڕاشکاوی شانازیی بەمەوە بکات؟

واتا، گەڕۆکەکانی ئیخوان و کۆبوونەوەیان بۆ ((فاروق))نەبوو بەتەنها، بەڵکو بۆ عەلی ماهیریش بوو. چونکە لەکاتی گەڕانەوەیدا لەکۆنگرەی مێزگرد، کە لە لەندەن بەسترا بۆ تاوتوێ کردنی مەسەلەی فەلەستین (مارس – ئازاری– ١٩٣٩)، گەڕۆکەکان و ئیخوان بەهاوارکردنەوە کۆببوونەوەو لەپێشوازی کردنیدا بوون.[١٠٠]

بەڵام نەحاس پاشا وای بۆ دەچوو کەهاتنی ئیخوان موسلیمین بۆناو سیاسەت و، بەرفراوان بوونی بانگەشەکەیان، بەتایبەتی لەم کاتەدا، دەربڕین

---

[٩٩] حسن البنا، مذكرات الدعوة والداعية ص ٨٩.

[100] Heywoth – Dunne- Ibid. p. 23.

لەپیلانێکی فراوانتر، ترسناکتر دەکات. نەحاس لەوتارێکدا لە(٢)ی تەمموزی (١٩٣٨)دا دەڵێت:

((فاکتەرێکی تری قەیرانەکە .. پیلانگێڕان ویستیان پیلانەکەیان لەهەردوولاوە بەکاربهێنن. نیشانەکانی ئەم پیلانەش، لەپێش ئەوەدا کەبچین بۆ مۆنترۆ تا لەکۆنگرەی لابردنی ئیمتیازی بیانیەکاندا ئامادەبین، دیاربوون. بەوەی قسەوقسەلۆکێك دروست ببوو، داوای ئەوە دەکرا کەپێویستە شەریعەتی ئیسلام بکرێتە بنەمای یاسا دانانی میسرو پێویستە هەموو رێساکانی بەتەواوی جێبەجێبکرێن، قوتابیە کورو کچەکانیش لەزانکۆدا جیابکرێنەوە. بەم شتانەش مەبەستیان ئەوەبوو کەئاستەنگ و قۆرت بخەنە رێگای ئەوەی لەسەری رێکەوتبوون، کەدەبێت بیانیەکانی نێو وڵاتەکەمان پابەندبن بەیاساکانی میسرەوە. چونکە بێگومان جێبەجێکردن و پراکتیزەکردنی شەریعەتی ئیسلام و ئەو یاسا بڕیاردراوانەی کەشەریعەتە پاکەکەمان دەیگرێتەوە، وەك بڕینی دەستی دزو قامچی لێدانی زیناکەر، بەهیچ شێوەیەك نوێنەرانی وڵاتە بیانیەکان لەسەری ڕەزامەندنابن. خەریك بوو ئەم پڕو پاگەندانەش ڕێگرێك لەبەردەم لابردنی ئیمتیازاتی بیانیەکانی وڵاتەکەمانداو، پیلانگێڕەکانیش لەپشتی ئەوەوە ئاواتەکەیان بێتەدی))[١٠١].

---

[١٠١] صباح الخير، ١٩٧٧/٣/٣١ - د. عبدالعظيم رمضان، مقال: الدين في الصراع السياسي.

... بەتایبەتیش لەم دەمەدا، شێخ بەننا دەستی کرد بەهێرش کردنەسەر حیزبایەتی و حیزبەکان و داوای ئەوەی کرد کەهەموویان هەڵبوەشێنرێنەوەو، کەوتە پشتگیریکردنی دەسەلاتەکانی شاو هەوڵی دا ئەو پشتگیریە جەماوەرییەی بۆ دروست بکات کەبەدرێژایی تەمەنی، کۆشك بەخۆیەوەی نەدیبوو. ئەمەش هانی فاروقی دا کەهەوڵ بۆ رێکخستنی ((کودەتایەکی دەستووری))بدات و بەمەبەستیش یادی سەری ساڵی کۆچی، بۆئەم کودەتایە هەڵبژارد، بەوەی کەبەرادیۆ وتارێکی پێشکەشکردو تیایدا رایگەیاند کەجڵەوی مەسەلەکانی بەدەستەوەیەو گوتی ((پشت بەستن و متمانەم بەخودا وام لێدەکات کەمەسەلەکان بەرێوەببەم و هەروەها رێگە راستەکەشم نیشان دەدات))[١٠٢]. لەگەڵ هێرش کردنیشدا بۆسەر دەستوور، نیشانەکانی لایەنگری کردنی میحوەرو بەکرێگیراوانی بەدەرکەوتن. شێخ بەنناو کۆمەڵەکەشی رۆڵی خۆیان لەم رووەوە بینی، لەوانەیە هەرئەمەش بێت پاڵی نابێت بەنووسەرێکی ئیسلامیی وەك عەباس ئەلعەقادەوە کەبەتوورەییەوە بنووسێت ((لەمیسردا بانگەشەیەکی دیکتاتۆرانە هەیە، هیچ پێویستی بەقسە لەسەرکردن نیە. ئەوانەیش کەهەڵدەستن بەم بانگەشەیەو پارە لەخاوەنەکانی وەردەگرن، هەر خۆیانن کەهێرش دەکەنە سەر دەوڵەتە دیموکراسیەکان و بەناوی ئایین و سوریاو فەلەستینەوە،

---

[١٠٢] مصر الفتاة، ١٩٣٩/٣/٢٧.

هەستی خەڵکی لەدژیان دەبزوێنن. کەچی بەناوی ئایین و بەناوی ئەلبانیاو بەرقەو تەرابلوس و سۆماڵەوە هەستی خەڵکی لەدژی دەوڵەتەکانی تر نابزوێنن .. لەمەشەوە کەباسمان کرد، بەئاسانی دەتوانین بزانین کەئەم کۆمەڵە ئایینداراانە لەکوێوە خەرجی و دارایییان وەردەگرن، هەروەها بۆ چ ڕووی بانگەشە سەختەکەشیان دەکەنە ئەم ئاراستەیەی کەوەکو تاکە ئاراستەیەك لەبەردەمیاندا ماوە، بۆ خزمەتکردنی خواستەکانی دیکتاتۆریەت.. ئەمە سیخوڕییەکی بەکرێگیراوانەیە، خۆی لەپشت پەردەی ئیسلامێتیدا دەشارێتەوە، تا وڵاتی ئیسلام بخاتە دواوە. چونکە سەرکەوتنی بانگەشە دیکتاتۆرانەکە لەبەرژەوەندیی و سەروەریی مسوڵمانناندا نییە، بەڵکو دەبێتەهۆی لەناوچوونی مسوڵمانان))[١٠٣].

لەسایەی ڕەزامەندیی تەوژمە ئایینیەکەشدا(شێخ مەراغی - شێخ حەسەن ئەلبەننا)، هەروەها بەهۆی هاندان و نەخشەیەکی عەلی ماهیریشەوە کەلەکۆتایی سیەکانداو لەگەڵ بەرزبوونەوەی ئەستێرەی هیتلەریدا، ببووە تەوەرەی چالاکیە سەربە میحوەرەکان، فاروقیش بەهەمان شێوە هەوڵیدا گەمەی لەمیحوەر نزیك بوونەوە بکات.

لەڕۆژی (٢٣)ی شوباتی (١٩٣٩)شدا (کونت شیانو)ی وەزیری دەرەوەی ئیتالیا لەبیرەوەرد تایبەتیەکانیدا نووسیویەتی کە لە(لەتۆلیکۆ)ی باڵیۆزی

---

[١٠٣] الدستور، ١٩٣٩/٧/٢٧ - مقال لعباس محمود العقاد

ئیتالی لەبەرلینەوە هەواڵێکی لەسەر دیدارێك پێ گەیشتووە کەلەنێوان خۆی -ئەتۆلیکۆ- و وەزیری میسری ڕێپێدراو (موراد سەید ئەحمەد پاشا)دا ڕوویداوە. وەزیری میسری لەم دیدارەدا، بەناوی پاشاکەیەوە پرسیاری ئەوەی کردووەکە.. ئەگەر میسر بێ لایەنی خۆی ڕابگەیەنێت و لەئەنجامی ئەمەدا بەریتانیای گەورە ڕاستەوخۆ یاناڕاستەوخۆ دەست وەرداتە مەسەلەکەوە، ئایا میحوەر ئامادە دەبێت پشتگیری لێ بکات))[١٠٤]. پەیوەندی کردنیش لەنێوان کۆشك و میحوەردا بەردەوام بوو، شێوازەکانیشی جۆراو جۆربوون. لە (١٤)ی نیسانی (١٩٤١)دا یوسف پاشا زولفەقار (باوکی شاژن فەریدەو باڵیۆزی میسر لەتاران) پەیوەندی بەباڵیۆزی ئەڵمانیاوە کردو تکای لێکرد کەبەهیتلەر ڕابگەیەنێت ((فاروق و گەلەکەی نایانەوێت لەگەڵ ئەڵمانیادا بکەونە جەنگەوەو.. ئاواتەخوازیشن هێزەکانی ئەڵمانیا بەسەرکەوتووی ببینن و میسر ڕزگارکەن لەداگیرکەری بەریتانی))[١٠٥]. بگرە فاروق سیخوڕیشی دەکرد بۆ ئەڵمانیەکان، ئەوە تا لەڕۆژی (٢٩)ی حوزەیرانی (١٩٤١)دا فاروق بروسکەیەکی بۆ باڵیۆزی میسر لە تاران ناردو داوای ئەوەی لێکرد بەباڵیۆزی ئەڵمانیا ڕابگەیەنێت ((کە فاروق چەند زانیارییەکی لەلایە، ئاماژە بەوە دەکەن کە ئینگلیز ناوچە نەوتیەکانی ئێران داگیردەکەن، تابیپارێزن لەو هێرشەی ئەڵمانیا کەلای ڕوسیاوە دەکرێت و هەروەها هێرشی دژ بەعێراق و ئێرانیش))[١٠٦].

---

[104] Ciono, count Galeazzo- cianos Diary (1939 - 1943) London – p 32.

[١٠٥] الاهرام، ١٩٧١/٢/٩- د. محمد انيس: دراسة عن (٤) فبراير سنة ١٩٤٢.

[١٠٦] السياسة الدولية، اكتوبر ١٩٧١- د. عبدالعظيم رمضان، مقال: الاتصالات المصرية بدول المحور ١٩٤٥/٣/٩.

وەکو خۆئامادەکردنێکیش بۆ ئەم هەڵگەڕانەوە ترسناکە- لەگوێڕایەڵی کردنی ئینگلتەراوە بۆ گوێرایەڵی کردنی ئەڵمانیا- پێویست بوو حیزبێك بدۆزێتەوە کەهەندێك جەماوەری هەبێت ، تا بتوانێت پشتگیریی ئەم هەڵگەڕانەوەیە بکاتو کوڵەکەیەکی میللی بۆ دروست بکات.

(عەزیز ئەلمیسری پاشا)ی هاوڕێی خۆشەویستی عەلی ماهیرو هاوپەیمانی میحوەریش، خاوەنی بیرۆکەی دروست کردنی حیزبێکی نوێ بوو، کەهەردوو حیزبە بەشدارەکەی باڵی کۆشك- عەلی ماهیر، کەتەوەرەی بیرۆکەکەیە- یەکبخات. لەهەمان کاتیشدا ئەم دوو حیزبە ملکەچ بوون بۆ نۆڕێنو دەسەڵاتی عەلی ماهیرو عەزیز ئەلمیسری، ئەوانیش ئیخوان موسلیمینو میسر ئەلفەتاتن، بەمەش حیزبێکی ئیسلامی شێوە فاشیست دروست بکرێت کەبەنۆڕێنو دەسەڵاتی کۆشك پشت بەست کرابێتو ئەوەش ڕابگەیەنێت کەلەئینگلیز (دوژمنانی نیشتمان)هەڵگەڕاوەتەوە.(١٠٧)

وەکو خۆئامادەکردنیش بۆئەم مەسەلەیە، ئەحمەد حسێن ناوی حیزبەکەی خۆی گۆڕی، تا ئەمیش بەهەمان شێوە بەرگێکی ئیسلامیانە بپۆشێت.. وا دەریش دەکەوێت فشارەکەی سەر بەننا زۆر بەهێزبوو بێت، بەڕاددەیەك کەوای لێکرد لە ((پەیامی کۆنگرەی پێنجەم))دا بەشێکی تایبەت بەناوی ((الاخوان ومصر الفتاة))ەوە تەرخان بکاتو تیایدا بڵێت

(107) Heyworth- Dunne- op- cit- p. 36.

((زۆرکەسان حەزدەکەن کەئیخوان موسلیمین و میسر ئەلفەتات بەکبگرن، ئەمەش بێ گومان هەستێکی پاک و جوامێریانەیە، چونکە هیچ شتێك لەوەجوانتر نییە کەیەکێتی و هاوکاری لەپێناو خێرو چاکەدا بکرێت. بەڵام هەندێك مەسەلە هەیە کەتەنها زەمەن خۆی دەتوانێت یەکلاییان بکاتەوە .. لەبەرئەوە با ڕۆژگار ئەرکی خۆی جێ بەجێ بکات و حوکمی خۆی دەربکات، ڕۆژگاریش باشترین زامنی یەکلاکردنەوەی مەسەلەکانە)). بەڵام بەننا هەستی پێ دەکات ((ئەمەش مانای ئەوە نییە کەئیخوان دژایەتی میسر ئەلفەتات دەکەن، بەڵکو ئێمە پێمان خۆشە کەهەموو خێرخوازێك سەرکەوتووبێت و خێریش بێتەڕێگای. ئیخوانیش نایانەوێت ئاوەدانکردنەوە تێکەڵ بەوێرانکاری بکەن، مەیدانی جیهاد کرندیش فراوانەو جێگای هەمووانی تیادەبێتەوە))[١٠٨].

بەهەرحاڵ ئەم پەیوەندییە توندو تۆڵەی نێوان شێخی بەنناو میحوەری کۆشك (عەلی ماهیر- ئەلمەراغی- عەزیز ئەلمیسری) چەند شتێکی زۆری لەپاش کەوتەوە.. لەلایەکەوە ئەو دەرفەتەی بۆ بەننا ڕەخساند کەبازێك بە کۆمەڵەکەی بدات بۆناو ڕووداوەکان و دەرکەوێت .. بەیەك دووساڵێکیش ژمارەی لقەکانی کۆمەڵەکە بووە زیاتر لەدە ئەوەندەی خۆی و بووەخاوەنی گۆڤارێکیش کەزمانحاڵی بوو. هەروەها تیمە گەڕۆکەکانیشیان پێك هاتن، تا

---

(١٠٨) حسن البنا، رسالة المؤتمر الخامس ص ٥٧.

ئەركی بەرپەرچدانەوەو پاراستنی ئاسایش بەجێ بگەیەنن، زەمینەیان بۆ چەند خۆپیشاندانێك خۆش كرد كە یەكەمین جار بوو لەمێژووی نوێی میسردا بەجۆشەوە بەلام ئەم كارانە ڕوویەكی تریشیان هەبوو هوتاف بەگیانی پاشا بكێشن.

لەبەرئەوەی كۆمەڵێكی گرنگ لەئەندامانی كۆمەڵەكەو كادێرانی سەركردایەتیان، لەساڵی (١٩٣٩)دا قایل نەبوون بەم چوونە ناو سیاسەتەی كەپێچەوانەی بەرژەوەندیەكانی جەماوەربوو. ئەوەشیان ڕەت كردەوە ستایشی شایەك بكەن كەباش دەیانزانی چەند گەندەڵە، هەروەها ڕەتیشیان كردەوە بچنە ئەو كۆنگرە گومانلێكراوانەوە كەسیاسیەكی گومانلێكراوی وەك عەلی ماهیر كاریگەری لەسەری هەبووە.. دەشگوترا هەندێك لەم هەڵگەڕاوانە لەهەوادارانی وەفدبوون .. چونكە كۆمەڵەكە لەقۆناغی یەكەمیدا كەتەنها وەكو گروپێكی ئایینی پوخت خۆی دەردەخست، زۆر ئاسایی بوو كەهەوادارانی وەفد پەیوەندیی پێوە بكەن. بەلام گەر كۆمەڵەكە ببێتە ئامرازێك بۆ لێدانی وەفد، لەپێناوی بەرژەوەندیی كۆشكدا، ئەوا ئەمە شتێكی ترە ... بەم شێوەیە ((هەڵگەڕاوەكان ئاگاداركردنەوەیەكیان ئاڕاستەی بەننا كرد، تا ئەحمەد ئەلسوككەری دەربكات بەهۆی ئەو ئاڕاستە سیاسیانەوە كەهەیەتی. و كۆمەڵەكەش هەموو پەیوەندییە سیاسییەكانی

خـۆی بپچڕێنێـت، بەتایبـەتی لەگـەڵ عـەلی ماهـیردا))[١٠٩]. بـەڵام بـەننا ئاگادارکردنەوەکـە ڕەت دەکاتـەوەو بڕیـارێکیش دەردەکـات کەهـەموو بەرهەڵسـتکارەکانی لـەڕیزی کۆمەڵەکـە دەربکرێـن، بـەڵکو هەڕەشەشـیان لێدەکات کەئەگـەر هـەچ نهێنیـەکی کۆمەڵەکـە ئاشـکرا بکـەن،ئـەوا پۆلیـس لەدژیان ئاگادار دەکاتەوە (کام نهێنیانە؟ ئایا بۆ پۆلیس دەیپارێزێت؟ چۆن پێشـەوایەك پـەنا دەباتەبـەر پۆلیـس، لـەدژی ئەوانـەی کەنـەیارین لـەناو حیزبەکـەی خۆیـدا؟)، لەڕاستیشـدا زۆر بەڵگـە هـەن دەیسـەلمێنن کـەپۆلیس بەفـەرمان و ڕێنمـایی دەسـەڵاتە باڵاکـان، پارێزگارییـان لەحەسـەن ئەلبـەننا دەکـرد.[١١٠] ژنـە توێژەرێکیـش دەڵێـت ((ئـەم ڕۆژانـە زیـاترو زیـاتر سروشـتی دیکتاتۆرانـەی ڕەفتارەکـانی شـێخ بـەننای بەرامبـەر ئـەندامانی کۆمەڵەکـە بەخۆوەبینی، ئـەوەش بـووە شـتێکی ڕوون و ئاشـکرا کـە شـێخ دەیویسـت خودی خـۆی و بەتـەنها، جڵـەوی کـاری سیاسـی کۆمەڵەکـە بگرێتەدەسـت و ڕێنمـایی بکـات))[١١١]. ئەوانـەش کـە جیاببوونـەوە، کۆمـەڵی ((گـەنجانی محەمەدی سەروەرمان))یان پێك هێناو گۆڤاری ((ئەلنەزیر))یش لەگەڵیاندا

---

[١٠٩] طارق البشري، المرجع السابق ص ٤٨.

(110) Heyworth- Dunne- op. Cit. P. 38.

(111) Harris, Christina- op. Cit. P. 179.

جیابورەوە، ماوەیەکیش باسی هەندێك زانیاریان دەکرد سەبارەت بەوەی کەبەننا چەند یارمەتیەکی ماددی لەعەلی ماهیر وەرگرتووە.(١١٢)

(مەحمود ئەبو زەید عوسمان) کەیەکێك لەسەرکردەکانی جیابوونەوەکەش لەگۆڤاری ئەلنەزیردا دەنووسێت و تیایدا هۆیەکانی جیابوونەوەی کۆمەڵەی خۆی دەست نیشان دەکات و، شێخ بەننا بەوە تاوانبار دەکات کە:

ا-سەر بەکۆشکی پاشایەتی و عەلی ماهیرە.

ب-یاری بەپارەو ماڵی کۆمەڵەکە دەکات.

ج-پراکتیزەکردنی پرانسیپی شورا ڕەت دەکاتەوە.

د-چەند کەسایەتیەکی بێ ڕەوشتی وەکو (شێخ عەبدولحەکیم عابدین)داڵدە دەدات و دەپارێزێت.(١١٣)

هەروەها یەکێکی تریش لەپاشکەوتەکان ئەوەبوو کەئینگلیز هەستیان بەمەترسی بەیەك گەیشتنی شێخ و کۆمەڵەکەی لەگەڵ پیلانی لایەنگرانی میحوەردا کرد .. ئینجا باڵیۆزخانەی بەریتانیا کەوتە چاودێری کردنی جموجوڵەکانی شێخ و، وەکو نەیارێکیش سەیریان دەکرد، بەتایبەتی پاش ئەوەی کەتوانیان وەزارەتەکەی عەلی ماهیر هەرەس پێ بهێنن .. د. محەمەد

(112) Mitchell- op. Cit. 17.

(١١٣) امال السبكي، المرجع السابق ص٢٥.

حسێن پاشاش لەبیرەوەریەکانیدا دەگێڕێتەوە کەدەسەڵاتی بەریتانی بەحسێن سڕی پاشای سەرۆکی وەزارەتیان ڕاگەیاندبوو کەبەننا بۆ حسابی ئیتاڵیەکان ئیش دەکات و، بەپێویستیشیان دەزانی سنوورێك بۆ چالاکیەکانی دابنێن، ((سڕی پاشاش بۆچوونی وابوو، گەر بەننا لەقاهیرەوە بگوازرێتەوە بۆناوچەیەکی وەك سەعید، ئەم مەبەستە دێتەدی))، بۆیە لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە قسەی لەگەڵدا کردم و داوای لێکردم کەبیگوازمەوە بۆ (قنا)، منیش بەلامەوە ئاسایی بوو کەبەدەم داواکارییەکەوە بچم.[114] بەڵام فەرمانی گواستنەوەکەی دەست بەجێ بەفشارێك لەکۆشکەوە پووچەڵ کرایەوە.

((بەڵام هێندەی پێ نەچوو دەسەڵاتە بەریتانیەکان سەرلەنوێ لە(١٩)ی تشرینی یەکەمی (١٩٤١)دا، داوای دەسگیرکردنی حەسەن ئەلبەنناو ئەحمەد ئەلسوککەرییان کرد، هەروەها عەبدولحەکیم عابدین و چەند ئیخوانیەکی دیکەش دەسگیرکران))[115]. بەم شێوەیەش یەکەم نەهامەتی لەمێژووی شێخ و کۆمەڵەکەیدا،دەست پێدەکات، بەڵام نەهامەتیەکی کورت خایەن. چونکە بەننا چەندەها هاوڕێی خۆشەویست و خاوەن دەسەڵاتی

---

[114] د. محمد حسين هيكل، مذكرات في السياسة المصرية ج٢ ص ٢٠٨.

[115] د. عبدالعظيم رمضان، الحركة الوطنية في مصر من الى ١٩٤٨ ج٢- دار الوطن العربي بيروت ص١٢٨.

هەیە .. پاش چەند ڕۆژێکیش، بەنناو پیاوەکانی بەرەڵاکران. (جۆرج کێرک)یش، کەبەپیاوێکی خاوەن زانیاری فراوان ناسراوە، دەڵێت ((بەرەڵاکردنەکەیان بەهۆی فشارێکی کۆشکەوە بوو، کەلەناو خەڵکیدا بۆچوونێکی وا بڵاوببۆوە، (بەننا)یارمەتیەکی گەورەیان پێشکەش دەکات))[١١٦].

شایەتێکی ئاگاداریش هەیە، کە چەند زانیارییەکی بەبایەخ لەسەر بەرەڵاکردنە لەناکاوەکەی شێخ و وردەکاریەکانی دەخاتەڕوو .. ئەحمەد حسێنی پێشەوای حیزبی میسر ئەلفەتات دەگێڕێتەوە ((کەکاتێك جەنگ دەستی پێکرد، خۆی- ئەحمەد حسێن-و هاوەڵەکانی خرانە زیندانی (الزیتون)ەوەو، هەموو چالاکیەکانیشیان ڕاوەستێنرا. حەسەن ئەلبەنناو سەرکردەکانی ئیخوانیش وەکو هەموو ئەوانەی دیکە، لەکاتی دەستپێکردنی جەنگدا زیندانی کران. ئەوەی سەرنجی زیندانیەکانیشی ڕاکێشا ئەوەبوو کەحامید جەودە (وەزیری حیزبی سەعدیەکان لەوەزارەتی حسین سڕی ١٩٤١) هاتە زیندانەکەو چەند سەعاتێك لەگەڵ بەنناد کۆبۆوە، پاشا هێندەی پێ نەچوو دوای چەند ڕۆژێك بەننا بەربوو)).. ئەحمەد حسێنیش وای لێکدەداتەوە کەئەم بەرەڵاکردنە سەیرە، مانای ئەوەیە حیزبی سەعدیەکان حەزیان بەوەبووە کەبزووتنەوەی ئیخوان بۆ

---

[١١٦] جورج كيرك، المرجع السابق ص ٣١٤.

پشتگیریکردنی، نۆرینی حیزبەکەیان بەکاربهێنن. هەروەها دەڵێت: ((کاتێك شێخ بەننا بەربوو نۆرین و دەسەڵاتی زیادی کردبوو .. زۆر بەسەربەستی و ئازادیشەوە بەردەوام بوو لەسەربانگەشەکەی، بەهەموو بەشەکانی ولاتدا دەگەڕا، خەڵکی کۆدەکردەوەو کۆمەڵانی دروست دەکرد. لەهەموو ولاتیشدا ئەوە دەنگی دابووەوە کەئیخوان موسلیمین لەژێر پارێزگاریی حکومەتدان، بەتایبەتیش پارێزگاریی سەعدیەکان))[117]. هەروەها محەمەد سەبیحیش کەیەکێکە لەسەرکردەکانی میسر ئەلفەتات گەواهی دەدات و (لەگفتوگۆکەیدا لەگەڵ د. عەبدولعەزیم رەمەزان) جەخت لەسەرئەوە دەکات کەفاروق ئیخوانی پاراستووەو هێزیشی بەکارهێناوە بۆ بەرەڵلاکردنیان.[118]

بەننا دوای هاتنەدەرەوەی، دەکەوێتە گفتوگۆکردن لەگەڵ باڵوێزخانەی بەریتانیدا.. ئەمەش مەسەلەیەکە گەرچی هەندێك کەس لەسەرەئەنجامەکانی کۆك نین، بەڵام هیچ گومانێکی تێدا نیەو هەمووان دووپاتی دەکەنەوە، تەنانەت بەننا خۆیشی.

پێش ئەوەیش کەدۆسیەی ((نەهامەتی یەکەم)) دابخەین، دوو تێبینیمان هەیە:

---

[117] مرافعة احمد حسين المحامي في قضية اغتيال المرحوم فهمي النقراشي ١٩٤٩ ص ٤١.

[118] د. عبدالعظيم رمضان، المرجع السابق ص ١٤٥.

یەکەم .. پەیوەندیەکەی نێوان بەننا و کۆشك، ڕێگریی لەبەننا نەکرد کەپەیوەندییەکی توندو تۆڵ لەگەڵ وەلی عەهددا دروست بکات، ئەو وەلی عەهدەی کەنەیاری فاروق و ڕێبازەکەی بوو لەنزیکبوونەوە لەمیحوەر، کە هەمیشە قوربانی دەرو دڵسۆز بوو بۆ ئینگلیز .. وەکو گوزارشت کردنیش لەپەیوەندیەکی بەهێز، وەلی عەهد کتێبخانەیەکی ئیسلامی گەورەی بەخشییە مەڵبەندی گشتی ئیخوان موسلیمین لە (الحلمية الجديدة).[119]

تێبینی دووەمیشیان، ئەحمەد حسێن لەهەمان لێپێچینەوەی پێشوودا باسی دەکات، ئەوەیە کەپۆلیس کۆمەڵی ئیخوان موسلیمینیان وەکو بوارێك بۆکارو چالاکیەکانی خۆیان لەقەڵەم نەدەدا، لەبەرئەوە هیچ دوای جمو جوڵەکانیان نەدەکەوتن و زانیارییان لەسەریان کۆنەدەکردەوە، چونکە بەتەواوی دڵنیابوون لێیان. هەروەها ئەحمەد حوسێن دەڵێت، کاتێك کەبڕیاری هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەکە دەرچوو، پۆلیس لەترس و دڵەڕاوکێیەکی گەورەدا بوون، چونکە هیچ ڕێو شوێنێکیان دانەنابوو بۆ بەرگری کردنی چالاکیەکانی کۆمەڵەکە. بەڵکو ئەحمەد حسەین ڕووداوێکی زۆر سەیر دەگێڕێتەوەو دەڵێت، ڕۆژێك لەڕۆژان خۆی و حەسەن ئەلبەننا دیدارێکیان لەگەڵ عەبدولڕەحیم عەمماری (بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی، پاشان بریکاری وەزارەتی ناوخۆی سەعدیەکان)کردو، شێخ لەدیدارەکەدا

---

[119] محمد شوقي زكي المرجع السابق ص١٤٥.

ئەوەی ڕووبەڕووی عەممار کردەوە کەئەو ئەندامی کۆمەڵی ئیخوان بووە، عەمماریش هیچ نکوڵیەکی لەم قسەیە نەکرد.

لەدادگاییەکیشدا ئەحمەد حسێن عەبدولڕەحیم عەماری داواکرد بۆشایەتی دان و، ئەم مەسەلەیەشی ڕووبەڕوو کردەوە..[١٢٠]

ڕووداوەکانی (٤)ی شوباتی (١٩٤٢)دێنە پێشەوەو وەفد دێتەسەر حوکم. وەفدیش لەو ڕۆژانەدا بەدەست ئەوەوە دەینالاند، کەوەك نەیارەکانی دەیانگوت، ((بەنووکی ڕمی ئینگلیز)) هاتنە سەرحوکمی قبوڵکردبوو. بەدەست چەندەها هێرشی توندیشەوە دەینالاند کەحوکمڕانیەکەیان بەگەندەڵ لەقەڵەم دەدا. هەروەها بەدەست ئەوەشەوە دەینالاند کەژمارەیەك دەرەبەگی زۆر، بەهۆی سەرکردەیەکی گەنجی دەرەبەگی چوست و چالاکەوە کە(فوئاد سەراجەدین) بوو هاتبوونە ڕیزەکانی سەرکردایەتیەکەیەوە. لەسەر هەموو ئەمانەشەوە بەدەست چەند لێکترازانێکەوە دەینالاند کەببوونە مەترسی بۆی.

بەم شێوەیەش هەندێك لەباڵەکانی وەفد، بەتەواوەتی ئامادەبوون پەیوەندیی بەنەیارەکانی دوێنێوە شێخ بەننا بکەن.

لەڕاستیشدا باڵە لیبرالیەکەی وەفد بەتوندی ئەوەی ڕەتدەکردەوە کەئایین یان کۆمەڵە ئایینیەکان بەهەچ شێوەیەك دەست لەسیاسەت وەردەن،

---

[١٢٠] مرافعة احمد حسين، المرجع السابق ص ٤٢.

موستەفا ئەلنەحاس پاشاش بێزارییەكی تایبەتی بەرامبەر ئەم مەسەلەیە هەبوو .. كاتێكیش نەحاس پاشا چاوی بەئەحمەد حسێنی سەرۆكی میسرئەلفەتات كەوت، بەتورەییەوە بەڕوویدا هاواری كردو گوتی ((تۆ دەست نێژیت و یەكێك پاڵی پێوەناویت بۆ ئەم كارە، دەنا ئەو پارەیە لەكوێ دێنیت كەبۆ بزووتنەوەكەتی خەرج دەكەیت؟))، ئینجا لەگەڵیدا كەوتە تاوتوێ كردنی پرانسیپەكانی میسر ئەلفەتات و پێی گووت ((چەند پرانسیپێكی ترسناكی تێدایە كەخەریكە تێیان ناگەم، بۆ نموونە سەیری ئەو (الله)یەبكە كەلەسەرەتای دروشمەكەتدا داتناوە، من تەنها وەكو جادوویەك لێكی دەدەمەوە، چونكە دانانی (الله)لەبەرنامەیەكی سیاسیدا، جادووگەری و چاوبەست دەگەیەنێت))[١٢١]

بەڵام باڵە ڕاست ڕەوەكەی وەفد، كەلەوكاتەدا هێزێكی سەركردانەیان بۆخۆیان شك دەبرد، ئەویش فوئاد سەرجەدین پاشابوو ((وایان لەقەڵەم دەدا كەبزووتنەوەی ئیخوان موسلیمین وەكو ئامرازێكی سودبەخش وان، لەدژی ئەو فشارە كۆمەڵایەتیانەی ڕوو لەزیادبووننس، بەتایبەتی لەو كاتەدا كەبەهۆی جەنگەوە چالاكی شیوعیەكان زیادی كردبوو. بەم شێوەیەش سەراجەدین وەكو وەزیری كشتوكاڵ پلەو پایەی خۆی بەكار هێنا بۆ هاندانی ئیخوان تا چالاكیەكانیان لەگوندەكاندا بەرفراوان بكەن بەم

---

[١٢١] المرجع السابق، ص ٤٧.

شێوەیەو لەسەرشانی سەراجەدین پاشاو کۆمەڵە دەرەبەگەکەی ناو وەفدەوە، شێخ بەننا ڕووەو گوندەکان بازیدا. بەڵام پەیوەندیی نێوان وەفدو ئیخوان هێندەی خواروخێچی پێگە کۆمەڵایەتیە جۆراو جۆرەکانی ناو خودی وەفد، خوارو خێچ بوو.

لە (٧)ی شوباتی (١٩٤٢)دا، نەحاس پاشای سەرەك وەزیران، هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و ئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی نوێی ڕاگەیاند. کۆنگرەی شەشەمی ئیخوانیش کەلەکانونی دووەمی (١٩٤١)دا بەسترا، ڕایگەیاند کەکاتەکە بەتەواوەتی لەبارە، بۆئەوەی پاڵیوراوەکانی ئیخوان بەشداریی لەهەڵبژاردنی پەرلەماندا بکەن. بەنناش لەسنووری ناوچەی ئیسماعیلیەدا خۆی هەڵبژارد، بەڵام هێندەی پێنەچوو بەهۆی دیدارێکی بەپەلەی نێوان بەنناو سەرۆك وەزیرانەوە، لەخۆهەڵبژاردنەکە پاشگەزبووەوە))[١٢٢].

دەشگوترێت بەننا بەرامبەر ئەم پاشگەزبوونەوەیە ((نرخێکی)) بەرزی داواکردووە، کەئەمەیە:

أ- ئازادی کارو چالاکی بۆ کۆمەڵەکە.

---

(122) Mitchell –op. Cit. P. 27.

ب- بەڵێندانی حکومەت، کەکارێك لەدژی مەی فرۆشیو خانەی لەش فرۆشیە ڕەسمیەکان بکات.(١٢٣)

لەکۆتایی ساڵی (١٩٤٢)شدا، سەرلەنوێ نەحاس ڕووبەڕووی ئیخوان بووەوەو هەموو بارەگاکانیشی داخستن تەنها مەڵبەندی گشتی نەبێت. بەڵام لەپاشاندا، بەهۆی سەردانی هەندێك لەسەرکردەکانی وەفدەوە بۆمەڵبەندی گشتی، پەیوەندیەکان چاك بوونەوە.(١٢٤)

بەکورتی هاوپەیمانی کردنی نێوان وەفدو ئیخوان، تەنها بۆماوەیەکی دیاری کراوبوو، ئەویش ئەوماوەیە بوو کەوەفد لەسەر حوکم بوو، نەپێشتر بوو نەدواتر. (چونکە هاوپەیمانێتیەکانی ئیخوان، هەمیشە لەگەڵ ئەوانەدا بووە کەلەسەر حوکم بوون). هەروەها ئەم هاوپەیمانێتیە ببووە هۆی دروست بوونی ململانێ لەناو خودی وەفدیشدا:((لیبرالیەکان))دژی بوون، گەورە خاوەن موڵکەکانیش لەگەڵیدا بوون.

ڕیچارد میشێلیش، کەبەلای ئیخوانەوە توێژەرێکی پەسەندە، دەڵێت ((کۆمەڵی ئیخوان تێڕوانینێکی باویان بۆ ئیسلام بەرجەستە کردبوو، وەکو قەلایەکی بتەویش خستبوویانە ڕوو کەهیچ ڕاوەشاندنێکی ڕیشەیی کۆمەلایەتی یائابووری کاری تێنەکات. ئەم تێڕوانینە نیمچە ڕاڤە کردنێك

---

(123) Heywworth- Dunne- op. Cit. P. 40.

(١٢٤) أحمد انس الحجاجي، الامام - الجزء الثاني ص ٢٩٩.

ئەو هەڵوێستە هاوڕێیەتیە ڕاڤە دەکات کەوەفد -یان با ڕاستتر بڵێین باڵە ڕاست ڕەوەکەی وەفد- لەساڵەکانی ١٩٤٣-١٩٤٤ دا، بەرامبەر کۆمەڵەکە وەری گرتبوو. هەروەها ڕەنگە ئەو هەڵوێستە هاوڕێیەتیانەش ڕاڤەبکات کەکۆشك‌و حکومەتە کەمایەتیەکان، بەرامبەر کۆمەڵەکە وەریان گرتبوو))[١٢٥]

هەر کەوەفدیش گۆڕراو زنجیرەی حکومەتە کەمایەتیەکان هاتنە پێشەوە، ڕاستەوخۆ بەننا ڕووی هاوپەیمانێتیەکانی گۆڕی‌و.. جارێکی تریش هەوڵی‌دا پەیوەندیەکەی لەگەڵ کۆشکدا توندو تۆڵ بکاتەوە. لەبەرئەوەیش بەننا کەناڵی پەیوەندی کردنەکەی پێشووی لەدەست دابوو، کەلە عەلی ماهیرو مەراغیدا خۆی دەنواند، چونکە ئەمانە وەك جاران لەکۆشکەوە نزیك نەبوون، بۆیە بەردەوام بۆ کەناڵێکی پەیوەندیی نوێ دەگەڕا لەنێوان خۆی‌و شادا. ئەنوەر ساداتیش دەگێڕێتەوە کەشێخ بەننا زۆر بەپەرۆشەوە تکای لێکردبوو تا هەوڵ بدات لەڕێگەی یوسف ڕەشادەوە پەیوەندیەك لەگەڵ شادا دەستەبەر بکات. ڕەشادیش پاش ئەوەی شارێی پێدا دیداری لەگەڵدا کرد. سادات بەردەوام دەبێت‌و دەڵێت، یوسف ڕەشاد لەپاشاندا تێی گەیاندبوو کەلەساڵی ١٩٤٦دا، پاشا بەتەواوی ڕەزامەندبوو لەشێخ‌و کۆمەڵەکەی.[١٢٦]

---

(125) Mitchell-op-cit. 39.

(١٢٦) انور السادات، صفحات مجهولة.. الترجمة الانجليزية ص٩٩.

لەگەڵ ئاڵوگۆڕە جۆراو جۆرە سیاسییەکاندا، شێخ ۆر کارایانە هەوڵی دەدا مانۆڕ بکات.

شێخ وەکو هەموو نەیارەکانی دیکەی وەفد، سوودی لەڕووداوەکەی (٤)ی شوبات بینی[١٢٧]. پاشان سوودی لەباڵە ڕاست ڕەوەکەی وەفد بینی. پاشان لەگەڵ حکومەتە کەمایەتیەکان کەوتەوە هاوپەیمانی کردن.

لەساڵی (١٩٤٥)یشدا، ئەحمەد ماهیر پاشا هەڵبژاردنێکی ناخاوێن و فێڵاوی ئەنجام دا لەم هەڵبژاردنەشدا، بەننا و پێنج لەشوێنکەوتووەکانی خۆیان پاڵاوت، بەڵام هیچیان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا.

لەوانەشە بەننا دوابەدوای ئەم دۆڕان و سەرنەکەوتنە، هەستی بەپێویستی سەرلەنوێ توندوتۆڵ کردنەوەی ڕیزەکانی کۆمەڵەکەی کردبێت.بۆیە کۆمەڵەکە کۆنگرەیەکی نوێیان بەست. تێبینیش دەکرێت کەحکومەت ڕێگای بەبەستنی ئەم کۆنگرەیە دابێت، لەکاتێکدا کەڕێگا بە هیچ کۆبوونەوەیەکی سیاسی نەدەدرا هیچ حیزبێك بیکات. کۆنگرەکەش پێشنیارەکانی بەننای سەبارەت بەیاسای سستمی بنەڕەتیی دەستەی گشتی ئیخوان موسلیمین پەسەندکرد، کەئەمەش لیستی سستمی ناوخۆیی کۆمەڵەکە دەنوێنێت .. بەم یاسایەش، مورشیدی گشتی جڵەوی چارەنووسی کۆمەڵەکەی لەدەستی خۆیدا هێندەی ترتوند کرد.

---

[١٢٧] انور عبدالملك، المرجع السابق ص٢٥.

ڕووداوەکانی (١٩٤٦)یش دەست پێدەکەن و شەپۆلی شۆڕش بەرزدەبێتەوە، هەموو میسریش دەهەژێت و داوای وەدەرنانی تەواوەتی داگیرکەر دەکات. کۆمەڵەکەش لەو کاتەدا تەوەرەیەك بوو لەگرنگترین تەوەرەکانی خەباتی نیشتمانی .. هەروەها مەڵبەندە کرێکارییە بەبایەخەکانی وەك شبرالخەیمەو ئەوانی دیکەش بەهەمان شێوە.

لەلاپەڕەکانی پێشودا، بینیمان کەهەڵوێستی کۆمەڵەکەو ئەندامەکانی، سەبارەت بەخۆپیشاندانە گەورەکەی شبرالخەیمە چۆن بوو .. ئەی ئایا لەزانکۆدا چۆن بووە؟

ئاراستە سیاسیەکان لەزانکۆدا ببوون بەسێ بەشەوە: وەفد بەنۆرینە باوەکەیەوە کەلەنێو ڕیزەکانی قوتابیانی زانکۆکاندا هەیبوو. پاشان ئیخوان موسلیمین و شیوعیەکان بەو کاریگەریە بەهێزەوە کەلەماوەی هەردووساڵی ١٩٤٦-١٩٤٧ دا ڕوو لەزیادبوون بوو.

هێزە نیشتمانیەکانیش بەهەموو پۆلە جیاوازەکانیانەوە، هەوڵیان دەدا ڕیزەکانی زانکۆ بەئاراستەی بەرنامەیەکی نیشتمانی یەکبخەن. سەرەتاکەش بریتی بوو لەبانگەوازی بەستنی کۆنگرەیەك لەکۆلیژی پزیشکی لە(٧)ی تشرینی یەکەمی (١٩٤٥)دا. بەلام ئیخوان موسلیمین، وەکو هەوڵێکیش بۆهەڵوەشاندنی ئەم کۆنگرەیە، بەپەلە کەوتنە بەستنی

کۆنگرەیەکی تایبەت بەخۆیان، گووتیشیان (٦)هەزار خوێندکار ئامادەی بووە.

بەناوی ئەم کۆنگرەیەشەوە، نامەیەکیان ئاراستەی سەرەك وەزیران کردو گووتیان ئەم نامەیە گوزارشت لە ((خاکی سەوزی میسر))دەکات. پاشان ئامادەی کۆنگرەی (٧)ی تشرینی یەکەم بوون‌و داوایان لەهەمووان کرد کە ڕەزامەندبن، لەسەر بڕیارەکانی کۆنگرەکەی ئەمان. کاتێکیش ئامادەبووان ڕەتیان کردەوە، ئەمەیان بەبیانوویەکی باش زانی بۆ پاشەکشەکردن.(١٢٨)

هاوپەیمانیە نیشتمانیەکەش لەنێو زانکۆدا، لەچوارچێوەی ((لیژنەی ئامادەکاریی لیژنەی نیشتمانی قوتابیان))دا، لەسەر گەڵاڵەکردنی خۆی بەردەوام بوو، کەنوێنەری قوتابیە وەفدی‌و شیوعیەکان‌و ئەوانەی تر بوو.. بەڵام ئیخوان موسلیمین لەدەرەوەی چوار چێوەکەدا، مابوونەوەو هەوڵیان دەدا لەهێڵێکی پێچەوانەدا کاربکەن.

زانکۆش دووجوڵانەوەی بەخۆیەوە بینی.. جوڵانەوەو خۆپیشاندانەکانی هێزە نیشتمانیەکان، کەلە ((لیژنەی نیشتمانیی قوتابیان))دا یەکیان گرتبوو. وە جوڵانەوەی ئیخوان موسلیمین بەئاڕاستەیەکی پێچەوانە.(١٢٩)

---

(١٢٨) محمد حسن أحمد (اسم سري)، الاخوان المسلمون في الميزان ص ٨٨٠.

(129) Thieck, Jean- Pierre- La Jounee du 21 Fevrier 1946 dans I. historie du mouvement National Egyptien.

لەکلتێکیشدا کەبەچڕو پڕی خۆئامادە دەکرا بۆ ڕۆژی ،انگرتنە گشتیەکەی (٢١)ی شوباتی (١٩٤٦)، ((لیژنەی نیشتمانی قوتابیانو کرێکاران))کەلەیەکگرتنی لیژنەی نیشتمانی قوتابیانو سەرکردایەتیە کرێکارییە نیشتمانیەکان پێکهاتبوو، دوو نوێنەری نارد بۆلای شێخ بەننا تا دیداری لەگەڵدا بکەنو بانگهێشتی بکەن کەبەشداری لەم خۆئامادە کردنەدا بکات. بەلام شێخ دەستی پێکردنو پاشان بەبیانووی ئەوەی ((ئیخوان ئامادەنین))، بەتوندی داواکەیانی ڕەتکردەوە. لەگەڵ ئەمەشدا ئیخوان چەند ڕۆژێك پێش ئەوە ((١١ی شوبات))، بەتەواوی ئامادەبوون کە بەسەرکردایەتی (مستەفا موئمین)ی پێشەوای قوتابیانیان، خۆپیشاندانێك لەژێر پارێزگاری پۆلیسدا سازبکەنو، بەدووبارەکردنەوەی چەند دروشمێکی لایەنگری کردنی شاوە، ڕووەو کۆشکی عابدین بکەونەڕێ.[١٣٠]

هەروەها بەتەواوەتی ئامادەش بوون کەبەبۆنەی یادی چوونەسەرتەختی شاوە، لەئایاری (١٩٤٦)دا ئاهەنگ بگێڕن، چەند ئاهەنگێك کەتاڕاددەیەکی زۆر زیادەڕەوییان تێدابوو..

لەم ساڵەدا کەجەماوەری میللی بەخوێنو شەهیدەکانیان ڕەتکردنەوەی خۆیان بۆداگیرکەرو بەکرێگیراوانی کۆشکی پاشایەتیو ئەنجومەنی وەزیران تۆمارکرد.. ئیخوان موسلیمین لەبەشە جۆراوجۆرەکانی وڵاتدا، ئاهەنگی

---

[130] Mitchell- op- cit. P. 45.

گەورەیان بەبۆنەی چوونەسەرتەختی شاوە گێڕا. بەننا و ئەندامانی ئەنجومەنی ئیرشادی گشتیش، بەشدارییان لەم ئاهەنگانەدا کرد کەپێچەوانەی هەستو سۆزی هەموو میسریەکان بوو. ڕۆژنامەی ئیخوانیش بڵاوی دەکاتەوە ((لە (المحلة الكبرى)وە هەواڵێکمان پێ گەیشتووە، کەپاش نیوەڕۆی دوێنێ، بەبۆنەی ئەم یادە خۆشەوە نمایشێکی جوان لەلایەن (١٥٠٠)کەس لەگەڕۆکەکانی ئیخوان موسلیمینی ئەوێوە ئەنجام درا))[131].

لەسەر ئەمەشەوە شێخ بەننا هەوڵیدا سەرنجەکان لەمەسەلە نیشتمانیەکە دووربخاتەوەو ڕایگەیاند کەکێشە بنەڕەتیەکە بریتییە لەگێڕانەوەی خەلافەتی لەدەست چوو. ڕەنگە بەمەش ویستبێتی کەبەهەمان شێوە پاشاش چەواشە بکات، بەوەی کەپەیمانی مێژەری خەلافەتی بداتێ.

بەم شێوەیەش، پەیوەندی نێوان کۆشکی پاشایەتیو ئیخوان پتەودەبێتو.. دەشگاتە ڕاددەیەك کەپێش ئەوەی ئیسماعیل سدقی بانگ بکرێت، بۆئەوەی سەرۆکایەتی ناپاکترینو دڕندەترین وەزارەتەکانی مێژووی نوێی میسر وەربگرێت، پرسو ڕاوێژ بەبەننا بکەن.[132]

لەشوباتی (١٩٤٧)دا، شێخ یەکەمین هەنگاوەکانی دەنێتە ناو کۆشکی عابدینەوەو بۆیەکەمین جار بۆ خوانو داوەتێکی شاهانە بانگهێشت

---

[131] الاخوان المسلمون، ١٩٤٦/٥/٦.

[132] آخر الساعة ١٩٥٤/١٢/١.

دەكرێت. هێندەی ئەوەش كەدووساڵی (٤٦-١٩٤٧)ساڵانی لەیەك تەبازانی ئیخوان بوو، چونكە دەبووایە دەست خۆشییان لەچەند هەنگاوێك بكردایە، كەهیچ نیشتمان پەروەرێك ناتوانێت دەستخۆشییان لێ بكات، وەك پەیماننامەكەی سدقی- بیڤن و پەیوەندییە توندەكانی بەننا لەگەڵ سدقی زۆرداردا كەپێشتر بینیمانن .. هێندەش نرخەكە گران بوو ریچارد میشێل دەڵێت ((بەهەرحاڵ، ئاشكرایە كەئیخوان موسلیمین بەدرێژایی دوو ساڵی ٤٦- ١٩٤٧ وەكو ئامرازێك بۆ دژایەتی كردنی وەفدو شیوعی سەیریان دەكرا، لەوەش دەچێت بەننا كۆمەڵێك ئاسانكاریی ڕەسمی (!)لەسدقی وەرگرتبێت و ئەمەش هانی دابێت كە ئەم ڕۆڵە ببینێت. یەكێك لەم ئاسانكاریانەش بریتی بوو لەمۆڵەتی دەركردنی ڕۆژنامەیەكی ڕەسمی ڕۆژانە بۆكۆمەڵەكە، ئەویش (الاخوان المسلمین)بوو، كەلە ئایاری (١٩٤٦)دا دەرچوو. هەروەها مۆڵەتی ئەوەش كەپەڕەی چاپكرنیان بەنرخی ڕەسمی پێبگات، وات نزیكەی (٢٠ یا ٣٠٪)لەنرخی بازاڕی ڕەش كەمتر. هەروەها چەند ئیمتیازێكی بەبایەخیش درایە تیمەكانی گەڕۆكەكان، بەوەی كەبڕیاردرا بەرگی ڕەسمیان هەبێت و ئامرازو پێداویستیان بەنرخی داشكاو یا ڕەمزی پێببەخشرێت و پارچە زەویەكیشیان بۆ دابین بكرێت تا سەربازگەكانیانی تێدا دروست بكەن. هەروەها سدقی زۆر بەتەنگ ئەوەشەوە بوو (محەمەد حەسەن ئەلعەشماوی)، كەیەكێك بوو لەهاوڕێ

نزیکەکانی بەننا، بکاتە وەزیری مەعاریفی گشتی .. زیاتریش لە،ەدەچێت کەکۆمەکە ماددیەکان لەرێی هەردوو وەزارەتی مەعاریف و کاروبارە کۆمەلایەتیەکانەوە درابێتە کۆمەڵەکە، بەناوی ئەوەوە کەئەمە بەشداری یان دەسگیرۆیی کردنی دەوڵەتە، بۆ ئەو خزمەتە فێرکاری و کۆمەلایەتی و خێر خوازیانەی کۆمەڵەکە پێی هەڵدەستن))[١٣٣].

شتێکی سروشتیشە کەئیخوان زیاترو زیاتر لەبەرامبەر ئەم ئاسنکاریانەدا، بەدەنگ سیاسەتەکەی سدقیەوە بێن، بۆیە ئیخوان گەرۆکەکان و هەموو هێزەکانی خۆی تەرخان کرد، بۆ دژایەتی کردنی هەریەکێك کەنەیاری سدقی و سیاسەتە ناپاکەکەی بێت.

هێرشی ئیخوانیش زیاتر بۆسەر دوولایەن بوو، ((وەفد)) و ((شیوعیەکان)).

ئەحمەد حسێن دەڵێت، ئیخوان ((کینەبەرایەتی وەفدیان کردو ئەوانیش کینەبەرایەتیان کردن، لەبەرئەوە گرژی لەنێوان هەردوولایەکەدا دروست بوو و لەهەموولایەکەوە پێکدادان دەستی پێکرد. شتێکی سروشتیش بوو کەحکومەت لەهەموو پێکدادانێکی نێوان ئەمان و وەفددا، لایەنگری ئەمان بکات، بۆیە دەیپاراستن و پشتگیریشی دەکردن))[١٣٤].

---

(133) Mitchell-op-cit. P. 42.

(١٣٤) مرافعة احمد حسين- المرجع السابق ص٤٣.

وەفدیش بەهەمان شێوە بەرپەرچیدانەوە، ڕۆژنامەکانیشی هێرشیان دەکردە سەر شێخ بەنناو بە ((شێخ حەسەنی راسپۆتین)) ناویان برد. ((دەنگی ئوممەت))یش کەڕۆژنامەی وەفد بوو، لەباسی سەردانێکی شێخدا بۆ یەکێك لەهەرێمەکان دەڵێت ((خەڵکی هاواریان دەکرد، بڕوخێ شێخی دەسکردی ئینگلیز))[١٣٥].هەروەها میسر ئەلفەتاتیش بەشداریی لەم شاڵاوەدا کرد کەدەکرایە سەر بەننا، ئەحمەد حسێنیش بەنووسین هێرشی کردەسەر بەنناو گوتی ((حەسەن ئەلبەننا ئامرازێکە بەدەست کۆنەپەرستی و سەرمایەداریی جولەکەو ئینگلیزو سدقی پاشاوە))[١٣٦]

بۆیە تا ئەوپەڕی ئاست پەنایان بردەبەر بەکارهێنانی توندوتیژیی سیاسی. پێکدادانە سیاسیەکانیش بۆ یەکەم جار بەکارهێنانی فیشەك و قومبەلەو گروپە ڕێکخراوە نیمچە سەربازییە گەڕۆکەکانی بەخۆوەبینی.

لە (٦)ی تەمموزی (١٩٤٦)دا، پێکدادانێك لەنێوان وەفدو ئیخواندا لەپۆرسەعید ڕووی‌دا، ئیخوان فیشەکیان تێیدا بەکارهێناو سێ قومبەلەشیان تەقاندەوە، ڕووداوەکەش بووەهۆی کوژرانی یەکێك لەوەفدیەکان و بریندار بوونی (٣٥) کەس، ((بۆیە کۆمەڵێکی زۆر لەبەردەم خانەی ئیخواندا کۆبوونەوەو ئاگریان تێبەردا، هەروەها ئاگریان بەردایە

---

[١٣٥] صوت الامة. ١٩٤٦/٢/٢٨.

[١٣٦] مصر الفتاة. ١٩٤٦/٧/١٧.

یانەی وەرزشیی ئیخوانیش))[١٣٧]. لەوکاتەدا، شێخی سەردانی شارەکەی دەکرد، وەفدیەکان لەیەکێك لەمزگەوتەکاندا، گەمارۆیان دا، بەلاّم شێخ توانی خۆی قوتار کاتو ڕابکات. لەڕۆژی دوایشدا تەرمی کوژراوەکە بەخاك سپێردراو ((پاش بەخاك سپاردنەکە، ئامادەبوان هەستان بەگەمارۆدانی مەڵبەندێکی ئیخوانو بلاّوەی پێکردن، پۆلیسیش کەوتە بلاّوە پێکردنیان، بەلاّم ئەمان بەڕووی پۆلیسدا هەڵگەڕانەوە، بۆیە پۆلیسەکان تەقەیان لێکردنو (١٦) کەس بەرکەوتن))[١٣٨].

بەلاّم شیوعیەکان بەشێکی گەورەتریان بەرکەوت .. ئەمەش بەوەی کەئیخوان بەڕەسمی دەسخۆشیان لەو هەڵمەتە دڕندانەیە کرد، کەسدقی لەژێر پەردەی ئەوەی لەوکاتەدا ناوینرا بوو کێشەی گەورەی شیوعییەکان ((قضیة الشیوعیة الکبری))، کردیە سەر چەپڕەوو دیموکراسیو وەفدی شیوعیەکان. ڕۆژنامەی ئیخوانیش بەشێکی ڕۆژانەی لەژێر ناوی ((قەلاّچۆکردنی شیوعیەت))دا، بۆ بەدوادا چونو ستایشکردنی ئەم هەڵمەتە تەرخان کردبوو.

میشێلیش دەڵێت ((لەکاتی گەڕانی بەردەوامدابەدوای شیوعیە ناسراوەکانو ئەوانەی گومانی شیوعێتیان لێ دەکرا، هەواڵگیریی ئیخوان

---

[١٣٧] المصري ١٩٤٦/٧/٨.

[١٣٨] الاهرام ١٩٤٧/٧/٨.

چەند زانیارییەکی بەسوودیان دایە حکومەت،بەتایبەتیش لەبوارە خوێندکاری و کرێکاریەکاندا)) [١٣٩].

بەم شێوەیەش هاوپەیمانییە سیانیەکە: کۆشک- حکومەتە کەمایەتیەکان- ئیخوان موسلیمین، لەیەک تەوەرەی سەرەکیدا بەیەک دەگەیشتن، کەبریتیی بوو لەدژایەتی کردنی وەفدو شیوعیەکان .. هەروەها لەچەند هەڵوێستێکی دیاری کراویشدا، سەبارەت بەمەسەلە نیشتمانیەکەو چارەسەرکردنی، بەیەک دەگەیشتن. ئەمانەش چەند هەلوێستێك بوون لای گشت هێزە نیشتمانیەکانەوە ڕەت کراوە بوونەوە.

بەڵام ئیخوان لەسەر ڕێگەکەیان بەردەوام بوون و زیادە ڕەوییەکی زۆریشیان کرد.

چونکە نەك هەر ریزی نیشتمانییان بەش بەشکرد، بەڵکو بەمەبەست و لەکاتێکی زۆر ناسکیشدا، کەوتنە وروژاندنی فیتنەی تایەفەگەری*، واتا تێکشکاندنی یەکێتی دوو توخمی نەتەوە.

ڕۆژنامەی ((میسر)) بڵاوی دەکاتەوە کە کۆمەڵی ئیخوانیش لەناهەنگێکیان لەبەردەم کەنیسەی (مارجرجیس)دا گێڕاو وتاربێژەکەی ئیخوان لەئاهەنگەکەدا دووبارەی کردەوەو گوتی ((سبەی کۆمپانیای ئاو

---

(139) Mitchell –op- cit. P. 39.

دەکەوێتە دەست ئێمەو ئێمەش یەك قیبتی تێدا ناهێڵین .. سبەی مسوڵمانەکان کۆنترۆڵی هەموو کۆمپانیاکان دەکەن و یەك قیبتیشیان تێدا نامێنێت))[١٤٠].

ڕەنگە ئەم شێوازەش سەیربێت سەبارەت بەوڵاتێك کەڕووبەڕوی ئیستعمار بووبێتەوەو، سەرچاوەی هێزە بنەڕەتیەکەشی، بۆ ئەم ڕوبەڕوبوونەوەیە بریتی بێت لەیەکێتیە نیشتمانەیەکەی، چ لەسەر ئاستی ئایینی، یان لەسەر ئاستی سیاسی.

سەیرو سەر سووڕمانەکەش لەکاتێکدا هێندەی تر زیاد دەکات کەدەبینین یەکێك لە سەرکردەکانی ئیخوان (شێخ محەمەد ئەلغەزالی) کتێبێك بەناونیشانی (دەمارگیری و لێبوردن لەنێوان مەسیحێتی و ئیسلامدا)دەردەکات و تیایدا بنەمای یەکێتی نیشتمانی ڕەت دەکاتەوەو بگرە ئیدانەشی دەکات. ئەم سەرکردە ئیخوانیە دەڵێت، لەکاتی شۆڕشەکەی (١٩١٩)دا، ڕێکەوتنی سەرکردە مسوڵمان و مەسیحیەکان لەسەر ئەوەبوو کەهەمووان لەپێناوی دەرکردنی دوژمندا، ئایینەکانیان لەخەیاڵی خۆیان دەرکەن .. ئەم ڕێکەوتنەش بەشتێکی سەیر لەقەڵەم دەدات و جێبەجێکردنیشی بەسەیرو سەمەرەتر. هەروەها گوتیشی، زۆریی ژمارەی

* فیتنەی تایەفەگەری: لێرەدا مەبەستی لەوەیە کەئیخوان دەیانویست ناکۆکی لەنێوان دوو توخمی ئایینی سەرەکی میسردا دروست بکەن (مسوڵمان و مەسیحیەکان). وەرگێڕ.

فەرمانبەرە مەسیحیەکان لەبەڕێوەبەرایەتیەکانی میسردا ((مانای وەلاوەنانی ئیسلامەو زاڵکردنی کەسانی دیکەیە بەسەریدا))[١٤١].

کەی کاتی ئەوەبوو؟

ئیخوان چ نرخێکی گەورەشیان دا، لەبەرامبەر ئەو ((ئاسانکاری))یانەدا کەوەریان گرتبوو؟

لەڕاستیشدا ئەو نرخەی کە دایان تەنها بریتی نەبوو لەهەڵوەشاندنی یەکێتی نیشتمانی ئاینی و یەکێتی نیشتمانی سیاسی، لەکاتێکدا کەمیسر ڕووبەڕووی دوژمنە بنەڕەتیەکەی دەبۆوە (داگیرکەر).. بەڵکو هەروەها گەیشتە دابەش بوون و لێکترازانی خودی ڕیزەکانی خۆیشیان... ئەمەش ڕێگەی بۆئەوە خۆشکرد، بەدەستی ئەوانە لێیان بدرێت کە هاوپەیمان بوون و هانیان دابوون ئەم ڕێگایە بگرنەبەر لەکۆتایشداو، پێش ئەوەیش کەئەم پەڕەیە هەڵبدەینەوە، ئەوە ماوە کەبڵێین ئیخوان هێندەیان پێنەچوو ڕویان لەسدقیش وەرگێڕا، ئەمەش لەکاتێکدا کەهەستیان کرد ڕۆژەکانی سدقی لەوەزارەت تەواو بووەو یەکێکی نوێ بەڕێوەیە کەئەویش نەقراشیە، لەبەرئەوە وەکو عادەتی خۆیان هاوپەیمانێتیان لەگەڵ ئەم نوێیەدا کرد.

شتێکی ئاسانیش نەبوو کە ئیخوانیەك بڕوا بەم جۆرە ڕێبازە بێنێت.

---

[١٤٠] جريدة مصر ١٩٤٧/٥/٣.

[١٤١] محمد الغزالي، العصب والتسامح بين المسيحية والاسلام ص١٨.

هەروەها بەلای ((برای مسولْمان))یشەوە شتێکی ئاسان نەبوو، خۆی لەخۆپیشاندانێکدا ببینێت کەهاوار بۆ ستایش‌و تەمەن درێژیی پاشایەکی گەندەڵ، یان سەرەك وەزیرانێکی ناپاك بکات‌و، پشتگیریی لەپەیماننامەیەك بکات کەڕیزی نیشتمانی لێك دەترازێنێت‌و هەموو میسر ڕەتی دەکاتەوە.

دابەش بوونیش، تاکە ڕێگابوو لەبەردەم کۆمەڵێکدا کە دەستێکی تەنهای بەهێز لەسەرەوە بالادەست بوو بەسەریداو بەڕێوەی دەبرد.

هەڵگەڕاوەو نەیارەکانی شێخیش پەنایان بردەبەر مەسەلەیەکی زۆر بایەخدارو ئاڵۆز، کەهەر لەساڵی (١٩٤٥)ەوە ئەم مەسەلەیە لەنێو کۆمەڵەکەدا هەبوو، لەوکاتەوە کەهەندێك کەس چەند گومانێکی ڕەووشتکارانەیان دژی عەبدولحەکیم عابدین- سکرتێری گشتی کۆمەڵەکەو مێردی خوشکی شێخ بەننا- وروژاندو تاوانباریان کرد.

بەنناش یەکێك لەسەرکردە نزیکەکانی خۆی ڕاسپارد (د. ئیبراهیم حەسەن) تا لێکۆڵینەوە لەتاوانبار کردنەکەدا بکات کەئەمەیە ((پێشێل کردنی حورمەتی ماڵ‌و ناموسی هەندێك لەئیخوان)). لەکاتێکیشدا د. ئیبراهیم حەسەن خەریکی لێکۆڵینەوە دەبێت، هەواڵەکان دزە دەکەنە دەرەوە، ئەمەش دەبێتەهۆی وروژاندنی ڕق‌و تورەیی هەندێك لەئەندامەکان. بۆیە د. ئیبراهیم پێشنیارێك پێشکەش دەکات کەشێوە گونجاندنێکی تیدابێت، لەپێشنیارەکەشیدا داوای ئەوە دەکات کە عەبدولحەکیم عابدین‌و

ئەو .چوار ئەندامەی مەکتەبی گشتیی ئیرشادی کەعەبدرلحەکیمیان تاوانبار کردبـوو دەربکرێـن ... بـەڵام بـەننا بەزاواکەیـەوە پەیوەسـت دەبێـت و سـەرکردەکانی کۆمەڵەکـە پێـك دەهێنێـت بـۆ گـەڕان بـەدوای ڕاسـتیەکاندا. کـاتێکیش ئـەم لیژنەیـە بەشـێوەیەکی تاڕاددەیـەك ئاشـکرا خـەریکی چالاکییـەکانی دەبێـت، ژمـارەی ئەوانـەی گومانیـان لـەڕەفتارەکانی عەبدولحـەکیم هەیـە زیـاد دەکـەن و ئەمـەش لیژنەکـە دەخاتـە تـەنگژەوە .. چونکـە تاوانـەکان زۆرن و ترسناکیشـن، تاوانبارەکـەش زاواو بـرادەری ئیمامـەو نـهێنی هەڵگریشـیەتی .. لەبەرئەمـە لیژنەکـە پێشـنیارێکی گونجێنەری پێشکەش کرد، بۆچوونیشی وابوو کە ڕەنگە شێخ بەوە قایل بێت لیژنەکە بەڕەسمی ڕایبگەیەنێت کەڕاستی تاوانبار کردنەکان نەسەلما، بـە مـەرجێك وەکـو ((پاکسـازی))یـەك عەبدولحـەکیم لەپلـەو پایـەکانی و لەکۆمەڵەکە دووربخرێتـەوە.شێخیش جارێکی تر ڕەتـی دەکاتـەوەو دەسـت بەرداری زاواکەی نابێت.

مەکتـەبی گشـتی ئیرشـادیش کۆبوونەوەیـەکی تـوڕە دەبەسـتێت، لـەم کۆبوونەوەیەدا، شێخ بەننا بۆ یەکەمین و دواهەمین جار لەژیانیدا ڕووبەڕووی زۆرینەیـەکی تـوڕە دەوەسـتێت، کـە زاواکـەی بەچـەند تـاوانێکی ترسـناك تاوانبـار دەکـەن، بچووکترینیـان ئەوەیـە کەبـە ((ڕاسـپۆتینی کۆمەڵەکە))لەقەڵەمی دەدەن.

مورشیدیش سووردەبێت لەسەر هەڵوێستی پاراستنی زاواکەی، ملیش نادات بەڕای زۆرینەی مەکتەبی گشتیی ئیرشادیو بڕیاری لیژنەی گەڕان بەدوای ڕاستیەکاندا، هەروەها پشت بەنۆرینی خۆیشی دەبەستێت لەدەستەی دامەزرێنەری کۆمەڵەکەدا ((تا بڕیارێك سەبارەت بەبێ تاوانی عەبدولحەکیم بەدەست بهێنێت - بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی کۆمەڵەکە- دوای ئەوەی بەڵێن دەدات کە تایبەتمەندیەکانی لێ بسەنێتەوەو پاش ماوەیەك بۆ هەتا هەتایە دەری بکات)).

د. ئیبراهیم حەسەنیش وەکو ناڕەزایی دەربڕینێك، لەنیسانی (١٩٤٧)دا، دەستی لەکارکێشایەوە وازی هێنا، هەروەها هەندێکی دیکەش لەگەڵیدا وازیان هێنا.

پاشان ناکۆکیەکی نوێ ڕوویدا لەگەڵ سەرکردەیەکی تردا کەیەکێك بوو لەکۆڵەکە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵەکە، ئەویش ئەحمەد ئەلسوککەری بوو، لەلاپەڕەکانی سەرەتای ئەم توێژینەوەیەشدا، باسی ئەو پەیوەندییە توندو تۆڵە کرا کەهەر لەمنداڵیەوە، لەنێوان بەنناو سوککەریدا هەبوو، هەروەها ئەو متمانە تەواوەش کەشێخ دابوویە سەککەری، تا بەناویەوە لەگەڵ زۆر لەو لایەنانەدا دانوستان بکات کە پەیوەندی پێوەکردنیان پێویستی بەمتمانەیەکی زۆر گەورە هەیە، وەك باڵیۆزخانەی بەریتانیاو وەفدو ئەوانەی تریش.

لەوانەشە شێوازە زۆرە ملێیەکەی شێخ، لەبەرامبەر زۆرینەی مەکتەبی ئیرشاددا، برینێکی کۆنی لای سوککەری کولاندبێتەوە، کەهەمیشە داوای کەم کردنەوەی دەسەڵاتەکانی شێخ و دیموکراسیەتی پەیوەندییەکانی ڕێکخستنی دەکرد.

هەروەها لەوانەشە ئەم قەیرانە شانبەشانی ناکۆکیەك بووبێت، لەنێوان مورشید سوککەریدا سەبارەت بەپەیوەندیی لەگەڵ وەفددا. چونکە سوککەری هیچ سودێکی لەوەدا نەدەبینی لەگەڵ وەفددا بەیەکدا بدەن، کە گەورەترین هێزی سیاسیی جەماوەری بوو لەوڵاتدا. بەڵکو سوککەری داوای ئەوەی دەکرد ((جۆرێك یەکێتی لەنێوان دوو حیزبەکەدا هەبێت))[١٤٢].

هەندێك لەتوێژەرەکانیش دەڵێن، سوککەری بەننای سەرزەنشت کردو ناڕازی بوو لەوەی بەننا ((یارمەتی ماددی لەئینگلیز)) قبوڵ کردبوو[١٤٣].

زۆر بەئاسانیش بەننا داوای لەدەستەی دامەزرێنەر کرد، لەسەر چەند بابەتێك کەخۆی دیاری کردبوون، سوککەری بخەنە بەر لێپرسینەوە. دەستەی دامەزرێنەریش بڕیاری دەرکردنی سوککەرییان ڕاگەیاند .. زنجیرەیەك دەست لەکارکێشانەوەی فراوانی ئەندامانیش بەدوای ئەمەدا ڕوویان دا.

---

(142) Mitchell-op- cit. P. 52.

(143) Alexander, Mark – Left and Right in Egypt- Twentieth century (Feb, 1952).

بوونەدەرەوەی د.ئیبراهیم حەسەن و سووککەرنی و ئەوانەی دیکە، گورزێکی کوشندە بوو بۆ کۆمەڵەکە. چونکە بووەهۆی لەدەست چوونی ژمارەیەك لەگرنگترین کادێرە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵەکەو، هەروەها چەند مەسەلەیەکیشی خستەڕوو کەمتمانەی خەڵکی سەبارەت بەکۆمەڵەکەو بێگەردیی بانگەشەکەی لەق کرد، تەنانەت سەبارەت بەشێخ خۆیشی و بەتواناکانیشی کەبتوانێت لەچوارچێوەی پەیوەندییە خێزانیەکەی گوزەربکات .. لەبەرئەوەیش کەناکۆکییەکان دەرەنجامی خراپ بوونی هەڵوێستی کۆمەڵەکە بوو، بەرامبەر مەسەلە نیشتمانیەکەو هێزە نیشتمانیەکان، لەسەر هەمووشیانەوە وەفد. بۆیە وەفد ئەم هەلەی قۆستەوەو هەڵمەتێکی ڕاگەیاندنی بەتینی لەدژیان بەرپاکرد، کەبەشێوەیەکی کرداری ئەم هەڵمەتە، کۆڵەکەکانی کۆمەڵەکەی ڕاوەشاند. لەڕووبەڕووبوونەوەی ئەمەشدا شێخ سووربوو لەسەرئەوەی کەزیاترو زیاتر جڵەوی کۆمەڵەکە لەدەستی خۆیدا توندکات .. پشت و پەنای ڕاستەوخۆیشی، دەزگای نهێنی بوو .. کەبەپەلە کەوتە ڕاهێنان و فراوانکردن و پڕچەککردن و .. بەکارهێنانی، وەکو ئامرازێك بۆ پاراستنی یاسا، لەنێو ڕیزەکانی ئیخوانداو، تۆقاندنی نەیارەکانی لەنێو کۆمەڵەکەو لەدەرەوەشیدا.

... ئەمانەش هەمووی لەکاتێکدا ڕوویان دەدا کەکۆمەڵەکەو شێخ بەخێراییەکی بەتین، پلەو پایەی میللی خۆیان لەدەست دەدا.. شێخیش وایدەزانی کەبەنزیك بوونەوەی لەکۆشك و دەسەلاتدارە کەمایەتییە بەکرێگیراوەکان، کات و یارمەتی و پشتگیریەکی وای دەست دەکەوێت کەبتوانێت، وەکو خۆئامادەکردنێك بۆ ڕۆژی دیاری کراو، کۆمەڵەکەی پێ پتەو بکات.. ئەوەشی لەبیرچووبوووەوە کەهەر کۆمەڵێکی سیاسی و هەر پێشەوایەکی سیاسی، کاتێك پلەوپایە جەماوەریەکەی لەدەست دەدات، نرخ و بەهای کۆتایی پێ دێت. هەروەها ئەوەشی بیرچووبۆوە کەسەرکردەی حیزبە کەمایەتییەکان، بەیارمەتی و کۆمەکە ماددیەکانیان خوێن و پایەو جەماوەرو ناوبانگی کۆمەڵەکەیان دەکڕی .. کاتێکیش ئەم بەهایانە تا ڕاددەیەکی زانراو کەم دەبنەوە، لەناوبردنی خودی کۆمەڵەکە دەبێتە کارێکی ئاسان، بەتایبەتی ئەگەر بەهۆی بازبازێن و ئەملاولاکردنی بەردەوامییەوە، ئاستێك لەبێ متمانەیی بۆ خۆی دروست کردبێت و، ئەگەر سوپایەکی نهێنیشی هەبێت هەمووان، نەیارو هاوڕێکانیشی وەکو یەك بترسێنێت.

# لەقورئانەوە .. بۆ دینامیت

## ((هەنگاوی دووهەممان .. برایان سازبن))

لەژێر ئەم ناونیشانەدا بەننا سەروتاری یەکەم ژمارەی گۆڤاری ((ئەلنەزیر))ی نووسی وتیایدا دەڵێت ((خودا بەهێزو دەسەڵات ڕێگری لەهیچ شتێك ناكات، گەر بەقورئان ڕێگری لێ نەکات)). هەروەها گوتیشی لەمەودوا ڕووی بانگەشەی دەکاتە هەموو لێپرسراوەکان، ئەگەر بەدەنگیەوە هاتن، ئەوا پشتیان دەگرێت، ئەگەر پەناشیان بردەبەر مانۆڕو ملیان نەدا ((ئەوا ئێمە جەنگێکین ڕووبەڕووی هەموو پێشەوایەك یا سەرکردەی حزبێك یان دەستەیەك کەپشتگیریی لەئیسلام نەکات و، بۆ گێڕانەوەی حوکم و سەروەریی ئیسلام ملی ڕێگا نەگرێت))[١٤٤].

لەپەڕەکانی پێشودا، بینیمان کە شێخ چۆن بەهەمان شێوە داوای جیهادی دەکردو.. چۆن جیهادی کردبووە ئەو سیمایەی کەکۆمەڵەکەی خۆی لەکۆمەڵە سیاسیەکانی تر پێ جیادەکردەوە.

شێخیش هەر لەساڵی (١٩٣٨)ەوە زۆر بەپەرۆشەوە، جەختی لەسەرئەم مەسەلەیە دەکردو زۆریش لەسەرئەم مەسەلەیە دەدوا، بەپەخشانیش و بەشیعریش دەدوا.

---

[١٤٤] النذير العدد الاول- ٣٠ ربيع الاول ١٣٥٧هـ.

الدين شيء والسياسة غيره

دعوى نحاربها بكل سلاح

قد جاء طه عابداً ومجاهداً

دك الحصون وقص كل جناح.[١٤٥]

واتا (ئایین شتێکەو سیاسەتیش شتێکی ترە، ئەمە بانگەوازێکە بەهەموو چەکێك دژایەتی دەکەین، (طه)* وەکو خوا پەرستێكو موجاهیدێك هات، قەلاکانی ڕمانو هەموو باڵەکانیشی بڕی).

هەروەها عەبدولحەکیم عابدینی سکرتێری گشتی کۆمەڵەکەش، لەشیعرە جیهادیەکانیدا لەشێخەکەی بەجۆشتر بوو.

لنجرينها دماء جد ثائرة

وثورة الحق لايدري لها أمد

او يرجع الشرع دستورا لأمتنا

فليحذر القوم أني منذر صعد [١٤٦]

---

[١٤٥] اسماعيل احمد شافعي، الاخوان المسلمون. دعوة البعث والانقاذ، مقطفات من رسائل وخطب المرشد العام- مطبعة العميري- بني سويف ص٣.

* (طه)مەبەستی لەپێغەمبەرە (د.خ).

[١٤٦] عبدالحيكم عابدين، البواكير، مجموعة شعرية. دار الصاوي للطبع والنشر، ص ٤٠.

واتا (یان خوێنێکی زۆر شۆڕشگێڕانەی بۆ دەڕێژین).شۆڕشی هەقیش تەواو بوونی نیە، یان دەبێت شەرع ببێتەوە بەدەستوور بۆ نەتەوەکەمان، با خەڵکیش ئاگاداربن من وریاکەرەوەیەکی توندم).

لەپێشتریشدا گوتمان ساڵی (١٩٣٨) سەرەتای قۆناغی جێبەجێکردن بوو، کە بەبۆچوونی شێخ، ئەم قۆناغە لەدوای دوو قۆناغی ترەوە دەهات کەئەمانەن: ((ناساندن)).. ((بانگەشەکەش لەم قۆناغەدا گشتیەو ملکەچی تەواویش تێیدا سەپێنراو نییە .. بەرنامەی بانگەشەکەش لەم قۆناغەدا بریتییە لەبەرنامەی کۆمەڵە خێرخوازەکان)).

((دروست بوون لەرێگەی پالاوتنی کەسانێکی ساڵحەوە، بۆ گرتنە ئەستۆی جیهاد. ((بەرنامەی بانگەشەکەش لەم قۆناغەدا لەلایەنە روحیەکەوە سۆفیگەرییەکی پەتییەو)) لەلایەنە کرداریەکەشەوە سەربازیەکی پەتییە)).

بەلام جێبەجێکردن: قۆناغی سێهەمە. ((بانگەشەکەش لەم قۆناغەدا بریتییە لەجیهادو کاری بەردەوامو تاقیکردنەوەو گیرۆدەبوون))[١٤٧].

جیهادیش دەست پێدەکات ... بانگەشە نەك هەر تەنها بەیداخەکانی بەرز دەکاتەوە، بەڵکو لەجێبەجێکردنیش نزیك دەبێتەوە .. بەلام چۆن؟

---

[١٤٧] لطفي عثمان، المرجع السابق، ص ٩٠.

پێش ئەوەی بپرسین چۆن؟ دەپرسین بۆ؟ یان وردتر، دەپرسین ناوەڕۆکی جیهاد لای شێخ بەننا چییەو، خۆیو شوێنکەوتووەکانی چۆن لێی تێگەیشتوون؟

بیرۆکەکە لەدابەشکردنی سەرەتاییەوە سەرچاوە دەگرێت، شێخ بەننا مسوڵمانەکانی کردبووە چوار بەشەوە: باوەڕدار (مؤمن)- ڕاڕا (متردد)- بەرژەوەند پەرست (نفعی)- ناچار (متحامل)[١٤٨].

چەمکی کرداریی ئەم جۆرە دابەشکردنەش وەك ریچارد میشێل دەڵێت، ئەوەیە ((کەبەپێی ئەم تیۆرە، هەر میسریەك بەناچاری دەبێت خۆی لەیەکێك لەم دوو شوێنەدا دانێت، یان دەبێت دوژمنی ئیخوان بێت، یان دەبێت ((بڕوادار)) بێت، واتا برایەکی مسوڵمان بێت))[١٤٩]

بەپێی ئەم دابەش کردنەش .. کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین دەبێتە خاڵی بەیەکگەیشتنی (ڕێژگەی) بڕواداران، واتا بەمانا ئیسلامیە باوەکە دەبێتە ((کۆمەڵی مسوڵمانان))و، ئیمامەکەشی ئیمامی ئەهلی حەلو عەقد دەبێت لەئیسلامدا.

لادانیش لەئیمامو کۆمەڵەکە، دەبێتەلادان لە ((کۆمەڵی مسوڵمانان))، واتا لادان لەخودی ئیسلام.. لەبەر ئەمەشە شێخ بەننا هەر لەڕۆژەکانی یەکەمی

---

[١٤٨] حسن البنا، الرسائل الثلاث، ص ٦.

[149] Mitchell- op- cit. P. 319.

کۆمەڵەکەیەوە، وای دەبینی کەهەرکەسێك نەیاری بێت، لە((یاخی بووەکان))ەو ((بەشمشێر لێیدەن)).

بەڵام .. ئیخوان چۆن لە جیهاد تێ گەیشتبوون؟

((جیهاد بریتییە لەبەکارهێنانی هەموو توانایەکی ڕەخساو، بۆ هەڵکێشانی ڕەگ و ڕیشەی ستەم و گەندەڵی لەسەر ڕووی زەوی. مرۆڤیش ناتوانێت ستەم و گەندەڵی لەچواردەوری خۆی بنەبڕ بکات، ئەگەر ستەم و گەندەڵی لەناخی دەروونی خۆیدا بژی .. لەبەرەئەوە مرۆڤی مسوڵمان فرمانی پێکراوە کەجیهاد بەسەر حەزەکانی ناخی خۆیدا بکات، ئینجا بکەوێتە جیهادکردن بەسەر ستەم و گەندەڵی کۆمەڵگەکەیدا، پاشانیش لەکۆتاییدا بکەوێتە، کردنی ستەم و گەندەڵی لەهەموو جیهاندا .. مسوڵمانانیش بۆ ئەوە فەرمانی پێ نەکراوە کەجیهاد لەکوڵ خۆی بکاتەوە، بەڵکو فەرمانی پێکراوە کە لەپێناو خوادا، جیهادێکی حەق بکات هەر مسوڵمانێکیش بیەوێت جیهادێکی حەق بکات لەپێناوی خوادا، ئەوا پێویستە لەسەری هەمیشە ئامادەبێت بۆ کارو کۆشش کردن ئەگەر ئایینەکەی داوای تواناو هێزی لێکرد بیبەخشێت، داوای سەروەت و ماڵی کرد پێشکەشی بکات، داوای گیانی کرد بەدڵنیاییەوە فیدای بکات. مسوڵمان سەربازی حەقە، ئەگەر بەدەست و کردەوە ئامادە نەبێت، ئەوا بەناخ و دەروون هەمیشە ئامادەیە. ئەگەر بەشێوەیەکی ڕاستەقینەو

کرداریش لەجیهاددا نەژی، ئەوا بەنیەت و مەبەست لەجیهاددا دەژی. هەرکەسێکیش بۆخۆی و دونیا بژی بەدوو جیهاد- بەکارو نیەت- ئەوا ئەو کەسە موونافیقە کەزمانی بڕوای هێناوەو بەدڵ بڕوای نەهێناوە.. ئەو کەسەی لەش گران و تەمبەڵ بێت و حەز بە ئیسراحەت و خامۆشی بکات و سەلامەتی دونیاکەی لەئایینەکەی پێ باشتربێت، مسوڵمانێکی ڕاست نیە))[150].

بەڵام شێخ بەننا ڕووی قسەکانی دەکاتە شوێنکەوتووەکانی و دەڵێت: ((برایانی مسوڵمان، ئەم ئایینە بەجیهادی باب و باپیرانتان لەسەر چەند کۆڵەکەیەکی بەهێز لەباوەڕبوون بە خواو، دەست بەردان لەخۆشی دنیای بێ نرخ و هەڵبژاردنی دنیای نەمریی و، قوربانی دان بەخوێن و روح و سامان، لەپێناوی سەرخستنی حەقداو، مردن لەڕێی خوادا، چەسپا))[151].

لەنامەی ((بەرەو ڕووناکی))شدا دەڵێت: ((ئەو نەتەوانەش کەڕابوون پێویستیان بەهێز هەیەو هەروەها پێویستیشیان بەوەیە کەسروشتێکی سەربازیانە لەڕۆڵەکانیاندا بچێنن، بەتایبەتی لەم سەردەمانەدا کەتەنها بەئامادەبوون بۆ جەنگ، ئاشتی زامن دەکرێت و، بۆچوونی هەموونەوەکان بۆتە ئەوەی کەهێز زامن ترین ڕێگای حەق بەدیهێنانە.. ئیسلامیش ئەم لایەنەی پشت گوێ نەخستووە، بەڵکو کردوێتیە یەکێك لەفەرزە پتەوەکانی

---

[150] مجلة الدعوة، نمرة جمادي الاولى (ابريل ١٩٧٧)، د. يوسف القرضاوي، مقال: الجهاد في الاسلام.

خـۆیو، بـەهیچ شـێوەیەکیش لەگـەڵ نوێـژو ڕۆژوودا جیـای نەکردۆتـەوە. لەهـەموو دونیاشـدا، هیـچ پـەیڕەوو پڕۆگرامێك، نـەکۆنو نـە تـازە، هێنـدەی ئیسلام، کەبەقورئانو حەدیسو ژیاننامـەی پێغەمبـەر (د.خ)باسـی کردووە، بایەخی بەم لایەنە نەداوە)).[152]

شێخی بەنناش لەم بانگەشەی جیهادەدا، پشت بـەبڕێکی زۆر لەئایـەتو فەرموودەی پیرۆز دەبەستێت..

((وأعدوا لهم ماستطعتم من قوة ومن رباط الخيـل ترهبـون بـه عـدو الله وعدوكم))وە ئەم فەرموودەیەی خـوای پـەروەردگاریش ((كتـب عليكـم القتـال وهو كره لكم وعسى أن تكرهوا شيئا وهـو خير لكـم وعسـى ان تحبـوا شـيئا وهو شر لكم)).

ئەم ئایەتە پیرۆزەش ((فليقاتل في سبيل الله الذين يشترون الحيـاة الدنيـا بالاخرة))ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش (والذي نفسـي بيـده لـولا ان رجـالا من المؤمنين لا تطيـب انفسهم ان يختلفوا عـني ولا أجـد مـا أحملـهم عليـه ماتخلفت عن سرية تغزو في سبيل الله، والذي نفسي بيده لوددت أني اقتل في سبيل الله ثم احيا ثم اقتل ثم احيا ثم اقتل ثم احيا ثم اقتل) موسـلیمو بوخاری گێڕاویانەتەوە.

---

[151] حسن البنا، رسالة المؤتمر الخامس ص ٦٣.

[152] حسن البنا، الرسائل الثلاث ص ٩٣.

(ابی هریره)ش دەڵێت پێغەمبەری خوا فەرموویەتی ((من لقي الله بغير أثر من جهاد لقي الله وفيه ثلمة))ترمزیو ئیبن ماجه گێڕاویانەتەوە.
فەرموودەیەکی تریش ((من مات ولم يغز، ولم يحدث نفسه بالغزو مات على شعبة من النفاق))موسلیم گێڕاویەتیەوە.

بەڵام نەیارەکانی شێخیش بەهەمان شێوە هەربەشی خۆیانیان بەڵگە پێیەو، بەردەوامیش بەبیری دەهێننەوە کەتوندوتیژی بەرامبەر ئەو مسوڵمانانە بەکاردەهێنێت کەجیاوازیی بیرو بۆچوونیان لەگەڵ شێخو کۆمەڵەکەدا لەپلەی ئیسلامێتیان کەم ناکاتەوە.

بەم ئایەتە پیرۆزەش وەڵامی بیانووەکانی شێخ دەدەنەوە ((فذكر إنما انت مذكر، لست عليهم بمسيطر)).

بەم ئایەتە پیرۆزەش ((وليس عليك هداهم، ولكن الله يهدي من يشاء)).ئەو قسانەش ئاڕاستەی پێغەمبەر کراوە، هەروەها ئەم ئایەتە پیرۆزەش هەر ئاڕاستەی ئەو کراوە ((أفأنت تكره الناس حتى يكونوا مؤمنين)).

ئەمەش هەر بۆ ئەوە ((ادع الى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي أحسن إن ربك هو أعلم بمن ضل عن سبيله وهو أعلم بالمهتدين)).

خوای پەروەردگاریش مسوڵمانان فێردەکات و دەفەرموێت ((ولاتجادلوا اهل الكتاب الا بالتی هی أحسن)).

تەنانەت لەگەڵ ستەمکارو کافرانیشدا ((اذهبا الى فرعون إنه طغى، فقولا له قولا لينا لعله يتذكر أو يخشى)).

هەروەها چەندەها فەرموودەی پێغەمبەریش ((لاتروعوا المسلم فإن روعة المسلم ظلم عظيم)).

حەدیسێکی دیکەش ((من أخاف مؤمنا كان على الله ألا يؤمنه من افزاع يوم القيامة)).

هەروەها ئەم حەدیسەش ((لايشر أحدكم الى اخيه بالسلاح، فإنه لايدري لعل الشيطان ينزع في يده، فيقع في حفرة من النار)).

چەندەها ئایەت و حەدیسی زۆریش کەلەژماردن نایەن، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا شێخ بەننا هەر لەسەر ڕێگە هەڵدێرەکەی بەردەوام دەبێت و.. خۆی و پیاوەکانیشی پێ لەدڕك و داڵ دەنێن.

بەنناش بەم قسەیە، کە ئاراستەی شوێنکەوتووەکانی دەکات، کۆتایی بە((پەیامی جیهاد)) دەهێنێت ((ئەی برایان، ئەو نەتەوەیەی کەلەدروست کردنی مردندا کارامەیەو دەزانێت چۆن مردنێکی سەربەرزو مەردانە دەمرێت، خودا لەو دونیا ژیانی سەرفرازی و خۆشگوزەرانیی هەتا هەتایی پێدەبەخشێت. تەنها خۆشویستنی دونیاو ڕق لێ بوونی مردنیشە کەئاوا

لاوازو قۆڵبەستی کردووین. کەواتــە خۆتــان بۆ کــارێکی گــەورەو مــەزن ئامادەبکەن‌و کار بۆ مردنیش بکەن ژیانتان پێ دەبەخشرێت. ئەوەش بزانـن کەمردن ناچاریەو کار بۆ مردنیش بکەن، ژیانتان پێ دەبەخشـرێت. ئـەوەش بزانن کەمردن ناچاریەو دەبێت هەموومان بمرین، تەنهایەك جاریشە. ئەگەر ئەویش لەپێناوی خوادا بێت، ئەوا قازانجی دونیاو پاداشـتی ئاخیرەتـە.. لەبەرئەوە کار بۆ مردنێکی پیرۆز بکەن، خۆشی‌و کامەرانی تەواوتان دەست دەکەوێت. خـوا شـەرەفی شـەهیدبوون، لـەپێناو خۆیـدا بەئێمـەش‌و ئێـوەش ببەخشێت))[153].

... ئەمەیە تیۆری شێخ سەبارەت بەجیهاد. چۆن بوو و، بەچی کۆتایشی هات؟

سەرەتا ڕاستەقینەکە بەتیمە گەڕۆکەکان دەستی پێکرد.

لەپێشتردا زانیمـان کەبـەننا چـەند هـەوڵ‌و کۆششـی دا بـۆ پتـەوکردنی دەزگای گەڕۆکەکان‌و کەشافە. لەڕاستیشدا ئامانجی بنەڕەتیی گەڕۆکەکان، تەنها بریتیی نەبوو لەپێکهێنانی ئامرازێکی بەرپەرچدانەوە، لەسەر چەند بنەمایــەکی ســـەربازی‌و دیســـپلینێکی تونـــد. بـــەڵکو گەڕۆکـــەکان ((کێڵگە))یەکیش بوون کەتێیدا چاوە بەئاگاکانی مورشید چاودێری ئەندامە

---

[153] حسن البنا، رسالة الجهاد - دارالكتاب العربي- القاهرة ص٣٧ وحول هذا الموضوع راجع أيضا: محمد فهمي الطحاوي -المجاهدين- القاهرة (١٩٥٢) احمد نار، القتال قي الاسلام - القاهرة (١٩٥٢).

زیاتر بەجۆش و دڵسۆزو گوێڕایەڵەکانی دەکرد.و.. لەناوکێکی تایبەتدا کۆی دەکردنەوە.

وەك بینیشمان، بەننا ((گەڕۆکەکانی خۆی))لەچەند خۆپیشاندانێکی پڕجۆش و خرۆشدا بەکارهێنا، کەزۆربەی جار دروشم و هاوارەکانیان ستایشکردن و تەمەن درێژی خواستن بوو بۆ شا. هەروەها بۆ پاسەوانی و پارێزگاری کردنی گەڕان و کۆنگرەو کۆبوونەوەکانی، وە بۆ تۆقاندنی نەیارە سیاسیەکانیشی بەکاری هێنان یەکەم جار هێزی بازوو جەستەیان بەکارهێنا، پاشان لەدوای ئەوە فیشەك و قومبەلە، ئەمەش پاڵی نا بەحیزبی و وەفدەوە کەلەساڵی (١٩٤٦)دا ئاگادار کردنەوەیەك ئاراستەی حکومەتەکەی سدقی بکات کەئەگەر ((ئەم ڕێکخراوە نیمچە سەربازیانە هەڵنەوەشێنێتەوە، ئەوا وەفد خۆی مەسەلەکە دەگرێتەدەست و دەشزانێت چۆن توندوتیژ خوازو ئاژاوەچیەکان بیدەنگ و دەمکوت دەکات)).

سەیر لەوەدایە کەبوونی گەڕۆکەکان، خۆی لەخۆیدا مەسەلەیەك بوو پێچەوانەی یاسابوو. چونکە لە(٨)ی ئازاری (١٩٣٨)دا، حکومەتی محەمەد مەحمود پاشا یاسایەکی دەرکردو، بەپێی ئەم یاسایە دروست بوونی ((ئەو کۆمەڵەو گروپانەی قەدەغە کرد، کەچ لەڕووی پێکهاتنیانەوە، یان ئەرك و فرمانیانەوە، یان مەشق و ڕاهێنانی ئەندامەکانیانەوە، یان ڕێبازەکانیانەوە

---

الاسلام – القاهرة (١٩٥٢).

یان جل‌و بەرگیانەوە یان ئامرازو پێداویستیانەوە، شێوە ڕێکخستنێکی نیمچە سەربازییان هەبێت))[١٥٤] واتا ((گەڕۆکەکانی ئیخوان پێچەوانەی یاسای گشتی‌و تایبەتیش بوو. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، لەکاتی جەنگ‌و لەو کاتەشدا کەئەم یاسایە بەسەر تیمی کراس شینەکان (وەفد)و تیمی کراس سەوزەکان (میسر ئەلفەتات)دا جێبەجێکرا، ڕێگا بەمانەوەی ئەم سوپایە درا))[١٥٥].

لەوانەشە ئەمە ڕاڤەی ئەوە بکات، بۆچ بەننا پەیوەست بوو بەوەوە کەبەشێوەیەکی ئاشکرا گەڕۆکەکان بۆ بەرژەوەندیی سەراو دەسەڵاتە فەرمانڕەواکان بەکاربهێنێت.چونکە ئەگەر ئەو هەستە لای دەسەڵاتداران دروست نەکرێت کە گەڕۆکەکان لەخزمەتی ئەواندایە .. ئەوا ئەم تیمە گەڕۆکانە بەپێی یاسا تووشی هەڵوەشاندنەوە دەبن.

ئەحمەد حسێنیش دەپرسێت - بەتەواویش پرسیارەکەی لەجێی خۆیدایە- ((ئەو نهێنیە چی بوو کەوای لەحکومەت‌و پۆلیس کردبوو، ڕێگا بەکۆمەڵەکە بدەن ئەم سوپا گەڕۆکانەی هەبێت، دوای ئەوەی خۆی کردبوو بەململانێ حزبییەکاندا؟)) هەرخۆشی وەڵام دەداتەوە کە ((حکومەتە کەمایەتیەکان خۆیان هانی دروست بوونی ئەم سوپایەیان دا. هەروەها

---

[١٥٤] قانون رقم ١٧ لسنة ١٩٣٨.

[١٥٥] د. عبدالعظيم رمضان، المرجع السابق - ج٢- ص ١٢٧.

وەکو چەکێکیش بۆ دژایەتی کردنی وەفد، کە بەهەر نرخێك بوو دەیانویست لەناوی بەرن، تەنانەت ئەگەر بەدەرچوونیش بێت. هەروەها یاساو داب و نەریتە باوەکان، پشتگیری و کۆمەکیان دەکرد)). هەروەها ئەحمەد حسێن بەردەوام دەبێت و دەسەلاتدارانیش بەوەتاوانبار دەکات کەخۆیان ((ئەو گەنجانەیان بەدەست ئەم ڕێکخستنانەوە دابوو، ئەم خۆپیشاندانە سەربازیانەی کەلەبەرئەوەی بەناوی ئایینەوە دەکران، قەشەنگیان هێندەی تر زیادی کردبوو))[١٥٦].

ڕەنگە بەسوودو خۆشیش بێت لەگەڵ نووسینەکەی ئەحمەد حسێندا بڕۆین.. کەتێیدا تۆماری دەکات ((وەزارەتی کاروبارە کۆمەلایەتیەکان، بەبیانووی ئەوەی لقەکانی کۆمەڵی ئیخوان چالاکی کۆمەلایەتی ئەنجام دەدەن، چەندەها یارمەتی ماددی پێشکەش دەکردن. شێخ بەنناش لە (لیژنەی خوێندنی بالای حکومی)دا دامەزرێنرا بوو، ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتیەکان و شارەوانیەکانیش، لەهەموو شوێنێکەوە زوو زوو یارمەتی ئەم لیژنەیەیان دەدا)). پاشان ڕووداوێکی سەیر دەگێڕێتەوە .. ((جارێك لەکەرتی پۆلیسی ئەلخەلیفە، روشدی ئەلغەمراوی لێپرسراوی ئەو کەرتە، بۆ بەجێ گەیاندنی ئەو ڕێنماییانەی کە پێی درابوو سەبارەت بەڕێگەگرتن لەدروست بوونی هەر خڕبوونەوەو کۆبوونەوەیەك، ڕێگری

---

[١٥٦] مرافعة احمد حسين، المرجع السابق– ص ٤٢.

لەگەڕۆکەکانی ئیخوان دەکات کە بەو ناوچەیەدا هاتو چۆ بکەنو بەرەنگاریان دەبێتەوە. بەڵام دەسەڵاتداران لەسەر ئەم هەڵوێستە، سەرزەنشتی ئەلغەمراوی دەکەن. گەڕۆکەکانی ئیخوانیش ڕێگایان پێدەدرێت، وەکو دەربڕینێك لەسەرکەوتنو دەسەڵات سەپاندنیان، ئاهەنگێکی گەورە لەبەردەم بینای کەرتی خەلیفەدا سازبکەن)) کاتێکیش کۆمەڵەکە هەڵوەشێنرایەوە لەساڵی (١٩٤٨)دا، لەناو ئەو وەرەقەو نووسراوانەدا کەدەستیان بەسەردا گیرا، ئاگادارکردنەوەیەك دۆزرایەوە کەلەیەکێك لەلقەکانی کۆمەڵەکەوە (لقی ئەلمەحجە)ئاراستەی مورشیدی گشتی کرابوو، تێیدا بەمورشید ڕاگەیەنراوە کەبەنیازن هەموو پێنج شەممەیەك کۆبوونەوەیەك بکەن، داواشی لێکراوە ئیشو کاری تەواویان بۆبکات تابەئازادیو بێ ترس کۆبوونەوەکانیان ببەستن. مورشیدیش ئاماژەی خۆی لەسەر وەرەقەکە نووسیوەو ((پارێزگاو کەرتی پۆلیسی خەلیفەی ئاگادار کردۆتەوە کەدڵنیابن لەلقی مەحجەر، تاکەس دەست نەهێنێتە ڕێگای کۆبوونەوەکانیان)). ئەحمەد حسێنیش توانج لەم مەسەلەیە دەداتو دەڵێت ((ئەم ئاماژەیە، زیاتر لەهی وەزیری ناوخۆ دەچێت، نەك سەرۆکی کۆمەڵەیەك))[١٥٧].

---

[١٥٧] المرجع السابق ص ٤٢.

یەکێك لەسەرکردەکانی کۆمەڵەکەش ئاماژە بەوە دەدات کەبەننا ئەنجومەنێکی بالای لەحەوت ئەندام بەسەرکردایەتی خۆی بۆ گەڕۆکەکان دروست کردبوو، (الصاغ محمود لبيب*) کرابووە پشکنەری گشتی. چالاکی ئەنجومەنەکەش بەدروست کردنی قوتابخانەیەك بۆ ڕاهێنەران دەستی پێکرد، کەپاش دوومانگ (٣٥)ڕاهێنەری لێ دەرچوون، پاشان ئەم ڕاهێنەرانە دەستیان کرد بەکۆمەڵ پێکهێنانو مەشق پێکردنیان .. لەکاتی تەواوبوونی جەنگیشدا ژمارەی گەڕۆکەکان گەیشتە (٤٥) هەزار کەس.[١٥٨]

ئەوەی لەم ڕووەوە بەلای ئێمەوە گرنگە، ئەوەیە کەبەننا لەبنەڕەتەوە بۆیە بایەخی دابوو بەتیمە گەڕۆکەکان، لەبەرئەوەی ئەمە کێڵگەیەك بوو بەننا پیاوانی ڕێکستنە نهێنیەکەی خۆی لێوە هەڵدەبژارد.. لەبەردەم دانپیانانێکی زۆر گرنگیشدا ڕادەوەستین کەعەبدولمەجید حەسەن- بکوژی نەقراشی پاشا- لەکاتی لێکۆڵینەوەدا ڕایگەیاندووە، گووتویەتی ((کاتێك کەلە گروپی گەڕۆکەکانەوە گوازراوەتەوە بۆ دەزگای تایبەت، هەستی بەهیچ گۆڕانێك نەکردووە کەبەسەریدا هاتبێت، چونکە هەردوو سیستمەکە لەڕووی

---

[١٥٨] عبدالغني عابدين (السكرتير العام المساعد لجمعية الكشافة المصرية ووكيل عام جوالة الاخوان المسلمين)- تقرير عن النشاط الكشفي لجماعة الاخوان المسلمين.

* (الصاغ) پلەیەکی سەربازییە.

مەشق کردن و شێوازی مامەڵەکردن و پەیوەندییەکانی نێو ڕێکخستنەوە، وەکو یەك وابوون))[١٥٩].

ئەوەبوو مەسەلە بنەڕەتیەکە.. گەڕۆکەکان تەنها دەفرێك یان قۆناغێك یان بێژنگێك بوون، ڕێك و پێك گوێرایەڵ و بەجۆشترین برای مسوڵمانیان دەگەیاندە .. دەزگای تایبەت.

هەرکە قۆناغی جێبەجێکردنیش دەستی پێکرد، شێخی بەننا زۆر بەوردی کەوتە چاودێری کردنی سوپا، هەموو هێزو توانایەکیشی خستەگەڕ تازۆرترین ژمارەی ئەفسەرانی سوپا ڕابکێشێت و بیانخاتە ڕیزەکانی ڕێکخستنێکی نهێنی کۆمەڵەکەیەوە.

بۆ زیاتر نهێنی کردنی مەسەلەکەش، شێخ جڵەوەکەی بەدەستی خۆیەوە گرتبوو.

کادێرەکانی کۆمەڵەکەش دەستیان کردبوو بەڕاکێشان و جەمسەرگیرکردنی چەند کۆمەڵێك لەئەفسەران و زۆربەنهێنیش یەك یەك بەمورشیدیان دەناساندن.

((لەم کاتەشدا جەمال عەبدولناسری لاو یەکەمین پەیوەندیە سیاسییەکانی خۆی لەگەڵ گەنجێکی ئەزهەریدا پێك دەهێنا، کەحەوت

---

[١٥٩] طارق البشري- المرجع السابق- ص ٥٠.

هەشت ساڵێك لەخۆی گەورەتر بوو، ئەویش ئەحمەد حەسەن ئەلباقوری (ئەندامی کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین بوو))[١٦٠]

مەجدی حەسەنەینیش دەڵێت ((هەتا ساڵی (١٩٥٠) بەوە ناسرابووم کەمەیلم بەلای ئیخواندا هەیە، نەك تەنها مەیلیش، بەڵکو پەیوەندیەکی توندو تۆڵیشم بەحەسەن ئەلبەننای ڕەحمەتیەوە هەبوو، مەشقم بەژمارەیەکی زۆریش لەئیخوانیەکان دەکرد))[١٦١].

حەسەن ئیبراهیمیش کەدەڵێت ((هەروەها لەڕێی ئەلساغ مەحمود لەبیبی خانەنشینەوە، پەیوەندیمان کرد بەئیخوان موسلیمینەوەو حەسەن ئەلبەننای ڕەحمەتیش دیداری لەگەڵدا دەکردین))[١٦٢].

خالید محێدینیش بۆ ماوەیەك پەیوەندی بەشێخ حەسەن ئەلبەنناوە هەبوو .. یەکێك لەتوێژەرەکانیش لیستێك پێشکەش دەکات کەناوی ئەندامانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی تەمموزی (١٩٥٢)ی تێدایەو ئاڕاستە سیاسیەکانیشیان دەستنیشان دەکات، کەئەمانەن:

- عەبدولحەکیم عامر: ئیخوان موسلیمین.

---

[160] Lacouture, Jean- Nasser p New york (1973) p. 38.

[١٦١] جمال الشرقاوي، حريق القاهرة – دار الثقافة الجديد (١٩٧٦)– شهاد مسجلة لمجدي حسنين.

[١٦٢] روز اليوسف. ١٩٧٧/٤/١١– احمد حمروش: اعترافات شهود يوليو.

- کەمالەدین حسین: ئیخوان موسلیمین.
- جەمال عەبدولناسر: وەفد- ئیخوان موسلیمین.
- ئەنوەر سادات: میسر ئەلفەتات- ئیخوان موسلیمین.[١٦٣]
- ئەنوەر ساداتیش بۆماوەیەك پەیوەندیەکی توندو تۆڵی بەشێوەیەکی تایبەتی لەگەڵ شێخ بەننادا هەبوو، لەکتێبەکەشیدا ((صفحات مجهولة))بەدورو درێژی باسی لەم پەیوەندیە کردووە.

هەروەها رەشاد موهەنناو حسێن ئەلشافیعیش بەهەمان شێوە پەیوەندیان بەئیخوانەوە هەبوو.[١٦٤]

یەکێك لەنووسەرەکانیش دەڵێت، لەیەکێك لەکۆبوونەوە ئامادەکارییەکانی ئەفسەرە ئازادیخوازەکاندا، پرسیار لەجەمال عەبدولناسر کرا ((ئایا چاوەڕوانی خێرو خۆشی بکەین لەئیخوان)) عەبدولناسریش وەڵامی دایەوە ((بەڵێ، خێرو خۆشیەکی زۆر))[١٦٥].

---

(163) Vatikiotis- Egyptian Army in polotics- op. Cit. P. 47.

(164) Mitchell- op. Cit p. 98.

(١٦٥) المصور ٣١/١٠/١٩٥٤- حلمي سلام: قصة ثورة الجيش من المهد الى المجد.

ولمزيد من التفاصيل حول علاقة الاخوان راجع:

Nagib, Mouhammed- Egypts Disting – apersional atatement- london- 1955.p. 32.
Hayden, D- Egypts Surpise Dictatorship – National and English review, (oct. 1952)p. 212.

خالید مـحێدیشـنیش لەقسـەو باسـێکی تایبـەتیدا کەلەگـەڵیدا کـراوە، دەگێڕێتەوەکـە ئەفسـەرەکان ڕاسـتەوخۆ پـەیوەندیان بـەڕێکخراوی نـهێنی تایبەتیـەوە دەکرد، ڕێو ڕەسمـی پـەیوەندی کردەکەشیان ئەوەی دەگـەیاند کەکارەکە بێ سنوور نهێنیە، بەوەی کەپەیمان‌و بەیعەکە لـەژوورێکی تـاریکدا ئـەنجام دەدراو ئەفسـەرەکانیش لەسـەر قورئـان‌و دەمانچەیـەك سـوێندیان دەخوارد.

پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکیش .. ژمارەیەك لەو ئەفسەرانە کەبەدیهاتنی ئاواتـە نیشـتمانیەکانیان لەبزووتنـەوەی ئیخوانـدا دەبیـنی، پاشەکشـەیان کردو دوورکەوتنەوە .. دورکەوتنەوەکەشیان لەوماوەیەدا بوو کەکۆمەڵەکەو کۆنەپەرستان‌و سەرا بەشێوەیەکی ئاشکرا، دەستیان نایە نێو دەستی یەك لەدووسالی ١٩٤٦ - ١٩٤٧ دا.

بەڵام کۆمەڵەکە توانی ژمارەیەکی تا ڕاددەیەك باش لەئەفسەران بەرەو ڕیزەکـانی خـۆی ڕابکێشـێت، ئـەویش بەسـوود وەرگرتـن لـەو جۆشـەی کەزۆربەیان هەیانبوو بۆجەنگی فەلەستین‌و.. هەروەها بەسوود وەرگرتن لەو هەڵوێستەش کەکۆمەڵەکە بەرامبەر ئەم جەنگە هەیبوو .. بەم شێوەیە شێخ بەننا توانی پشت‌و پەنایەکی تاڕاددەیـەك بـاش لـەنێو ڕیزەکـانی سوپادا

بۆخۆی دروست بکات، لەم ڕووەشەوە چەند ناوێکی ئاشکرا هەن وەك (عبدالمنعم عبدالرؤوف، أبو المكارم عبدالحي ومعروف الحضري)[١٦٦]

گەرچی (ئەحمەد حەمروش) لەکتێبەکەیدا ((داستانی شۆڕشی ٢٣ی تەمموز))، دووپاتی دەکاتەوە کەزۆر لەئەفسەرەکان لەکاتی جەنگی فەلەستیندا، بەهۆی ئەوەی کەسەرکردایەتی سیاسی کۆمەڵەکە دەستیان وەردەدایەتەکتیکە هونەریەکانی شەڕەوە، لەکۆمەڵەکە جیابوونەوە، وەکو نموونەیەکیش لەسەر ئەم مەسەلەیە، شێخ محەمەد فەرغەلی باس دەکات کەسەرکردەی گیانبەخشەکانی ئیخوان بوو لەجەنگی فەلەستیندا، ئەم سەرکردەیە سواربوو، لەسەرئەوەی کەئیخوان لەریزبوونیاندا بۆ هێرش کردنەسەر دوژمن، پەیرەوی شێوازو سوننەتی پێغەمبەربکەن، ئەمەش بووەهۆی ئەوەی زیانی زۆر گەورەو جەرگبڕیان پێ بگاتو، هەروەها پاڵی بەژمارەیەك لەئەفسەرەکانیشەوە نا کەلەڕێنماییەکانی کۆمەڵەکە هەڵبگەڕێنەوەو لێی دەربچن.[١٦٧] بەلام توێژەرێکی تر دەڵێت: ئەو ڕۆڵەی

---

[١٦٦] محكمة الشعب - الجزء الرابع (محاكمة محمود عبداللطيف) شهادة محمد فرغلي، ص ٧٦٦.

[١٦٧] أحمد حمروش، قصة ثورة ٢٣ يوليو- ج١= المؤسسة العربية للدراسات والنشر- بيروت.

کەئیخوان لەجەنگی فەلەستیندا بینیان، هۆیەك بوو بۆ زیاترو زیاتر نزیك بوونەوەیان لەکۆمەلانێکی فراوانتر لەئەفسەران.(١٦٨)

لەڕاستیشدا دەزگای نهێنی، لەسێ بەش پێك هاتبوو: دەزگای مەدەنی، دەزگای سوپاو دەزگای پۆلیس.(١٦٩) سەرکردەی هەر دەزگایەکیشیان پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بەمورشیدی گشتیەوە هەبوو. بایەخی دەزگای سوپاش لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کەپەیداکردنی پێداویستی چەكو زەخیرەو مەشقی بۆ دەزگای نهێنی مەدەنی دابیندەکردو، هەروەها ئەو ناوکەش بوو کەبەننا بەئومێد بوو، ڕۆژێك لەڕۆژان دەسەلاتی پێبگرێتە دەست. سەیرەکەش لەوەدایە کە هەروەها دەسەلاتدارانیش چاوپۆشییان لەچالاکی ئیخوان دەکرد لەنێو سوپادا، ئەوەتا ئەنوەر سادات بۆ یەکەم جار، چاوی بەشێخ حەسەن ئەلبەننا دەکەوێت، ئەویش لەکاتێکدا کە بەننا سەردانی یەکێك لەسەربازگەکانی سوپای کرد، تا ئامادەی ئاهەنگی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر بێت، وتارێکی تێروتەسەلیشی پێشکەشکرد کە سەرنجی ئەفسەرەکانی ڕاکێشا.(١٧٠)

---

(168)Khadduri –op- cit. P76.

(١٦٩) محكمة الشعب – الجزء الثاني– شهادة حسين ابو سالم– ص ٣٤٧.

(١٧٠) حتى يعلم الناس: (١٩٥٤) ص (وهو كتيب أصدره قادة الاخوان في الاردن والعراق والسودان يحددون فيه موقف الاخوان من ثورة يوليو).

بەرێگەدانیش بە بەننا کەچالاکی ئاشکرای لەریزەکانی سوپادا هەبێت، نیشانەیەکی پرسیاری گەورە زیاد دەکات؟

پرسیارەکەش ئەمەیە: بەننا چیدەویست لەم چالاکیە چڕەی نێو ڕیزەکانی سوپا؟

لەڕاستیدا ئەم پرسیارە لە کۆبوونەوەیەکی نهێنیدا خرایەڕوو، کە لەدورگەی (شای) دا بەسترا. لەم کۆبوونەوەیەدا، دوو ئەفسەر ئامادەبوون، کەیەکێکیان جەمال عەبدولناسر بوو، ئەوی دیکەشیان ئەلساغ مەحمود لەبیبی، ڕاوێژکاری سەربازی مورشیدی گشتی بوو .. جەمال عەبدولناسر پرسیارەکەی کردو مەحمود لەبیبیش وەڵامی دایەوە ((پێویستە لەسەرمان کەدەستبکەین بەدروستکردنی چەند کۆمەڵێك لەئەفسەرانی خاوەن باوەڕو عەقیدە، لەکاتی خۆیشیدا، هەموومان لەیەکرێزدا دێینە مەیدان تا ڕووبەڕووی دوژمنمان ببینەوەو ڕێگری ئەوەی لێبکەین کە دژایەتی بانگەشەکەمان بکات)) [171]

بەڵام ئەم جۆگانە هەموویان کۆدەبنەوەو ڕوو لەبەبایەخترین دەکەن: ((دەزگای تایبەت)) کە بەدەزگای ((نهێنی)) ناوی دەر کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەتوێژەرەکان کاتێکی دیاریکراو بۆ سەرهەڵدانی ئەم دەزگایە دەستنیشان ناکەن .. کە پێکهاتن و پەرەسەندن و چالاکبوونی بەتەواوەتی نهێنی بوو، تەنانەت بەلای سەرکردەکانی کۆمەڵەکە خۆیشیانەوە .. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوانەی یەکەمجار لەئیسماعیلیە (ساڵی ١٩٣٠) لە کۆمەڵەکە هەڵگەڕانەوە، یەکێك لەو شتانەی بەننایان پێ تاوانبار دەکرد ئەوەبوو کە

(١٧١) حسن البنا، مذكرات الدعوة والداعية. ص ١٢٨.

هەڵدەستێت ((بەچەند کارێکی نهێنی)) [١٧٢]. لەگەڵ ئەوەشدا لەکۆنگرەی سێهەمی کۆمەڵەکە لەساڵی (١٩٣٥) دا بەسترا، پلەکانی ئەندامێتی بەم شێوەیە دەستنیشان کرابوو، برای یاریدەدەر، برای ئەندامی کارا، برای موجاهید ... برای موجاهیدیش هیچ جێگەیەکی لەسەر نەخشەی ڕێکخراوەیی ئاشکرای کۆمەڵەکە بۆ دیاری نەکرا بوو، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ((موجاهیدەکان)) لەدەزگای تایبەتدا ڕێکخرابوون ...

بەڵام، زۆربەی توێژەرەکان وا بەڕاستتر دەزانن کەدەزگای تایبەت، پاش یەکەمین نەهامەتی لەنێوان دووساڵی ١٩٤٢ و ١٩٤٣ دا پێکهاتبێت. [١٧٣] بەهەرحاڵ ئەوشتەی گومانی تێدا نیە ئەوەیە کە ((دەزگای تایبەت)) لەخۆوە پەیدا نەبووە. چونکە بێگومان ئەو شێخەی کەزۆر بەپەرۆشەوە، لەڕووی عەقیدەو پەروەردەوە وەرزش و سەربازیەوە خەریکی ئامادەکردنی گەنجەکانی کۆمەڵەکە بوو، وە لەساڵی (١٩٣٥)ەوە لەهەیکەلی ڕێکخراوەیی کۆمەڵەکەدا پلەیەکی بەناوی ((الاخ المجاهد))ەوە دانابوو، وە سستمی کەتیبەکان و گەڕۆکەکانی دروست کردبوو، وە بەئیخوانی ڕاگەیاندبوو کە: لەمەودوا دژایەتی هەموو ئەوانە دەکەن (واتا هەموو سیاسیە میسریەکان) .. دەڵێم بێگومان شێخ لێرەو لەوێ، بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ، خەریکی هەڵبژاردنی ئەو جۆرە کەسانە بوو کە دەیویستن بۆ دەزگا تایبەتەکەی.

لەڕاستیشدا بەننا زۆر بەتەنگ (نهێنی) بوونی تەواوەتی هەڵس وکەوتەکانیەوە بوو، بۆچوونیشی وابوو کە پێویستە بانگەشەکە بەنهێنی جێبەجێبکرێت، بۆ ئەوەی خۆڕاگریەکەی پارێزراو بێت و

---

[172] Mitchell – op. Cit . P . 30.

[173] Ibid – p – 30.

بەردەوامیەکەی زامن کراوبێت [١٧٤]. بینیشمان کە:چۆن بەننا هەڕەشەی لەهەڵگەڕاوەکانی کرد لەساڵی (١٩٣٨)داو، بەڵێنیشی دا ئەگەر ((نهێنیەکان))ی کۆمەڵەکە بدرکێنن چییان بەسەردێت.

تێبینیش دەکرێت کە دروستبوونی ((دەزگای تایبەت))، چەند گۆڕانێکی بنەڕەتیشی لەهەیکەلی ڕێکخراوەیی کۆمەڵەکە لەگەڵدا بووە، ئەویش بەسێ هێڵی تەریبدا دەڕوات کە هەریەکەیان شێوازو هێزو پرۆگرام‌و سەرکردایەتی خۆی هەیە.

- سیستمی خێزانەکان: ئەندامە ئاساییەکان دەگرێتەخۆی‌و دەفری بنەڕەتیی بەئەندام بوونیشە لەکۆمەڵەکەدا.
- سیستمی گەڕۆکەکان: ئەو ئەندامانە دەگرێتەخۆی کەزیاتر بەجۆشن‌و زیاتربەدەنگەوە دێن‌و زیاتر گوێڕایەڵن.
- سیستمی تایبەت: ئەویش دەزگایەکە تا ئەوپەڕی سنوور نهێنیەو، لەسێ بەش پێکدێت: بەشی مەدەنی - بەشی سوپا - بەشی پۆلیس.

لەدوای دەزگای نهێنیش چەند بەشێکی تایبەتمەند دێت وەك ((دەزگای پڕ چەککردن)) و ((دەزگای هەواڵ))، ئەم دەزگایەی دووەمیشیان لەجێی دەزگای هەواڵگیریی تایبەتیی کۆمەڵەکەیە .. لەسەرەتاشدا بۆ ئەوە بەکاردەهێنرا کە دزەبکەنە نێو ڕیزی ڕێکخستنە شیوعیەکانەوەو گەورەترین بڕی زانیاری لەبارەیانەوە کۆبکەنەوە... [١٧٥]

---

[١٧٤] احمد أنس الحجاجي، الرجل الذي أشعل الثورة – ص ١٦ – ٣٥.

[175] Mitchell – op – cit . p. 31.

بەنناش یەکێکی لە هەرە دڵسۆزەکانی خۆی ...دبووە سەرکردەی ئەم دەزگایە کە ئەویش عەبدولڕەحمان ئەلسندی بوو. هەروەها (ساڵح عەشماوی)ش لەسەرەتادا سەرکرادەیتی ئەم دەزگایەی گرتە دەست، بەڵام لەپاشاندا لاچوو.

((سیستمەکە))ش بۆ ((چەند کۆمەڵێك)) دابەشدەبێت، هەر کۆمەڵێکیش لەپێنج کەس پێکهاتووە، هەر لقێکی بە بایەخیش چەند کۆمەڵێکی تێدایە، هەر کۆمەڵێکیش یەکێك سەرکردایەتی دەکات. بەشی هەرە گەورەی ئەم سیستمەش لەقاهیرەدایە، ڕەنگە چەند مەڵبەندێك یان ناوچەیەکیش هەبێت کە ئەم سیستمەی تێدا نەبێت وەك ئەسوان، ئەمەش لەبەرئەوەی دوورەو ناتوانێت لەئامانجەکانی ئەم سیستمە تێبگات.[176]

ئەندامانی دەزگاکە، مەشقێکی سەربازیانەی سەختوتوندو تیژیان پێدەکرێتو، بەگوێڕایەڵی تەواوەتی و ئامادەیی قوربانی دان ڕادەهێنرێن ... ((پاش ئەوەیش کە مەشقو ڕاهێنان تەواو دەبێت، ئەندامەکە سوێندی بەیعەت دەخوت: سوێند بەخوای گەورە دەخۆم کەپاسەوانێکی پاك بم بۆ مەبدەئەکانی ئیخوان، بەگوێڕایەڵیو ملکەچی بۆ خێرو چاکە موجاهید بم لەڕێی خوداو، هەتا لەتوانشمدا هەبێت تێبکۆشم)).[177]

لەقۆناغەکانی سەرەتاشدا، سوێندی بەیعەکە بەپێی چەند مەراسیمێکی تایبەت بەڕێوە دەچوو (لە ژورێکی نیمچە تاریکدا کە حەسیری تێدا ڕاخرا بوو، سوێندی بەیعەکەش لەسەر قورئانێكو دەمانچەیەك دەخورا)، ((تامو

---

[176] محكمة الشعب - الجزء الاول – المرجع السابق (شهادة هنداوي دوير) ص ٣٢.

[177] المرجع السابق ص ١٢٦.

چێژ)) ێکی تایبەتیشی هەبوو، لەبەرئەوەی بەگشتی لەسەر دەستی شێخ بەننا خۆی ئەنجام دەدرا.

یەکێك لەسەرکردەکانی دەزگای نهێنیش (هنداوی دوێر) شانازی دەکات و دەڵێت ((من لەسەر دەستی خودی حەسەن ئەلبەننا سوێندم خوارد)).[١٧٨]

پاش ئەوەیش کە د. ئیبراهیم حەسەن و ئەلسوککەری و شوێنکەوتوەکانیشیان لەکۆمەڵەکە جیابوونەوەو هێرشەکانیان بۆ سەر مورشید توندبوو، بەوەی دیکتاتۆرەو تەنها ڕاو بۆچونی خۆی دەسەپێنێت، بەننا بایەخێکی زیاتری دا بە دەزگا نهێنیەکەی و پشتگیریەکی بەهێزتری لێکرد. ڕەنگە بەمەش هەستی بەوە کردبێت پێویستیی بەدەزگایەکی بتەوی توندو تۆڵ هەیە کەبەهۆیەوە نۆرین و دەسەڵاتی خودی خۆی ڕۆچێتە هەموو بەشەکانی کۆمەڵەکەوە. ڕەنگە دەزکاگەش ، وەك زۆرکەس ئاماژەیان پێ داوە، هەروەك چۆن ئامرازێکی پاراستنی بانگەشەکەو تۆقاندنی نەیارەکانی بوو، هەر بەو شێوەیەش ئامرازێك بووبێت، بۆ بەرپەرچدانەوەی هەڵگەڕاوەکانی ناوخۆی.[١٧٩]

---

[١٧٨] المرجع السابق، ص ١٢٦.

[١٧٩] صدرت عدة كتب عن الجهاز السري ومهامه و أساليب عمله كلها تقريبا بمنهج معاد مثل:

- محمد التابعي – هؤلاء هم الاخوان – القاهرة (١٩٥٤).
- كمال كيرة – محكمة الشعب.
- جرائم عصابة الاخوان (سلسلة كتب قومية). ويلاحظ افتقاد هذه الكتب جميعا للبعد الاكاديمي وللموضوعية في الترض والتحليل.

ئەندامی دەزگا نهێنیەکەش، بەجۆرێکی تایبەتی پەروەردە دەکراو لەڕووی عەقیدەشەوە کۆنترۆڵ دەکرا، بەشێوەیەکی وا کەفیکرەی ((جیهاد)) و ((شەهید بوون لەڕێی خوادا)) زاڵ ببێت بەسەریدا. بەنناش هەمیشە بەتەنگ ئەوەوە بوو کەفیکرەی جیهادو فیکرەی مردن لەپێناو خوادا پێکەوە ببەستێتەوە، ڕاشی دەگەیاند کەنموونەیی ترین و باشترین کۆتایی - کە هیچ شتێك لەوە باشتر نیە - شەهید بوونە ... ڕەنگە گەر بەشێوەیەکی وردیش دوای نووسینەکانی شێخ بەننا بکەویت، تێبینی ئەوە بکەیت کە چەندەها دەستەواژەی سەیری لەم ڕووەوە بەکارهێناوە.

ئەوەتا لەساڵی (١٩٣٧) دا کەشۆڕشی فەلەستینی کلْپەی سەند، بەننا وتارێکی لەسەر جیهاد نووسی و ناوی نا دروست کردنی مردن))، لەترۆپکی چالاکی و هێزی دەزگای نهێنیشدا، بەننا پاش ئەوەی ناونیشانی وتارەکەی گۆڕی بە تاسەیرتر بێت، سەرلەنوێ جارێکی تریش بلاّوی کردەوە.[١٨٠]

بەم شێوەیەو .. پاش ئەوەی ئەندامی دەزگای نهێنی لە ((هونەری مردن)) دا کارامە دەبێت، دەست دەکات بە کار کردن. مەحمود عەبدوللەتیف لەکاتی دادگایی کردنیدا، بەتاوانی هەوڵی تیرۆر کردنی جەمال عەبدولناسر، دەڵێت ...

((- داواکار: تێگەیشتیت مەبەست لەسیستمی نهێنی چیە؟

- تاوانبار: مەبەستەکەی بریتییە لەجیهادکردن لەڕێی خواداو دیراسەکردنی قورئان و ژیاننامەی پێغەمبەر .. ئەمەی لێ تێگەیشتوم.

[١٨٠] الاخوان المسلمون (١٦-٨- ١٩٤٦).

- دواكار: ئامانجى چىيە؟
- تاوانبار: ئامانجى دژايەتى كردنى دوژمنانى بانگەوازى ئيسلامە.
- داواكار: پيلانەكە نازانيت. تۆ دەچوويت سەرۆك بكوژيت، بيرت لەوە نەكردەوە چى بكەيت بۆ ئەوەى رابكەيت؟
- تاوانبار: نەخێر بيرم لىٚ نەكردەوە. هنداوى پێى گوتم پاش ئەوە پاسەوانەكان تەقەت لىٚ دەكەن‌و دەمريت.
- داواكار: دەتزانى كەدەمريت؟
- تاوانبار: بەڵىٚ.
- داواكار: بيرت لەرێگەيەك نەكردەوە بۆ دەرباز بوون؟
- تاوانبار: نەخێر)). [181]

هەروەها تێبينى ئەوەش دەكرێت كەشێخ بەننا پاش دروست كردنى دەزگاى نهێنى، كەوتە ئامادەكردنى بنياتێكى فيكرى توندو پڕ، كەئەندامى دەزگاى نهێنى ڕووبەڕوو لەبەردەم ئەوەى ناوى نراوە ((ڕەوابوونى جيهاد)) دادەنێت، ئەمەش ئەوە بەسەر كەسى موسوڵماندا دەسەپێنێت لەگەڵ هەموو ئەوانەدا بجەنگێت كەدەبنە كۆسپ لەسەر ڕێگاى بانگەشەكە.

لووتكەى سەركەوتنى بەنناش وەكو بانگەشەكە ڕێك‌و وەكو ڕێكخەرێك، ئەوە بوو كەتوانيبووى لەدەروونى ئەندامانى ئەم دەزگايەدا، ئەوە بچێنێت

---

[181] محكمة الشعب – الجزء الأول– المرجع السابق ص ١١.

کە مردن لەڕێی خوادا شتێکی ئاسان و سووکەو ئارەزووی دەکرێت بڕواداری موجاهیدیش یەك هەنگاوی ناياب دەنێت کەلەژیانێکی بێ نرخەوە دەیگوازێتەوە بۆ ژیانێکی نەمری بێ کۆتاو ئەو بەهەشتەی دەستگیر دەبێت کەبەڵێن دراوە بۆ شەهیدان بێت ... [١٨٢]

بەم شێوەیە، بەپێی ئەم بیرۆکەیەو لەم چوارچێوەیدا، بەرنامەی نوێی خوێندن بۆ ئیخوانی خێزانە ئیخوانییەکان ئامادە کرا .. هەروەها ئاهەنگی ئیسلامیەکانیش، وەك یادی غەزای بەدرو ئەوانەی دیکە، بوونە بۆنەو یادی گرنگ، تا بە بەردەوامی ئەم بیرۆکەیە لەدەروونی ئەندامانی کۆمەڵەکەدا بچەسپێت و ڕابێن لەسەری .. بەنناش هەمیشە سوور بوو لەسەر ئەوەی بڕوا بەئەندامانی دەزگای نهێنی بهێنێت کەئەوان ((سەربازانی خودان و پارێزەرانی ئایینەکەین))، ((بەتەنها))ش لەسەرشانی ئەوان ڕزگاربوونی نیشتمانی ئیسلام و عەقیدەی ئیسلام دێتە دی .. ئایا ئەوان ((کۆمەڵی موسوڵمانان)) و ((ئەهلی حەل و عەقد نین لەئیسلامدا)).

بەم شێوەیە دەزگاکە پێك هات و بەم پێگانەش هاتە کایەوە، بەراددەیەکیش فراوان بوو کە لەساڵی (١٩٤٨) دا لەنزیکەی هەزار ئەندام پێك دەهات. [١٨٣] ڕێکخستنێکی زۆر وردیشی هەبوو، زۆر بەتێرو تەسەلیش پڕچەك کرابوو، زۆر بەچاکیش مەشق و ڕاهێنانیان پێ کرابوو.

---

[١٨٢] راجع في هذا الصدد – محمد لبيب البوهي، مع شهداء الاسلام– القاهرة ١٩٥٢.

[183] Mitchell – op – cit . p. 205.

پڕچەك دەرابوو، زۆر بەچاكیش مەشق و ڕاهێنانیان پێ کرابوو. لەسەرو هەموو ئەمانەشەوە بەتەواوەتی ئامادە بوون، لەڕێی بانگەشەکەو بەئەنجام گەیاندنی فرمانەکانی مورشیددا بمرن.

ئایا سوێندی ملکەچی و گوێڕایەڵیان بۆ نەخواردووە؟ ئایا پەیمان و بەیعەیان نەداوەتیٚ کە لەهەموو شتێکدا بەتەواوەتی گوێڕایەڵ بن، کە بەدڵیان بێت یان نا؟

نهێنی بوونی سیستمی تایبەت بەڕاددەیەك بوو، کەتەنانەت سەبارەت بەخوودی سەرکردایەتی کۆمەڵەکەش هەر نهێنی بوو ... یەکێك لەسەرکردەکانی دەزگاکە (ئیبراهیم ئەلتەیب) لەدانپیانانەکەیدا لەبەردەم دادگادا دەڵێت: ((مەکتەبی ئیرشاد خۆی لە قەرەی ئەم مەسەلانە (دەزگای تایبەت) نەدەدا، چونکە هەر لەسەر بنەماپەیڕەوکراوەکەی سەردەمی بەننا دەڕۆیشت، لەبەر ئەوە بۆ (مەکتەبی ئیرشاد) نەبوو دەست وەرداتە ناوئەو مەسەلانەی بەئیشی ئەو لەقەڵەم نەدەدرا)).[١٨٤]

بەڵکو زۆر لەو سەرکردانە هەر نەیاندەزانی کە دەزگایەکی لەم جۆرە لەئارادا هەیە، تا ماوەیەکی زۆر پاش دروست بوونی ... دکتۆر خەمیس حمێدەی بریکاری کۆمەڵی ئیخوان، لەدان پیانانەکانیدا لەبەردەم دادگادا دەڵێت:

---

[١٨٤] محكمة الشعب – الجزء الثالث (شهادة ابراهيم الطيب) ص ٥١٦.

(( -داواکار: پلەو پایەت چییە لەکۆمەڵەکەدا؟

- شایەت: بریکاری ئیخوان موسلیمین.
- داواکار: زانیاریت چییە لەسەر دەزگای تایبەت؟
- شایەت : بەڵێ قوربان، دەورووبەری سالی (١٩٣٩ – ١٩٤٠) چوینە ناو ئیخوان موسلیمینەوە، پاش ماوەیەك تا سالی (١٩٤٦)، لەمامۆستا حەسەن ئەلبەنناوە تێگەیشتم کە کۆمەڵێك گەنجی ئیخوانی هەن، لەسەر چەك مەشق دەکەن.
- لەبەر ئەوەش کە یاسا ڕێگای بەمەشق کردن نەدەدا، بۆیە دەچوونە چەند شوێنێکی دووری گوندەکانی سەعید یان میقتەمو مەشقیان دەکرد، لەوێش هەندێك کەس، کە لەم ئیشانەیان دەزانی، دەهاتنە لایانو بەنهێنی مەشقیان پێ دەکردن)).[١٨٥]

بەڵام مونیر ئەلدەللەی ئەندامی مەکتەبی ئیرشادی گشتی لەدانپیانانەکەیدا لەبەردەم دادگادا دەڵێت ((.. کاتێك ئێمە چووینە کۆمەڵەکەوە، ئەم دەزگایە هەبوو، بەڵام تا ڕووداوەکەی خازنەدار ڕووی نەدا، پێمان نەزانی))[١٨٦]

جەنگی فەلەستینیش هەلێکی لەبار بوو ..

شێخ حەسەن ئەلبەناش تائەوپەڕی سنوور کارامە بوو لەبەکارهێنانی شەپۆلی هەستی نەتەوایەتیو ئیسلامەتیدا بۆ پتەوکردنی شوێنو پایەی کۆمەڵەکەی .. (کریستینا هاریس) دەڵێت لەسالی (١٩٣٦)ەوە لە(( لەشۆڕشی فەلەستیندا هەل بۆ شێخ حەسەن ئەلبەننا ڕێکەوتو، بواری کارکردنو فراوان بوونی بۆ ڕەخسا. هەروەها پشتگیریی شۆڕشی

---

[١٨٥] المرجع السابق ص ٥٥٧.

[١٨٦] محكمة الشعب – الجزء السادس– محاكمة حسن الهضيبي – المرجع السابق (شهادة منير الدلة) ص ١٣٦.

فەلەستین و سۆزی(حاجی ئەمین ئەلحوسەینی)ی موفتی فەلەستینیشی بەدەست هینا)).[١٨٧]

لەبەرئەوەی شۆرشی فەلەستینی سالی (١٩٣٦)یش لەبنەرەتدا دژی داگیرکەریی بەریتانی بوو، کەئەمەش وای کردبوو حکومەتی میسری دوو دڵ بیت لەوەی هەچ پشتگیریەکی رەسمی لی بکات. بۆیە چەندەها راوبۆچوون لەسەر ئەوە قایل بوون کەلەریی ئیخوان موسلیمینەوە بوار بدریت، پشتگیریی میللی لی بکریت.

ئەوەی لەم مەسەلەیەدا پەیوەندی بەئیمەوە هەیە، ئەوەیە کە قەزیەی فەلەستین زۆر بواری بۆ ئیخوان موسلمین رەخساند .. بەوەی کەبەهۆی پشتگیریانەوە لەقەزیەی فەلەستینی رەهەندی ئیسلامی و عەرەبی کۆمەلەکە ئاشکرا بوو، هەروەها بواری ئەوەشیان بۆ رەخسا کە چالاکیەکانیان بۆ هەموو ناوچە عەرەبییەکان دریژ ببیتەوە، جەماوەرییشیان لەفەلەستینەوە بۆ سوریاو لوبنان و ولاتەکانی دیکەش بلاو بووەوە .. بەلام ئەوەی کە لەم بەشەدا زۆر بەلای ئیمەوە گرنگە، ئەوەیە کە پشتگیری کردنی شۆرشی فەلەستین سالی (١٩٣٦)[١٨٨] پاشان خۆئامادەکردن بۆبەشداری کردنی جەنگی فەلەستین (١٩٤٨) ، دوو هەلی زیرین بوون لەبەردەم شیخی بەننادا، تا چەك و جبەخانەیەکی زۆر قەبە کۆبکاتەوەو، لەژیر پەردەی خۆئامادەکردنیشدا بۆ جەنگی فەلەستین بەئاشکرا مەشق بەپیاوەکانی

---

[187]Harris, clristina- op. Cit. P. 182.

[١٨٨] لمزيد من التفاصيل حول دور الاخوان في ثورة ١٩٣٦ بفلسطين راجع عبدالباسط البنا، تاج الاسلام و ملحمة الامام – القاهرة (١٩٥٢) ص ٣٧.

بکات .. لە هەموو ئەم شتانەشدا سووی لەتەوژمە نەتەوایەتیە بەهیزەکە بینی.

لەدادگایی کردنی ئەندامانی کۆمەلەکەشدا، سالی (١٩٥٤) چەندەها قسەوباسی زۆر سەبارەت بەبەکاربردن و خەرج کردنی نابەجیی ئەو پارەو پارمەتیانە کرا، کەبەناوی جیهاد کردن لەفەلەستیندا کۆ کرابوونەوە .. هەروەها سەبارەت بە کۆکردنەوەی چەکیش بەبیانووی جەنگی فەلەستینەوە، پاشان عەمبارکردنی لە گەنجینەکانی دەزگای نهینیداو بەکارهینانی لەچالاکیە تیرۆریستییەکانی ناوخۆدا ... [١٨٩]

لەبەر ئەوەش کە ئەم قسەوباس و تاوانبار کردنانە بی بەلگەن، بۆیە نایان خەینە روو و باسیان ناکەین.

بەهەرحال ئەو جەنگی فەلەستینەی کە هۆیەك بوو، بۆ دەستکەوتیکی سیاسی قەبەو فراوان بۆ کۆمەلەکە،هەر خۆشی یەکیك بوو لەهۆکارەکانی نەهامەتیە گەورەکەی ...

هەروەها ئەم جەنگە ئەوەشی ئاشکرا کرد - بۆ هەموو ئەوانەی نەیاندەزانی - کە کۆمەلەکە خاوەنی سوپایەکی چەکداری راستەقینەیەو، ئەم سوپایەش کە لەتوانایدایە لەفەلەستین شەر بکات، دەتوانیت لەشوینیکی دیکەش شەر بکات و .. رەنگە لەمیسریشدا .. زۆریش لەگیان بەخشەکانی ئیخوان لەناو خاکی فەلەستیندا کوژران، بەتایبەتی لەرۆژەکانی سەرەتادا، چونکە وایان دەزانی بەتەنها هاوارکردنەکانی جیهادو رووبەرووبوونەوەی ئازایانە، خۆی لەخۆیدا هەموو شتیکە، بۆیە گوللەی

(١٨٩) الجمهورية، ٢٢/١١/ ١٩٥٤ .

زایۆنیەکان زۆری لی دروینە کردن، ئەمەش وای‌لیکردن کەشیوازی شەرکردنیان بگۆرن‌و پەنا ببەنەبەر شەری پارتی‌زانی.[190]

ئەحمەد حسین دەلیت، شەری فەلەستین ((هەلیکی زیرینی بۆ ئیخوان رەخساند کە بە بیانووی جەنگی فەلەستینەوە، چەکیکی زۆر کۆبکەنەوەو مەشق لەسەر بەکارهینانی بکەن)). هەورەها ئیخوان (( بریکی زۆر چەك‌و تەقەمەنیان هەبوو، کە لەژیر پەرەدەی ئامادەکردن‌و سازدانی گیانبەخشەکاندا، بۆ جەنگی فەلەستین کۆیانکردبۆوە، کە لەراستیدا بۆ ئەوە ئامادەیان دەکرد تا بە بەکارهینانی هیز کودەتایەك لەمیسردا بەرپا بکەن)).[191]

هەروەها د. محەمەد حسین هەیکەل دەلیت، لەکاتی جەنگی فەلەستیندا ((هەیبەتی کۆمەلی ئیخوان زیادی کردو بوونە هیزیکیش کە سامیان لی‌دەکرا)).[192]

کاتیکیش بریاری هەلوەشاندنەوەی کۆمەلەکە دەرچوو، گیانبەخشەکانی ئیخوان لە فەلەستین کەوتنە تەنگژەوە .. چونکە هیزەکانی سوپا گەمارۆی شوین‌و بنکەکانیان دان‌و، سەرۆکی ئەرکانی سوپاش (لیوا فواد سادق) پیی راگەیاندن کەبۆیان هەیە یەکیك لەم دووانە هەلبژیرن، یان چەك فریدەن‌و بگەرینەوە بۆ میسر، واتا بۆ زیندانەکان، یان بەتەواوەتی ملکەچ بن بۆهیزەکانی سوپا ... گیانبەخشەکانیش نامەیەکیان لەبەنناوە پیگەیشتبوو

---

[190] كامل اسماعيل شريف، الاخوان في حرب فلسطين – الطبعة الثانية ص ٨٠ والفيا: محمد البوهي– مع شهداء الاخوان، المرجع السابق، ص ٢٤– ٢٦.

[191] أحمد حسين، واحترقت القاهرة – ص ٣١٣ – ٣١٥.

[192] د. محمد حسين هيكل، مذكرات في السياسة المصرية، ج٢، ص ٣٢٨.

کە تیایدا تکای لیکردبوون ملکەچ بن بۆ رژێمو بەهیچ شێوەیەك رووبەروویان نەبنەوە ، زۆربەشیان ئەم ریگا چارەیەیان هەلبژاردو ملکەچ بوون .. لەژێر دەسەلاتی سوپای میسریشدا، لەناو فەلەستیندا مانەوە .. پاش ریکەوتننامەی (رودس) ، چەك کران و نیردران بۆ سەربازگەکانی (طور) و (هایکستب)و لەوێ دەست بەسەر مانەوە. [١٩٣] ئینجا با بگەرێینەوە بۆلای دەزگای نهینی، سەرچاوەی هێزو لاوازیی شیخ، خەونی دێرینی شیخ و مۆتەکەی کۆمەلەکە لەنەهامەتیەکەدا.

هەروەها با پەرەکانی ئەم دەزگایە هەلبدەینەوەو، بزانین تیگەیشتنی کرداریی ئەندامەکانی، سەبارەت بەبیرۆکەی جیهاد چی بووە ..

---

[١٩٣] کامل اسماعیل شریف، المرجع السابق، ص ١٤٦ – ١٨٥ .

# بەشی کۆتایی

## پاشان پەردەکە دادرایەوە

لەسیاسەتیشدا وەکو چیرۆکە ئەفسانەییەکان، ڕوو دەدات کەکابرای ڕاوچی بەدەستی خۆی دێوەکە لەچراکە بهێنێتە دەرەوە، پاشان لێی بترسێت .. مەسەلەی پەیوەندیەکەی نێوان کۆشكو حکومڕانە کەمایەتیەکانیش لەگەڵ شێخو کۆمەڵەکەدا هەر بەو شێوەیە بووە.

ڕاوچییەکە دێوەکەی بەرەڵلا کرد، تا وەفدو هێزە چەپڕەوەکانی پێ بترسێنێتو وەکو ئامرازێکیش بەکاری بهێنێت، بۆ کۆکردنەوەی هەندێك هێزی جەماوەری، تاپشتگیریی لەسیاسەتێك بکەن کەهیچ لایەنگیرێکی نەبوو .. بەلام هەر کە دێوەکە هەستایەسەرپێو لەپاڵپشتە ئایینیەکەیەوە هەیبەتو سەرکەشیەکی پەیداکرد، وە لەچەکداریی دەزگا نهێنییەکەیەوە بووە خاوەن هێز، ئیتر وردە وردە ڕاوچییەکە لێیترسا ..

هەستیشی بەوە کرد کەوەفد بەهەر شێوەیەکبێت دەتوانرێت مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، ئەو زیندانو دەستبەسەر خانانەش کەدەرگاکانیان کراونەتەوە - بەهۆی دەستخۆشکەری ئیخوانەوە- بۆ پێشوازیکردن لەشیوعیو پێشکەوتوخوازەکان دەتوانن ئەگەر بەشێوەیەکی کاتیشبێت چەپڕەوەکان دەمبەستبکەن. بەلام دێوەکە کێشەیەکە بێچارەسەر

دەمێنێتەوەو، هێزو دەسەلاتیشی بەشێوەیەك زیاد دەكات كەتەنانەت سەبارەت بە كۆنەپەرستەكانیش ترسناك دەبێت، ئەوانەی كەبەپارەو ماڵ پشتگیریو كۆمەكیان دەكردو چاوپۆشییان لەپرچەكبوونیو زۆر شتی تریشی دەكرد .. هەروەها گەورە خاوەن موڵكو سەرمایەدارەكانیش، كە پێیان قبوڵ بوو ئیخوان ((ئیماندار)) بنو هێرشی بكەنە سەر پێشكەوتنو داوا لەكرێكاران بكەن پابەند بن بەرەوشتی جوانو بەرزەوەو پەنا نەبەنە بەرمانگرتن، ئەوانیش لەكۆتایی چلەكاندا، كەوتنە ترسو دڵە راوكێیەكەوە، كە پاڵی پێوەنان هەڵوێستێكی مەنگیان هەبێت كە هەر بانگەوازێكی چاكسازیی رەتبكەنەوە، بگرە تەنانەت بەچپەباسكردنیشی هەر رەتبكەنەوە ...

ئیخوان موسلیمینیش لەكۆتاییدا، پێویستە لەسەریان كەشتێك، ئەگەر تەنها یەك وشەشبێت، سەبارەت بە دەوڵەمەندو هەژارەكان بڵێن .. لەوانەشە بەشێوەیەكی نەرم گوتبێتیانو بەشێوازێكیش دایانڕشتبێت كە كەس تورە نەكات ((یەكێك لە ئەركەكانی كۆمەڵەكەمان ئەوەیە كەببێتە نێوەند لەنێوان دەوڵەمەندە بێئاگاكانو هەژارە دەستكورتەكاندا، ئەویش بەرێكخستنی چاكەو كۆكردنەوەی خێرویارمەتی، تا لە بۆنەو جەژنەكاندا دابەشكرێت)).[٣٥]

---

[٣٥] حسن البنا، دعوتنا في طور جديد .. دار الكتاب العربي بمصر (١٩٥٤)، ص- ٣ .

ئەم جۆرە وشانەش هەژارەكان قایل ناكات و بگرە كێشەكانیشیان چارەسەر ناكات، بەڵام ((دەوڵەمەندە بێ ئاگاكان)) تورە دەكات، بەتایبەتی ئەگەر وەكو سروشتی خۆیان بیر تەسكبن، هەروەها گەشەسەندنی ململانێكانیش زیاتر بیرتەسكیی بەسەردا دەسەپاندن..

لەیەكێك لەچیرۆكەكانیشدا، پاشا بەتووڕەییەوە هاوار دەكات (( من چاك دەزانم چی‌دەڵێم .. وەختی پێچ وپەناكردنمان نیە .. ئەم شتانە لەئێمە گەورەترن .. هەركەسێكبێت بابێتە سەرحوكم .. هاوڕێمبێت یان دوژمنم بێت .. بەس ڕزگارمانكات لەم تاوانبارانە .. ئەم وڵاتە پیس بووە .. پڕبووە لەفێڵ و تەڵەكە .. شیوعی و ئیخوان موسلیمین و ئیشتراكیەت و .. نیشتمان پەروەری و .. تەڕەماش .. ئەمانە هەرچی وپەرچی و بەتاڵەن، هیچ شتێكیان نیە لێی بترسن .. چ زیانێك دەكەن و چیان لەكیس دەچێت .. ئێمە هەموو شتێكمان لەكیس دەچێت)) [٣٦] * ڕەنگە شتێكی سەیریشبێت كەتوێژینەوەیەكی ئەكادیمی پەنا بەرێتە بەر چیرۆك و قسە بۆ بەڵگە هێنانەوە، بەڵام ئەو نووسینەی سەرەوە زۆر پڕ ماناو بەڵگەیە ... چونكە تێگەیشتنی حوكمڕانەكانی میسر لەقۆناغێكدا گەلاڵە دەكات و دەخاتە ڕوو كەتێیدا هەموو هەوڵ و پێچ و پەناكردنەكانیان شكستی بەدەست هێناو

---

[٣٦] فتحي غانم، الرجل الذي فقد ظله– الكتاب الثالث (ناجي) – سبتمبر ١٩٦٩، ص ٣٠.

* ئەم پارچەیە بەدیالێكتی میسری نووسراوە.

بڕوایان وابو هیچ ڕێگەچارەیەکیان نییە تەنها (وەفد)ی دوژمنیان نەبێت..وەفد لەشۆڕش کردن باشترەو، تەنانەت لەهاوڕێکانی دوێنێش باشترە کە ئێستا بەپشتی هێزو سوپا چەکدارەکەیان یاخیبوون.

جەنگی فەلەستینیش هۆیەکی تر بوو ..کۆنەپەرستانی میسر دەستخۆشییان لەجەنگی فەلەستین کردو بەشداریشیان تێداکرد، هانی ئیخوانیشیان دا کە ئەوانیش بەشداری تێدا بکەن .. لەوانەشە بەوهیوایە هانیان دابن کە بەشدارییەکەیان تەنها بەبەکارهێنانی ((وشەو دروشم بێت))، بەڵام کاتێك کەمەسەلەکان بوون بەجدی و، کاتێك جەنگی فەلەستین بوو بەوەی ڕژێم بخاتە تەنگژەیەکی سەیرەوە، لەنێوان پێچ و پەناکردنێکدا کەڕژێم بەدەستی خۆی دروستی کردبوو، تا دەنگی هێزە میللیەکانی پێدەمکوت بکات و لەچەند شتێکی لاوەکیدا بیتوێنێتەوە، وەلەنێوان ترسانیدا لەبەربەرەکانی کردنی هێزەکانی داگیرکەر (سەروەرە کۆنەکە)و هێزەکانی ئیستعماری ئەمریکی (سەروەرە نوێیەکە، کەدەستی ناوەتە تورقوراگەی سەروەرە کۆنەکە). بەناچاری دەبوو جەنگی فەلەستین بگۆڕێت بۆ شانۆگەریەك .. لەسەر تەختەی شانۆش، بەهیچ شێوەیەك ڕێگا بە هیچ ئەکتەرێك نادرێت کەشەڕەکانی ناو شانۆگەریەکە بگۆڕێت، بۆ پێکدادانێکی ڕاستەقینە .. نیشانەکانی پێکدادانیش لەم ڕووەوە، لەکاتێکدا دەستی پێکرد ((... ... ...)) ... شەڕەکانی ئیخوانی بۆ

بەشی باکووری بیابانی (نەقەب) ڕەتکردەوە، بەڵام چەند کۆمەڵێکیان لە (سینا) وە دزەیانکردە ناو فەلەستینەوەو، لەشوباتی ١٩٤٨ دا دەستیانکرد بەکوشتاری ڕاستەقینەو هێرشکردن بۆسەر سەربازگەکانی جولەکە)) [٣٧].

ئینگلیزیش، کەلەگەڵ شێخدا ڕێکەوتبوون و شێخ لەگەڵیاندا ڕێکەوتبوو، لەفەلەستیندا ناپاکیەکەیان لەعەرەب و موسوڵمانەکان کرد، کەهەموو لایەنگرەکانی پێبریندارو شەرمەزار دەبێت.

بابەتێکی نوێش خۆی بەمەیدانەکەدا دەکات.

لە (١٧)ی شوباتی (١٩٤٨)دا، هەموو کۆنەپەرستە عەرەبیەکان دەشڵەقێن، بەوەی کەلە سەنعا هەوڵی کودەتایەك لەدژی ئیمامێتیە گەندەڵ و دواکەوتووەکە ڕوودەدات و ئیمام و سیان لەکوڕەکانیشی دەکوژرێن.ئەم هەواڵەش هەموو ئەو کۆنەپەرستە عەرەبانەی لەرزاند کەوایان دەزانی هەر هەوڵێکی گۆڕانکاری بە بەکارهێنانی هێز، واتای پەتایەکە کەلەوانەیە بەناو خاکەکەیدا بڵاوبێتەوە..

هەمووانیش سەرسامبوون کاتێك بینیان ((پەنجەکانی)) ئیمامی بەننا تا سەنعا دوورکەوتووەتەوەو درێژبووە، وەکاتێك بینیان کۆمەڵەکە لەململانێکەی یەمەندا، خۆی وەکو بەشدارێك و وەکو نێوەندێك و بگرە ناوبژیوانێکیش ڕاگەیاند کەمەرجەکانی خۆی بسەپێنێت و پێشنیاری چەند

---

[٣٧] طارق البشري، المرجع السابق ص ٢٦٠.

داواکارییەکی چاکسازی بکات و ئەو پلەو پایانەش دەستنیشان بکات کەدەبێت بەسەر سەرکردەکانی کودەتاکەدا دابەشبکرێن، ئەوانەی کەبۆهەمووان ئاشکرابوو پەیوەندەییەکی توندو تۆڵیان بەشێخی بەنناوە هەبووە. ئەمەش مەسەلەیەك بوو، شێخی بەننا نەیدەویست بیشارێتەوە، بەڵکو ڕەنگە – هەندێ کات – بەمەبەست شانازیشی پێوەکردبێت .[٣٨]

لەوانەشە ئەمە هەندێك شتی تێدا بێت، کەحوکمڕانە کۆنەپەرستەکانی میسر زۆر بەتوندی بترسێنێت .. لەبەر هەموو ئەوشتانەی پێشووش، پەیوەندییەکانی نێوان شێخ و پاشاو حوکڕانە کەمایەتیەکان دەستیان بەتێکچوون کرد.. کۆمەڵەکەش بەدەست لاوازیی ناوخۆییەوە دەینالاندو پشتگیریی هێزە سیاسییە بالادەستەکانی دەرەوەشی لەدەستدابوو، خراپیی پەیوەندیەکەیشی لەگەڵ شادا، خاڵی بنەڕەتی وەرچەرخانی بوو.[٣٩]

کاتێکیش برا، موجاهید، چەکدار، دەکەوێتە هەڵوێستی بەرەنگاربوونەوەو، هەستدەکات پێویستە لەسەری کەبانگەشەی بپارێزێت و

[٣٨] لوجهة النظر المعادية لتحرك الاخوان في اليمن، راجع:الاخوان والارهاب: القاهرة (١٩٥٥)، ص ٤٢-٥١، ص ٤٢ – ٥١. لوجهة نظر الاخوان محمد الغزالي، من هنا نعلم. الطبعة الرابعة. الذي يمجد الانقلاب كتحرك إسلامي ضد حكم الكهانة، ص ١٠٦. وراجع أيضا: مجلة المباحث، ١٢/ ١٢/ ١٩٥٠.

[٣٩] طارق البشري، المرجع السابق ص ٣٦٩.

ڕووبەڕووی دوژمنەکانی بێتەوە .. ئەوا ئەقڵ شوێنی خۆی بەتەواوی چۆڵدەکات، تا فیشەك‌و دینامیت قسەبکەن.

لەکانوونی دووەمی (١٩٤٨)دا، پۆلیس بڵاوی کردەوە کەبەڕێکەوت پێیان زانیوە، کۆمەڵێك گەنج بەنهێنی لەناوچەی شاخی (مقطم)دا، مەشق لەسەر چەکدەکەن، کاتێکیش داویانە بەسەر کۆمەڵە گەنجەکەدا – کەماوەیەکی کەم بەرهەڵستیان کردووە – پۆلیسەکان دەستیان بەسەر (١٦٥) قومبەلەو چەند کۆمەڵێك چەکدا گرتووە .. سەید فایزی سەرکردەی کۆمەڵەکەش (ئەم کابرایە لەگەڵ ئەوەشدا کەیەکێك بوو لە سەرکردە بنەڕەتیەکانی دەزگای نهێنی، بەلاّم ناوەکەی بەلای پۆلیسەوە تەواو تازەو نەناسراو بوو) گوتی (ئەم چەکانە لەپێناوی فەلەستیندا کۆدەکرێنەوەو گەنجەکانیش بۆ فەلەستین مەشقدەکەن)، هەروەها گوتی: ((ئەم چەکانەیان لەعەرەب (دەوارنشینەکان) کڕیوە، لەپێناوی عەرەب (فەلەستینیەکان))دا.. [٤٠] .. بەهۆی چەند فشارو واستەیەکی کۆمەڵەکەشەوە، سەید فایزو هاوڕێکانی بەرەڵلاکران ..

بەلاّم وردە وردە پۆلیس کەوتە چاودێریکردنی گەنجەکانی کۆمەڵەکە.

هەنگاوی دووەمیش لە (٢٢)ی ئازاری (١٩٤٨)دا دەبێت، کاتێك دوان لەئیخوانەکان، (أحمد بك الخازندار)ی ڕاوێژکار دەکوژن، ئەویش لەبەرئەوەی

---

[٤٠] المصري، ٢٤/ ١/ ١٩٤٨.

حوکمێکی سەختی بەسەر یەکێك لەئەندامەکانی کۆمەڵەکەدا دابوو کەپێشتر بەوە تاوانبار کرابوو لەمەلهایەکی شەوانەدا هێرشی کردۆتە سەر کۆمەڵێك سەربازی ئینگلیز، پۆلیسیش بۆی ئاشکرا دەبێت کەپەیوەندیەك لەنێوان ئەم دوولاوەو کۆمەڵەکەی ناوچەی میقتەم و دەزگایەکی نهێنی چەکداری ناو کۆمەڵەی ئیخواندا هەیە .. بۆ ماوەیەکی کەمیش، خودی مورشید دەسگیر دەکرێت، بەڵام هێندەی پێناچێت لەبەر نەبوونی بەڵگە ئازاد دەکرێت.[٤١]

گەرچی ئەندامانی کۆمەڵەکەش بەرووکەش، نارەزایی خۆیان لەسەر رووداوی کوشتنەکە دەربڕی، بەڵام بێگومان چەندەها هەست و سۆزی جیاواز لە ناخیاندا دەهەژا، چونکە جیهاد حەقەو، واجبیشە، کوژراوەکەش بەتێڕوانینی ئەوان تاوانیکردووە، چونکە حوکمی زیندانی کردنی بەسەر گەنجێکی موسوڵمانی ئەندامی کۆمەڵەکەدا داوە، لەبەرئەوەی هێرشی کردۆتەسەر کۆمەڵێك کافرو داگیرکەری دوژمنی ئیسلام .. رەنگە ئەم جۆرە هەست و سۆزەش، بەلای میسرەوە شتێکی نوێ نەبووبێت .. بەوەی کەلەپاش بلاو بوونەوەی شەپۆلی تیرۆرکردنەکان، بەتایبەتی تیرۆرکردنی ئەحمەد ماهیرو ئەمین عوسمان و چەند کەسێکی دیکەش، هۆڵەکانی دادگا،

---

[٤١] اخر الساعة ٢٤/ ١١/ ١٩٤٨.

وەك عـەبدولڕەحمان ئـەلڕافیعی مێـژوو نـووس دەڵێـت، ببوونـە ((چـەند مینبەرێك بۆ شكۆدارو پیرۆزكردنی كوشتن و تاوان)) [٤٢]

ئەم ڕووداوەش تەنها پێشەكییەك بوو ..

جـەنگی فەلەستین كڵپـەی دەسـەند، گـەرچی ئیخوانیـش بەشـداریانكرد لەهەڵگیرسانیدا، بەڵام هەروەها لەتیژكردنەوەی هەستی ڕەگـەز پەرستیشدا، دژی جوولەكـە میسـرییەكان بەشـدارییان كـردو بـەبڕێكی زیـاتریش، پـڕ بەتواناشیان هـەوڵیان دا جەنگەكـە لەجـەنگی نێـوان عـەرەب و زایۆنـیزم و ئیستعمارەوە بگۆڕن بۆ جەنگی نێوان موسوڵمان و جولەكە.

شتێكی سروشتیش بوو ئـەو دەزگـای تایبەتـەی، كەپڕچـەك كرابـوو و هەسـتو سـۆزی بریندارکرابـوو، چ بـەهۆی لەكاركـەوتنی ڕەوتـی كوشـتارو خیانـەتی حكومەتـە عەرەبییـە بەكرێگیراوەكانـەوە، یـان بـەهۆی گرتنـی ((برایانی جیهاد))ەوە كە خازنـەداریان كوشتبوو، هەسـت و سـۆزی قوشـقی كرابـوو .. شتێكی سروشـتی بـوو كـە بەبـەكارهێنانی دینـامیت بەشـداریی لەخۆشكردن و بەتینكردنی ئاگری ڕەگەزپەرستیی ئایینیدا بكات.

لـە ٢٠ی حوزەیرانـی ١٩٤٨ دا لەگـەڕەكی جولەكـەكاندا هـەندێ خانوو ئاگریان تێبەرداو لە ١٩ی تـەممووزدا هـەردوو شـوێنكاری شبكۆریل و ئـەركۆ تەقێنرانەوە كەموڵكی بازرگانە یەهودییەكان بوون.

---

[٤٢] عبدالرحمن الرافعي، في أعقاب الثورة المصرية، ج٣، ص ٢٦٧.

هەر کە یەکەم ئاگربەستی جەنگی فەلەستینیش ئیمزا دەکرێت، خەڵك هەست بەسەرهەڵدانی بۆنی ناپاکی و خۆبەدەستەوەدان دەکەن و، دینامیتیش پاش ئەوەی لەفەلەستیندا بەکارهێنانی دژی جولەکەکان بێسود دەبێت، بەپەلە لەناوخۆدا دژی جولەکە میسریەکان دەست بەکار دەبێت.

دوا هەفتەی مانگی تەمموزو یەکەم هەفتەی ئابیش، دەبنە دووهەفتەی ترس و تۆقاندن لە قاهیرەدا، ئەویش بەوەی یەك لەدوای یەك تەقینەوەکان لەموڵك و ماڵی جولەکەکاندا ڕوودەدات و شەقامەکانی ناوجەرگەی پایتەخت، جار لەدوای جار بەهۆی تەقینەوە توندەکانەوە دەکەونە لەرزین، کەچەندەها کەس بەهۆیەوە گیانیان لەدەست دا .. لەماوەی دوو هەفتەشدا دوکان و کۆگاکانی بنزایۆن و جاتینیۆ کۆمپانیای بازرگانی دەلتا و ویستگەی مارکۆنی بۆ تەلەگرافی بێتەل وێرانکران. [٤٣] لە (٢٢)ی ئەیلولیشدا چەندەها خانوو لەگەڕەکی جولەکەکان وێرانکرا، پاشان تەقینەوەیەکی بەهێزیش لە تەلاری کۆمپانیای خۆرهەڵات بۆ ڕیکلامەکان ڕووی دا. [٤٤] پێویستیش بەوەناکات کەبڵێین قوربانییەکان ژمارەیان زۆر زۆربوو و هەمووشیان خەڵکی بێتاوانبوون..

---

[٤٣] المصري (٢٠، ٢١، ٢٩، يوليو، ١، ٤، اغسطس ١٩٤٨).

[44] Resner, Lawrence – Eternal stranger: The Rilght of Modern Jew From Baghdad to Casadlanca. New York (1951). P. 116.

چاوەکانی پۆلیسیش کەلەدوا دواییدا ئاگادارببوونەوە، سەرێکی داوەکەیان دۆزیبۆوە، ئەویش بەوەی لەبێستانێکی ئیسماعیلیەدا، کەشێخ محەمەد فەرغەلیی سەرکردەی کەتیبەکانی ئیخوانی ناو فەلەستین خاوەنیبوو، دەستیان بەسەر جبەخانەیەکی قەبەدا گرت ..

لە (١٥)ی تشرینی دووەمیشدا، ئوتومبێلە جیبە بەناوبانگەکە گیرا ..

سەرچاوەکانی پۆلیس دەڵێن، گرتنی ئوتومبێلەکە شتێکی ڕێکەوتبوو، هەرچەندە زۆر کەسیش بەشتێکی دووری دەزانن ڕێکەوت بووبێت .. بەهەرحاڵ شانس‌و بەختوای هێناو ڕووداوی گرتنی جیبەکە، دەستی پۆلیسی خستەسەر سی‌و دوو کادێر، لەگرنگترین کادێرەکانی دەزگای نهێنی‌و سەر هەموو بەڵگەنامەو ئەرشیفەکانی دەزگای نهێنیش، کە هەموو نەخشەو ڕێکخستنەکانیان‌و ناوی زۆربەی سەرکردەو ئەندامەکانیشی تێدابوو.[٤٥] بەنناش زۆربەی ڕۆژەکانی مانگی تشرینی یەکەم‌و چەند ڕۆژێکی تشرینی دووەم لەحەجکردن بوو، بەڵام هەر کە گەڕایەوە یەکسەر دەستگیر کرا،گوایا لەئوتومبێلە جیبەکەدا، بەڵگە هەبووە لەسەری‌و، بەرپرسیاری ڕاستەوخۆ بووە، لەتەقاندنەوەی کۆمپانیای ریکلامەکە.[٤٦]

---

[٤٥] قضايا الاخوان – قضية سيارة الجيب: الحيثيات ونص الحكم – دار الفكر الاسلامي – القاهرة (١٩٥١).

[46] Mitchell – op – cit. P. 64.

پاشان بەننا لەزیندان هاتەدەرەوە، تا کۆشش بۆ ڕاگرتنی ڕەوڕەوەی ڕووداوەکان بکاتو، هەوڵبدات کۆمەڵەکە دەرباز بکات لەوەی ببێتە نێچیری ڕژێمێك، کەئێستا لێی ناقایلەو بگرە حەزیشدەکات لەناوی‌بەرێت ..

بەڵام ڕەوتی ڕووداوەکان لەهێزو توانای جوڵەکردنی شێخ خێراتر بوو..

ئەو شێخەش کەڕاهاتبوو بەوەی دەستی و پێچ‌وپەنا بەسیاسەتو سیاسییەکان بکات، سەیریکرد بەتەواوەتی گەمارۆی دراوەو توانای هیچ شتێکی نیە .. چونکە هاوپەیمانە نزیکەکانی دوێنێ (کۆشكو سەعدیەکان)، ئەوانەی کەهانیان دەداو بەچاوی ڕەزامەندییەوە سەیری جوڵەکانی ئیخوانیان ڕووەو مەسەلەی فەلەستین دەکرد، بەئامانجی ئەوەی لەجەنگی وەدەرنانی داگیرکەرانی میسرو مەسەلە جۆراو جۆرەکانی ناوخۆ دووریان بخەنەوە، دەستیانکرد بەناپاکیکردن لە مەسەلەی فەلەستین، هەروەك چۆن لەپێشتردا، ناپاکیان لە مەسەلەی میسر کرد..

ئەو بەننایەی کە بەرامبەر مەسەلەی فەلەستین دەروونی شوێنکەوتووەکانی تا ئەوپەڕی ڕاددە پڕ کردبوو لەهەستو سۆزی ئیسلامیانەی لەرزۆك، وا خۆی دەبینێتەوە کەپێویستە لەسەری یان ڕووبەڕووی کۆشكو حکومەت بێتەوە، یان ڕووبەڕووی شوێنکەوتووەکانی ببێتەوە .. هەوڵیشی دا کە هەڵوێستێکی نێوەندی، لەنێوان ئەم دوو ئەگەرەدا هەڵبژێرێت .. لەوانەشە بووبێتە کۆچی قوربانی ئەم هەوڵە.

گەنجە ئیخوانیەکانی زانکۆو ئەوانەی دیکەش، لەرەتکردنەوەی ئەو مەرجە شەرمەزارکەرانەدا کەحکومەت لەرێکەوتننامەی ئاگربەستی فەلەستیندا ملی پێدابوو، کلّپەیان دەسەند. رەنگە بەنناش هەولّیدابێت کەدوا وەرەقەکانی (نۆرین لەنێو قوتابیانی زانکۆدا) راکێشێت و یاری پێبکات، لەپێناوی ئەوەدا کە کەمێك چنگی حکومەت لەسەر قورگی کۆمەڵەکە سوکبکات و دوور بخاتەوە .. پۆلیسیش وەك عادەتی ئەم رۆژانەیان، کەوتنە بەرپەرچدانەوەیان و، چەندەها شەری چەکدارانەش لەبەردەم حەوشەی کۆلیژی پزیشکی (القصر العینی)دا، کە یەکێك بوو لەمەڵبەندەکانی هێزی قوتابیانی ئیخوان، رووی‌دا .. پۆلیسیش فیشەکیان بەکارهێناو ئیخوانیش تەقەمەنی .. سەلیم زەکیی حوکمداری پایتەختیش لەئۆتۆمبێلەکەی خۆیەوە شەرەکەی بەرێوە دەبرد (ئۆتۆمبێلەکەی هەرئەو ئۆتۆمبێلە بوو کە حەسەن ئەلبەننا پێش کەمتر لەساڵ و نیوێك، بۆ هێمن کردنەوەی خۆپیشاندەرەکان سواری‌بوو)، قومبەلەیەکی بۆ هەڵدراو راستەوخۆ پێکای .. بەیاننامەیەکی حکومیش کۆمەڵی ئیخوان موسلیمینی بەکوشتنی تاوانبار کرد.

بەهۆی ئەمەشەوە، لەحاکمی سەربازیەوە بریارێك دەرچوو (پێشتر حوکمە عورفیەکان بەهۆی جەنگی فەلەستینەوە راگەیەنرا بوو) کە رۆژنامەی کۆمەڵەکە رابگیرێت .. بەنناش بێهوودە هەولّی‌دا کۆمەڵەکە دەرباز بکات ..

بۆیە پەیوەندیی بەهەموو هاوڕێکانیەوە کرد، تەنانەت بەنەیارەکانیشیەوە، هەموو وەرەقەکانیشی بەکارهێنا، هەوڵیدا پەیوەندی بە پاشاوە بکات، هەروەها بەئیبراهیم عەبدولهادی سەرۆکی دیوانی پاشایەتیشەوە، وە بە عەبدولرەحمان عەممار (هاوڕێی تایبەتی خۆیو هاوڕێی کۆمەڵەکە)ەشەوە، کەئەو کاتە بریکاری وەزارەتی ناوخۆ بوو ..

لەبەر ئەوەی کە شێخ سەرچاوەکانی هێزەکەی خۆی لەدەست دا بوو، بۆیە یاریو دەستی دەستیان پێدەکرد. لەسەعات (١٠)ی شەوی (٨)ی کانوونی یەکەمدا، عەبدولرەحمان عەممار پەیوەندیی پێوەکردو دڵنیای کردەوە کەشتێك دەکرێت بۆ ڕاستکردنەوەی هەڵوێستەکەو ڕزگارکردنی کۆمەڵەکە. شێخیش دڵئارام بوو و لەگەڵ کۆمەڵێك لە لایەنگرەکانیدا خۆیان لەمەڵبەندی گشتیدا مەلاسدراو چاوەڕوانی ((ڕزگارکردن)) بوون، بەلام هێندەیان پێزانی، رادیۆ کەوتە بلاوکردنەوەی بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران، سەبارەت بەهەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەکە، بەپێی یاداشتنامەیەك کەعەبدولرەحمان عەممار خۆی ئامادەیکردبوو.

لەم کاتەدا هەندێکیان هەوڵیان دا، لەبارەگای مەڵبەندی گشتی بچنەدەرەوە، بەلام بینیان گەمارۆ دراوە .. پۆلیس خۆیکرد بەناویداو

هەموویانی دەسگیر کرد، جگە لە بەننا .. کەبەبیانووی ئەوەی بڕیاری دەسگیرکردنی دەرنەکراو، بەئازادی وازیلێهێنرا .. [٤٧]

ئەم ئازادیەشی هۆی ئازاردان و دوایی هاتنیبوو.

یاداشتنامەکەی عەبدولرەحمان عەممایش سەبارەت بەهەڵوەشاندنی کۆمەڵەکە، کەبەرزکرابۆوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران، لیستێکی درێژی تاوانبارکردنی دەگرتەخۆ، کەهەموو کارە توندو تیژەکانی کۆمەڵەکەی دەخستەڕوو، تەنانەت ئەو کارانەی بەئاماژەی دەسەلاتداران و بۆ بەرژەوەندیی ئەوانیش کردبوویان.

لەنێوان ئەو سیانزە تاوانبارکردنەشدا کەیادشتنامەکە باسیکردون، ئەمانە دەبینین:

* کۆمەڵەکە خۆی ئامادە دەکرد بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی سیاسی بەرپا، ئەویش لەڕێگەی تۆقاندنەوە، بەبەکارهێنانی چەند ڕێکخستنێکی مەشق پێکراوی سەربازی، کەئەوانیش تیمەکانی گەڕۆکەکان بوون.

* بەرپرسیارێتی کۆمەڵەکە بەرامبەر کوشتنی یەکێك لەنەیارە سیاسیەکانی (وەفدیەك) لەپۆر سەعید.

[٤٧] الدعوة، نمرة ربيع الاول ١٣٩٧ (فبراير ١٩٧٧)- تصريح لسعد الدين الوليلي، السكرتير الخاص للشيخ البنا بعنوان (ماهي الاسرار الحقيقية في قضية اغتيال الشيخ حسن البنا).

- بەرپرسیاریتی کۆمەڵەکە بەرامبەر بەهەبوونی چەکوتەقەمەنی ((ڕووداوەکەی میقتەم - جبەخانەی چەك لەبێستانەکەی شێخ محەمەد فەرغەلی - دەست بەسەراگرتنی کارخانەیەکی چاکسازی لەئیسماعیلیە)).
- تەقاندنەوەی ئوتێلی (مەلیك جورج) لە ئیسماعیلیە.
- تەقاندنەوەی چەند کۆمپانیایەکی بازرگانی کەخاوەنەکانیان جولەکەبوون.
- دەست درێژیکردنە سەرپیاوانی ئاسایش لەکاتی بەرئەنجام گەیاندنی ئەرك و فرمانەکانیاندا.
- تۆقاندنی خاوەن کۆمپانیا بازرگانییەکان و هەڕەشە لێکردنیان بەئامانجی دەسکەوتنی چەند ((پیتاك)) و ((بەشداری)) یەك کەپێشەکی بدرێتە ڕۆژنامەی ئیخوان.
- لەسەر ڕۆشنایی ئەم یاداشتنامەیەش، حاکمی سەربازیی گشتی (مەحمود فەهمی ئەلنەقراشی پاشا) بڕیارێکی سەربازی دەرکرد کەنۆمادە بوو، یەکەمیشیان ئەمەیە: دەستبەجێ ئەو کۆمەڵەیەی کە بەکۆمەڵی ئیخوان موسلیمین ناسراوە بەهەموو لقەکانیەوە لەهەر شوێنێك هەبن هەڵدەوەشێنرێتەوەو، ئەو شوێنانەش کەبۆ چالاکیەکانیان تەرخانکراوە دادەخرێن و، هەموو نووسراوو بەڵگەنامەو

تۆمارو چاپكراوو پارەو موڵكو ماڵو هەموو ئەو شتانەی كە كۆمەڵەكە خاوەنین بەگشتی، دەستیان بەسەردا دەگیرێت. ئەندامانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی كۆمەڵەی ناوبراوو لقەكانی و بەڕێوەبەرو ئەندامەكانی و هەموو ئەوانەش كەبەهەر شێوەیەك سەر بەكۆمەڵەكەن، قەدەغەیە لەسەریان درێژە بە چالاكی كۆمەڵەكە بدەن، بەتایبەتی بەستنی كۆبوونەوە لەسەر ئاستی كۆمەڵەكە، یان یەكێك لەلقەكانی یان ڕێكخستنی ئەم جۆرە كۆبوونەوانە یان بانگەوازكردن بۆی یان بەپێی كۆكردنەوەی یارمەتی یان بەشداریی هەوڵدان بۆشتێك لەم بابەتە، ئەم بڕیارەش كۆبوونەوەی پێنج كەس یان زیاتر لەوانەی كەپێشتر ئەندام بوون لەكۆمەڵەی ناوبراودا قەدەغەیە.

هەروەها قەدەغەیە لەسەر هەر كەسێكی سروشتی یان كاربەدەست كە ڕێگا بەبەكارهێنانی هەر شوێنێكی خۆی بدات و بۆ بەستنی ئەم جۆرە كۆبوونەوانە، یاخود یارمەتیەكی ئەدەبی یان ماددی تریان پێشكەشبكات.

ماددەی سێهەمیان دەڵێت: ((هەركەسێك كەئەندام بووە لەكۆمەڵە هەڵوەشێنراوەكەدا یان سەر بەو كۆمەڵەیە بووە، نووسراویان بەڵگەنامە، تۆمار یان دەفتەر یان ئامراز یان هەرشتێكی تری لەلادانراوە كەپەیوەندیی بەكۆمەڵەكەوە، یان بەیەكێك لە لقەكانیەوە هەبێت، پێویستە لەسەری پاش

بڵاوکردنەوەی ئەم بڕیارە، لە ماوەی پێنج ڕۆژدا ئەو شتانە بەنزیکترین بنکەی پۆلیسی ناوچەکەی خۆی بسپێرێت)).

بەڵام ماددەی چوارەم، ئەوا باس لەتەرخانکردنی ((مەندوبێکی تایبەتدەکات، کەئەرك و فرمانی بریتی بێت لەگرتنەدەستی هەموو موڵك وماڵەکانی کۆمەڵە هەڵوەشێنراوەکەو پاکتاوکردنی بەشێوەیەکی پێویست، پاشان ئەنجامەکەی تەرخان بکات بۆ ئەوکارە خێر خوازیی و کۆمەڵایەتیانەی کەوەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی دەستنیشانی دەکات)).

ئینجا بەرداشی سەرکوت کردنی پۆلیسی ڕووەو ئیخوان کەوتە سووڕانەوە .. ئەوانەی کەدەستخۆشییان لەسووڕانەوەی‌دەکرد دژی وەفدیی و شیوعیی و پێشکەوتووخوازە نەیارەکانیان، ئێستا دەبینین دێوەزمەی دیکتاتۆریەت بەهەمان شێوە ئەوانیش قوتدەدات.

ئەو دەستبەسەر خانەو زیندانانەش کەبەهۆی دەستخۆشی لێکردن و ئافەرینی ئیخوانەوە لە ١٥ی ئایاری ١٩٤٨ دا (بەبۆنەی جەنگی فەلەستینەوە) دەرگایان خرابووە سەرپشت و، پێشوازیی لەنەیارەسیاسیەکانیان دەکرد. ئێستا تابێت فراوان دەبێت، بۆئەوەی پێشوازی لەهەزارەها ئەندامی ئیخوان بکات.

سەدوپەنجا فەرمانبەر لەکارخران و فەسڵکران، تەنها لەناو قاهیرەشدا (٥٠٠) فەرمانبەر دوورخرانەوەو ئاوارەکران بۆ(الوجه القبلي)*،نزیکەی

هەزار خوێندکاریش لەسەرجەم کۆلیج و قوتابخانە ئامادەییەکاندا دەرکران.
(٤٨)

بەنناش پڕ بەتوانای هەوڵی‌دا گەردەلولی نەهامەتیەکە ڕابگرێت .. بەڵام بەڕاستی دستەوسان بوو.

چونکە ئەو حکومەتەی کەلەگەڵیدا ڕێکەوتبوو، زۆربە سەختی دەستی‌دەوەشاندو سووربوو لەسەر پاکتاوکردنی ئیخوان. (نەقراشی)ش هەموو هەوڵەکانی بەننای ڕەتکردەوە بۆ چاوپێکەوتنی. ئەوکۆمەڵەیەش کە شێخ بەعەرەقی ناوچەوان و ماندوبوون بنیاتی نابوو و، بەماوەی بیست ساڵ بەدەستی خۆی خشت بەخشتی نابووە سەریەك، بە بەرچاوی خۆیەوە دەڕما. دەزگای نهێنیش هێڵەکانی پەیوەندی کردنی لێك دەپچڕان، چونکە ڕووداوی جێبەکە گورزێکی کوشندە بوو، بۆ سەرکردایەتی دەزگای نهێنی و تۆڕەکانی پەیوەندی کردنی. کاتێکیش لەسەرکردایەتی دەزگاکە درا، بەننا پەیوەندی پێیەوە پچڕاو، بگرە ئەو دەسەڵاتەشی لەدەست دا کە بەسەریدا هەیبوو. (٤٩)

---

(٤٨) حسن البنا، القول الفصل.

* لەمیسردا (الوجه البحری) و(الوجه القبلی) هەیە، یەکەمیان باکووری میسرەو ڕوەو دەریایە، دوەمیشیان باشووری میسرە.

(49) Mitchell – op – cit. P. 67.

لە (٢٨)ی كانونی یەكەمیشدا، كار لەكار ترازاو كارەساتەكە گەیشتە بەرزترین لوتكەی، ئەویش بەوەی كە قوتابییەكی تەمەن بیستو سێ ساڵ (عەبدولمەجید ئەحمەد حەسەن) دوو فیشەكی نا بە مەحمود فەهمی ئەلنەقراشی پاشای سەرەك وەزیرانەوەو بەباشی پێكای.

لایەنگرانی حكومەتیش لاشەی سەرەك وەزیرانیان بەخاك سپاردو لەرێو ڕەسمی بەخاك سپاردنەكەشیدا هاواریان دەكرد ((مردن بۆ حەسەن ئەلبەننا)). [50]

پاشان ئیبراهیم عەبدولهادی هات، بۆئەوەی ئاستی بازنەی توندوتیژییە ڕەسمیەكە تائەوپەڕی سنوور بخاتەگەڕو بۆئەوەی بازنەی دەستگیر كردنەكان لەڕیزەكانی ئیخواندا فراوان ببێتو (٤٠٠٠) دەست بەسەر بگرێتەخۆی [51] . هەندێك لەدەست بەسەرەكانیش تا ئەوپەڕی سنوور تووشی ئەشكەنجەدانی دڕندانەبوون، كەبەهیچ شێوەیەك میسر شتی وای بەخۆیەوە نەدیبوو. بەكورتی ((شەش مانگی پاش حوكم گرتنە دەسی ئیبراهیم عەبدولهادی، وێنەیەكی چەسپاوی دەسەلاتی ڕەسمی ستەمكاربوو

(٥٠) المباحث ٢٣/ ١/ ١٩٥١.

(51) Cahirs de Lorient Contemporain II (1949) P. 42.

لەدەروونی هەموو میسریەکاندا، عەبدولهادیش بەم شەش مانگە، هەموو گروپەکانی رای گشتی میسری کردە دوژمنی خۆی))[٥٢]

لەزیندانە تۆقێنەرەکانی ئەشکەنجەدانیشدا - کەتاوانبارو خێزانەکەشی بەژن و پیاوەوە دەخرانە ناوی - ناخۆشترین شت کەئازاری ئیخوانەکانی دەدا، ئەوەبوو کەدەزگاکانی ئاسایش ئەم ئایەتە پیرۆزەیان تێدا هەڵواسیبوو ((إنما جزاء الذين يحاربون الله ورسوله ويسعون في الارض فسادا أن يقتلوا أويصلبوا أو تقطع أيديهم و أرجلهم من خلاف أو ينفوا من الأرض ذلك لهم خزي في الحياة الدنيا ولهم في الآخرة عذاب عظيم)).

لەوانەشە ئەم گەنجانەی ئەندامانی دەزگای نهێنی، لەوکاتەدا کە دڕندانە ئەشکەنجە دەدران، چەندەها گومانی زۆر لەدەروونیاندا دروست بووبێت، سەبارەت بەسوودی تۆقاندنی نەیارەکانیان و، سەبارەت بەرادەی گونجانی ((فیکرەی جیهاد)) لەگەڵ ئەو شتانەدا کەئەوان کردبوویان. لەوانەشە فەتواکانی موفتی میسرو بەیاننامەکانی شێخی ئەزهەرو گەورە زانایان، کە کارەکانیان ئیدانە دەکرد، زۆر کاریگەری لەسەریان هەبووبێت.

بەڵام نەگبەتی گەورە لەوەدا بوو کەخودی شێخ بەننا خۆیشی ناڕەزایی بەرامبەر ئەم کارانە دەربڕی و ئەنجامدەرانی تاوانبار کرد بەوەی ((نە ئیخوانن و نەموسوڵمانیشن))، ئالێرەشدا هەموو تاوانبارەکان ورەیان

---

[52]Mitchell – op. Cit P. 67.

ڕووخا. چونکە هەموو ئەو خۆڕاگری و بەرگە گرتنەی کەئە ئەشکەنجەداندا هەیانبوو، لەو ((بەیعە))یەوە سەرچاوەی دەگرت کەلەسەر دەستی شێخی بەننا لەژوورێکی تاریکدا سوێندیان لەسەر خواردبوو .. بەڵام گەر شێخ پشتی ئەوان و ئەو فیکرەی ((جیهاد))ە بەرەڵڵا بکات، کەفێری کردبوون .. ئەوا چی دەمێنێتەوە؟.

عەبدولمەجید حەسەن سێ هەفتەی تەواو بەرگەی ئەو ئەشکەنجەدانە دڕندانەیەی گرت کەخۆی و خێزانەکەی ڕووبەڕووی دەبوونەوە، بەڵام کاتێك ئەو بەیاننامەیەی شێخ بەننای خوێندەوە کەڕۆژنامەکان بڵاویان کردبۆوە، هێندەی پێ نەچوو بەتەواوەتی ورەی ڕوخا. (٥٣)

لەڕاستیشدا لادانی ئیخوان بەلای ئیرهاب و تۆقاندندا، هەڵەیەکی گورچکبڕ بوو، وای بۆ نەیارەکانی ڕەخساند کەبەرەسمی بەسەختترین شێوە، توندوتیژیان لەگەڵدا بەکاربهێنن.

هەروەها ئەم ئیرهابە زۆربەی ئەو هێزانەشی دابڕی لێیان، کە لەگەڵیاندا نەرم بوون یان بەچاوی ڕەزامەندیەوە سەیری بانگەشەیان دەکردن.

لەگەڵ بەرداشی ئەشکەنجەدانیشدا، بەرداشی پڕوپاگەندەش کەوتبووەگەڕ، بۆئەوەی کۆمەڵەکەو شێخەکەی و ڕێبازەکەی و دەزگانهێنیەکەشی تاوانبار بکات.

---

(53) Mitchell- Op. Cit P. 78.

- فەتوای موفتی وڵاتی میسر کارەکانی کۆمەڵەکە ئیدانە دەکاتو ئەنجامدەرانیشی بە کافر تاوانبار دەکات.
- بەیاننامەیەکیش لەدەستەی زانایانەوە.
- بەیاننامەیەکی دیکەش لەشێخی ئەزهەرەوە.
- هەروەها چەند بیرمەندو نووسەرێکی دیکەش، کەلەناو جەماوەری فراوانی گەلدا، ڕێزو پایەیەکی باشیان هەبوو، بەشدارییان لەهەڵمەتی ئیدانەکردنی کارە توندوتیژو تیرۆریستییەکانی ئیخواندا کرد.
- د. تەها حسێن دەڵێت: ((ئەم هەموو چەكو تەقەمەنیە چیە کەلەماڵی زیندووەکانو گۆڕی مردووەکاندا حەشار دەدرێن؟ ئەم فێڵو تەڵەکە شاردراوانە چیە، ئەم پیلانو نەخشانە چین ڕێك دەخرێن، ئەم چاوبەستو فریودانانە چین ئەنجام دەدرێن، ئەم هەموو تاوانە لەپای چی، ئەم هەموو خراپەیە لەپای چیو بۆچ ئاوا ژیانی میسریەکان سوكو هەرزان بووە .. دەڵێن گوایا ئەمە هەمووی بەفەرمانی ئیسلام ڕێگەی پێدراوە، ئەو ئیسلامەی کەهیچ شتێکی هێندەی کوشتن حەرام نەکردووەو، لەهەمووشتێك زیاتر نەهی لەوە کردووە کە لەسەر تاوانو دوژمنایەتی هاوکاری یەکتری بکەن)). [٥٤]

---

[٥٤] جرائم عصابة الاخوان- المرجع السابق ص ١٩٣.

* (کامل ئەلشناوی)ش دەڵێت ((من دڵگرانم بەوەی، کەنەك کۆمەڵێکی ڕێکخراو، بەڵکو تەنها یەك مرۆڤێك هەبێت، کەمردن بۆ خەڵك دروستبکاتو لەئاشوب گێڕانو وێرانکاریدا کارامەبێت. دڵیشم داخی لێ دەچۆڕێت گەرئەم کۆمەڵە بەناوی ئیسلامەوە تاوانەکانیان ئەنجام بدەنو کەسانێکیش هەبن باوەڕیان بەبانگەشەکەیان هەبێت .. ئەو ئیسلامەی کەکتێبە پیرۆزەکەی دەفەرموێت ((وجادلهم بالتي هي أحسن))، ناڵێت دەمانچەو تۆپو تەقەمەنی گفتوگۆیان لەگەڵدا بکە)). (٥٥)

بەڵام نارەزایی دەربڕین، لەدژی دەزگای نهێنیو تاوانەکانی، بەتەنها لەدەرەوەی کۆمەڵەکەوە نەبوو، بەڵکو لەوانەیە لەناو خودی کۆمەڵەکەشدا زیاتر بووبێت.. بگرە لەخودی شێخو دروست کەرو بنیاتنەری دەزگا نهێنیەکەیشیەوە.

منیر ئەلدەللەی ئەندامی مەکتەبی گشتی ئیرشاد لەدانپیانانەکان لەبەردەم دادگادا دەڵێت ((... پاش ڕووداوەکەی خازنەدار، مامۆستا حەسەن ئەلبەننام بینی زۆر بێتاقەتو خەمناك بوو لەو بەزمەو پێی گوتم ئیخوان چۆن شتی وایان کردووە .. ئەمە تاوانێکی دڕندانەیە .. هەر بەهۆی ئەمەشەوە گلەیی حاڵی خۆی کردو گوتی مەبەست لەپێکهێنانی دەزگاکە

---

(٥٥) جرائم عصابه الاخوان – المرجع السابق ص ١٩٣.

ئەوەبووە کە ئیخوان لەواتای جیهادکردنی ناخی خۆیان تیٚبگەیەنرێن، بەلاٚم هەندێکیان لایان دا ... هەروەها گوتیشی بیٚ ئەوەی ئەم پێی بزانێت ئەم شتانە ڕوویان داوە، زۆر دڵتەنگیش بوو و زۆریشی پیٚ ناخۆش بوو)).

سەرۆکی دادگاش قسەکانی پیٚ دەبڕێت ((ئێمە باسی ئەوە ناکەین کەماموٚستا بەننا زۆری پێناخۆش بووە یان نا، باسی ئەوە دەکەین ئایا لێت نەپرسیوە ئەم دەزگایە سەربەکیٚیە؟)) ئەویش وەلاٚم دەداتەوە ((ئەم قسانە مانای ئەوەیە کەدەزگاکە پێویستە سەر بەو بێت و لەژێر دەسەلاٚتی ئەودا بێت، بەلاٚم لەژێر دەسەلاٚتی ئەودا نەبوو، ئەوشتانەش کەکردبووی بیٚ فەرمان و ئاگاداری ئەو کرابوو .. لەکاتی هەڵوەشاندنیشیدا، سەرلەنویٚ بۆ جاری دووەم بەننا گلەیی حاڵی کردەوەو گوتی، سوپاس بۆ خوا کە کۆمەڵەکە هەڵوەشایەوە، تا لەم بەلاٚو تەنگ و چەڵەمانە ڕزگارمان بێت و ساغی ڕایانماڵین)) [٥٦].*

ئەم شایەتیە ترسناکەش، بەهەموو ئەو زانیاریە سەرسووڕهێنەرانەوە کە تێیدایەو خاوەنەکەی بەرپرسیارە لێی، جیٚ دەهێڵین. بەلاٚم تێبینی دەکەین کەشایەتیەکی دیکە هەیە، هەر هەمان ئەم شتانە دووپات دەکاتەوە، ئەویش شایەتیەکەی خاتوو مونیرە عامری خێزانی ساڵح حەرب پاشایە، ساڵح

[٥٦] محكمة الشعب، الجزء الثاني، محاكمة حسن الهضيبي (شهادة منير الدله) ص ١٢٣٦ - ١٢٣٧.

حەرب سەرۆکی کۆمەڵەی لاوە موسوڵمانەکان و هاوڕێی تایبەتی حەسەن ئەلبەننا بوو .. ئەم خاتوونە لەکێشەی کوژرانی حەسەن ئەلبەننادا، لەدانیشتنی ڕۆژی (١٨)ی تشرینی دووەمی (١٩٥٣) دا، لەبەردەم لێکۆڵەرەوەدا شایەتی دەدات و دەڵێت: ((شێخ حەسەن ئەلبەننا دەهات بۆ دیداری ساڵح حەرب پاشا، تا لەگەڵ حکومەتدارێك بکەوێت، واسیتەی نێوان هەردوولایەنەکەش مامۆستا موستەفا مەرعی بوو. منیش دەمبینی کە مامۆستا بەننا زۆر دڵتەنگ و بێزارە، پرسیارم لێکردو ئەویش گوتی، پاش کوشتنی خازنەدار جڵەوی مەسەلەکان لەدەستم دەرچووە، دەمەوێت بیگێڕمەوە، بەڵام ناتوانم))[٢٣]*

بەردەوامیش دەبین تا هەڵوێستی سەرکردەکانی دیکەی کۆمەڵەکە بەرامبەر کارە تیرۆریستییەکان بزانین.

.. حەسەن ئەلهوزەیبی جێ نشینی حەسەن ئەلبەننا، لەدان پیانانەکانیدا لەبەردەم دادگادا دەڵێت ((کاتێك لەساڵی (١٩٥١)دا هاتمە ناو ئیخوان موسلیمینەوە، بۆم دەرکەوت کە شتێکیان هەیە ناوی سیستەمی نهێنییە، منیش پرسیم ئامانج لەبوونی ئەم سیستەمە چییەو؟ بۆچی هەوڵدەدات و؟ چی پێ دەکەن؟ بەتایبەتی پاش ئەوەی کە سەلمابوو پێشتر لەساڵەکانی

---

[٢٣] محضر تحقيق النيابة في قضية مقتل البنا (الجناية ١٠٧١ – ١٩٥٢) جلسة يوم ١٨ نوفمبر ١٩٥٣ – (شهادة السيدة منيرة عامر) ص ٢٥٩ ومابعدها.

(٤٦- ٤٧ - ٤٨)دا، چەند تاوانێکیان کردووە، بێ گومان ئەم تاوانانەش کەکرابوون لادان و دەرچوون بوون لەمەبەستە بنەڕەتیەکە)). [٢٤]*

سەرکردەیەکی دیکەی ئیخوانیش (محمد عبدالمعز محمد عبدالله) لەشایەتیەکەیدا لەبەردەم دادگادا دەڵێت: ((- پارێزەر: کوشتنی نەقراشی حەڵاڵە؟))

- شایەت: تاوانە.
- پارێزەر: ئەی کوشتنی خازنەدار، حەرامە؟
- شایەت: بەڵێ؟
- پارێزەر: ئیسلامەتیە یان کفرە؟
- شایەت: کفرە.
- پارێزەر: ئەی بکوژەکەی؟
- شایەت: دەچێتە دۆزەخەوە.
- پارێزەر: لەسەردەمی کێدا خازنەدار کوژرا؟
- شایەت: لەسەردەمی حەسەن ئەلبەننادا.
- پارێزەر: ئەی نەقراشی؟
- شایەت: لەسەردەمی حەسەن ئەلبەننادا.

---

[٢٤] محكمة الشعب – الجزء الرابع – محاكمة محمود عبداللطيف (شهادة حسن الهضيبي)– ص ٧٨٨.

- پارێزەر: ئەی ئەوەی بانگەواز بۆ کوشتن دەکا ت، کافرە یان موسوڵمانە؟

- شایەت:..........)) [٢٥]

- سەرکردەیەکی دیکەش لەسەرکردەکانی کۆمەڵەکە، کە(محمود الحواتکی)یە لەدادگا دەڵێت:

(( - پارێزەر: ئایا کوشتنی خازنەدار یەکێکە لە هەڵەکان؟

- شایەت: بەڵێ.

- پارێزەر: ئەوانەی ئەم هەڵانەیان کردووە موسوڵمانن یان موسوڵمان نین؟

- شایەت: بەرگی ئیمان لەبەریان داکەنراوە.

- پارێزەر: ئایا بەبۆچوونی تۆ ئەوانەی بڕیار لەسەر ئەم تاوانانە دەدەن و ڕازین لەسەری، موسوڵمانن یان موسوڵمان نین؟

- شایەت: موسوڵمان نین.

- شایەتەکەش بەردەوام بوو لەسەر دانپیانانەکانی و دووپاتی کردەوە کەلەسەردەمی حەسەن ئەلبەننادا ئەوەی دەرچوایە لەدەزگای نهێنی دەکوژرا)) [٢٦]

---

[٢٥] محكمة الشعب – الجزء الثاني – محاكمة محمود عبداللطيف (محمد عبدالمعز محمد عبدالله) ص ٣٧٦.

بەلام د.خەمیس حمێدەیی بریکاری کۆمەڵی ئیخوان، کە لەدادگا پرسیاری لەبارەی چالاکی دەزگای نهێنی‌یەوە لێدەکرێت، بەم شێوەیە وەلام دەداتەوە:

((-سەرۆکی دادگا:ئایا ئەمە راستە؟

شایەت: هەڵەیە.

-سەرۆك: هەڵەیە؟.

-شایەت: بەڵێ.

-سەرۆك: واتە کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین هەڵەن؟

-شایەت: ئەوپەڕی سنوور هەڵەن))

سەرۆکیش لێی دەپرسێت، ئایا کارەکەی مەحمود عەبدوللە عەبدوللەتیف کە (هەوڵی‌دا جەمال عەبدولناصر بکوژێت)

بەکارێکی کۆمەڵی ئیخوانیش وەلام دەداتەوە: ((من ئەو ئیشەی مەحمود عەبدوللەتیف بەکارێکی تاوانکاری دادەنێم)) (٢٧)

ئەم قسەو باسانەش واز لێ دەهێنین، چونکە لەوانەیە بێ سنوور درێژە بکێشێت، لەبەر ئەوەی زنجیرەی دانپیانانەکانی ئیخوان لەنێو دادگاکاندا

(٢٦) المرجع السابق، شهادة محمود الحواتكي، ص ٢٥٤.

(٢٧) محكمة الشعب- الجزء الثالث شهادة خميس حميدة، ص ٦٨٠.

کۆتاییان نایەت.. تەنها ویستمان لەمانەوە بیسەلمێنین کە ئەو گوتەی (جیهاد)ە دەزگای نهێنی، لەسەر بناغەکەی دروست کراوە، نەوەکو پێویست ڕوون و ئاشکرابوو، نەوەکو پێویست جێگیر بوو، نەوەکو پێویستیش لەلایەن سەرکردەکانی کۆمەڵەکەوە پەسەندو قبووڵ کرابوو، کاتێکیش گەشاوەییەکە خامۆش بوو و ئیخوان لەبەردەم دەسەڵاتی گورز وەشێندا ڕووبەڕووی چارەنووسیان بوونەوە، زوربەیان ورەیان ڕووخاو ئیعترافی تەواویان کرد.. ترسناکترین ئیعرافیشیان ئەوەبوو کە بیرۆکەی دەزگای نهێنیان ئیدانە دەکردو بەڕێوەبەرەکانیشیان بەکافر لەقەڵەم دەدا. ئەمە جێدەهێڵین و دەگەڕێینەوە بۆلای شێخ لەنەهامەتییە سەختەکەیدا گەورەترین شت کەشێخ بەدەستیەوە دەینالاند، ئەو ئازادییە بوو کەبەسریا سەپێنرابوو، زیاتر لەجارێکیش داوای لەنەیارەکانی کرد کە بیخەنە زیندانەوە بەڵام رەتیان کردەوە.. ئەوان بیرۆکەی پاکتاوکردنیان بەتەواوەتی لەلایان کامڵ بوو.. یەکەم جار پاکتاوکردنی لەڕووی سیاسییەوە پاشان لەڕووی جەستەوە ڕوی‌دا.

شێخ بەئازادیەکی زیاتر لەشوێنە کەوتوە زیندانیەکانی، ئەشکەنجەی دەچەشت. گەمارۆ دراو، دەستەوەسان و لاواز وازیان لێ هێنابوو گرێی کۆمەڵەکە لێك ترازابوو، دەزگای نهێنی هێڵەکانی پەرت پەرت ببوو، بینا

سەرکەشەکەش دەڕووخا، ((ڕاهیبانی شەوو سوارچاکانی ڕۆژ))یش لەژێر دەزگای ئەشکەنجەدان بەچۆکدا دەهاتن و ئیعترافی تەواوەتیان دەکردو، زیاترو زیاتر ئیخوانەکانی بۆ زیندانەکان ڕادەکێشا.

ئەو شێخەش کەبەرچاوو بەرگوێی هەموو کەسێك کەوتبوو و لەهەموولایەکەوە حسابی بۆ دەکرا، وای لێهاتبوو دەپاڕایەوە بۆ ئەوەی دیدارێك لەگەڵ سەرەك وەزیراندا سازبکات، لەم پێناوەشدا، هەموو تەنازولێکی دەکرد .. سەرەك وەزیرانیش ڕەتی دەکردەوە کەدیداری لەگەڵدا بکات.

بارودۆخێکی ئاواش سەبارەت بە پیاوێکی وەك حەسەن ئەلبەننا، لوتکەی کارەسات و ناخۆشیە.

شێخی باڵ شکاو، بەدوو ئاراستەدا کەوتە جووڵە .. لەلایەکەوە بەنووسین بەرگری کردن لەخۆی و کۆمەڵەکەی تۆماربکات، لەلایەکی تریشەوە هەوڵبدات گەمەی واسیتەو تەنازولکردن دەست پێ بکاتەوە، بەئومێدی ئەوەی شتێك لەبەرماوەی کۆمەڵەکە دەرباز بکات.

شێخ دوا پەیامەکانی خۆی نووسی ((القول الفصل))، جیاوازییەکی زۆرگەورەش لەنێوان ئەم پەیامەو پەیامەکانی پێشتریدا هەیە.

بەننا لە ((القول الفصل)) دا، بەم شێوەیە دەست پێ دەکات: ((ڕای گشتی میسری و عەرەبی و ئیسلامی، تەنها لەیەك لایەنەوە کێشەی ئیخوان

موسلیمینیان بیستووە. لایەنی ئەو حکومەتەی، کەبەدەرکردنی فەرمانێکی سەربازیانە بۆ هەڵوەشاندنەوەی، دەست درێژیی کردە سەر کۆمەڵەکە. دیارە ئەمیش ئەو لاینەیە کە خاوەنی هەموو هۆیەکانی پڕوپاگەندەو ڕاگەیاندنە، هەر لەو ڕۆژنامانەوە کەبەتەواوەتی ملکەچی چاودێریی دەوڵەتین و لەو ڕادیۆیەوە کەلەژێر کۆنترۆڵی کەمینەدایە. بەڵام ڕای گشتی هیچی لەلایەنەکەی ترەوە نەبیستووە، هیچی لەئیخوانەوە نەبیستووە کە لەهەموو هۆیەکی بەرگری لەخۆکردن بێ بەش کراون، ڕۆژنامەکانیان دەستی بەسەردا گیراوەو قەڵەمەکانیان لەکارخراوەو زمانەکانیان بەستراوەو ... هەموو وتار بێژێکیان دەسگیرکراوەو کۆبوونەوەی هەر پێنج کەسێکیان لەهەرشوێنێکدا بەتاوانێك لەقەڵەم دراوە، کە کەمترین سزای شەش مانگ زیندانی کردنە. لەبەر ئەمە پێویست بوو لەسەرمان کەئەم بەیاننامەیە، پێشکەش بەڕای گشتی میسری و عەرەبی و ئیسلامی و ویژدانی مرۆیی جیهانی بکەین، تا نەکەونە هەڵەیەکەوەو لە حوکمداندا ستەم بکەن و تەنها بە بیستنی ڕای لایەنێك بڕیار بدەن. گوتراویشە: ئەگەر کەسێك هاتەلات و چاوێکی دەرهێنرابوو، ئەوا بڕیار مەدەتاکەسەکەی تریش دەبینیت، چونکە لەوانەیە ئەمیان هەردووچاوی هەڵکەنرابێت)) [٢٨]

[٢٨] حسن البنا، القول الفصل.

بەلام سەبارەت بەچەکەکان، ئەوا بەننا چەند جارێك ئەم گوتەیەی دووبارە کردەوە ((ئەم چەکانە بۆ موجاهیدەکانی ئیخوان‌و فەلەستین‌و دەستەی بالای عەرەبیی فەلەستینیەو حکومەتیش خۆی ئاگاداری ئەمەیە))

هەروەها حکومەتیشی بەوە تاوانبارکرد کەبڕیاری هەڵوەشاندنی کۆمەڵەکەی لەژێرفشاری یاداشتنامەیەکی سێ لایەنیدا دەرکردووە، کە هەریەك لەبەریتانیاو فەرەنساو ئەمریکا پاش کۆبوونەوەی نوێنەرە دیبلۆماسیەکانیان لە(فاید) لە (٦)ی کانونی یەکەمی (١٩٤٨) دا، پێشکەشیان کردو تیایدا داوای هەڵوەشاندنی کۆمەڵەکەیان کرد.

پاش ئەوەی کەبەننا چەندەها هۆکاری تری خستە ڕوو، وەك پەردەپۆشکردنی دۆڕاندن لەجەنگی فەلەستینداو خۆسازدان بۆ دانوستانێکی نوێ لەگەڵ ئینگلیزدا، دەستی کردوە بە باسکردنی ئەوەی کەخۆی ناوی نابوو پەنجە نادیارەکان‌و پیلانە ((مەبەستدارەکان، ئەوانەی کەلەیەکەم ڕۆژەوە بەربەرەکانی بانگەشەکەیان دەکردو خۆیان بۆ مەلاس دابوو، وەك جولەکەی جیهانی‌و کۆمۆنیزمی نێو دەولەتی‌و ئیستیعمار و لایەنگرانی بێ ئایینی‌و بەرەڵلایی)).

لەکۆتایی ((القول الفصل)) دا بەننا گوتی ((لەپێناوی ماف خۆشماندا پڕ بە توانا جیهاد دەکەین، ئەگەر ژیانێکی سەربەرزانەی مەزنیشمان پێ نەبڕێت، ئەوا مردنێکی پیرۆزی پڕ شکۆمان پێ دەبڕێت)).

بەڵام ((القول الفصل)) هەر بە نووسراوی مایەوەو .. هەتا شێخیش نەمرد ڕووناکی نەبینی.

گوتمان شێخ پەنای بردەبەر واسیتەو تەنازول کردن .. لەڕاستیشدا کەوتە داوی ئەم هەڵوێستەوە .. هەنگاو بەهەنگاو ڕایان کیشا تا یەك لەدوای یەك تەنازول بکات، لەکۆتایشدا تیرۆریان کرد.عەبدولهادی چاوپێکەوتنی بەننای ڕەت کردەوە، پاشان مەسەلەکەی دایە دەست دوو کەس لەدڵسۆزترین کەسانی دەستەو دایرەکەی خۆی، تا دەستی بەشێخ بکەنو یەکەم جار ڕای بکێشنە ناو داوی پاکتاوکردنی سیاسیەوە.

با چاوێکیش بەڕاوکەران و .. پاشان بەداوەکەشدا بخشێنین.

- دوو ڕاوکەرەکە: موستەفا بەگ مەرعی و زەکی پاشا عەلی.

- داوەکە: ڕاکێشانی شێخ بەرەو دەرکردنی چەند بەیاننامەیەك و وەرگرتنی چەند هەڵوێستێك کە ناوبانگە سیاسییەکەی بڕوخێنێتو بەڕواڵەتێکی لاواز لەبەردەم شوێنکەوتوانو جەماوەرەکەیدا بیخاتەڕوو، ئەمەش ببێتە هۆی ڕووخاندنی ورەی ئیخوانە دەستبەسەرەکان، ئینجا لەکۆتایشدا پاش ئەوەی لەڕووی سیاسییەوە پاکتاو دەکرێت، لەڕووی جەستەشەوە پاکتاو بکرێت.

- لەبەردەم دادگای شۆڕشدا، کاتێ ئیبراهیم عەبدولهادی بەچەند تاوانێك دادگایی دەکرێت، کەیەکێکیان سازدانی نەخشەی کوشتنی حەسەن ئەلبەننایە، داواکاری جێگری ئەحکام دەڵێت:

((تاوانبار عەبدولهادی)) بەو هەموو دەسگیر کردنەش، هێشتا هەر دڵنیا نەبوو لەوەی کەتاوان لێکراو (حەسەن ئەلبەننا)ی بەتەواوەتی لەلایەنگرەکانی دابڕیبێت، بەڵکو وای بۆ دەچوو کە لەوانەیە نێچیرەکەی، لایەنگری تری هەبێتو هێشتا پیاوەکانی نەیانتوانیبێت بیاندۆزنەوە. لەبەرئەمە هەندێك لەوەزیرەکانی خۆی لەوێنەی کەسانێکدا ناردەلای کەدەیانەوێت دانوستانی لەگەڵدا بکەن، بۆئەوەی کۆمەڵەکەی بگەڕێننەوە دۆخی جارانی، بەمەرجێك ئەمیش هەموو پیاوەکانی خۆی بۆ ئەوان ئاشکرا بکات، ئەمەش وەك ڕێ خۆشکردنێك ۆ دەسگیرکردنیان .. بەڵام کەلەمەوە دەرکەوت تاوان لێکراو هیچ لایەنگیرێکی دیکەی نییە، تاوانبار دڵنیابوو لەوەی هەلی گەنجاوی بۆ ڕەخساوە، تا نێچیرە بێپشتو پەناکەی لەناوبەرێت)) [٢٩]

بەڵام ئایا دانوستانەکە لەنێوان ((ڕاوکەر)) و ((ڕاوەکە))دا چۆن بەڕێوە دەچوو.. شێخی باڵ قرتێنراویش چۆن ڕادەکێشرایە ناو داوەکەوە..

---

[٢٩] محاكمات الثورة – الكتاب الاول (محاكمة ابراهيم عبدالهادي) ص ١٨١.

با گوێ بۆ شایەتیەکەی نزیکترین کەسەکانی حەسەن ئەلبەننا بگرین، عەبدولکەریم مەنسوری ژنبرای ئەوەی کەخۆی ڕۆژێك لەڕۆژان ناوی نابوو ((براکەی خەدیجە)).. ئەمیش هەر هەمان دەستەواژە بەکار دەهێنێت - بگرە ئێمەش هەر لەوەوە وەرمان گرتووە ((.. جگە لەمەش، حکومەت مامۆستا مستەفا مەرعی وەکو ئامرازێکی ڕاوکردن بەکارهێنا .. چونکەمستەفا مەرعی پەیوەندیی بەسالح حەربەوە کردو پێی گوت دەمەوێت لەگەڵ ئیمامی شەهیددا ڕێك بکەوم. مامۆستا مستەفا مەرعیش کەوتە بەکارهێنانی چەند شێوازێکی خواروخێچی گوماناوی قێزەون، کەدەیویست ئیمامی شەهید لەقاهیرەدابهێڵێتەوەو بەشێوازێکی چاوبەست وای تێ بگەبەنێت کەحکومەت بڕیاری هەڵوەشاندنەوەکە پووچەڵ دەکاتەوەو لەگەڵ ئیخواندا ڕێك دەکەوێت و مەسەلەکان دەگەڕێتەوە دۆخی جارانی)) (*)

سەرۆکی دادگاش لێی دەپرسێت: گوتت چەند شێوازێکی خواروخێچی گوماناوی بەکارهێنا، چی بوون ئەم شێوازە خوارو خێچانە؟

شایەتەکەش وەڵام دەداتەوە: ((بەڵێ قوربان ئێستا پێتان دەڵێم. ئەو وای لەئیمامی شەهید دەگەیاند، گوایا بەڕاستی دەیانەوێت ئیخوان موسلیمین هەستێننەوە .. بەڵام پێشیدەگوت، بەس بەیارمەتی خۆت بەیاننامەیەکم بۆ بنووسە کە بیسەلمێنیت نیەتتان پاکە. مستەفا مەرعیش خۆی وشەکانی بەیاننامەکەی بەئیمامی شەهید دەگوت، ئیمامیش ناڕازی بوو لەسەر چەند

وشەیەکی نادروست کەمستەفا مەرعی دەینوسین و ڕەنووسی دەکردن، ئەمیش پێی دەگوت .. ئەگەر ئەمە نرخی هەستاندنەوەی ئیخوان و نرخی ڕێکەوتن بێت لەگەڵ حکومەتدا، ئەوا شتێکی ئاسانەو هیچ کێشەیەکی تێدانیە گەر بنووسرێت. هەرکە ئەم بەیاننامەیەش نووسرا، خێراموستەفا مەرعی بردی و دایەدەست سەرۆکی حکومەت، ئینجا پاش چەند ڕاستکردنەوەیەك، هێنایەوە بۆلای ئیمامی شەهیدو پێی دەگوت ئەم دەستەواژەیەیان باشەو بەکەڵکی نووسین دێت و ئەمەیان باش نییەو دەبێت لابرێت. بەم شێوەیە کەوتە ڕاستکردنەوەی بەیاننامەکە، لەپاشاندا هەر کە بەیاننامەکەی لێ وەرگرت، یەکسەر بردی بۆلای بکوژەکەی نەقراشی و پێی گوت، سەیر کە ئەها شێخ بەننا بەیاننامەی لەدژت دەرکردووە، ئینجا بەمە کەوتە جولاندن و وروژاندنی تاوانبارە بکوژەکە. دەرەنجامی ئەم شێوازەش کەموستەفا مەرعی بەکاری هێنا، بکوژەکەی نەقراشی قسەیەکی زۆری بەدەستەوەداو بووە ئامرازێکی لەبار بەدەست دەستەی لێکۆڵینەوەوە، لێکۆڵەرەوەو پیاوانی پۆلیسی سیاسیش چیان بویستایە ئەوەی دەگوت)) (٣٠) *

بەم شێوەیە، کاتێك سیاسەتمەدار دەکەوێتە کەندەلانی تەنازولکردنەوە .. ئەوا هیچ شتێك فریای ناکەوێت. بەنناش بەیاننامەیەك بەناونیشانی

---

(٣٠) المرجع السابق ص ١٢٥.

((بەياننامەيەك بۆ خەڵك)) ئيمزا دەكات‌و، تێيدا نارەزايی خۆی لەسەر كاری پياوەكانی‌و هاورێيانی رێبازەكەی دەردەبڕێت‌و كارەكانيان بەتيرۆرو لادان لەرێنماييەكانی ئيسلام لەقەڵەم دەدا.

بەنناش جەختی لەسەر پێويستی ئازادكردنی هەندێك لەپياوەكانی دەكرد، راشی دەگەياند كە ((ناتوانێت نكوڵی بكات لەوهەڵانەی ئيخوانەكان كردويانن‌و، ئەم هەڵانەش بەرادەيەك ناخيان جووڵاندووە كەخودی خۆيشی، هەستی بەپێويستی هەڵوەشاندنەوەی كۆمەڵەكە كردووە)) [٣١].

گوتيشی جڵەوكردنی رەوتی رووداوەكان، پێويستی بەچەند كەسێكی دياری كراوەوەيە كەشێخ بتوانێت لەرێيانەوە هەڵوێستەكە كۆنترۆڵ بكات ..

بەڵام عەبدولهادی قەناعەتی بەبۆچوونەكەی شێخ نەكردو بەو بەياننامەيەشەوە رانەوەستا كە دەری كردبوو، مستەفا مەرعيش زۆر جەختی لەسەر ئەوە دەكرد كەپێويستە ئيخوان راديۆ نهێنيەكەيان‌و هەموو ئەو چەكانەی لەلايان ماوە بەدەستەوەی بدەن. [٣٢]

پاش دوو رۆژ لەبڵاوبوونەوەی ((بەياننامەيەك بۆ خەڵك))، يەكێك لەسەركردەكانی دەزگای نهينی، لەكاتی هەوڵدانيدا بۆ تەقاندنەوەی دادگای ئيستئناف ميسر، دەسگير كرا. با قسەكردنيش لەسەر ئەم مەسەلەيە بەجێ

---

[٣١] موسى اسحق الحسيني، المرجع السابق ص ٣٦.

[٣٢] جمال سليم، البوليس يحكم مصر – القاهرة للثقافة العربية (١٩٧٦) ص ١٩٩.

بهێڵێز بۆ (محەمەد یوسف ئەللەیسی) شایەتی یەکەم لەکێشەی کوژرانی حەسەن ئەلبەننادا، ئەوەی کەلەم کاتەدا، پیاوی پۆلیسی سیاسی بوو ئەرکی چاودێریکردنی هەڵس‌وکەوتەکانی حەسەن ئەلبەنناشی خرابووە ئەستۆ، هەروەها هەرئەمیش بوو کە ڕۆژی کوژرانەکەی، بەننای ڕاکێشایە داوەکەوە .. ئەم شایەتە دەڵێت ((.. ڕووداوی تەقاندنەوەی دادگای ئیستئناف قەوما، منیش چاوم بەشێخ بەننا کەوت، زۆر دڵتەنگ بوو بەم ڕووداوە، واشی بۆ دەچوو کە ئەم ڕووداوە ئیشی ئیخوان نەبێت، بەڵام کەزانی ئیشی ئەوانەو ئەوان وایان کردووە، بەتەواوەتی دڵگران بوو دەستی کرد بەگریان، دەشیگوت من خەمی حکومەتم نیەو بەلامەوە گرنگ نیە، بەڵکو خەمی میللەتمە، ئێستا واتێدەگەن کەئیخوان موسلیمون تیرۆریستن، هەروەها دەشیگوت پێی سەیرە، چۆن ئەم شتە ڕوویداوە. ئینجا لە پاش ئەمە دانوستانێك لەنێوان ئەم‌و موستەفا مەرعیدا، سەبارەت بەدەست بەسەرەکان کرا، ساڵح حەرب پاشاش پەیوەندیی بە مەرعی بەگەوە کرد، بۆئەوەی لەگەڵ شێخ بەننادا کۆببنەوە .. ڕێکیش کەوتن. مەرعی بەگیش بەشێخ بەننای گوت، یەکەمجار پێم گوتیت بەیاننامەیەك بنووسە بەقسەت نەکردم، لەبەرئەوە ئێستا پێویستە بەیاننامەیەك بنووسیت. ئینجا ڕێکەوتن

---

** ئەمانە هەمووی بەمیسری نوسراون. ((وەرگێڕ)).

لەسەر دەرکردنی بەیاننامەیەك بەناوی ((نەئیخوان‌و نەموسولْمانن)).
پاشان پەیوەندی کردنەکانیان هەر بەردەوام بوو)) [٣٣] *

کاتێکیش نێچیرەکە دەکەوێتە داوەکەوە .. هەچ شتێك بکات لێی‌ناگیرێت .. با ئەوەش بخوێنینەوە کەشێخ بەننا بەدەستی خۆی نووسی:

((نە ئیخوانن‌و نەموسولْمانن)) ئەم ڕووداوە نوێیە ڕوویدا، ڕووداوی هەوڵدان بۆ تەقاندنەوەی نووسینگەی بەڕێز جێگری گشتی. ڕۆژنامەکانیش ڕایانگەیاند کەئەنجامدەرەکەی سەر بەئیخوان موسلیمینە، بۆیە بەپێویستم زانی کەڕایبگەیەنم ئەنجامدەری، ئەم تاوانە گەورەیەو هەموو تاوانە هاوشێوەکانی دیکەش، ناکرێت نە لەئیخوان‌و نەلەموسولْمانانیش، چونکە ئیسلام ئەم جۆرە کارانەحەرام دەکات‌و ئیخونیەکانیش ڕەتی‌دەکەنەوە.

زیاتریش پێدەچێت بگرە گومانیشی تێدا نیە ، ئەم کەسە ویستویەتی بەم کارە ڕکەبەرایەتی ئەو نووسینە بکات کەدوو ڕۆژ پێش ئەوە لەژێر ناونیشانی ((بەیاننامەیەك بۆ خەڵك)) دا بڵاوکرایەوە. بەڵام میسری ئارام، ئەم هەوڵە تاوانکاریانە نایترسێنێت. لەمەودواش ئەم گەلە سروشت هێمنە، لەگەڵ حکومەتە ئاسایش‌و ئارامی پارێزەکەیدا، لەسایەی خاوەن شکۆ

---

[٣٣] محضر تحقيق قضية مقتل حسن البنا (الجناية ١٠٧١ – ١٥٩٢) محضر اقوال محمد يوسف الليثي ص ٤٤).

* ئەمانە هەمووی لەدەقە عەرەبییەکەدا بەدایلێکتی میسری نووسراون. (وەرگێڕ)

پاشای مەزندا، هاوکاری یەکدەکەن لەپێناو بنەبڕکردن و لەناو بردنی ئەم دیاردە ترسناکەدا.

با ئەو گێرەشێوێنە بچووکانەش بزانن، ئەو هەڕەشە نامانەی کەدەینێرن بۆ گەورەپیاوان و کەسانی دیکەش، تەنها وایان لێدەکات لەئەرك و فەرمانەکانیاندا زیاتر جدیبن و باشتر بەئەنجامیان بگەیەنن. دەبا وازبهێنن لەم کارە قێزەونانەو هەریەکەیان لەسنووری کاری خۆیدا بکەوێتە خزمەتکردنی وڵاتەکەی خۆی، گەر دەتوانن کارێکی بەسوودو بەکەڵکیان لەدەست بێتەوە.

منیش ڕایدەگەیەنم کەلەمڕۆوە، هەرکارێك لەم جۆرە کارانە لەهەرکەسێکەوە ئەنجامدرێت کەپەیوەندی بەئیخوانەوە هەبووبێت، ئەوا لەدژی خودی من ئەوکارە دەکات و منیش لەبەرامبەریدا هیچم پێناکرێت، تەنها ئەوە نەبێت کەخۆم ڕووبەڕووی سزا بکەمەوەو داوا لەلایەنە پەیوەندیدارەکان بکەم ڕەگەزنامە میسریەکەمم لێ بسەننەوە کەتەنها شایانی میسریە شەرەفمەندو پاك و بێگەردەکانە. دەبا ئەوانەی دەبیستن و گوێڕایەڵن پەیڕەوی ئەمەبکەن، بێگومان لێکۆڵینەوەش ڕەسەن و ناڕەسەنەکان ئاشکرا دەکات. ولله عاقبة الامور* ((حەسەن ئەلبەننا))*

بەم شێوەیە دانوستان چیەکان پرتەقاڵەکەیان تا دوا دڵۆپ گووشی..

شـێخیش کەلەقەفـەزی ئازادیدایـە، لـەپیاوەکانی نـاوزیندانی زیـاتر ئەشکەنجە دەچێژێت .. تووشی فشاری تاڵو سەختیش دەبێت .. هەزارەها خـێزان بـێ بەخێوکـەرن، براکـانی لـەزینداندان، خۆیشـی هیـچ دەسـەڵاتو هێزێکی نیە.

بەیاننامەکەی یەکەمیش بـووە هـۆی جولاندنـی ڕقو تووڕەیـی ئەندانـە زیندانیەکانی کۆمەڵەکە، دەشگوترێت ئەو ئەندامانە نامەیـەکیان ئاڕاستەی کردو تێیدا گوتیان بۆچوونیان وایە ((کەبەیاننامەکە هەڵبەستراو بێت، ئەگەر ڕاستیشبێت ئەوا لـەپاش ئازادبوونمان، ڕۆژی ئەوە دێت حسابت لەگـەڵدا بکەین)) [٣٤].

ڕکەبەرایەتی کردنی بەیاننامەکەی شێخ، لەلایەن ئەوانـەوە کەلـەدەرەوەی زینداندا مابوونەوە، بریتی دەبێت لەهەوڵی تەقاندنەوەی دادگای ئیستئناف .. کابرا لەنێوان هەردوو دەمی گوێزشکێنەکەدایە، زینـدانی دەسـتی فشـاری نەیارەکانی و فشاری پیاوەکانێتی، بەڵام هیچ دەسەڵاتێکیشی نیە.

شێخیش چی لێ دەمێنێتەوە ..

پیاوەکانی لەزیندانو هەڕەشەنامەی بۆ دەنێرن، ئەوانـەش کەلـەدەرەوەی زیندانن یاخی دبەن لێی، خۆیشی دڵسۆزترین دڵسۆزەکانی تاوانبار دەکات،

---

[٣٤] Mitchell – op- cit. P. 69.

* ئەمە دەقی ئایەتێکی قورئانی پیرۆزە، لەبەرئەوە وەك خۆی بەجێمان هێشت.

ئەوانەی لەسەر قورئان و دەمانچەیەك سوێندیان بۆ خوارد كەبەتەواوەتی لەهەمووشتێكدا – بەدڵیان بێت یان نا – گوێرایەڵبن .. ((راهیبانی شەوو سوارچاكانی ڕۆژ)) تاوانبار دەكات بەوەی كە ((نەئیخوانن و نەموسوڵمانن)).

بگرە بەمەشەوە ناوەستێت و دەكەوێتە ستایشكردنی ئەو حكومەتەی كەبەتوندترین شێوە، ئەشكەنجەی پیاوەكانی دەدات دەڵێت ئەم حكومەتە بەتەنگ پاراستنی ئاسایش و ئارامیی میللەتەوەیە ((لەسایەی خاوەن شكۆ پاشای مەزندا)).. بەڵكو میللەتیش هاندەدات كەلەگەڵ حكومەتدا هاوكاری بكەن ((بۆ بنەبڕكردن و لەناو بردنی ئەم دیاردە ترسناكە)).

((راهیبانی شەوو سوارچاكانی ڕۆژ))یش، لەدوابەیاننامەی شێخدا، بوونە ((ئەو گێرەشێوێنە بچووكانە))و جیهادەكەشیان بووە ((كاری قێزەون)).

شێخیش هیچی بۆ نامێنێتەوە بیڵێت .. تەنها ئەوەنەبێت كەداوا بكات ڕەگەزنامە میسریەكەی لێ بسەننەوە ((كەتەنها شایانی شەرەفمەندو بێگەردەكانە))؟

پاشان خوێن ڕێژەكان بڕیاریان دا، تەقە لەجەستەكەی بكەن.

ئوتومبێلە تایبەتیەكەیان لێسەندەوە، ئینجا دەمانچە ڕێپێدراوەكەشی و ئەو پاسەوانێتیەش كەهەیبوو. لەپاشاندا ڕایانكێشا بۆ دانووستانێكی تر، یان دوادانوستان و .. دایانەبەر گوللە.

ڕۆژی ڕاستەقینەی كۆچی دوایی ئیمامی شەهیدیش، شێخ حەسەن ئەحمەد عەبدولرەحمان ئەلبەننای سەعاتچی مورشیدی گشتی .. بەهەڵواسراوی دەمێنێتەوەو گەڕانی وردی پێویستە.

ئایا ڕۆژەكە وەك لەوەفاتنامەكەیدا تۆماركراوە، ڕۆژی (١٢)ی شوباتی (١٩٤٩)یە..

یان ئەو ڕۆژەیە كە شێخ بەیاننامەی ((نەئیخوانن‌و نەموسڵمانن))ی دەركرد..

یان ڕۆژی دەركردنی ((بەیاننامەیەك بۆ خەڵك))ە..

یاخود زۆر پێش ئەمەیەو .. ئەو ڕۆژەیە كەڕێگای بەخۆی دا بچێتە مەیدانی سیاسەتەوە لەدەرگای لایەنگریكردنی كۆشك‌و.. دژایەتی كردنی گەلەوە؟

لێكۆڵینەوەش سەلماندی كەنەخشەدانەری سەرەكی بۆ كوشتنی شێخ حەسەن ئەلبەننا، شا فاروق بووە.

ئیخوان خۆیشیان زیاتر لەجارێك دووپاتیان كردەوە كە شێخ ((لە (١٢)ی شوباتی (١٩٤٩)ی زایینی، بەرامبەر (١٤)ی ڕەبیعی دووەمی (١٣٦٨)ی كۆچیدا كوژراوە .. لەڕۆژی جەژنی لەدایكبوونی پاشای پێشوو (فاروق ئەحمەد فوئاد)دا. كوشتنیشی دیاری جەژنی لەدایك بوونی پاشایەكبوو،

کەوێرانکاریو نەهامەتی بۆ گەلەکەی هێنا)) [٣٥]. بەڵکو مەسەلەکە کۆمەڵەکەی گەیاندە ڕادەیەك، کەبەڕەسمی داوایان لەدادگا کرد - ئەو دادگایەی پاش شۆڕشی تەمووز بەسترا، بۆ دادگاییکردنی بکوژانی شێخ حەسەن ئەلبەننا - تا چەند تاوانبارێکی نوێ ڕووبەڕووی دادگا بکەنەوە، لەسەر هەمووشیانەوە فاروق پاشای پێشوو، بەوەی کەهاندەرو بکەری بنەڕەتی تاوانەکەیە.

لەبەرئەوەیش کەبکوژە ڕاستەقینەکە فاروق بوو .. بۆیە توێژەر سەرسوڕمانی خۆی - بگرە لەسەر سوڕمانیش زیاتر - ناشارێتەوە، کاتێك لەتۆماری سەردانەکانی (ڕۆژی (١٤)ی تشرینی دووەمی (١٩٥١)ی کۆشکی عابدیندا، ناوی زۆر لەسەرکردەکانی ئیخوان دەبینێت، کەهاتوونەتە بەر دەرگاکانی کۆشکی عابدین .. ڕەنگیشە بۆئەوە هاتبن تا - جارێکی تر - گوزارشت لەلایەنگیریی خۆیان بکەن بۆ بکوژی شێخەکەیان، یاخود ڕەنگە بۆئەوە هاتبن کەدەریبڕن خوێنی شەهیدەکەیان بیرچۆتەوە. ئیمزاکانیش بەڵگەن لەسەرئەمە..

جێ نشینی شێخ بەننا .. حەسەن ئیسماعیل ئەلهوزەیبی مورشدی نوێ.

کەسەکانی شێخ بەننا .. عەبدولرەحمان ئەلبەننای برای، ئەندامی مەکتەبی گشتی ئیرشاد.

---

[٣٥] الدعوة غرة ربيع الاول ١٣٩٣ (فبراير ١٩٧٧) ص ٣٨.

عەبدولحەكیم عابدین، كەزاوای شێخ و سكرتێری گشتی كۆمەڵەیە.

نزیكترین پیاوەكانیشی:

- سالْح عەشماوی.
- عەبدولقادر عۆدە.
- حسێن كەمالەدین.
- محەمەد ئەلغەزالی.
- عەبدولعەزیز كامل.

ئەمانەش هەموویان ئەندامی مەكتەبی گشتیی ئیرشادن.

تەنانەت (سعد الدین الولیلی)یشیان هێنابوو، كەسكرتێری تایبەتی ئیمامی شەهیدو نهێنی هەڵگریو هاوڕێی خەباتی درێژی بوو، تائەویش بەهەمان شێوە ئیمزا بكات و لایەنگری خۆی بۆ فاروق دەرببڕێت!

بەدرێژایی گەشتەكەمان لەگەڵ ئەم لێكۆڵینەوەیەدا، چەندەها نیشانەی پرسیارو سەرسووڕمان لەلامان كەڵەكە بوو. ئەم نیشانەی سەرسوڕمانەی كۆتاییشیان لە سەرسوڕمان زیاتری پێویستەو .. پرسیاركردنی زیاتریشی پێویستە، سەبارەت بەڕاددەی بەئەمەكی ئەو ئیمزاكەرانە بۆ یادی شێخ و ئیمام و مورشیدو شەهیدەكەیان و .. سەبارەت بەراددەی ڕاستگۆیی ئەو سروودەبە ئەمەكانەی دایدەڕێژن بۆ شێخێك، كەلەبەر هەیوانەكانی كۆشكی بكوژەكەیدا یادكردنیان لەبیر كرد!

# ئیسلامی سیاسی

## لەتوندڕەوییەوە بۆ توندڕەویی زیاتر

((قوڕ بەسەر ئەو کەسەی باش شارەزای قەڵای بەرامبەرەکەی نییە لەناوەوە))

**(پەندێکی فیرعەونی)**

... پێش ئەوە پێکەوە بابەتەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە باسبکەین، با خوێنەر ڕێگەم بدات پێکەوە لەبەردەم کۆمەڵێك تێبینی و گریمانەدا ڕاوەستین، کەڕەنگە لێکۆڵینەوەکە تەسەلبکات و پێویست بێت بۆی و زەروریش بێت پێش دەستپێکردنی .. ئەم کۆمەڵە تێبینیەش دەبن بەدوو بەشەوە ..

یەکەمیان سەبارەت بەهەڵوێستی مارکسیزم لە ئایین .. دووەمیشیان سەبارەت بە هەندێك دەرهاویشتەی مێژووی و کۆمەلایەتی، کەلەوانەیە ڕاڤەیان ڕوونکردنەوەیەك، لەبابەت هەندێك دەرهاویشتەی ئەم لێکۆڵنەوەیەوە پێشکەش بکات.

یەکەم: سەبارەت بە هەڵوێستی مارکسیزم لەئایین.

- ڕەنگە پێویست بێت بەڕەتکردنەوەی ئەو بۆچوونە دەست پێبکەین کە دەڵێت، هزری ماددی بەزەرورەت مانای وەرگرتنی

هەڵوێستێکی دژبە ئایینە. یان ڕەت کردنەوەی بیرۆکەی دەوڵەتی ئایینی و، تێکەڵکردنی ئایین بەسیاسەت هەر لەبنچینەوە، واتای وەرگرتنی هەڵوێستێکی دژ بە ئایینە وەکو باوەڕێك..

- ئایین بەبۆچوونی مارکسیزم .. دیاردەیەکی بابەتییە، لەڕووی بوارەوە، سەر بە ((هۆشیاریی کۆمەڵایەتی))یە. بەشێوەیەکی سروشتیش، کارێکی گرانە مامەڵە لەگەڵ گەلێکدا بکرێت، هەرگەلێك، بێ ئەوەی پێکهێنەرەکانی هوشیاری کۆمەڵایەتی ئەو گەلەبزانرێت و بابەتیانە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

ئەنجلس دەڵێت ((ئایین لەواقیعدا بریتی‌یە لەڕەنگدانەوەی نامادديانەی چەند هێزێك لەئەقڵی خەڵکیدا کەلەژیانی ڕۆژانەیاندا زاڵە بەسەریاندا)).[١]

مارکسیش دەڵێت: ((ئایین لەلای زۆربەی خەڵکی، بریتیە لەتیۆری گشتی ئەم جیهانە، هەروەها کۆی زانیارییە ئینسکلۆپیدیەکانیشیانە، ئەو لۆژیکەشیانە کە فۆرمێکی میللی وەردەگرێت، بابەتی شانازیکردنی ڕۆحی و جێگەی جۆش و حەماسیشیانەو، هەروەها ئامرازی سزادانیشیانە، پرۆگرامی ئەخلاقیشیانە)).[٢]

---

[١] مارکس وانجلس – المؤلفات الکاملة – المجلد ٢٠– ص ٣٢٨.

[٢] مارکس – نقد فلسفة القانون عند هیجل.

ئەنجلسیش زۆر بە توندوتیژی ڕەخنە لەوانە دەگرێت کەبەڕووکەش مامەڵە لەگەڵ ئاییندا دەکەن، یان سووکایەتی بەکاریگەریەکەی دەکەن لەسەر جەماوەر، دەڵێت: ((دیاردەیەك بەدرێژایی ١٨٠٠ ساڵ بەسەر ئەقڵی مرۆڤایەتی پێشکەوتوودا زاڵبووبێتو، وای لەئیمپراتۆر قوستەنتین، کە هیواو ئاواتەکانی بێ سنوور بوون، کردبێت کەدەستلەملانێی مەسیحیەت بێتو لەسەر بنەمای ئەم ئایینە ئیمپراتۆریەتەکەی فراوان بکات. دیاردەیەکی ئاوا ناکرێت، وەکو تۆڕێکی ناسك یان چەند خەیاڵێك سەیری بکرێت کە جادووگەرەکان دووبارەی دەکەنەوە))[٣].

مارکسیش لەکتێبی خێزانی (پیرۆز)دا، بەتوندی هێرشی کردەسەر ئەو گەنجە هیگڵیانەی کەئایینیان لەسەنگەری دوژمندا دانابوو، دووپاتیشی دەکردەوە کەئەم هەڵوێستە، هەوڵێکە بۆ شاردنەوەی دوژمنە ڕاستەقینەکە .. کەچینایەتیە.

لەکتێبی ((ئایدۆلۆژیای ئەڵمانی))یشیاندا، مارکسو ئەنجلس گوتەکانی (برونوپاور)ی دژ بەئایین ئیدانە دەکەنو، دەڵێن: دوژمنەکانمان لێرەن لەسەر زەوی، پێویستیشە لێرە لە سەر زەوی ڕووبەڕوویان بینەوە،

---

[٣] انجلس مقال، برونوبارو المسيحية الاولى نقلا عن: ماركس، انجلس – حول الدين – المنشورات الاجتماعية – باريس بافرنسة – ص ١٨٢.

شیاویش نیه کەلەم ڕووبەڕووبونەوەیـ، ڕابکەین تا چەند دوژمنێك لەئاسمان دروست بکەین[٤].

ئەنجلس گوتارێکی هەیە بەناونیشانی ((بەشداریکردن لەمێژووی مەسیحیەتی یەکەم دا: مێژووی مەسیحیەتی یەکەم چەند خاڵێکی بەیەکگەیشتنی سەرنجڕاکێش لەگەڵ بزووتنەوەی کرێکاریی هاوچەرخدا دەخاتەڕوو. مەسیحیەت لەسەرەتایدا، بەوەی کەبزووتنەوەی چەوساوەکان بووە، لەبزووتنەوەی کرێکاران دەچوو. لەسەرەتادا وەکو ئاینێك بۆ کۆیلەو هەژارو بێبەش و ئەو گەلە کۆیلەکراوانەی ڕۆما چەوساندبوونیەوە سەری هەڵدا)).

مەسیحیەت و سۆشیالیزم لەوەدا بەیەك دەگەن کەهەردووکیان مژدەی ڕزگار بوون دەدەن لەکۆیلەیەتی و کلۆڵی.

مەسیحیەت ڕزگاربوون لەئاسماندا دادەنێت .. پاش مردن.

سۆشیالیزمیش لێرە لەسەر زەوی .. لەکاتی ژیاندا.

مەسیحیەتی یەکەم و سۆشیالیزم لەوەشدا لەیەك دەچن کەهەردووکیان تووشی ڕاوەدونان و .. چەوساندنەوە دەبن .. هەروەها لەتێڕوانینە ئینتەر ناسیۆنالیزمییەکەشیاندا))[٥].

---

[٤] ماركس، انجلس- الايدولوجية الالمانية- الترجمة الانجليزية- ص ٤٠٥.

[٥] ماركس وانجلس عن الدين - المرجع السابق. ص ١٨٥.

لەگوتارێکی دیکەشدا بەناونیشانی ((کتێبی زیندوبوونەوە))،ئەنجلس جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە (ئارنست رینان)ی بیرمەندی فەرەنسی سەبارەت بە مەسیحیەتی یەکەم گوتویەتی و دەڵێت: ((گەر ویستتان بۆچوونێکی ڕاست لەسەر ئەوە وەرگرن کە ئایا کۆمەڵە مەسیحیەکانی یەکەم چۆن بوون، ئەوا بەراوردیان مەکەن بەکۆمەڵە ئاینیەکانی ئێستا، بەڵکو بەراوردیانکەن بە لقە ناوخۆییەکانی دەوڵەتیی یەکەم)).

پاشان مارکسیزم وەکو ((هوشیارییەکی کۆمەڵایەتی)) سەیری ئایین دەکات، کە دەتوانێت لەسایەی بارو دۆخێکی دیاریکراوو بەچەند دەرهاویشتەیەکی دیاریکراودا ڕۆڵێکی ئیجابی بەبایەخ لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی مرۆڤدا دژی چەوساندنەوە دەبیینێت.

لینین دەڵێت: ((سەرهەڵدانی ناڕەزایی سیاسی لەبەرگی ئاییندا، دیاردەیەکە هەموو گەلێك لەقۆناغێکی دیاریکراوی گەشەسەندنیدا بەخۆیەوەی دەبیینێت))[٦]

ئەنجلسیش بەهەمان شێوە، لەقسەکانیدا ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە ئایین بەشێکە لەپێکهێنەری بنەڕەتی هۆشیاریی کۆمەڵایەتی و هەروەها لەهەندێك قۆناغدا، بەشێکە لەبزووتنەوەی کۆمەڵایەتیش، بەتایبەتی لەو

---

[٦] لينين المؤلفات الكاملة - المجلد ٤ ص ٢٢٨.

قۆناغــەدا کەدەکەوێتــە پێــش قۆناغــەکانی هۆشــیاریی چینایــەتی یەکلاکەرەوەوە..

.. ((ئایین لەناوەڕۆکدا، جۆرە ناڕەزامەندیەکی تێدایە، ئایین ناڵەو نرکەی چەوســاوەکانە، هــەروەها هــەوڵدەدات قەرەبۆیــەکی ئــایندەیی، لــەجیاتی جیهانی ئیستای تاڵو ناخۆش پێشکەش بکات، کەهێشتا مەرجو تواناکان کامڵ نەبوون، بۆ گۆڕینی بەشێوەیەکی شۆڕشگێڕانە. فکرە ئایینیەکانیش توانیویانــە ڕۆڵێکــی بەبایــەخ لەدروســتکردنی کەشــی فیکریــدا ببینــن، بــۆ ژمارەیــەك لەبزووتنــەوە کۆمەلآیەتییــەکانی بــەندەو کۆیلــەکانو گروپــەکانی تریش. ئەم بزوتنەوانەش گەرچی لەسیمادا هۆشیاریی ئایینی بوون، بەلآم لەناوەڕۆکە کۆمەلآیەتیەکەیاندا، شۆڕشگێڕی بوون. سیما ئایینیەکەشــیان لەڕاســتیدا، تەنــها ڕواڵــەتی دەرەکیــان دەنوێنێــت کــە پەیوەســتە بــەخودی ئاستی گەشەسەندنی کۆمەلآیەتییەوە)).[٧]

بەلآم مارکسیزم کاتێك جەخت لەسەر ئەوە دەکــات کــەئایین دەتوانێــت ڕۆڵێــك لــە بزووتنــەوەی گۆڕانــی کۆمەلآیــەتیدا ببینێــت، واتــا ڕۆڵێکــی سیاسییانە، کەلەهەمان کاتدا واش دەبینێت کەئەمە پەیوەستە بەئاستێکی دیــاریکراوەوە، لەگەشەســەندنی کۆمەلآیــەتیو پێشــکەوتنی هۆشــیاریی کۆمەلآیــەتی. بەشــێوەیەکی دەستنیشــان کراویــش، ئــەم ڕۆڵــە لەگــەڵ

---

[٧] مارکس وانجلس – المؤلفات الكاملة– المجلد ٧ – ص ٣٥٩.

گەشەسەندنی هوشیاری چینایەتیدا کەم دەکات و بگرە ناشمێنێت، ئەو هۆشیارییە چینایەتییەی کە ململانێکە دەگۆڕێت بۆ ململانێی نێوان کۆمەڵانێك کەتووشی چەوساندنەوەو سەرکوتکردن دەبن و پەنادەبەنە بەر ئایینێکی نوێی جیاواز لەئایینی باڵادەستەکان و دەیکەنە تەوەرەی خەبات و ڕزگاربوونیان، وە کۆمەڵانێکی تر کە لەڕووی چینایەتییەوە لەوانی دیکە جیاوازن و هەموویان سەر بە هەمان ئایینن..

بەڵکو لێرەدا مەسەلەکە وا لەباڵادەست و چەوسێنەرەوەکان دەکات کەبتوانن هەندێك لەپیاوە ئایینیەکان و دروشمە بریقەدارە ئایینیەکان، وەکو ئامرازێك بۆ دواخستنی ململانێ چینایەتیەکە بەکاربهێنن..

پاشانیش ئایین وەکو بڕوایەکی ئاسمانی هەندێك کەس دەتوانن لەماوەی ڕابوونی یەکەمدا، وەکو ئامرازێك بۆ ئازادبوون بەکاری بهێنن. لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك کەس دەتوانن وەکو ئامرازێك بۆ داپۆشین و بەردەوام بوونی ستەمیش بەکاری بهێنن..

لەم گۆشە نیگایەشەوە دەگوترێت، پەیوەندیداریی بەئایینەوە، وەکو کۆمەڵە ڕەفتارێکی سەر زەوی، بەشێکە لە ((هوشیاری کۆمەڵایەتی)). لەم بارەیەشەوە لینین دەڵێت ((خەڵکی لەمەیدانی سیاسەتدا قوربانییەکی ساویلکە بوون کەکەسانی دیکە فریویان داون، لە پێشتریشدا وابووەو هەتا هەتاشە هەروا دەمێننەوە. بەڵکو گەر فێری ئەوەش نەبن کەچۆن

بەرژەوەندییـــە چینایەتیـــەکان لـــەنێوان ،ێڕەکـــانی وتـــارو بەیاننامـــەو ئامۆژگـاریو بانگەشـــە ئـایینیو ئـەخلاقیو سیاسـیو کۆمەڵایەتیـەکاندا بخوێننەوە، ئەوا خۆشیان فریو دەدەن)).[٨]

ئێسـتا ڕەنگـە مەسـەلەکە ڕوون بووبێتـەوە .. ئـایین وەکـو بڕوایـەکی ئاسمانی، پەیوەندییەکی ناخیی مرۆڤە، پێویستە ڕێزیبگیرێتو پارێزگاریی لەماف پێوەپابەندبوونو ملکەچبوون بۆ ئـەركو پێداویسـتیەکانی بکرێـت. بـەڵام بـەکارهێنانی ئـایین وەکـو ئـامرازێك لـەململانێی کۆمەڵایـەتیدا، ئـەوا مارکسـیزم وای دەبینێـت کەلەقۆناغـەکانی یەکـەمی گەشەسـەندنی کۆمەڵایەتیدا، شتێکی شیاوو گونجاو بووەو بگرە شۆڕشگێڕیشبووە. بەڵام لەگـەڵ سـەرهەڵدانو گەڵاڵـەبوونی چینـە کۆمەڵایەتییـەکانو ڕاوەستانیشـیدا ڕووبەڕوو لە شەڕگەی ململانێی چینایەتیدا، ئەوا ئاخنینی ئایینی بۆناو ئەم شەڕگەیە، دەتوانێـت هزرەکـان لەدەرهاویشتە واقیعـیو زەمیینیـەکانی ئـەم ململانێیە لابدات، بەڵکو دەتوانێت گوتە ئایینیەکانیش بکاتە دروشمێك یان ئـامرازێك کەفـەرمانڕەواکانو هـەندێك لـەپیاوانی ئـایین، بـۆ تواندنـەوەی هوشیاریی کۆمەڵایـەتیو چینایـەتیی جـەماوەر و پاشـانیش بۆسـەپاندنی بڕێکی زیاتر لە چەوساندنەوەو ستەم بەسەریاندا بەکاریبهێنن.

---

[٨] لينين – المؤلفات الكاملة – المجلد ٢٣ – ص ٤٧.

لێرەشـەوە، ڕێـزی مارکسـیزم بـۆ ئـایین شـتێکەو، داواکردنـی ملکەچبوونیشـی ((ملکەچبوونی مارکسیزم)) بـۆ گوشـاری ئەوانـەی ئـایین لەجەنگی ململانێی چینایەتیدا بەکاردەهێنن شتێکی ترە.

ڕەنگـە پـاش ئـەم تێبینیانـەش بتوانـین بـەبێ سـڵکردن دەسـتبکەین بەهەڵسەنگاندنی هەڵوێستە ڕەخنەئامێزەکانمان، سەبارەت بە ((ئیسـلامی سیاسـی)). بەوەی کەئێمە وای بۆدەچـین، ئەمـە هەوڵێکـە بـۆ بـەکارهێنانی دەرهاویشـتە ئایینییـەکان، لـەپێناو چـەند بەرژەوەندییـەکی کۆمەڵایـەتی دیـاری کـراوداو دژی چـەند بەرژەوەندییـەکی کۆمەڵایـەتیی دیـاری کـراو. ئەمـەش پێچەوانـەی خـودی جەوهـەری ئیسـلامە کـە ئاراسـتەی ((هـەموو مرۆڤایەتی کراوە)).

دووەم: چـەند تێبینیـەکی سـەرەتایی سـەبارەت بەهـەندێك مەسـەلەی کۆمەڵایەتی و سیاسی:

- ئێمـە بەدەسـتەواژەی ئیسـلامی سیاسـی، مەبەسـتمان لەهەموو هەوڵێکە بۆ تێکهەڵکێشکردنی ئایین لـە مامەڵـە دنیاییـەکانی تاکـە کەسـەکان و کۆمەڵـەکاندا، ئەمـەش ئـەو مەسـەلەیەیە کـە ئیسـلام دادەبڕێت لەوەی شـتێکی ((گشـتگیر))ەو خـۆی نـادات لەوردەکارییەکان (جزئیـات)ی ژیـان. ئەمەشـە کەلـەچاخی نوێـدا لەبیرۆکـەی ((دەوڵـەتی ئایینی))دا بەرجەستە دەبێت.

- ڕەنگە بڕگەیەکیش کەلەدەمی شێخ حەسەن ئەلبەنناوە دەرچووبوو، ئەو ئەرکەمان بۆ بگەڕێنێتەوە کەلەم ڕووەوە خۆمان بەباسێکی دوورو درێژەوە ماندوو بکەین. پێدەچێت بۆئەوەش گوتبێتی خۆی لەداواکاریی ئەوانە بدزێتەوە کەبەپەرۆشەوە جەختیاندەکرد، بەرنامەیەکی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتی بۆ کۆمەڵەکەی دابڕێژێت..

حەسەن ئەلبەننا دەڵێت ((پێویستە لەسەرمان لەو سنوورەدا بوەستین کەخوداو پێغەمبەر دەستنیشانیان کردووە، بۆئەوەی خۆمان پەیوەست نەکەین بەشتێکەوە کەخودا پەیوەستی نەکردووین پێوەیو سەردەمەکەمان بەڕەنگی سەردەمێك نەگۆڕین کەلەگەڵیدا نەگونجێت. لەگەڵ ئەمەشدا ئیخوان بۆچوونی وایە کەئیسلام وەکو ئایینێکی گشتی، بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکانی ژیان هاتووە، لەوەش کامڵترو گشتگیرترە خۆی بدات لەوردەکارییەکانی ئەم ژیانە، بەتایبەتی لەو مەسەلانەدا کەبەتەواوەتی دونیایین))[٩]

دەڵێم ئەم بڕگەیە لەدەمی شێخ دەرچووە، چونکە بەبۆچوونی من ئەم بڕگەیە لەگەڵ هەموو ڕەوتی بانگەشەکەی شێخدا، کەداوای حکومەتێکی

[٩] حسن البنا – رسالة المؤتمر الخامس. اعيد نشرها فمن: حسن البنا – مجموعة الرسائل، مؤسسة الرسالة (بيروت) ص ٢٧٢.

ئاینی دەکرد، پێچەوانەیە، بگرە دژیشیەتی .. بۆیەش دووپاتی دەکەمەوە، بۆ ئەوەی هەندێك کەس واتێنەگەن کەمن قسە بەدەم شێخەوە هەڵدەبەستم و شتێك دەڵێم کە ئەو نەیگوتووە. بەڵام بەلای منەوە ئەم بڕگەیە بەسەو بگرە زیادیشە، بۆشیکردنەوەی بیرۆکەکەم سەبارەت بەڕەتکردنەوەی گوتەکانی (ئیسلامی سیاسی)، کە بەزەرورەت پێویستە لەسەری بایەخ بەوردەکارییەکانی ژیان بدات .. بەتایبەتیش لەو مەسەلانەدا کەبەتەواوەتی دونیاین..

- هەروەها ئەم لێکۆڵینەوەیە پشت بە پێویستی جیاکردنەوەی خودی پێکهێنەرەکانی هۆشیاریی ئایینی دەبەستێت. ئایینەکان، بەوەی کەپێکهێنەرێکی بنەڕەتیی و گرنگی هۆشیاریی جەماوەرن، بۆیە قەبارەی ئەو ڕۆڵەی کەلەژیانی تاکەکان و کۆمەڵگەکاندا دەیبینن، بەپێی چەند گۆڕراوێکی ئابووری و کۆمەلایەتی دەستنیشان دەکرێت. توخمی ئایین لەهەندێك کۆمەڵگەدا (بۆ نموونە وەك کۆمەڵگە ئەوروپییەکان) ڕۆڵێکی سنووردای هەیە، ئەمەش نەك لەبەرئەوەی شارستانیەتی خۆرئاوایی شارستانیەتێکی کافرە، ئەوەتا تا ئێستاش کەنیسەی ئەوروپی ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە. بەڵکو لەبەرچەند دەرهاویشتەیکی ئابووری و کۆمەلایەتیی دیاری کراو ..

- بۆ نموونە لەلوبنانیشدا پێچەوانەی ئەمە ڕاستە. چونکە لەئەنجامی چەند بارودۆخێکی سیاسیی دیاریکراودا، ئینتیمای چینایەتی تارادەیەکی گەورە کەمیکرد. لەهەمان کاتیشدا هەستو سۆزی ئایینیو تایەفەگەرێتی ئایینی زاڵبوو، تا لەوێ ببێتە تەوەرەی ئەو ژیانەی تێیدان. بەڵکو حەزی تایفەگەرێتی ئایینی، پۆل پۆل بوونێکبووە کە ڕەهەندێکی سیاسی گروپیو جوگرافی هەبوو.. ((جەنگەکانی نێوان دوو پۆلی موسوڵمانی شیعە، کەئەوانیش بریتین لەحیزبوڵلا و کۆمەڵی ئەمەل. هەروەها جەنگەکانی نێوان هێزە لوبنانیەکانو سوپای مەسیحی لوبنانی بەسەرکردایەتی میشێل عۆن، ئەمانیش دووپۆلی مەسیحی مارۆنین)).
- ناشکرێت بگوترێت لوبنانیەکان، لەناکاو بوونە ئایندارترین گەل.

چونکە گەر گەشەی بزووتنەوە سیاسییە سیما ئایینیەکان وەکو پێودانگەیەك وەرگرین، بۆگەشەی ئاراستە ئایینیەکان بەگشتی، ئەوا هەڵەیەکی زۆر گەورەمان کردووەو نموونەکەی لوبنانیشمان، کەنموونەیەکی تاڵو بگرە قێزەونیشە، بەوەی کە تایەفەگەرێتی ئایینی مرۆڤ دەکاتە چەند ئامرازێکی کوشتاری بێ دڵو بەزەییو هەستی مرۆیی یان نیشتمانی یان تەنانەت ئایینیش، دەڵێم نموونەکەی لوبنانیشمان بەو نموونەیە لەقەڵەم

داوە کە ئومێدی دەکراو ئاواتی دەخوازرا .. ئەمەش قسەیەکە کەس پێی قبوڵ نییە..

لەمەوە دەگەینە گوتەیەك کەلەمەودوا ئەم لێکۆڵینەوەیە پێوەی پابەند دەبێت .. ئەویش بریتییە لەپێویستی جیاوازیکردن، لەنێوان توخمی باوەڕ لەئاییندار، بەرزیوونەوە یان نزمبووەوەی چالاکی کۆمەڵە ئیسلامیە سیاسییەکان. چونکە ئەمانە دوو توخمن پێکەوە پەیوەستنین و بگرە لەوانەشە بەپێی چەند پێشکەوتنێکی کۆمەلایەتی دیاریکراو یەکێکیان گەشەبکات و هەر لەهەمان کاتیشدا ئەوی دیکەیان بپوکێتەوە.

- لەم گۆشەیەوە دەتوانین بڕیار بدەین کە کۆمەڵەکانی ئیسلامی سیاسی، ئەوانەی هەموویان ئاڕاستەیەکی توندڕەویان هەیە، بەهیچ شێوەیەك مانای ئەوە ناگەیەنێت کە ئەمانە یەکتۆز باوەڕێکی بەهێزتریان لەکەسانی دیکە هەبێت، چونکە توندڕەویی ئاییني شتێکە جیاوازە لەئاینداری، بەشێوەیەکی دسەتنیشان کراویش بریتی نیە لە بڕێك ئاینداریی زیاتر، بەڵکو هەڵوێستێکی سیاسی کۆمەلایەتی چینایەتی دیاریکراوە.
- دەشتوانین درێژەی پێ بدەین و بڵێین دەرهاویشتەکانی ئاڕاستە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکانی کۆمەلانی ئیسلامی سیاسی، بەهەموو جۆرەکانیانەوە (گەرچی هەندێکیشیان بەرگێکی زیاتر

میانڕەویەان زیاتر توندڕەو بپۆشن)، هەموو بەگشتی، کۆمەڵانێکی سیاسین کەڕوانگە چینایەتیەکەی ململانێکە ڕەتدەکەنەوە .. مرۆڤەکانیش لەسەر بنەمای ئەوە دابەش ناکەن کەئایا پلەوپایەیان لەکرداری بەرهەمهێناندا چییە (سەرمایەدارو کرێکار، خاوەن زەوی و کرێ گرتە)، بەڵکو لەڕوانگەیەکی فیکرەییەوە دابەشیاندەکەن، کەلەچوارچێوەی ملکەچیی کەسەکە بۆفیکری کۆمەڵەکە یان بانگەشەکەی دەرناچێت.

- ئەمانەش هەموویان لەواقیعی کرداریدا، دەرهاویشتە چینایەتیەکان ڕەتدەکەنەوە، ئەو دەرهاویشتانەی کەدەتوانن چینی کرێگرتە ئازاد بکەن، لە چەوساندنەوەی چینە خاوەن موڵکەکان (زەوی بۆ ئەوکەسەی کەدەیکێڵێت – موڵکداریی گشتی بۆ هۆکارەکانی بەرهەمهێنان ...هتد).

ئەمانەش هەموویان لەڕاستیدا پشتی شێوازی باوی بەرهەمهێنانیان گرتووەو هیچ زیانێکیشیان لەبەردەوام بوونیدا نەبینیوە، بەمەرجێك هەموو سەرمایەدارو کرێکارەکان پابەندبوون بە ڕێنماییەکانی کۆمەڵەکەوە، یان ئەوەی کەکۆمەڵەکە بەڕێنماییەکانی ئایینی دەزانێت...

کەواتە بەکورتی ئێمە لەبەردەم بانگەشەیەکی سەرمایەداریداین، بەڵام بانگەشەکە دزداشەیەکی سپی لەبەردایەو عەمامەیەکی بەسەرەوەیەو

ڕیشـــێکی بەرداوەتـــەوە .. ئـــەی لەســـەرەتاوە نـــەمانگوت ئێمـــە، ئـــەوە ڕەتدەکەینـــەوە کـــەئایین تێکـــەڵ بـــەبواری پەیوەندییـــە کۆمەڵایەتیـــەکان و ململانێی کۆمەڵایەتی بکرێت.

ئایا پێویست بەوە دەکات گوتەکەی لینین دووبـارە بکەینـەوە، ئـەوەی کەپێشتر ئامازەمـان پێکـرد ((خـەڵکی لەمـەیدانی سیاسـەتدا، قوربانییـەکی ساویلکەبوون کەکەسانی دیکە فریویان داون، لەپیشتریشـدا وابووەو هـەتا هەتاشە هەروا دەمێننەوە. گەر فێری ئەوەش نەبن چۆن بەرژەوەندییەکان، لەنێوان دێڕەکانی وتارو بەیاننامەو بانگەشە ئایینی و ... دا نەسەلمێنن)).

- بـەم شـێوەیە، لەمامەڵـەکردنماندا لەگـەڵ لایەنـە ئایینیـە توندڕەوەکەدا، هیچ ئاییندارییەکی زیاتریان تێدا نابینین. بەڵکو ئەمانە خـاوەنی هەڵوێسـتێکی سیاســی و کۆمەڵایــەتی و چینایــەتین، بــەڵام هەڵوێســتێك کەبەحاڵــەتێك لــەئاخنینی رۆحــی و فیکــری بــارکراوە، خاوەنەکــەی دەخاتــە قەفــەزی چــەند دەقێکــەوە کەزۆربــە وردی هەڵبژێردراون و بەسەر کەسەکەیدا دەسەپێنن، لەپێناوی دەقەکەدا یان ئەوانەدا کەجڵەوی دەقەکەیان بەدەستەوەیە، گوێڕایەڵانە بەحەزی خۆی دەست لەویست و فیکرو هەڵوێستە تایبەتیەکانی خۆی بەردات.
- بەیعــەتدان بەئــەمیر پێویســتە ((هــەچ کەســێك بمرێــت و بەیعەیــەك لەگــەردنیدا نــەبێت، مردنێکــی جاهلییانــە مــردووە))، بــەڵام

هەندێك كەس بەیعە دەكەنە توخمێك بۆ حوكم گرتنە دەست و بەدەسەلات توندكردن.

حەسەن ئەلبەننا دەڵێت ((گوێڕایەڵی (كە یەكێكە لەڕوكنەكانی بانگەشەكە) بریتییە لەملكەچبوون بۆ فرمان و دەست بەجێ بەئەنجام گەیاندنی، لەخۆشی و ناخۆشی و قایلی و ناقایلیدا .. سیستمی بانگەشەكەش لەلایەنە ڕوحیەكەوە سۆفیگەریەكی پوختەو، لەلایەنە كرداریەكەشەوە سەربازییەكی پوختە، دروشمیشمان هەمیشە بریتییە لەفرمان و گوێڕایەڵی بەبێ دوو دڵی و پاشگەز بوونەوەو گومان و سڵكردن))[10].

لیرەشدا پێویستە بانگەشەكە (هەر بانگەشەیەكی لەم جۆرە) قەرەبۆی ئەندامەكە بداتەوە، سەبارەت بەو ئیرادەیەی لەدەستی داوە، بۆیە ئەوەی پێدەبەخشێت كەلەفەرهەنگی ئەم كۆمەڵانەدا پێی دەوترێت ((پایە بڵند بوون بەئیمان))، لەبەرئەوە ئەندامەكە تەنها بریتی‌نیە لەكەسێكی ئیرادە داگیركراو، ئاسۆ تەنگ، كەللەڕەق، بێ توانا و بگرە ڕەتكەرەوەش، بۆ بەكارهێنانی عەقڵی لەپشكنینی فیكرو ڕەفتارو چالاكییەكانی ئەمیر یان كۆمەڵەكەدا. بەڵكو ئەو لەهەموو ئەو كەسانە باشترە كەلە دەرەوەی كۆمەڵەكەن، ئەم بەئیمانەكەی پایەی لەوان بڵندترە، ئەم لەخوانزیكترەو ئەیمانتریشەو ..

---

[10] حسن البنا المرجع السابق – ص ٢٠.

هتد. ڕەنگە ئەمەش ئەو حەزە دوژمنکارییە ڕاڤە بکات کەئەم ئەندامانە بەرامبەر کەسانی دیکەی دەرەوەی کۆمەڵەکە هەیانە، چونکە ئەم لەوان باشترەو ئەوانیش لەم پایە نزمترن، ئەم لەوان بەئیمانترەو ئەوانیش لەباشترین حاڵەتدا کەم ئیمانن، واتا گەر ڕێك بەم هێڵەدا بڕۆین ئەوان کافرن

..

هەڵوێستە توندڕەوەکەش، هەڵوێستێکە پشت بە دەقێك دەبەستێت کەپێشتر هەڵبژێردراوە. پابەندبوونەکەش سەرلەبەر بەدەقەکەوەیە. گەر دەقەکەش پێچەوانە وەستا لەگەڵ واقیعدا، ئەوا واقیعەکە هەڵەیەو دەقەکە ڕاستە، چونکە دەقەکە پێویستە ڕاست بێت .. بێ ئەوەی هیچ بایەخی ئەوە بزانرێت کە دەقەکە بەواقیعەکەوە ببەسترێتەوە .. بێ ئەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ڕەچاو بکرێت کەدەڵێت ((خۆتان لەکاروباری دونیاکەتان باشتر دەزانن)). بەم شێوەیە هەڵوێستە توندڕەوەکە حاڵەتێك لەدسەوسانی دەنوێنێت، سەبارەت بەمامەڵەکردن لەگەڵ واقیعدا. چونکە دەقەکە خۆی حەقیقەتی سەرەتاو کۆتاییە. ئەگەر دەقەکەش دەسەوسان بێت و نەتوانێت لەگەڵ واقیع و دەرهاویشتە نوێیەکانیدا مامەڵە بکات، ئەوا تۆش دەسەوسان دەبیت، سەبارەت بە گێڕانی جەنگەکانی واقیع و بەدەست هێنانی هۆکارەکانی گۆڕینی. پاشانیش هەڵوێستە توندڕەوەکە پەیوەندییە لەدەستچوەکەی نێوان واقیع و دەقەکە بە ((چەند خەونێك))ی کۆن کامڵ

دەكات، بەو ئومێدەی بگەڕێتەوە بۆلای و ڕزگاریبێت لەوەی بەرقەرارە ..
بەتایبەتی گەر نەتوانێت لەگەڵیدا بگونجێت و نەتوانێت ببێتە خاوەنی
ئامرازەكانی ململانێ كردن لەدژی .. حاڵەتی هەڵگەڕانەوە بۆ ڕابردوو و
بانگەواز كردن بۆ گەڕانەوە بۆلای، وەك خۆی كەلەپێشتردا چۆن بووە
((پوختەی هەموو ئەنجامەكانی نەتوانینی مامەڵە كردنە لەگەڵ واقیعدا ..)).

شوكری مستەفاش – تەها ئەلموستەفا شوكری ئەمیری ئاخیر زەمان
(ئەمناوە خۆی لەخۆی نابوو)، هۆكارەكانی ڕاگەیاندنیش ناویان نابوو
ئەمیری كۆمەڵی تەكفیرو هیجرە – ئەم گوتەیە ڕووندەكاتەوەو دەڵێت
((مەرجی باڵادەست بوونی موسوڵمانان و بەخەلیفەبوونیان و بنیاتنانی
دەوڵەتەكەیان و دەرخستنی ئایینەكەیان بریتییە لەئیمان و كاری چاكە. ئەم
مەرجە ناكرێت لەزەمانێكەوە بۆ زەمانێكی تر، یاخود لەشوێنێكەوە بۆ
شوێنێكی تر بگۆڕدرێت، ئەو ئیمان و كارە چاكەیەش كەپێغەمبەر (د.خ) و
هاوڕێكانی فەرمانیان پێكردووە، ناكرێت ببێتە ئیمان و كاری چاكەیەكی تر
لەئاخر زەماندا. ناكرێت)).

پاشانیش ئەمیری ئاخرزەمان، بەرەو فیكرەیەكی دیاری كراو ڕێنماییمان
دەكات، ((پێویستە ڕێبازەكەی پێغەمبەرو هاوەڵانی، بست بەبست و هەنگاو
بەهەنگاو پەیڕەویی بكرێت، چونكە خوای مەزن و پەروەردگار بوونەوەران
دروستدەكات و پاشان زیندوویان دەكاتەوە بەشێوەیەك كەنەدەگۆڕدرێن و

نەتێکدەچن و نەکەم و نەزیاد دەکەن - ئیسلامیش چۆن دەستی پێکردووە، هەر بەوشێوەیەش دەگێڕدرێتەوە))[١١].

.. ئالێرەشەوە گوتەی ڕەتکردنەوەی دەسکەوتەکانی شارستانیەت سەرهەڵدەدات، ئەو دەسکەوتانەی کەلەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدییەکانەوە تا ئەمڕۆ درێژەی هەیە. بەهەمان شێوە گوتەی پێویستی بازهەڵدانیش بەرەو دواوە، بۆئەوەی ((ئیسلام چۆن دەستیپێکردووە .. هەرواش بگەڕێتەوە)).

لەڕاستیشدا هیچ شتێکی نوێ لەم بیرۆکەیەدا نییە. چونکە لەکاتێکدا چەند هێزێکی کۆمەڵایەتی هەبن، واقیعی کۆمەڵایەتی بەرقەرار ڕەتبکەنەوەو لەهەمان کاتیشدا نەتوانن لەگەڵیدا بگونجێن، هیچ دەرهاویشتەیەکی ((چینایەتی))شیان نەبێت، بۆئەوەی لەڕوانگەیەکی چینایەتییەوە بیگۆڕن. ئەوا دەگەڕێنەوە بۆ دواوە، بۆئەوەی چەند ((یادەوەری)) ونموونەو ((ئاوات))ێك وەرگرن کەلە ڕابردوودا ڕوویان داوە، تا بانگیان بکەن بۆ ئەمڕۆ، یاخود با وردتر بڵێین ئەمڕۆ لەهەوڵێکدا کۆدەکەنەوە، تا پێی بگەڕێنەوە بۆ ڕابردوو.

لەوانەشە ئەمە لەزیاتر لەوڵاتێکداو لەزیاتر لەحاڵەتێك لەحاڵەتەکانی قەیرانی شۆڕشگێرییشدا ڕووی دابێت و بەزیاتر.. لەشێوەیەکیش.

---

[١١] شكري مصطفى - التوسمات - مخطوط.

ماركس سەبارەت بەحاڵەتیكی لەم شێوەیە دەڵێت ((لەماوەی قەیرانە شۆڕشگێڕییەكاندا، دەیانبینیت لەترس و تەنگانەدا پەنادەبەنەبەر ئامادەكردنی دەرهاویشتەكانی ڕابردوو، بۆئەوەی خزمەت بەمەبەستەكانیان بكەن. هەر لەم دەرهاویشتانەشەوە ناو و، جل و بەرگ و، دروشمەكانی شەڕیان وەردەگرن، بۆئەوەی لەسەر شانۆی مێژوو شانۆگەرییەكی نوێ بەم بەرگانەوە بگێڕن، كەبەشكۆمەندیی پێشینەكان و بەزمانێكی كۆنی خوازراو ڕەنگكراوە))[۱۲].

... دیقەتی ئەم بڕگەیە بدەن، ئایا بەشێوەیەكی زۆر سەرسوڕهێنەر لەگەڵ ئیسلامە سیاسییە توندڕەوەكانی ئەمڕۆدا ناگونجێت .. ناوەكان لەڕابردووەوە وەردەگرن، بۆ نموونە: سەركردەكانی كۆمەڵی موسوڵمانان (تەكفیر و هیجرە) چەند ناوێكی تازەیان وەرگرتبوو، شوكری موستەفا (ئەبوسەعد)، ماهیر بەكری (ئەبوعەبدوڵلا)، ئەنوەر مەئمون سەقر (ئەبو مسعەب)، محەمەد لئەمین عەبدولفەتاح (ئەبو لغەوس)[۱۳]. هەروەها جل و بەرگەكانیش شێوەیەكی نوێیان وەرگرتبوو، یان با ڕاستتر بڵێین شێوەیەكی كۆنیان وەرگرتبوو. هەروەها دروشمەكانیش .. هەموو شتەكانی دیكەش.

---

(۱۲) ماركس، انجلس - المؤلفات الكاملة - المجلد ۸ - ص ۱۱۹.

(۱۳) ملف القضية رقم (٦) حصر أمن الدولة - عسكرية عليا - اسنة ۱۹۷۷.

ئەمە حاڵەتێکە لەگەڕانەوەی دەروونیی بۆ ڕابردوو، دەربڕین لەحاڵەتێك لەدەسەوسانیدەکات، سەبارەت بە گونجان لەگەڵ واقیعدا، بەهۆی جیاوازبوونی واقیعەکە لەگەڵ دەقەکەدا.

- بەهۆی ئەمەشەوە تێبینیەکی دیکە دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیەکە ئەم کۆمەڵانە، هیچ بۆچوونێکی دیاریکراویان لەسەر ئاینده نییە، ئەمان کاتێك ناوو دروشمو بەرگو بۆچوونو کاروبارە کۆنەکان دەگێڕنەوە، بۆچوونیان وایە ئەوسیستمە ئابووریو کۆمەڵایەتییەی کەپراکتیزە دەکرێت (لەکاتێکدا کە ئەمان دەسەڵات دەگرنە دەست)، هەر هەمان ئەو سیستمەیەکە لەسەردەمی پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدینەکاندا، پراکتیزە کراوە. ئەمانیش خۆیان ماندوو ناکەن، بەخستنەڕووی وردەکارییەکانیەوە، چونکە وردەکاریەکان ڕەنگە پراکتیزە کردنیان لەئەمڕۆدا نەگونجێت (ئەمەش زۆر ئاساییە). هەروەها ئەمانە لەزۆربەی کاتیشدا، خاوەنی هیچ دیدێکی ئاشکرانین، سەبارەت بەوەی کەلەو زەمانەدا ڕوویداوە، ئەمەش یان بەهۆی کەمی زانیارییەوە یان بەهۆی جیاوازیو لێکدژیی گێڕانەوەی سەرگوزەشتەکانەوە .. لێرەدا سەرەڕای داواکاریی توندیش، بۆ پراکتیزە کردنی وشە بەوشەی شەریعەتو .. گەڕانەوەش بۆ ڕابردوو بەو شێوەیەی موستەفا شوکری دەیگوت ((بست بە بستو هەنگاو بەهەنگاو))، خۆمان لەبەردەم دەقێکی گشتیدا دەبینین

.. کەبەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا وردەکارییەکان، یان تەنانەت شێوە گشتیەکەی پرۆگرامی ئەو دەوڵەتە دیاریناکات کەداوای دەکەن هەروەها ئەو سیستمەش کەبانگەشەی بۆ دەکەن، پاشانیش ئێمە خۆمان لەبەردەم، شتێکدا دەبینین کە دەتوانرێت پێی بگوترێت ((ئیسلامی قوتو))، چونکە ئەوان وایبۆ دەچن تەنها دەسەڵاتگرتنەدەست خۆی لەخۆیدا هەمووشتێکەو کاسێتێکی ڤیدیۆیان هەیە هەموو ئەو شتانەی تیدایە کە پێویستە ڕووبدات و پێویستە ببێت .. تەنها کاسێتەکە دەخەنە ئامێرەکەوەو ئیتر ڕەوڕەوەی دەوڵەت بەپێی بۆچوونی ئەوان دەچێت بەڕێوە ..

- تێبینیەکی دیکەش هەیە سەبارەت بە پێکهاتەی ڕۆشنبیریی میسری. خوێندنی میسری بەسێ تەوەرەی بنەڕەتیدا تێپەڕدەبێت:

- خوێندنی حکومی (ئەمیش هەندێکی ئایینیە، زۆربەشی مەدەنیە)
- خوێندنی بیانی (ئەمیش هەندێکی ئاییني مەسیحیە، زۆربەشی مەدەنیە) لە هەندێك حاڵەتیشدا، سروشتێکی خۆرئاوایی پوختی هەیە ...

- خوێندنی ئەزهەری (ئەمیش زۆربەی ئایینیە، هەندێکیشی مەدەنیە). بێ گومان ئەم چەندبوونی تەوەرەی خوێندنانەش، جۆرێک بشێوی لە پێکهاتەی فیکری و ڕۆشنبیریی خوێندەوارە میسریەکاندا دروستدەکات. گەر تێبینی ئەوەش بکەین کە خوێندن لەهەرسێ تەوەرەکەدا، لەبنەڕەتەوە پشت بە فێرکردن دەبەستێت، بێ ئەوەی بانگەواز بۆ بەکارهێنانی هزر یان چالاککردنی عەقڵبکات، ئەمەش جگە لەلێکدژی نێوان پێکهێنەرەکانی دەستەی خوێندەواران ئەوا ئەو هزرە توندڕەوەی کەلەبنەڕەتەوە بەفێرکردنی دەقاودەقی دروستبووە، دەتوانێت لەنێوان ئەم دەستەیەدا دەسەلاتێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە. ئەمەش بەوەی هەمووان وا فێربوون کەهەمیشە زانیاری لەسەرەوە بێتەخوارەوە.. مامۆستایانی پۆلبن یان ئەمیری کۆمەڵ .. هەردووك وەکیەکن.

ڕەنگە ئەمەش بلاوبوونەوەی دیاردەی توندڕەویی ئایینی نێوان ڕۆشنبیران و پیشەگەران ڕاڤە بکات.

- گەرچی شۆڕشی تەمووزیش توانی یاساکانی چاکسازیی کشتوکاڵی گەورە خاوەن زەویەکان وەکو دەستەیەکی کۆمەلایەتی پاکتاو بکاتو، تەلارەکانی کەرتە گشتیەکانیشی هێنایەکایەوە. بەلام دوو گروپی کۆمەلایەتیشی خوڵقاند کەهەندێك جیاوازییان هەبوو،

ئەوانیش جووتیارەکانی چاکسازیی کۆمەڵایەتیی و کرێکارەکانی کەرتە گشتیەکان بوون. بێ گومانیش ئاستی بژێوی ئەم دوو گروپە، لەساڵەکانی سەرەتای دروست بوونیاندا، کەمێك باش ببوو. بەوەی خوێندنی خۆڕایی بەهەموو قۆناغەکانیەوە، بواری بۆ ئەم دوو گروپە ڕەخساند کە منداڵەکانیان بنێرن بۆ زانکۆ، تا پاش چەند ساڵێك ببنە دەرچووی زانکۆکان ..

- بەڵام ئاواتەکانی شۆڕشی تەمموز زۆر درێژەی نەکێشاو، چەند دەستەیەکی مشەخۆرو دەرامەت گەورەش، لەناوەڕاستی شەستەکان و دواتریشدا بەپەلە پێگەیشتن. بۆیە زانکۆ بووە جێگای چەند لێکدژیەکی چینایەتی فراوان، چونکە ئەو منداڵی جوتیارو کرێکارانەی کەتەنانەت کرێی هاتوچۆکردنیشیان پێ نەبوو، لەگەڵ کچان و کوڕانی ئەرستۆکراتیە نوێیەکەی میسردا، لەیەك پۆلدا دادەنیشتن، ئەوانیش بەو هەموو لوت بەرزی و دەوڵەمەندییە زۆرە قوشقی کەرەوە ..

لەکاتێکیشدا کەبەهۆی سەرنەکەوتنی یەکێتی ئیشتراکیەوە لەهەرسکردنی ڕەوتی ڕووداوەکاندا، بزووتنەوەی چەپڕەوی و ململانێی چینایەتی لاواز بوو. بەبێ هیچ هوشیاریەکی چینایەتی، تۆوی لەواقیع یاخیبوون سەری هەڵدا .. بەمەش توانرا گەنجەکان فێری گوتەکانی

گەڕانەوە بۆ ڕابردوو بکرێن، کەپڕە لەیەکسانی تەواوەتی و خۆشگوزەرانیی ڕەها.

- لەگەڵ ڕووداوەکانی زانکۆ لەساڵی ١٩٧٣دا، کەچەپ هێزەخەباتگێڕیەکەی خۆی بۆ گەڕابۆوەو زۆربە ئاشکرایی لەزانکۆکاندا بوونی هەبوو، ڕژێم هەستی بەپێویستیبوونی هێزێککرد کە لەزانکۆدا ململانێی چەپەکان بکات و فشاری لەسەریان هەبێت، ئەمانیش بریتی بوون لەکۆمەڵە ئاینیەکان .. پێویستیشە ئامارژە بەوە بکەین کەچالاکییە چەپڕەوییەکانی هەندێك چەپی مارکسی و ناسری زیاد لەپێویست کۆمەڵی قوتابیانیان بارگران کردبوو .. دەرەنجامەکەشی بریتی بوو لە گەشەکردنی ئەو تەوژمی ئیسلامە سیاسییەی کەپشتی بەحکومەت و یارمەتی و پارێزگاریەکانی بەستبوو ..
- لەگەڵ سەخت بوونی قەیرانە ئابووری و کۆمەلایەتیەکەشداو لەگەڵ زۆربوونی کۆچ کرندیشدا بۆ ولاتە خاوەن نەوتەکان، کەزۆربەی ئەم ولاتانە موسوڵمانن و واقیعێکی کۆمەلایەتی پارێزگارانەیان هەیە. ئەوانەی کۆچیان کردووە بۆ ئەو ولاتانە، شێوازی ژیانە پارێزگارانەکەی ئەویَ زۆرکاریان تێدەکات، بەڵکو لەوانەیە کاتێك دەگەڕێنەوە، ئەو قەناعەتە لایان دروست ببێت، کەبەستەرێك لەنێوان ئەو جۆرە ژیانەداو لەنێوان دەوڵەمەندی و خشگوزەرانی و چارەسەری

کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا هەیە .. ئەم بارە دەروونییە هەر لەمێشکی کەسەکەدا دەمێنێتەوەو سەرلەنوێ بیری ئەو ڕۆژانە دەکات کەکۆچی کردبوو بۆ ئەو وڵاتانە، ڕۆژانی کرێی زۆرو دەرامەتی باش و ژیانی تێروتەسەل ..

- هەروەها ئێمە لەجیهانێکدا دەژین کەسەرمایەداری تێیدا تووشی تەنگژەو کۆسپ و بێکاری و هەڵاوسان دەبێت، هەروەها وڵاتە سۆشیالیستییەکانیش تێیدا توشی تەنگژەو قەیران و خنکاندەبن (پۆڵەندا – مەجەر – ئەڵمانیای دیموکراسی – چیکۆسلۆفاکیا ... هتد) لێرەشەوە ئەو گوتەیەی داوای ڕووخاندنی بیرۆکەی چینایەتی و سیستمە کۆمەڵایەتییە چینایەتییەکان دەکات سەرهەڵدانی ئاسان دەبێت، بەوپێیەی کەهیچ کامیان کێشەکەیان بۆ چارەسەر نەکرا. بەهۆی ئەمەشەوە بانگەشەکردن بۆ دەروازە ئیسلامیەکە دێتە کایەوە.

پێویستیشە ئەوە بخەینەوە ڕوو کە دروست بوونی یەکەمین کۆمەڵە نوێیەکانی ئیسلامی سیاسیی (ئیخوان موسلیمین) لەساڵی (١٩٢٨)دا بوو، ئەوکاتەی قەیرانی ئابووری و سیستمی سەرمایەداری بەتین ببوو، ئەزموونە سۆشیالیستییە ساواکەش تووشی کۆسپ و تەگەرەوە بوو، لەسەرئاستی ناوخۆیش دارمانی ئەزموونە ناسرییەکەو پەك کەوتنی لەبەردەوام بوون و بگرە لەدۆزینەوەی دەروازەیەکی دەربازبوونی ڕاستەقینەش بۆ کۆمەڵگە،

کۆتایی هاتنیشی بەجۆرێك لەبێهودەی سیاسیو ئابووری کۆمەڵایەتی، بێگومان بواری بۆئەوە ڕەخساند پەنا بۆ ئەزموونێکی نوێ ببرێت، کەئەویش ((ئیسلامگەری))یە، ئەمەش بەوەی کەسەرمایەداری (پێش شۆڕشی تەمموز) شکستی بەدەست هێناو ئەوەش کەناونرابوو سۆشیالیزم بەهەمان شێوە هەرشکستی بەدەست هێنا ..

- هەروەها هاتنە ناوەوەی مشەخۆرانو گەندەڵیو گەندەڵکردنو زەوتکردنی بژێویی خەڵکیش، ئەمانەش هەموویان دەبنەهۆی دروست بوونی خۆشگوزەرانیەکی زیادەڕۆکە لە ڕووی خواردنو پۆشاكو ڕەفتارکردنەوە، ڕوو دەکاتە لاساییکردنەوەی کۆمەڵگە خۆرئاواییەکان .. پاشانو لەسایەی کەمی هۆشیاریی چینایەتیشەوە، پێکەوە گرێدانی دەوڵەمەندیی بێ سنوورو ڕێچکەی خۆرئاوایی، کەڕەنگە جیاواز بێت لەگەڵ نەریتە کۆمەڵایەتیەکاندا، دەبێتە شتێکی ئاسان .. پاشانیش ئەو هەستە گەشەدەکات کە پێویستە ئەم دیاردە دەرەکییە (بەرەڵڵایی ئەخلاقیو کۆمەڵایەتی)بەدیاردەیەکی دەرەکیی تر (توندگرتنی ئایینیو بانگەوازکردن بۆ دەوڵەتێکی ئیسلامی) ڕێگریی لێبکرێت.

- هەروەها تایبەتمەندێتی ئیسلامیش لەمیسردا، هەر ڕۆڵی هەیە. ئەزهەر بۆماوەیەکی دوورودرێژ (و بەهۆی پێنەگەیشتنی

پێکهێنەرە کۆمەلایەتیەکانیشەوە وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد) چەقی خەباتی گەلی میسربوو دژی نەیارەکانی .. زاناکانیشی زیاتر لەجارێك وەکو بەرگریکەرێك لەمافەکانی میسرو گەلەکەی، هاتنە پێشەوە. لەگەڵ گەشەکردنی جیاوازیی چینایەتیشدا، ئەم ڕۆڵە دەستیکرد بە کەمبوون، ئەمەش شتێکی زۆر سروشتیە، بەلام هەندێك لەبیرمەندو نووسەرەکانی تەوژمی چەپڕەویی، لەهەوڵدانیشیاندا بۆ ڕاکێشانی کەسانی ئاییندار، بۆ ناو ڕیزی گوتەکانیان، کەوتنەوە دووبارە کردنەوەی ئەم ڕووداوانە، نەك بەوپێیەی ئەمانە ڕووداوێکن، لەبارودۆخێکی دیاریکراودا ڕوویان داوە، بەڵکو بەوپێیەی دیاردەیەکن لەوانەیە بەردەوام بن و دووبارە ببنەوە. ئەم هەولانەش هەندێك جار لەچارەسەرکردنیاندا زیادەڕۆیی دەکرێت، کەلەدەرەنجامدا هانی کۆمەلانی ئیسلامی سیاسییان داوە، تا ئەم گوتانە بەکاربەرن و جەخت بکەن کەئیسلام تەنها خۆی چارەسەرە .. لەپێشتریشدا وابووەو .. ئێستاش هەر وایە.

- گوتە سیاسی و کۆمەلایەتیەکانیش، کاتێك بەرگی ئایینی دەپۆشن چ بەلای جەماوەرەوە یان تەنانەت بەلای فەرمانڕەواکانیشەوە شورایەکی تایبەتی دەستگیر دەبێت هەروەها لەسایەی بارودۆخێکی سیاسی و کۆمەلایەتیی دیاریکراویشدا، کەپێم وابێت کەپێشتر ئاماژەمان بەدەرهاویشتەکانیکرد، دەکرێت بازنەی کارگەرێتیەکەی

فراوانبێـت،ئەمــەش پــاڵ بەهــەندێك كەســەوە دەنێــت،. پــەیوەندیی پێوەبكات، تا لەگۆڕەپانی ململانێ سیاسی زیانبارو ندوتیژدا خۆیانی پـێ بەهێزبكـەن.. (باڵــە ئیسـلامیەكەی حـیزب ئەلعەمـەل- حـیزب الاحرام)ئەوەش ئەو مەسەلەیە كەقەبارەی تەوژمی ئیسلامی سیاسی، لەقــەبارەی ڕاسـتەقینەی خـۆی گـەورەتر نیشـاندەدات. دوا تێبینیـە سەرەتاییەكانیش بریتییە لەڕێچكەی تایبەتی ئەندامانی كۆمەڵەكانی ئیسلامی سیاسی. چونكە كاتێك ئەم ئەندامـە لـەڕووی بـەرگ‌وڕیش‌و ناوو ڕەفتاریـەوە، پەنادەباتـە بەر ڕابردوو، ئەوا ئەم شێوازە سـەرەڕای سەیرو سەمەرەییەكەیشی، جۆرە ڕێزێك دەدات بەكەسەكە، كەبەڕێزی خودی ئایین بەراورد دەكرێت. تەنانەت ئەو زمانە ئاڵۆزەو ئەو وشەو دەستەواژە كۆنانەش كە ئەو ئەندام‌و كەسانە بەكاری دەهێنن، جـۆرە تــرس‌و لــەرزێك، لــەدەروونی خــەڵكدا دروســتدەكەن، بــەوەی گــەر هاووڵاتییەكە لێیتێ‌نەگات، ئەوا لەبەرئەوەیە كەوەكو پێویست ئاییندار نییەو لەبەرئەوەیە، ئەوان زیاتر لەئایین شارەزاترن‌و لەخوانزیكترن.

... بەپێچەوانـەی ئەمەشەوە، گەر بانگەشـەكەرە سیاسـییەكانی تـر (بـۆ نموونـە وەك چەپڕەوەكان) بە جۆرو شێوازێكی ئاستبەرز لەگەڵ خـەڵكیدا بدوێن، ئەوا خەڵكی لێیان دوور دەكەونەوەو پشتیان تێدەكەن، گوایا ئەمانە لوت بەرزن‌و شتێك دەڵێن كە خەڵكی تێیناگات.

لێرەداو .. بەمەش، تایبەتمەندێتی ئایین و هەڵوێستی خەڵکی ئاسایی بەرامبەری ئاشکرا تر دەردەکەوێت.

ئێستاو پاش ئەم تێبینیانە، دەتوانین دەستبکەین بەبابەتی لێکۆڵینەوەکەمان، بڕواشناکەم باسی چەند شتێکی ناپێویستم کردبێت، چونکە وابزانم پێویست بوو ئەم بابەتانەی داهاتوو، لەچوارچێوەیەکی ڕاستدا دابنرێت، کەبتوانێت بەبێ هیچ دڵەڕاوکێیەك یان ترسێکی سەپێنراو، بەتەواوەتی بابەتیانە مامەڵە بکات، لەسەر بنەمایەکیش لەتێگەیشتنی هۆکارو پاڵنەرو دارهاویشتە کۆمەڵایەتی و ژینایەتی و ئابووری و سیاسییەکان، هەموو ئەمانەلەو چوارچێوە ناوخۆییەی خۆیدا کەبەستراوە بەتایبەتمەندێتی بارودۆخی میسرەوە، بەدرێژایی مێژووەکەی.. درەنگیشت ناخەین خوێنەری خۆشەویست.

تەنها بەچەند ویستگەیەکی ئیسلامی سیاسیدا تێپەڕدەبێت، یاخود بگرە بەچەند هەوڵێکدا، بۆپەنابردنە بەر ئیسلام وەکو ئامرازێك بۆ هاندانی جەماوەر لەڕووی سیاسییەوە.

بەشێوەیەکی سروشتیش بە جەمالەدین ئەلئەفغانی دەست پێدەکەین.

ئیستا ئێمە لەبەرزترین لوتکەداین .. ئەفغانی بەشێوەیەکی ئیجابیانەو لە ڕوویەکی ڕاستیشەوە، لەبانگەوازی ئیسلام تێگەیشتبوو. ئیسلام بانگەوازێکی لەپێناوی مرۆڤدا، لەپێناوی ئازادی و پێشکەوتن و کامەرانی

مرۆڤ و .. ئایندەدا کەبەستراوەتەوە بەشانبەشانبوونی ڕۆحی سەردەم و دەسکەوتەکانی زانستی نوێوە.

لەسەرەتاشەوە، ئەفغانی بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کە هزری ئایینی لەدیلێتیی لاساییکردنەوەو پابەندبوونی سەلەفیانە ڕزگاربکرێت، هەروەها بانگەوازیش بۆ ئەوە دەکات کەدەزگای ئیجتیهاد بەتەواوەتی بێ هیچ بەربەستێك والآبکرێت .. ((مانای چی دەرگای ئیجتهاد داخراوە؟ بەپێی چ دەقێك دەرگای ئیجتهاد داخرا، چ ئیمامێك گوتی نابێت هیچ موسوڵمانێك، پاش من ئیجتهاد بکات تا قوڵببێتەوە لەئاییندا؟ یان بەڕۆشنایی قورئان و حەدیسی ڕاست بچێتەبەڕێوە، یان کۆشش و ئیجتهاد بکات، بۆ فراوانکردنی تێگەیشتنی سەبارەت بەئایین و، بە قیاس بگاتە ئەوشتانەی کەلەگەڵ زانستە نوێیەکان و پێویستی و ڕێساکانی زەماندا دەگونجێن))[١٤]

هەروەها ئەفغانی بەڕاشکاوی جەختدەکات و دەڵێت ((ئایین نابێت لەگەڵ بابەتە زانستیەکاندا نەگونجێت، ئەگەر جیاوازییەکیش لەنێوانیاندا دروستبوو، ئەوا دەبێت تەئویلکرێت))[١٥].

نموونەیەکیش دەهێنێتەوە .. (زانست خڕی و سووڕانەوەی زەوی سەلماند، هەروەها ئەوەشی سەلماند کەڕۆژ جێگیرەو زەوی دەسوڕێتەوە،

---

[١٤] فتحي عثمان – الفكر الاسلامي والتطور – ص ٢٤٦.

(*) قیاس یەکێکە لەسەرچاوەکانی تەشریعی ئیسلامی.

ئەم ڕاستیەو هەموو ڕاستیە زانستیە هاوشێوەکانی دیکەش، پێویستە لەگەڵ قورئاندا بگونجێت، قورئانیش دەبێت لەوە بەرزتر بێت کەلەگەڵ زانستی ڕاستەقینەدا جیاوازبێت،بەتایبەتی لەگشتگیریەکاندا. ئەگەر لەقورئانیشدا دەقێکمان نەبینی کەلەگەڵ زانستو گشتگیریی ئاشکراکاندا بگونجێ، ئەوا تەنها پەنا دەبەینەبەر ئەو ئاماژانەی کەتێیدایەو، دەگەڕێینەوە بۆلای تەئویلکردن، چونکە نابێت زانستو داهێنانەکان بەڕاشکاوی‌و ئاشکرایی لەقورئاندا باسبکرێن، لەبەرئەوەی ئەم شتانە لەسەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئاندا لەخەڵك شاردراوە بوون‌و ناهاتبوونەوە کایەوە. گەر قورئان بهاتایەو باسی هێڵی شەمەندەفەرو کارەباو کارە سەیرو سەمەرە کارەباییەکان‌و چەندەها شتی تری بکردایە، ئەوا خەڵکی گومڕا دەبوون‌و پشتیان تێدەکردو بەدرۆیان لەقەڵەم دەدا)(١٥).. با ئەم بڕگەیەمان لەیاد بێت کاتێك لاپەڕەکانی داهاتوو دەخوێنینەوە، تا ببینین ئەم مەسەلەیە چەند خاوەنەکانی بەرەو نشێوی بردووە.

تەنانەت لەو مەسەلە ئاڵۆزانەشدا کەتوندڕەوەکانی ئێستا بەرگەی بیستنی ناوەکەشی ناگرن‌و یەکسەر بێڕاپایی، بەکوفری لەقەڵەم دەدەن. دەڵێم تەنانەت سەبارەت بەمەسەلەیەکی وەك (تیۆری دروستبوون‌و گەشەسەندن)یش، ئەفغانی قسەیەکی زۆر ئاقڵانەی کردووە کەشایانی

---

[١٥] خاطرات جمال الدين – (أملاه على محمود پاشا المخزومي) – ص ١٦١.

تێڕامانە ((.. لەئەفغانییان پرسی ڕای چییە سەبارەت بەم گوتەیەی ئەلمعەڕڕی:

والذي حارت البرية فيه      حيوان مستحدث من جماد

ئایا مەبەستی لەوەیە کە داروین لەتیۆری گەشەسەندندا مەبەستی بوو؟ ئەویش گوتی: زیادەڕۆیی ناکەم گەر بڵێم هیچ شتێك لەسەر زەوی نییە کەجەوهەرو بنەڕەتێکی نوێی هەبێت، مەبەستەکەی ئەلمعەڕڕیش ئاشکرایەو هیچ شاردراوەییەکی تێدا نیە .. مەبەستیشی تیۆری گەشەسەندنەوە، لەسەر ڕۆشنایی گوتەی عەرەبەکانیش، سەبارەت بەم مەسەلەیە ئەوەی گوتوە، چونکە ئەبوبەکر کوڕی بشرون لەنامەکەیدا بۆ ئەبی سەمح، کەباسێکە لەسەر توێژینەوەی کیمیا، گوتوویەتی: ((خۆڵ دەگۆڕرێت بۆ ڕووەك، ڕووەکیش دەگۆڕرێت بۆ گیاندار، بەرزترین لەدایکبووەکانی گیانداریش مرۆڤەو دواترینی ئەم سێ گۆڕرانەشە. گەر بنیاتنانی تیۆری دروستبوونو گەشەسەندنیش، لەسەر ئەم بناغەیە بێت، ئەوا زانا عەرەبەکان لەپێشترن نەك داروین، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، نکوڵی لەوە ناکەین کەداروین لەزۆر ڕووەوە خزمەتی مێژووی سروشتیی کردووەو کارێکی مەزنی کردووەو لەسەر پاشکەوتەکانیشی جێگیربووە))[١٦].

---

[١٦] المرجع السابق.

ڕهزری بێگەردو درەوشاوەو، ئەو ئیجتیهادە فیقهیەش کە پەیوەستە بەواقیعو ژیانی ڕۆژانەی خەڵکییەوە، بەرەوپێشچوونی ڕووداوو دۆزینەوە زانستیەکانیش .. هەر دەبوایە بەجەماوەرەوە ببەسترێنەوە ... نەك تەنها بۆ ڕزگاربوون لەئیستعمار .. بەڵکو بۆ ڕزگار بوون لەچەوساندنەوەش ((تۆ، ئەی جووتیاری داماو، دڵی زەوی هەڵدەدڕی، تا شتێکی لێ‌پەیدا بکەیت کەمێك نەبوونیەکان پڕبکەیتەوەو حەزی منداڵەکانت دامرکێنێتەوە، ئەی بۆ دڵی ستەمکارەکانت هەڵنادڕێت، بۆدڵی ئەوانە هەڵنادڕێت کە بەرهەمی ماندووبوونت دەخۆن)). وە هەروەها ((سۆشیالیزم گەرچی ئەمڕۆ لایەنگرانی کەمە، بەڵام هەردەبێت، ئەو ڕۆژەی زانستی ڕاست هەموو جیهان دەگرێتەوە، ئەویش بەهەموو جیهاندا بڵاو ببێتەوە، مرۆڤیش تێبگات کەخۆی‌و براکەی لەیەك خۆڵ‌و یەك ئاون، مرۆڤیش بەوە لەمرۆڤەکانی تر چاکترو پایەبەرزتر دەبێت، کەهەوڵی بەکەڵك بدات بۆ بەرژەوەندیی کۆمەڵ، نەك بەتاج یان موڵك یان پارەو ماڵکۆکردنەوە یان هەبوونی خزمەتکاری زۆرو چەوساندنەوە یان سوپا خڕکردنەوە یان چەندەها کاری پڕو پوچی تر، یان سەروەریەکی تەمەن کورت‌و ناوبانگێك کەتا ئاخر زەمان جێگای شەرم بێت))[17].

---

[17] المرجع السابق.

بەم شێوەیە لەلوتکەدا دەوەستین، بۆئەوەی سەیری ئیجتهادەکانی بیرمەندێکی ئیسلامیی ڕووناکبیر بکەین .. بەلاّم بۆئەوەی لەسەر لێکۆڵینەوەکەمان بەردەوام بین، ناچارین کەهەنگاو بەهەنگاو دابەزین..

کاتێك ئەفغانی لەمیسر دەرکراو پێیگوتن ((پەنا ببنەبەر پێشەواکەیان کەوتنە ترس و نیگەرانیەوە، ئەفغانی بەڕاشکاویەوە پێی گوتن ((پەنا ببەنەبەر محەمەد عەبدە، پەننابېەنەبەر محەمەد عەبدە، کەسێکی ئەمین و چاکە))

بەم شێوەیە ئەفغانی، دیاری خۆی پێشەکەشی میسر کرد .. دیاریەکەشی محەمەد عبدە بوو کە بەپلەکانی جیهاددا سەرکەوت تا بووە موفتی میسر ((ئەویش لە سەردەمێکدا کەمیسر لەدوو ڕێیانێکی ڕاستەقینەدا وەستابوو، چونکە مەدەنیەتی نوێ و (با)ی خۆرئاوا خێراو بگرە بەپەلەش هەڵیدەکردو میسریەکانیش، لەگەڵ سەرهەڵدانی هەموو شتێکی نوێدا، بەسەرسوڕمانەوە لەخۆیانیان دەپرسی .. ئایا حەلاڵە یان حەرام)). بانقەکان، بیمە، وێنەی فۆتۆگرافی، گوێگرتن لەڕادیۆ، بەکارهێنانی داهێنان، بەرهەمەکانی زانستی نوێ؟.. بەمێشکی کراوەشەوە، مێشکێك کەدەیزانی ئایین شتەکان ئاسان دەکات نەك ئاڵۆز، محەمەد عەبدە، فەتوایەکی دەرکرد کەخەڵکی ئارام کردو میسریشی بەئاڕاستەی پێشکەوتن بەرەو ێش پاڵنا ..

محەمەد عەبدەش، بەوەی کە ((موفتی ولآت)) و ((مامۆستای ئیمام))بوو، دەیتوانی بانگەشەی ئەوە بۆخۆی بکات کەپلەو پایەیەکی تایبەتی هەیە. بەلآم ئەوەی نەکرد کەئەم مندالآنەی ئێستا دەیکەن و لاف ((ئەمیری)) و ((خەلافەت)) لێدەدەن و هەریەکەیان خۆی بەئەمیری موسوڵمانان دەزانێت و، خۆیان دەکەنە کاهین و دەسەلآتێك بەخۆیان دەبەخشن بەسەر خەڵکیدا ..

مامۆستاو ئیمام ئەم شتە ڕەتدەکاتەوەو بگرە زۆربەتوندیش ڕێگای لێدەگرێت ((لەئیسلامدا هیچ دەسەلآتێکی ئاینی بوونی نییە، جگە لەدەسەلآتی ئامۆژگاریی باشەو بانگەوازکردن بۆ چاکەو دوور کەوتنەوە لەخراپە. ئەمەش دەسەلآتێکە خوا داوێتیە نزمترین موسوڵمان کەبیدات لەلوتی بەرزترینیان، هەروەها داوێتیە بەرزترینیشیان تا نزمەکانی پێئاگادار بکاتەوە)).

هەروەها کاتێکیش دەچێت بۆ ئەوروپاو سەرسام دەبێت بەو هەموو داهێنان و بگرە ڕەفتارو ڕەوشتانەش کەلە ئەوروپا هەیە، وتەیەکی زۆر کورت و زۆر پڕ مانا دەڵێت (کافرەکان وەکو موسوڵمان ڕەفتار دەکەن، کەچی موسوڵمانەکان بەشێوەیەك ڕەفتار دەکەن، وەك ئەوەی کافربن)).

مامۆستاو ئیمامیش بەئەقڵ و زانستەوە پەیوەست دەبێت ((موسوڵمانی حەق ئەو کەسەیە کەلەکارو بارەکانی دونیاو ئاییندا پشت بەئەقڵ

دەبەستێت))[١٨]. وە هەروەها ((نابێت ئایین بەربەستێك لەنێوان مرۆڤەكانو ئەو سروشتەدا دروستبكات كەخودا بەمرۆڤەكانی بەخشیوە، سەبارەت بەئامادەباشیان بۆ زانینی حەقیقەتی بوونەوەرەكان .. بەڵكو دەبێت ئایین پاڵیان پێوە بنێت كەبەشوێن زانیاریدا بگەڕێنو داوای ئەوەیان لێبكات ڕێزی بەڵگەكان بگرنو بەسەریاندا بسەپێنێت كەپڕ بە توانا هەوڵبدەن بۆ ناسینی ئەو جیهانانەی لەبەردەستیاندایە))[١٩]. بەڵام شێخ محەمەد عەبدە، وەكو مامۆستاكەی نەبوو لەبەستنەوەی ئەقڵو زانستو نوێگەریدا بە جەنگە ڕۆژانەكانی خەڵكییەوە، ڕەنگە لەڕۆژانێكی هێندە سەختیشدا سەركردایەتی وەرگرتبێت كە پێویستی بەیەكلاكردنەوەیەكی شۆڕشگێڕانەی واهەبوو كە شێخ نەیتوانی ئەنجامی بدات ..

ڕەنگە ترسابێتیش لە ((توندڕەوی))و جۆشی عوڕابییەكان، چ دژی خدێوی، یان توندڕەویو جۆشیان بۆ بەرژەوەندیی جەماوەر .. ئەوەتا بەڕاشكاوی ڕایدەگەیەنێت كە ڕەخنەی لەحكومەتی ریازو ڕێبازی خدێوی تۆفیق گرتووە ((بەڵام من دژی شۆڕش بووم، پێموابوو هێندە بەسە كەلەماوەی پێنج ساڵدا، دەستورێك بەدەست بهێنین. نەیاری دەركردنی ریاز پاشاو خۆپیشاندانەكەی عابیدینیش بووم، سلێمان پاشا ئەبازەو شەریعی

---

[١٨] محمد رشيد رضا – تأريخ الاستاذ الامام – ج ١ – ص ١١.

[١٩] محمد عبده – رسالة التوحيد – ص ١٤١.

پاشا ﷺ لـەدژی شۆڕش هـاوبۆچوونی مـن بـوون، ئێمـة داوای دەسـتورمان دەکرد))[٢٠].

بـەڵام شـۆڕش بـەرپا دەبێـت و لایـەنگریی جــەماوەر دەکـات، محەمــەد عــەبدەش هــەر بەهەڵوێسـتی خۆیــەوە پابـەند دەبێــت و بگــرە لەبــەردەم سەرکردەکانی شۆڕشدا وتارێکیش پێشکەش دەکات‌و تێیدا دەڵێت ((لـەناو هیــچ نەتەوەیــەك لەنەتــەوەکانی ســەرزەویدا، ڕووی نـــەداوە کەســایەتی‌و دەوڵەمەندو پیاوەکانی دەوڵەت داوای ئەوە بکەن کەلەگەڵ خەڵکی ئاساییدا بەکسانبن، دەست لە تایبەتمەندی‌و ناوبانگی وەزیفی‌و سەروەت‌و سامانیان بەربدەن‌و خـەڵکی چینـە نزمـەکانی تێدا بەشداربکەن .. ئایا چاکی ئێـوەی گەیاندووەتە ڕاددەیەك کەتائێستا هیچ کەسێك لەجیهاندا پێی نەگەیشتووە، بەڕاددەیەك کەقایلبوون‌و ئەوەتان هەڵبژاردووە، بەئاشـکرا گشت نەتەوەکان لەســـەروەری‌و ناوداریتـــان هاوبــەش بـــن. لەخۆشەویســـتی عەدالـــەت‌و مرۆڤایەتیدایە، خۆتان بەڕووتەڵەکان یەکسـان دەکـەن، یـان خۆشـتان نازانن چیدەکەن‌و بەرەوکوێ دەچن؟))[٢١].

.. ڕەنگە بەپێداچوونەوەی تێبینیەکانی پێشووشماندا، مەسـەلە ئاشـکرا ببێــت. جڵەوەکــە لەدەســت شــێخ دەرچــوو، ئــەو جــەماوەرەش کــەهیچ

---

[٢٠] د. علي الحديدي – عبدالله النديم – ص ١٧٧.

[٢١] المرجع السابق.

هۆشیارییەکی کۆمەلاّیەتیان نەبوو، هۆشیارییەکی نیشتمانیو کۆمەلاّیەتی ئاشکرایان بەدەستهێنابوو .. شێخیش ئەو شوێنو پایەیەی جارانی نەمابوو، بۆیە هەستی بەدابڕان کرد لەواقیعو لەگەڵ واقیعدا بەریەککەوتن .. بەمەش یەکهەنگاو گەڕایەوە دواوە..

شێخیش بۆ مامۆستاکەی دەنووسێتو دەریدەبڕێت کەبە تەواوەتی دابڕاوە لە ڕووداوەکان ((وام دەزانی توانام بێسنوورەو شوێن پایەم بتەوەو هیچ کاری تێناکات، کەچی ئەوەتا لەگەڵ ڕۆژگاردا، هەر ڕۆژەو شتێکی نوێ ڕووبەڕووم دەبێتەوە. قەڵەمەکەمم بەدەستەوە گرت، تا ئەو شتانەی ناخمت بۆ بنووسم کەتۆ لەمن باشتر دەیانزانیت، بەلاّم جگە لەناخێکی پەشێوو دڵێکی ئیفلیجو دەستو ئەژنۆیەکی لەرزۆكو فیکرێکی ڕۆیشتوو و ئەقڵێکی نائامادە، هیچی دیکەم لەدەروونمدا نەبینییەوە)).[٢٢] ئەفغانیش بەتوندوتیژیەوە وەلاّمی قوتابیەکەی دەداتەوەو دەڵێت ((بەڵکو تۆ بێورەیتو ڕووخاویت)).

مامۆستاو ئیمامیش کۆچدەکاتو پاش ئەمیش محەمەد ڕەشید ڕەزای جێنشینیدێت.. پاشانیش دەبینین هەنگاوێکی دیکەش لەپلەکان دێنەخوارەوە.

---

[٢٢] عباس العقاد – محمد عبده – ص ١٣٣.

ڕەشید ڕەزا یەکێك بوو لەو قوتابیانەی ئیمام کەبۆچوونیان وابوو ((ئیمام چەند تەنازولێکی ناپێویستی لەبەرژەوەندیی مەدەنیەتو پێشکەوتنی نوێدا کردووە))[٢٣]

بەلام لەگەل ئەمەشدا، بۆن و بەرامەی بۆچوونەکانی ئیمامو ڕێنماییەکانیشی، هەر لەهەلوێستو نووسینەکانی ڕەشید رەزا ڕەنگ دەداتەوە..

ئەوەتا لەسەر وتاری ژمارەی یەکەمی مەنار دا دەنووسێت ((ئەی مرۆڤی خۆرهەلاتیی لەخەودا نقومبوو، دلخۆش بەخەونە خۆشەکانت، وریا بە وریا، نووستنەکەت لەسنووری ئیسراحەتکردن تێپەڕیو خەریکبوو ببێتە لەهۆش خۆچوون یان مردنێکی ڕاستەقینە. لەخەوەکەت ڕاپەڕە، خەو لەچاوەکانت بسڕەو سەیری جیهانی نوێبکە، زەوی گۆڕراوە بەزەوییەکی تر .. چاکبزانە ئەم سەردەمە سەردەمی زانستو کارە، هەرکەسێك زانستی هەبوو کاریکردبووە سەروەر، هەرکەسێکیش نەزانبوو تەمبەلیکرد دارما))زانستیش مەسەلەیەکی زۆر بەبایەخ دەنوێنێت، لەهزری ڕەشید ڕەزادا .. هەروەها یەکێتیی نیشتمانیی نێوان موسولمانو مەسیحیەکانیش بەهەمان شێوە .. ئەوەتا باسی سەردانەکانی خۆیدەکات، بۆ بەیروتو دەلێت لەگەل پیاوچاکەکانیدا بەشداریکردووە ((لەدروستکردنی چەند

---

[٢٣] مجيد خضوري - التيارات السياسية في العلم العربي - الانجليزية - ص ٥٦.

قوتابخانەیەکدا بۆ فێرکردنی هەموو مەسیحیەکان، لەسەرئەوەش لەگەڵیاندا ڕێکەوتین .. بەشداریکردنی مەسیحیەکانیش لەگەڵیاندا جۆرێکە لەئیجتیهادی ئەقڵی))[٢٤].

هەروەها ستایشی خەڵکی بەیروتیش دەکات ((موسوڵمانەکانی بەیروتم بینی، هەموویان ئامادەبوون بۆ قبوڵکردنی هەموو چاکسازیەکی ئایینیو مەدەنی، هەروەها چەند کەسانێکیشم تێدا بەدیکردن کە خاوەن هەڵوێست بوونو حەزیاندەکرد ئەو کارانە بکەن کەنەتەوە سەربڵند دەکاتو کاروبارەکانی وڵات پێشدەخات)).

... زانستیش لای ڕەشید ڕەزا، تەنها بریتی‌یە لەزانستی نوێو هیچی تر. ئەوەتا باسی سەردانەکانی خۆی دەکات بۆ تەرابلوسو دەڵێت ((ئەمەش بەوەی موسوڵمانەکانی تەرابلوس وەك خەڵکی بەیروت نینو زیاتر سەرقاڵن بەلێکۆڵینەوەی کتێبەکانی هونەری عەرەبیو زانستە ئیسلامیەکانەوە، کەلەسەدەکانی ناوەڕاستدا، پاش نابوت بوونی وڵاتی موسوڵمانانو لاوازبونیان، زانستەکانی تر دانراون، ئەمەش ئامادەباشیی لاواز دەکات، چونکە ئەمە ئامادەباشی خۆڕسك سەرقاڵ دەکات نەك بەهێزی بکات، بەمەش دەبێتە کۆسپ لەبەردەم فێربوونی شتەکانی تردا)).

---

[٢٤] المنار – ج ١١ (١٩٠٨ – ١٩٠٩)– ص ٧٠٦.

.. ((یەكێك لەهۆكارەكانی ئەمەش ئەوەیە كەخەڵكی تەرابلوس كەمتر تێكەڵاو دەبن، لەگەڵ ئەو كەسە بیانیی و عوسمانیانەدا كەلەڕووی زانستو كردارەوە لەمان پێشكەوتووترن. تەرابلوس وایلێهاتووە دەڵێی دابڕاوە لەجیهانی مەدەنیەت، ئەوكەسانەی لەزانستدا پایەی بەرزیان هەیە، سەردانی ناكەن))[٢٥]. بەڵام ڕەشید ڕەزا هەموو گوتەكانی ئیمامەكەی خۆی پەیڕەوی نەكرد. چونكە گەرچی مامۆستاو ئیمام جەنگی ((نوێگەری))ی بەرپاكرد لەدژی ((تەقلیدخوازی))، بەڵام ڕەشید ڕەزا لەتەسكترین لایەنەوە، بانگەوازی نوێگەریی وەرگرتو بەهێرشەكانی هەڵیكوتایە سەر ئەوانەی كەخۆی ناوی نابوون ((بیانی خوازەكان))، تەنانەت لەهەندێك لەوشتانەش پاشگەزبووەوە كەخۆی لەڕۆژەكانی یەكەمدا داوایدەكردن، ئەوەتا دەڵێت ((ئەمە جۆرێكە لەشێتی كەهەوڵبدەین پایە ئایینیو مێژوویەكەی ئوممەی ئیسلام هەڵكێشینو بیگۆڕین بەهی ئوممەیەكی تر)). لەكۆتایی مەسەلەكەشدا، ڕەشید ڕەزا گەڕایەوە بۆلای بانگەوازكردن بۆ خەلافەتی ئیسلامی ((چونكە خەلافەت ئەو حكومەتە نموونەییەیە كەبەبێ ئەو، بارودۆخی مرۆڤایەتی چاكنابێت، دەوڵەتی ئیسلامیی ڕاستەقینەش باشترین دەوڵەتە، چونكە پلەیەكی ناوەندییە لەنێوان بێجووڵەییو

---

[٢٥] رحلات الامام محمد رشيد رضا – جمعها وحققها د. يوسف ايبش – المؤسسة العربية للدراسات و النشر. (بيروت) – (١٩٧١) – ص ١٢.

شارستانیەتی بیانیدا، ئەو شارستانیەتە مادییەی کەمیکرۆبی گەندەڵی و پەتای کوشندە لەناوی دەبەن. لەبەرئەوە ئەم شارستانیەتە ئەگەری لەناوچوونی هەیە))[٢٦].

پاشان هەنگاوێکی تریش بۆدواوە .. چونکە گەرچی ئەفغانی داوای سەربەستی هاو ولاتی دەکردو زۆربەسەختیش دژی حوکمڕانە ستەمکارەکان هێرشیدەکرد، گەرچی محەمەد عەبدەش، سەبارەت بەم مەسەلەیە بێدەنگ بوو، یاخود هەڵوێستێکی میانڕەوی بەرامبەری وەرگرتبوو، بەڵام ڕەشید ڕەزا داوای گوێڕایەڵی و سەروەریی ڕەهای کرد بۆ ((ئەو وەلی ئەمرەی کەخوا فەرمانی داوە گوێڕایەڵی بکرێت))[٢٧].

بەڵام پێویستە لەسەرمان پێش ئەوەی شێخ ڕەشید ڕەزا بەجێبهێڵین، ئاماژە بە هەڵوێستی بکەین، بەرامبەر مەسەلەیەکی گرنگ، ئەویش هەڵوێستیەتی سەبارەت بەمەسەلەی حیجاب .. ڕەشید ڕەزا باسی ڕۆڵی چەند کەسێکی ڕووناکبیر دەکات لەبەیروتدا، سەبارەت بە هەوڵدان بۆ فێرکردنی ئافرەتان و بەڕێوەبردنیان لەکاروانی شارستانیەتدا ((بەڵکو ئەوان وایان دەبینی کەژنانی موسڵمانان پێویستە حیجاب فڕێدەن و شانبەشانی ئافرەتانی گەلانی دیکە بڕۆن لەشارستانیەتی هاوچەرخدا. باشتریش وایە

---

[٢٦] رشيد رضا – الخلافة او الامامة العظمى – (٥١٣٤١)– ص ١١٦.

[٢٧] رشيد رضا – كتاب الوحي– ص ٢٣٩.

بۆ ئێ،ە کە ئەوە لەسەر بناغەیەکی پتەو بنیاتبنێن، واتا بەشێوەیەك بێت کە بەرژەوەندیی دونیاو ئایینیش پێکەوە گرێ بدات))[٢٨].

بەم شێوەیە دەبینین هەڵوێستەکان ناتەواون، چونکە تێڕوانینە گشتگیرەکەی ڕۆشنگەریی لەدەستدەچێتو، چەند پەڵەیەکی ڕووناکی لێرەو لەوێش شوێنی دەگرنەوە، بەڵام چەند پەڵەیەك کەدرەوشانەوەیەکی تایبەتی ئازایانەیان هەیە .. بەهەرحاڵ شێخ ڕەشید ڕەزا ناچاریکردین کەهەنگاوێکی دیکەش لەگەڵیدا دابەزین.

((ئێمە سەلەفین لەشوێنکەوتووەکانی شێخ ڕەشید ڕەزاین))

شێخ حەسەن ئەلبەننا ئاوا دووپاتیکردەوە.

ئێستا ئێمە لەگەڵ گەورەترین کۆمەڵەکانی ئیسلامی سیاسیداین .. لەبەردەم دامەزرێنەری ڕاستەقینەی بیرۆکەی ئیسلامی سیاسیشداین، لەچەرخی نوێدا. ساڵی (١٩٢٨)، ساڵی قەیرانی ئابووری جیهانیە، ساڵی بەدەرکەوتنی نابوت بوونی سەرەتایی ڕەوتە سیاسیەکەشە، لەگەڵ ئەمەشدا تاکە ئەزموونە سۆشیالیستییەکەش دادەڕوخا، دۆخەکەش زۆر لەبارە بۆ ئەوەی حەسەن ئەلبەننا هزرەکانی ڕووەو ((چارەسەرە ئیسلامیەکە)) ئاڕاستە بکات.

---

[٢٨] المنار - ج ٢٢ص (١٩٢١) - ٣٩٠.

((ئێمە سەلەفین لەشوێن کەوتوانی شێخ ڕەشید ڕەزاین))بەننا ئاوایگوت، هەروەها زۆر شانازیش بەوەوە دەکات کە ڕەشید ڕەزا پێش ئەوەی کۆچیدوایی بکات، خەریکبوو دەبووە ئیخوان موسلیمین.

بەڵام بەننا درێژکراوەیەکی (سەلەف)تر بوو لە ((لەقوتابیە سەلەفیەکە))ی شێخ محەمەد عەبدە...

بەم شێوەیە دەبینین هەمیشە هەنگاوێك بەرەو دواوە گەڕانەوە هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕەشید ڕەزا داوای ئەوەیدەکرد بەسینگێکی فراوانەوە، زانستی نوێو تەنانەت شارستانیەتی خۆرئاواش وەربگرێت، بەڵام بەننا هەموو شارستانیەتی خۆرئاوای ڕەتدەکردەوە، گوایا ئەمە شارستانیەتێکی ((نەسرانی)) و ((کافرە))، بگرە خوێندنی نوێو قوتابخانە نوێیەکانیشی هەر ڕەتدەکردەوە (ئەوەی کەخۆیشی مامۆستا بوو تێیاندا) دەیگوت ئەم قوتابخانانە ((بیدعەن))و منداڵانی لێوە دەردەچن ((پاش ئەوەی ئەقڵیان بەبۆچوونە بێباوەڕییەکان ژەهراوی بووەو فێری لاساییکردنەوەو بەرەڵاییکراون)).هەروەها هێرشیشدەکاتە سەر مەدەنیەتی خۆرئاوایی و دەڵێت ((بڕوام وایە کە نەتەوەکەم، بەحوکمی ئەو بارودۆخە سیاسیانەی بەسەریان هاتووەو ئەو کاریگەرەیە کۆمەڵایەتیانەی تووشیان بووەو، بەهۆی کاریگەریی مەدەنیەتی خۆرئاوایی و نیمچە ئەورووپییەوەو بەهۆی فەلسەفەی ماددی و لاساییکردنەوەی بیانییەوە، دوورکەوتوونەتەوە

لەمەبەستەکانی ئایینەکەیان و ئامانجەکانی کتێبەکەیان، سەروەریی و باب و باپیران و ئاسەواری پێشینەکانی خۆیانیان بیرچووەتەوە، بەهۆی ئەو هەموو شتەشەوە کە بەستەم و نەزانی خراوەتەپاڵ ئایین، ئەم ئایینە ئاراستەیان، لائالۆزو گوماناوی بووە)).[29]

حەسەن ئەلبەنناش کۆمەڵەکەی، لەسەر بنەمایەك لەبیرۆکەی ((بەیعە))دروستکرد. واش لەبەیعە تێگەیشتبوو کەبریتییە لەدەست بەردانی ئەندامەکە لەئیرادەی تایبەتی خۆی، بەشێوەیەك کەپڕ بەویست و هەڵبژاردنی خۆی پێشکەشی ((مورشید))ی بکات، بەرامبەر ئەوەی کە مورشید، لەجیاتی ئەو لەبەردەم خوادا بەرپرسیاربێت ... یەکەم بەیعەش لەنێو کۆمەڵی ئیخوان موسلیمیندا لەنێوان ئەو شەش دامەزرێنەرەدا ڕوویدا. کەبەحەسەن ئەلبەننا یان گوت ((ئێمە وەك تۆ ڕێگای کارکردن یان ڕێبازی خزمەتکردنی نیشتمان و ئایین و نەتەوە نازانین. ئەوەی ئێستاش ئێمە دەمانەوێت، ئەوەیە کە هەرچیمان هەیە، پێشکەشی تۆی بکەین، تا لەبەردەم خوادا، ئێمە بەرپرسیار نەبین و تۆ لەجیاتی ئێمە بەرپرسیار بیت لەوەی ئێمە دەیکەین)).[30]

---

(29) حسن البنا - مذكرات الدعوة والداعية - دار الشهاب - ص ١٠.

(30) المرجع السابق ص ٧٦.

یەكێك لەسەركردەكانی ئیخوانیش بەم شێوەیە بۆ مورشیدی نووسیبوو ((ماف تۆ ئەوەیە لەسەرمان كە گوێڕایەڵبین، لەسەر ئەمە بەیعەو پەیمانمان داوە، متمانەی تەواوەتیشمان بەتۆیەو تۆش دڵنیایی گشتگیرت لەلایە))[٣١].

... زیاتریش نزیك دەبینەوە لەتێگەیشتنی شێوازەكانی بانگەشەكە، شێخ بە مەبەست دەیەوێت سەلەفیەتی ئەندامانی قوڵبكاتەوە .. ئەوەش دەگێڕێتەوە كەچۆن جارێك ئامۆژگارییانكردبوو پێیان گوتبوو:ئەی برام ناوبنیٚ، منیش دەڵێم چی ناوبنێم .. دەڵێت برایان‌و هاوەڵان‌و كۆمپانیاكانت ناوبنیٚ. بەمیان بڵیٚ تۆ لە ئەبوبەكر دەچیت، بەویان بڵیٚ تۆ لەعومەر دەچیت، چونكە ئەمە گوڕو تینیان تێدا دروستدەكات .. كۆمپانیاكانیشت ناوبنیٚ پەیمانگای حەراء بۆ كوڕان، قوتابخانەی دایكانی موسوڵمانان، یانەی خەندەق.[٣٢]

شێخ بەمەبەستیش دەیویست ئەندامەكانی خۆی لەخەڵكانی دیكە جیابكاتەوە، هەروەها یەكەم كەسیش بوو كەبەناوو بەرگی جیاواز ئاماژەی بەجیاكردنەوەی شوێنكەوتوانی ئیسلامی سیاسیكرد .. كاتێك یەكەم قوتابخانەی دروستكرد ((ناوێكی ئیسلامیانەمان لێنا، كەئەویش پەیمانگای حەرائی ئیسلامیە، بەرگێكی تایبەتیشمان كردە مەرج بۆ قوتابیەكان: كە

---

[٣١] أنور الجندي – الاخوان المسلمون في ميزان الحق – ص ٦٩.

[٣٢] حسن البنا – مذكرات الدعوة والداعية – المرجع السابق – ص ٩٨.

بریتیە لەمێزداشەیەك و چاكەتێك لەقوماشی خۆماڵی و تەربۆشێكی سپی و جووتێك پاپوچ، هەروەها كاتەكانی خوێندنیش جیاواز بوو لەكاتی خوێندنی قوتابخانەكانی دیكە))[٣٣]

ئەو كتێب و زانیارییانەی كەلەسەر كۆمەڵی ئیخوان موسلیمین نووسراون زۆر زۆرن، بەڵام من تەنیا ئەم باسانەم وەرگرتووە سەبارەت بە ((بەیعەی تەواوەتی و ملكەچیی ڕەها بۆ مورشید، ناونان بەچەند ناوێكی سەلەفیانەی گورو تین بەخش، بەرگی تایبەتی و جیاكردنەوەی ئەندامەكان لەكۆمەڵگە بەپێی تواناو تەنانەت لەكاتەكانی خوێندنیشدا ..) )) .. بەننا لەسەرەتای بانگەشەكەیدا، ئەم سێ هێمایەی داڕشتبوو، لەوكاتەدا كەكۆمەڵەكەی هێشتا هەر لاواز بوو، دەشیویست بە سەلەفیەت خوازیەكە روحی ((بەهێزبوون))لە دەروونی شوێنكەتووەكانیدا بچێنێت و، بەجیاكردنەوەشیان لەكەسانی دیكە ((پایەبەرزی))یان تێدا بچێنێت. بەڵام كاتێك كۆمەڵەكە بەهێز بوو، بەننا پێویستی بەم بەهێزبوونە لەسەلەفیەتە یان پایەبەرزیە ڕواڵەتیە نەما..

بەڵام ... بیرۆكەكە هەر دەمێنێت، تا كۆمەڵە لەئیسلامە سیاسیە نوێیەكان دووبارەیبكەنەوە .. هەمان بیرۆكە بەهەرسێ ڕەهەندەكەیەوە .. ئایا مەسەلەكە ڕێكەوتە؟ یان ئەمە یەك ڕێبازە پەیرەوی دەكرێت.

---

[٣٣] المرجع السابق – ص ٩٦.

پاش ئەم تێبینیەش دەگەڕێتەوە بۆلای شێخ و کۆمەڵەکە .. با ئێستاش باسی هەڵوێستیان بکەین بەرامبەر بەحوکمڕانی.

- ئیسلام ئایین و دەوڵەتە، عیبادەت و سەرکردایەتیە، قورئان و شمشێرە، هیچیان لەیەکتر نابنەوە.
- ئایین شتێکەو سیاسەتیش شتێکی ترە .. ئەمە بانگەشەیەکە بەهەموو چەکێك دژایەتی دەکەین.
- ئەو ئیسلامەی ئیخوان بڕوایان پێیەتی، حکومەت دەکاتە ڕوکنێك لەڕوکنەکانی خۆی، هەروەك چۆن پشت بەئیرشادیش دەبەستێت، هەر بەو شێوەیە پشت بەجێبەجێکردنیش دەبەستێت ..
- حوکمڕانیش لەکتێبە فیقهیەکانماندا بەیەکێك لەعەقیدەو ئوسوڵەکان لەقەڵەم دراوە، نەك بەیەکێك لەلق و فیقهەکان.
- ((وا دەزانیت ئەو موسوڵمانەی کەبەم ژیانەی ئەمڕۆمان قایلدەبێت و تەنها سەرقاڵی عیبادەتەو دونیاو سیاسەت بۆ بێدەسەڵات و بەدکارو بیانی و ئیستیعمارەکان جێ دەهێڵێت، بە موسوڵمان ناودەبرێت؟ نەخێر، ئەوە موسوڵمان نییە. حەقیقەتی ئیسلام جیهادو کارو ئایین و دەوڵەتە))[٣٤].

---

[٣٤] الاخوان المسلمون (الاسبوعية) – ١٩٤٥/٣/٤ – مقال بين الدين والسياسة.

باخوێنەرێش یارمەتیم بدات کەلەبەردەم برگەی ((ن.ەخێر، ئەوە موسوڵمان نییە))دا بوەستم .. تەنانەت ئەوەیش کەسەرقاڵی عیبادەتکردنەو ناچێتە جەنگی ئیسلامی سیاسییەوە، موسوڵمان نییە .. ئایا ئەمەنییە تۆوی ئەو تەکفیرەی کەبەشێوەیەکی ئاشکرا، لەنێو کۆمەڵانی ئیسلامی سیاسی نوێدا بڵاوبۆتەوە..

... تا ئێرەش هەر دەبینین کۆمەڵی ئیخوان، چەند هەنگاوێك دەگەڕێنە دواوە، هەروەها دەبینین ئیخوان سەرچاوەو چاوگی ئەو فیکرە توندەڕەوەشن کەلەگۆڕەپانی کاری سیاسیی ئەمڕۆدا هەن.

بەڵام شێخ وەك بانگەشەکەرانی ئیسلامی سیاسی ئەمڕۆ، سادەو ساویلکە نەبوو..

شێخ گەمەی بەهەڵوێستو وشەو قسەکان دەکرد،بۆئەوەی هەوڵبدات کۆمەڵەکەی بەرێت بەڕێوەو دەزگا نهێنیەکەی بەهێز بکات، تا کاتی پێویست..

بەنناش هەرگیز هەموو دەرگاکانیبەڕووی خۆیدا، یان بەڕووی بانگەشەکەیدا دانەدەخست، بەڵکو هەمیشە ڕێگەیەکی بۆ دەربازبوون دەهێشتەوە .. بەتایبەت لەوکاتانەدا کەسەبارەت بە کۆمەڵەکەو ئامانجەکانی دەدوا...

... ((ئایا ئێمە ڕێبازێکی سۆفیگەرین، کۆمەڵەیەکی فێر خوازین، دامەزراوەیەکی کۆمەڵایەتین، حیزبێکی سیاسین. ئێمە بانگەوازی گشتگیری قورئانی حەقین .. ئێمە هەموو خێرو چاکەیەك لەخۆماندا کۆدەکەینەوە))[٣٥].

بەڵام هێندەی پێناچێت دەڵێت ((ئیخوان بانگەشەیەکی سەلەفیە، ڕێبازێکی سۆفیگەریە، دەستەیەکی سیاسییە، کۆمەڵێکی وەرزشییە، یەکگرتوویەکی زانستیە، کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیرییە، کۆمپانیایەکی ئابورییە، بیرۆکەیەکی کۆمەڵایەتیە))[٣٦].

بەڵام کەی دەتوانێت جیوە بەدەست بگرێت، ئەوەتا شێخ هێندەی پێناچێت هەمان وشەکانی پێشوو، بەئاراستەیەکی جیاوازدا بەکاردەهێنێت ((ئەی ئیخوان، ئێوە نەکۆمەڵەیەکی خێرخوازن، نەحیزبێکی سیاسین، نەدەستەیەکیشن کەئامانجێکی بابەتی و مەبەستێکی دیاریکراوتان هەبێت، بەڵام ئێوە ڕۆحێکی نوێو ڕووناکیەکی نوێو دەنگێکی بڵندن))[٣٧].

ئایا دەتوانیت لەم جۆرە وشانە، ڕۆحێکی نوێ .. ڕووناکیەکی نوێ .. دەنگێکی بڵند، تێبگەیتو ماناکەیان دیاریبکەیت.

---

[٣٥] أنور الجندي – المرجع السابق ص ١١.

[٣٦] المرجع السابق ص ١٥.

[٣٧] الاخوان المسلمون، ١٩٣٧/٣/٩ – مقال لحسن البنا بعنوان: حامي المصحف.

ئالێرەوە جیاوازی نێوان ئەمیری ((کۆمەڵی ئیخوان))و ئەمیری کۆمەڵە نوێیەکان سەرچاوە دەگرێت، چونکە ئەم زیاتر پێچ و پەنا دەکات و ئاواتەخوازیشە درێژترین ماوە بمێنێتەوە، بۆ ئەوەی بەژمارەیەکی زیاتر لەئەندامان و تەقەمەنی و ... دەزگای نهێنی ((خۆی بەهێز بکات)).

پێچ و پەناکردنی سیاسییانەی شێخ حەسەن ئەلببەناش دووشێوەی بنەڕەتیی وەرگرتبوو .. قەناعەتکردن بەحیزبە کەمایەتییەکان کەئەم دەتوانێت ڕووبەڕووی وەفد ببێتەوە، خۆنزیك خستنەوە لەپاشا و هەوڵدان بۆ ئەوەی کەبەرگی خەلیفەی موسوڵمانانی بەبەردا بکات .. ((٣٠٠ ملیۆن موسوڵمان لەجیهاندا دڵیان بۆ ئەو پاشا چاکەخوازە بەجۆشە لێدەدات کەپەیمانی پێداون پارێزەری قورئانبێت، بۆیە ئەمانیش پەیمان و بەیعەی دەدەنێ، وەکو سەربازێك بۆ قورئان لەبەر دەستیدا بمرن. زۆر لەوەش دەچێت کەخودا فاروقی بۆ ئەم هیدایەتە گشتیە هەڵبژاردبێت. کەواتە ئەی پاشای خاوەن شکۆ، لەسەر بەرەکەتی خوا پێشکەوەو دڵسۆزترین سەربازەکانیشت لەدواتەوەن))[٣٨].

---

[٣٨] النذير - ١٩٣٨/٦/١ - مقال لحسن البنا بعنوان: أيها الاخوان تجهزوا.

... ((ئومێدێکی زۆرمان بەپادشای خاوەن شکۆ هەیە، خوا پشتگیریی بکات))[39]. بەڵکو ڕۆژنامەکەی دیوانی پادشای ناونابوو دیوانی پادشایی ئیسلامی.[40]

ئەو ڕۆژەش کەفاروق چووە سەرتەختی پاشایەتی، کەڕاوەی گەڕۆکەکانی ئیخوان ڕوویانکردە کۆشکی عابدین ((تا لەسەر کتێبی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی، بەیعە بدەن بەفاروق)) ... ئەمەش ((پشتگیریی سەرای بەخشی بەگەڕۆکەکان و کۆمەڵەکە))[41].

شتێکی سروستیش بوو کەپاش ئەمە وەزارەتی محەمەد مەحمود پاشا لەساڵی (١٩٣٨)دا، یاسایەك بۆ قەدەغەکردنی هەموو گروپە نیمچە سەربازیەکان (کراس سەوزەکان - میسر ئەلفەتات، کراس شینەکان - وەفد) دەربکات و تەنها گەڕۆکەکانی ئیخوان لەبڕیارەکە جیابکاتەوەو یاسای قەدەغەکردنەکە نەیانگرێتەوە.[42]

ئیخوان موسلیمینیش پشتێك بوون بۆ حیزبەکەمایەتییەکان لەدژی حیزبی زۆرینەی پەرلەمانی (وەفد) .. هیچ سەرشۆڕی و شەرمێکیشیان

---

(٣٩) الاخوان المسلمون ١٩٣٨/٩/٩.

(٤٠) د. زكريا سليمان البيومي - الاخوان المسلمون والجماعات الاسلامية - مكتبة وهبة (١٩٧٩) ص ١٢٦.

(٤١) القانون ١٧ لسنة ١٩٣٨ بتأريخ ٨ مارس ١٩٣٨.

(٤٢) حسن البنا - مذكرات الدعوة والداعية- المرجع السابق - ص ٢٢٢.

لەوەدا نەدەبینی کەپشتی گەندەڵترین حوکمڕانی وەك ئیسماعیل سدقی بگرن و بەبەکاربردنی ئەم ئایەتە قورئانییە پیرۆزەش ((واذكر في الكتاب اسماعيلا انه كان صادق الوعد وكان صديقا نبيا)). بەڵکو پشتگیریی پەیماننامەی (سدقی - بیڤن)یشیانکردوو شوبهاندیان بە (سوڵحی حودەیبیە). شتێکی ئاسایش بوو کەپاش ئەمانە هەموو کۆمەڵەکە، بۆماوەیەکی دووردرێژیش، پشتگیریی و یارمەتی دانیان لەلایەن دەسەڵاتەوە دەسگیرببێت ..

لە (٢٤)ی ئایاری (١٩٣٧)دا، ئەنجومەنی بەڕێوەبەرایەتی (دقهلية) یارمەتییەکی ساڵانەی بەخشیە لقەکەی ئیخوان لەمەنسورە.[٤٣] پاشان کۆمەڵەکان یەکبەدوای یەك دەستیان پێکردو زۆربەشیان لەسەردەمی حکومەتە ستەمکارەکەی سدقیدا بوون، وەك ((بەخشینی مۆڵەتی دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە لەئایاری (١٩٤٦)دا. ڕێگادانیان بەکڕینی وەرەقەی چاپکردن بەنرخی ڕەسمی. چەند ئاسانکاریەکی تایبەت بۆ گەڕۆکەکانی ئیخوان موسلیمین کەلەمانەدا ڕەنگی دەدایەوە، داشکاندنی نرخی جل و بەرگە ڕەسمیەکانیان، ئازادیی بەکارهێنانی سەربازگەکان، بەخشینی پارچەیەك زەوی بۆ دروستکردنی سەربازگەکانیان .. هەروەها حکومەتیش محەمەد حەسەن ئەلعەشماوی وەکو وەزیری مەعاریف گرتەخۆی،

---

[٤٣] د. زكريا سليمان البيومي - المرجع السابق - ص ١٠٦.

عەشماویش واناسرابوو کەمەیلی بەلای ئاییندا هەیە. جگە لەمەش کۆمەڵەکە چەند یارمەتییەکی ناڕاستەوخۆی، لەهەردوو وەزراەتی فێرکردن و کاروبارە کۆمەڵایەتیەکانەوە پێشکەش دەکرا))[٤٤].

بەڵام هەموو ئەمانە بێسوودن .. چونکە شێخ هەر کەهەست دەکات بڕێك هێزی هەیە، ڕاستەوخۆ پەردە لەسەر بانگەوازی ((جیهاد)) لادەبات و چەك و تەقەمەنی و تیرۆرکردنیش وەکو ئامرازێك، بۆ گوزارشتکردن لەهەڵوێستی کۆمەڵەکە دەست پێ دەکەن.

.. کۆمەڵەکەش هەڵدەوەشێتەوە، شێخیش گەمارۆ دەدرێت و گەڕانەوەیەکی ناماقوڵانەش دەگەڕێتەوە دواوە، بەیاننامەیەکیش دەر دەکات وتێیدا دڵسۆزترین پیاوەکانی، کەڕۆژێك لەڕۆژان ناوی نابوون ((ڕاهیبانی شەوو سوارچاکانی ڕۆژ))، تاوانبار دەکات بەوەی کە ((نەئیخوانن و نەموسوڵمانن)).

ئینجا بەننا دەکوژرێت .. ئەو دەستەو دایەرەیەی کۆشکی پاشایەتی دەیکوژن، کەبەننا خۆی و فیکری و کۆمەڵەکەی ماندووکردبوو، لەپێناو مەرایی بۆکردنیاندا.

[٤٤] اقوال شكري مصطفى امام هيئة محكمة أمن الدةولة العسكرية العليا في رقم ٦ لسنة ١٩٧٧.

بەلام ئایا پێچ و پەناکردن بەرهەمی هەیە؟!...لەساڵی (١٩٥١)دا سەرکردەکانی کۆمەڵی ئیخوان، هەروەها نزیکترین کەسی حەسەن ئەلبەنناش، ڕووەدەکەنە کۆشکی عابدین، تا دەربڕین لەپشتگیریی و لایەنگریی تەواویان بکەن بۆ بکوژی ئیمامەکەیان ..

پێش ئەوەیش کەدرێژەی پێبدەین، دەمانەوێت تەنها ئەوە تۆمار بکەین کە ئەگەر بەروبوومی یەکەم کۆمەڵەکە ((بەیعە - ناونانە سەلەفیەکان - جیاکردنەوەی ڕواڵەتیانە لەکۆمەڵگە))بەشێوەیەکی ئاشکرا ڕەنگدانەوەی خۆی بەسەر کۆمەڵە ئیسلامییە سیاسییە نوێیەکاندا بەجێ هێشتبێت، بەهۆی زیاترو زیاتر دابڕانیانەوە لەدەرهاویشتە واقیعیەکانی کۆمەڵگەی نوێ و بەهۆی بێتواناییانەوە سەبارەت بەگوزەرانکردنی (ڕواڵەتیانە)یان، لەگەڵ کۆمەڵگەدا، وەك ئەوەی بەننا کردبووی. ئەوا وانەی پێچ و پەناکردنەکەش بەهەمان شێوە هەر بەروبوومی هەبوو، وەك چۆن لەمەودوا لەتوندڕەوێتی ئەم کۆمەڵانەداو لەڕەتکردنەوەیاندا، بۆ هەر سازشێك لەگەڵ دەسەڵاتدا دەیبینین .. چونکە ئەمانە بینیان پێچ و پەناکردن چی بەخاوەنەکەی کرد..

بەلام وانەکە ڕاستەوخۆ نەبوو .. چونکە کۆمەڵەکانی ئیسلامی سیاسی، پێویستیان بەئەزمونێکی تاڵتر بوو لە ئەزموونەکەی بەننا، ئەویش ئەزموونەکەی شوکری موستەفایە ..

شوكری موستەفا ئەندامێكی كۆمەڵی ئیخوانە، یەكێكە لەقوتابییەكانی سەید قوتب، ئەو سەیدقوتبەی كەبێزاربوو لەو سیاسەتی پێچ و پەناكردنەی كۆمەڵی ئیخوان پیادەیان دەكرد لەپێناو ((بەهێزبوون))،واتا دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتی سیاسیدا..

سەید قوتب بێزاربوو لەم پێچ و پەناكردنەو بڕیاری ئەوەیدا كەنابێت هیچ سازشێك لەگەڵ كۆمەڵگەی جاهیلیدا بكرێت، بەحوكمڕان و ناحوكمڕانیشیەوە.

سەید قوتبیش بیرمەندی سەردەمی هەڵگەڕانەوەی ئیخوانیی، سەردەمی نەهامەتی دووەمە (١٩٥٤)، كەماوەی زیندانیكردن بۆ ماوەیەكی زۆر درێژەیكێشا. چونكە (نەهامەتی یەكەم) سەبارەت بەدەستبەسەرەكان زۆر درێژەیكێشا، لەكۆتایی (١٩٤٨)ەوە تا (١٩٥٠)و سەبارەت بەزیندانەكانیش تا (١٩٥٢)ی خایاند..

بەلام گیراوو دەستبەسەرەكانی سەردەمی عەبدولناسر، بێ هیچ ئومێدێكی ڕاستەقینە، ساڵان لەبەردەمیاندا كەڵەكە بوو، پاشان عەبدولناسر هات تا ڕەسیدی خۆی بەرزكاتەوەو كەوتە كۆكردنەوەی نۆرین و نفوزێكی جەماوەری (میسری و عەرەبی و ئیسلامی)بیۆێنە، بەشێوەیەك كەنۆرین و هەموو هێزە سیاسیەكانی دیكە لەبەردەمیدا كەمبوونەوە، چ هێزە سیاسیە موناfیسەكان و چ هاوڕێكانی و چ نەیارەكانیش ..

لەبەردەم ئەم نفوزە جەماوەریە لەڕاددە بەدەرەشد ، هەردەبوو گۆشەگیری (ئەگە کاتێکیش بووایە) چارەنووسی ئەو هێزە سیاسیانە بوایە کەنەیاری حوکمڕانێتی عەبدولناسر بوون .. ئەم هێزە سیاسیانەش، بەشێوەیەکی دەستنیشانکراو کۆمۆنیست ئیخوانەکانبوون ..

کۆمۆنیستەکان ڕێگای ملکەچبوون بۆ جەماوەریان هەڵبژاردو بڕیاریشیان دا (یاخود بەلێکدانەوەیەکی تر بۆچوونیان وابوو) کەپشتگیری کردنیان (هەندێك جار دەگوترێت پشتگیریکردنی ڕەهاو بێقەیدو شەرتیش) بۆ عەبدولناسر بێت، واتای ئەوەیەکە بۆ خواستو ئیرادەی جەماوەر ملکەچبوون.

بەلاَم سەید قوتب ڕێگایەکی هەڵبژارد کەهەموو شتێکی بەرقەراری ڕەتدەکردەوە، چونکە ئەم شتانە هەمووی جاهلیلیانەیە، دژی ئیستعماربێت یاخود بەکرێ گیراوبێت، هەر هەمان شتەو جاهیلیانەیە، لەگەڵ سۆشیالیزمدا بێت یان دژبێت جاهیلیانەیە)) لەگەڵ دیموکراسیەتدا بێت یان دیکتاتۆریەت جاهیلیانەیە .. سەید قوتب ڕژێمی لەڕەگەوە ڕەتکردەوە، ئیتر لق و گەلاَو بەروبوومی هەچ شتێکبێت.

ئەمەش دوو هەڵوێستی بەدوادا هات: یەکەم تەکفیرکردنی حوکمڕان، دووەمیش: پایەبڵند بوون بەبڕوا..

تەنفیرکردنی حوکمڕانیش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کەڕژێمەکەی جاهیلیانەیەو بەو شتانە حوکم ناکات کەخوا ناردویێتی. گەرچی جەماوەریش (ئەمانیش هەموو موسولمانن بەگشتی) لایەنگری حوکمڕانە کافرەکەن و پشتگیریی حوکمڕانیەکەشی دەکەن، بەلام ئێمە سەرەڕای کەمی ژمارەشمان، باشترین و بەبایەخترین و بگرە بەهێزترینیشین، چونکە ئێمە لەخوا نزیکترین ((وکم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة بأمر الله))

... هەموو ئەمەش لەدەستەواژەی پایەبڵندبوون بەبڕوا کورتدەکاتەوە.

سەید قوتبیش دەبێتە قوربانی کتێبەکەی ((معالم على الطريق))و تیادەچێت، بەمەش نەهامەتی سێهەم ڕوودەدات (١٩٦٥).

لەناو زیندانی (طره)شدا، قوتابییەکی هەڵکەوتووی سەیدقوتب، لەنێوان زیندانیەکانی ئیخوان سەرهەڵدەدات، ئەویش شوکری موستەفایە. شوکری موستەفاش تەنها بریتیە لەدووبارە بوونەوەیەك بۆ هەمان دیاردە.. سەید قوتب بەپلەکاندا هاتەخوارەوە .. قۆناغێك یان چەند قۆناغێك بەرەوزیاتر توندڕەوی دابەزی .. شوکری مستەفاش هێڵەکەی بەهەمان ئاراستەدا، بەرەوخوار درێژ کرد..

... ئینجا شوکری مستەفا لەخۆی پرسی .. ئایا ئێمە دەسەلاتدارێتی فرمانکردن بەچاکەو نەهیکردن لەخراپەمان هەیە؟ ئایا ئێمە ((ئەهلی حەل و

عـەڕێین))؟ ئایـا مورشـیدەکەمان وەلی ئـەمرە بەوشـێوەیەی کەملکـەچیو گوێرایەڵی بکرێت))؟.

وەڵامدانەوەکانیش بەئاسانی .. نەخێر بوو.

بۆ؟ چونکە کۆمـەڵی ئیخـوان وەکـو ((کۆمـەڵێك لەموسـوڵمانان))خۆیـان ڕاگـەیاند، کەلەخـەڵکانی تـر بەتـەقواترنو، ئیمـاندارترینو، بانگـەواز بـۆ پێکـهێنانی دەوڵـەتێکی موسـوڵمانو حوکمڕانێکـی لەموسـوڵمان دەکـەنو داوای پیـادەکردنی شـەریعەت دەکـەن بـەڵام ئـەمان تەنـها کۆمـەڵێکن لەموسـوڵمانانو .. ((کۆمـەڵی موسـوڵمانان)) نـین کـە ((ئـەهلی حـەلو عەقد))و.. ((وەلی ئەمر بن لەئیسلامدا)).

جیاوازیش لەنێوان دانانو دانەنانی ئەو ((لە))یەدا، جیاوازیەکی ئاسانو کەمنیە، بەڵکو جەوهەری هەموو بیرۆکەکە دەنوێنێت، چونکە گەر شوکری مستەفا دروستکردنی ((کۆمەڵی موسـوڵمانان)) ڕابگەیـەنێتو خۆیبکاتـە ئەمیری کۆمەڵەکە (یاخود شوێنکەوتووەکانی وەکو ئەمیرێك بۆ کۆمەڵەکـە بەیعەتیان دابەو) .. کەواتە ئەو ئەمیری کۆمـەڵی مسوڵمانانە .. پاشـانیش بەلایەوە ئاساندەبێت ناوی خۆی بنێت ((طه المصطفی شکري))، ئەمیری موسوڵمانان، ئەمیری ئاخر زەمانو میراتگری زەویو هەموو ئەو کەسانەش کەلە سەری دەژین.

... هێڵەکە وادیارە بەرێکی، بەرەو خوارەوە درێژ دەبێتەوە .. دابەزین و بگرە زیاتر دابەزین .. ئێستا دەپرسین، ئایا کرداری لابردنی ((لە)) یەکەو هاتنەکایەوەی ئەو بۆچوونەی شوکری موستەفا کەگوایا ئەو ئەمیری کۆمەڵی موسوڵمانانە، چ جیاوازییەکی دروستکرد؟ ئەوەی کۆمەڵی موسوڵمانان لەکۆمەڵە ئیسلامیەکانی دبکە جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە کۆمەڵی موسوڵمانان دیدیان بەم شێوەیەیە:

- هەموو کۆمەڵگە بەرقەرارەکان جاهیلی و کافرن.
- ئێمە ئەو گوتانە ڕەتدەکەینەوە، کەئەوان لەزاری ئیمام و ئیجماع و هەموو ئەوانەی دیکەشەوە کەپێیان دەوترێت بتەکانی وەك قیاس، وەریدەگرن.
- پابەندبوون بەکۆمەڵی موسوڵمانانەوە، ڕوکنێکی بنەڕەتییە، بۆئەوەی موسوڵمان ببێتە موسوڵمانێکی ڕاستەقینە، ئێمە هەموو ئەو نەریتانە ڕەتدەکەینەوە کەهەڵیانبەستووەو سەبارەت بەومۆڵەتەی بەخۆیان داوە. ئەوانە خۆیان بەدەست تاغوتەوە داوە، کەئەویش بریتییە لەحوکمکردن بەوشتانەی خودا نەیناردون. هەر کەسێکیشیان شایەتمانی هێنابێت بەموسوڵمانیان لەقەڵەمداوە.

- موسوڵمان بوون بەتەنها بەوەنییە کە ئایەتمان بهێنێت، بەڵکو باوەڕهێنان و کارە، لێرەشەوە ئەو موسوڵمانەی کەلەکۆمەڵی موسوڵمانان جیادەبۆوە کافر بوو.
- ئیسلامی حەق ئەو ئیسلامەیەکە ((کۆمەڵی موسوڵمانان))بانگەشەی بۆ دەکات، ئەمیش تەنها ئەو ئیسلامەیە کە پێغەمبەر (د.خ)و ئەسحابەکان و سەردەمی خەلیفە ڕاشیدینەکان لەسەری دەڕۆیشتن، لەپاش ئەمانەشەوە، هیچ ئیسلامێکی ڕاست تا ئێستا لەسەر زەوی بوونی نەبووە.[٤٥]

لەو دەمەشدا کۆمەڵێکی تر هەبوو کەئەویش درێژکراوەی حیزبی ڕزگاریخوازی ئیسلامی بوو .. ناوی نرابوو کۆمەڵی ((ساڵح سریە)). ناکۆکی نێوان ئەم دووکۆمەڵەش لەدوو مەسەلەدا خەست ببۆوە. ساڵح سریە دەڵێت ((بەبێ بوونی خەلیفەیەك بۆ موسوڵمانان، هیچ جیهادێك نابێت هەروەها دەڵێت بنیاتنان و چاککردنی نەوەی مزگەوتەکان ناشەرعیە چونکە دەبێتە تفاقێك بۆ دەوڵەتی کافران))

---

[٤٥] شكري مصطفى – التوسمات (مخطوط على ورق كراس مسطر متوسط الحجم من ٨٥ صفحة .. مدون بالحبر الاسود والعناوين وبعض الفقرات الهامة بالحبر الاحمر).

کۆمەڵی سالح سریەش پاش ڕووداوەکانی فیتنەی سەربازی، کەبەلەسێدارەدانی خۆی و ژمارەیەك لەشوێنکەوتووانی و هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخراوەکەی تەواو بووە، زوو کۆتاییهات.

شوکری موستەفاش مایەوە تازیاتر درێژە بەتوندڕەویی بدات، ئەمەش تەنها لەبەر یەك هۆی ئاسان، ئەویش ئەوەیە کەشوکری هەموو کۆمەڵگەی ڕەتکردەوە، هەروەها حوکمڕان و ناحوکمڕانیشی بەکافر لەقەڵەم دا، فەتوای ئەوەشی دا کەئەمانە گەرچی شایەتمانیش بهێنن هەر موسوڵمان نین .. پاشانیش زیاتر دابڕا .. زیاتریش پەنای بردە بەر دەقەکەو، بەرامبەر هەموو واقیعێك پەیوەستبوو پێوەی، گەرچی واقیعەکە هەرچەندیش زەق و ئاشکرا بووایە..

پێویستیش ناکات ئێمە باسیبکەین .. ئەوەتا کابرا هەڵوێست و قسەی خۆی هەیە .. ئەو بەڵگەنامەیەش کەئێستا ئێمە قسەو هەڵوێستەکانی لێوە وەردەگرین، یەکێکە لەگرنگترین کتێبەکانی شوکری موستەفا، بۆئەوەش تەرخانکراوە تا ((ئەمیری کۆمەڵەکان)) واتا کادێرە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵەکە بیخوێنن .. ناویشی ((التوسمات))ە.

کتێبەکەش لەبەر یەك هۆی ئاسان نووسراوە، ئەویش ئەوەیە کە شوکری مستەفا لەگەرمەی تەکفیر کرندیدا بۆ کۆمەڵگە، هەموو دەسکەوتەکانی

مەدەنیەتی نوێی بە ((کالایەکی کافرانە))لە قەڵەم دا. .چاپخانە تفاقێکی کافرانەیە، نابێت بەکاربهێنرێت ..

.. بەهەرحاڵ نووسراوەکە لەبەردەستماندایە، با ئاماژە بەهەندێکی کەم لەبابەتەکانی بکەین[٤٦] .. ئێستا بێتوانج چەند برگەیەکی کتێبەکە دەخەینەڕوو.

ئینجا بسم الله الرحمن الرحيم، سەرەتاکەی بەم شێوەیەیە: إن كل شيء خلقناه بقدر. تساوي ما خلقنا السماوات والأرض ومابينهما إلابالحق وأجل مسمى والذين كفروا عما أنذروا معرضون. ئەرکی پێویست بۆ دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلام لەسەر دوو مەسەلە پێکدێت:

١) تەفرو توناکردنی کافران. ٢) گرتنەدەستی میراتی زەوی، لەلایەن ئیماندارانەوە مافێکی جێگیرو سوننەتێکی جێگیرە ناگۆڕرێت، لەبەر ئەمە خودا کردویێتیە یەکێك لەپەیمانەکانی خۆی))

.. ((كما بدأنا أول الخلق نعيده))

لێرەدا شوکری موستەفا ڕادەوەستێت تا وشەی ((كما)) بگرێتەدەست .. (كما)ش واتا ((مثل – وەکچۆن)) ((كما استخلف الذين من قبلهم)) لەیەکێك لەحەدیسەکانیشدا ((سيعود الاسلام غريبا كما بدأ))، (وەکچۆن)ێتیش لای

[٤٦] عبدالرحمن ابو الخير – ذكرياتي مع جماعة المسلمين (التكفير والهجرة). دار البحوث العلمية الكويت – (١٩٨٠)– ٥٧.

شوکری مستەفا کامڵو ڕەهایە .. وەکچۆن کافرە پێشینەکان بەهیلاکچوون، هەربەو شێوەیەك کافرە نوێیەکان بەهیلاك دەچنو ئیسلامیش لەسەردەمی پێغەمبەردا چۆنبووە هەر بەو شێوەیەش دەگەڕێتەوە، وەك ئەو سەردەمە، بەشێوەیەکی ڕەها، ((کما بدأنا أول الخلق نعیده)).

بەم شێوەیە ئیسلام بەتەواوەتی لەسەرەتادا چۆن بووە، هەر بەو شێوەیەش دەگەڕێتەوە، یان وەك شوکری گوتی (بست بە بستو هەنگاو بەهەنگاو).

هەروەها شوکری موستەفا بەردەوام دەبێت ..((بەڵام پێغەمبەر تا کۆچ (هجرة)ی نەکرد دەوڵەتی بۆ ئیسلام دروستنەکرد .. ئایا ئێمەی کۆمەڵی ئاخر زەمانیش، پێویستە لەسەرمان هیجرەتبکەین وەك پێغەمبەر، تا دەوڵەتێك بۆ ئیسلام دروستبکەین. وەڵامەکەش: بەڵێ .. پێویستە هیجرەتبکەین .. ئیسلامەتی پێکنایەتو دەوڵەتی بۆ دروست نابێت تەنها پاش هیجرەت نەبێت)) پاشان بەڵگەو بیانوویەکی تر دێنێتە پێشەوە ((وما من رسول الا وهاجر - واتا- هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کۆچی نەکردبێت)) (لێرەدا تێبینی وشەی پێغەمبەر - رسول - بکە، ئایا شوکری موستەفا خۆی بەپێغەمبەران بەراورد دەکرد؟!). هەروەها چەندەها بەڵگەو بیانوی دیکەش.. مەبەست لەبوونی مرۆڤایەتی پەرستنی خودایەو پاشان

بەدەستهێنانی ڕەزامەندیەتی، پەرستنی خوداش گەر بڕوونکردنەوەو شیکردنەوە بیکەین بەچەند بەشێکەوە، لەم شتانەدا خۆی دەنوێنێت:

١- لەپێش هەموو شتێك، مرۆڤ خۆی لەبەلاّ ڕزگار بکات، بەلاّی کەوتنە شەریك بۆ خودا پەیداکردن (شرك)ەوەو بەلاّی تووش هاتنی بەردبارانکردن و ئازاردان لەلایەن کافرانەوە.

٢- بانگەوازو ڕاگەیاندنی کامڵ و گشتگیر لەسەر ئاستی هەموو جیهان.

٣. جیهاد کردن لەپێناو خوادا، بۆئەوەی دەوڵەتی ئیسلام بێتەکایەوە.

ئەم پەرستن و عیبادەتکردنەش بەهەرسێ بەشەکەیەوە، مرۆڤ ناتوانێت بەجێیان بگەیەنێت، تەنها لەنێو ئەوکۆمەڵگە موسوڵمانەدا نەبێت کەلەهەموو مەسەلەکاندا، پەنا دەبەنەبەر شەرعی خودا، بەلاّم ئەم گۆمەڵگەیە بوونی نیە، هەبوونیشی بۆتە شتێکی زەرور بۆ پەرستنی خودا. چونکە هەرشتێك کەتەنها بەو واجبەکان بەجێبگەیەنرێت، خۆیشی واجبە. هەروەها چەندەها بەڵگەی دیکەش ((جیهاد کردن لەپێناوی خوادا، تەنها پاش هیجرەت فەرزکرا بەسەر موسوڵمانانندا))، ((مۆڵەتدان بەکوشتار، تەنها پاش هیجرەت لەمەدینەدا سەری هەڵدا)) هەروەها ((بەهیلاکچوونی کافران و ڕووخاندنی دەوڵەتەکەیان ڕوونادات، گەر ئیمانداران لەنێوانیاندابن، سوننەت وایە کە موسوڵمانان لەخاکی کوفر بێنەدەرەوەو تەنها کافرانی تێدا بمێننەوە.. ئینجا عەزابیان بەسەردا دەبارێت)).

... تەکفیرکردنی هەموو خەڵك گەر پەیوەندییان نەکرد بە کۆمەڵەکەیەوە، زەرورەتی هیجرەت لەمەوە کۆمەڵەکە ناونرا کۆمەڵی ((تەکفیر و هیجرە))، بەڵام ناوەڕاستەقینەکەی ((کۆمەڵی موسوڵمان))ە.

پاش هیجرەتیش جیهاد .. بۆ دیاریکردنی شێوەی جیهادەکەش پشت بەم ئایەتە پیرۆزە دەبەستێت ((بل نقذف بالحق على الباطل فيدفعه فإذا هو زاهق))، شوکری موستەفاش ئاماژە دەدات و دەڵێت ((خودا حەقی نەخستە سەرباتڵ .. بەڵکو لێیدا پێی .. واتا بەهێزو بەتوندی)).

پاشان ((باتڵەکە پووچەڵدەبێت و دەتوێتەوە - فإذا هو زاهق))واتا هاوسەنگی هێز شتێکی پێویست نییە، چونکە هێندە بەسە کەحەق خۆی هەڵداتە سەر بەتاڵ، ئیتر باتڵەکە هەرچەند بەهێزترو سەختترو پڕچەکتریش بێت ((پووچەڵدەبێتەوە)).

هەروەها شوکری شێوزای جیهادەکەو چەکەکانیشی دیاریدەکات، بۆ ئەمەش پەنادەباتەبەر دەقە حەرفیەکەو لێکدانەوەو ڕاقەی حەرفی دەقەکە ((ئەوەی لەمەدا ئاشکرایە ئەوەیە کەبەدەقێکی گشتی هاتووە، دەقەکەش ڕوونیدەکاتەوە کەئەم مەسەلەیە سەر بەئاییني خودایە، یەکێکە لەئەرکەکانی موسوڵمانانیش و بەبێ ئەمەش نابنە کەسێکی ئیماندار. گەر دەقەکانیش بەم شێوەیە هاتبن، کەواتە پێویستە شوێنیکەوین و گوێڕایەڵی بین .. بۆ نموونە کاتێك خودای مەزن دەفەرموێت (وأعدوا لهم ما استطعتم

من قوة ومن رباط الخيل ترهبون به عدو الله وعدوكم)ئەوا ئەم وتارە ئاراستەی هەموو موسوڵمانانی ئەوەڵ زەمان و ئاخرزەمانیشکراوە، هێزەکەش بریتیە لەهەڵدان، ئەسپیش هەر ئەسپە، گەر کەسێکیش هات و گووتی ئەسپ بۆ ئێستا بەکەڵکنایەت، ئەوا دەڵێین .. ئێمە کاتێك شەڕ دەکەین، شەڕەکەمان بەلێدان و شمشێرو ئەسپ دەکەین)).

ئەی چۆن ئەسپ ڕوبەڕووی تانك و فڕۆکەو موشەك و چەکی ئەتۆمی دەبێتەوە، بەئاسانی وەڵام دەداتەوە ((وكان حق علينا نصر المؤمنين)).

پاشان شوکری مستەفا بەردەوامدەبێت تا بازنەکەتەسکتربکاتەوە ((نە ئیجماع و نەقیاس و نەمەسڵەحەی مورسەلە ونە ... ونە ..، تەنها گوتەی خواو پێغەمبەرو بەس ... کۆمەڵی محەمەد (د.خ) وابوون، ڕاستەوخۆ لەوتەکانی خوداو پێغەمبەرەوە ڕێنماییان وەردەگرت، کۆمەڵی ئاخرزەمانیش پێویستە هەر هەمان ڕێباز بگرێت)).

تەنها قورئان و سوننەت، هەمووشتەکانی دیکە ڕەت کراون و سەربەئیسلام نین، تەنانەت زانست فێربوونیش ڕەتکراوەیە، چونکە ((کۆمەڵەکەی محەمەد (د.خ) تەنها بۆ زانست نەبوو کەفێردەبوون و هەروەها بۆ دونیاش نەبوو، بەڵکو لەپێناوی عیبادەتکردندا بوو)).. ((زانست ئامرازێکە بۆ پەرستنی خودا، هەر زانستێکیش مرۆڤ بۆ غەیری عیبادەتکردن فێری ببێت، ئەوا لەپێناوی خوادا نیەو بۆ خۆیەتی، ئەمەش

شیرکە. پێغەمبەر ﷺ یش دەیفەرموو، پەنا بەخوا دەبەم لەزانستێك كە كەڵكی نەبێت)) ((خودایە پەنا بەتۆ دەبەم لەزانستێك كەكەڵكی نەبێت واتە زانستێك کەتۆی پێنەپەرستم)). ((پێغەمبەر (د.خ)نەدەیخوێندەوەو نەحسابیشی دەکرد، لەتواناشیدا هەبوو بخوێنێتەوەو حساببکات، بەڵکو هەموو نەتەوەکەشی نەتەوەیەکی نەخوێندەوارە، ناخوێننەوەو حساب ناکەن.. خیر أمە اخرجت للناس امة امیة.))واتا باشترین نەتەوە کەبۆ خەڵکی وەدەرخراوە، نەتەوەیەکی نەخوێندەوار .. بەنەتەوەی نەخوێندەواریش مەبەستی لە گشت زۆرینەی ئەم نەتەوەیەیە، ئەمەش ڕێگریی لەوە ناکات کەهەندێکیان خوێندەواربن و حساببکەن، بەڵام کۆمەڵی حەق لەئاخر زەماندا .. بەگشتی و سیمایان ئەوەیە کە نەتەوەیەکی نەخوێندەوارن)).

بەم شێوەیە ڕاڤەکردنە حەرفیەکەی دەقەکە دەبێتە قەفەزێك کەدەرچوونی لێوە نیە .. پاشان جارێکیتر شوکری مستەفا دێتەوە، تاوێنەیەکی خەیاڵی بۆ سەرکردایەتی دەوڵەتەکەی بکێشێت .. ((خودا بەکوشتاری نێوان دووهێزی گەورە، ڕێگا بۆ کۆمەڵی حەق خۆشدەکات، دووهێز کەناکۆکیەکی فیکری گەورە لەنێوانیاندا هەیەو هەریەکەیان دەیەوێت دەستبەسەر هەموو جیهاندا بگرێت، مەبەستیشمان لەڕوسیاو ئەمریکایە .. پاش ئەوەیش کەئەم دووانە هەریەکەیان ئەویتر لەناو دەبات لەجەنگی جیهانی سێهەمدا، موسوڵمانان دەست بەکوشتار دەکەن)).

جارێکی تریش دەگەڕێینەوە بۆلای ((وەکچۆن))، وەك چۆن ڕۆمەکان و فارسەکان لەیەکیان دا، وەکو ڕێخۆشکردنێك بۆ پێکهاتنی دەوڵەتی ئیسلامی یەکەم .. هەر بەو شێوەیەش ئێستا ئەمە دووبارە ڕوودەداتەوە.

... جارێکیتر، مسوڵمانەکان چۆن دەجەنگن ((شێوزای جەنگ و کوشتار لای مسوڵمانان بریتییە لەڕووبەڕووبوونەوەی پیاو بەرامبەر پیاو، چونکە ئەمانە کەسانێکن دونیایان فرۆشتوەو ئاخیرەتیان کڕیوە، بەڵام بنەمای کافران لەکوشتاردا دەرەنجامێکی سروشتیی لەخودا یاخیبوونەو بەپارەو پول و بناغەیەکی کافرانەش پێکهێنراوە)).

مەسەلەکەش لای شوکری زۆر ئاسانە ((خودا بەهێزو توانای خۆی بالادەستمان دەکات لەزەویدا، ئەمەش مەسەلەیەکە، ئێمە ناتوانین دەستی تێوەردەین، خودای مەزن و میهرەبان خۆی پەیمانی پێداوین، گەر بیپەرستین سەرمانخات)).

... پێش ئەوەیش شوکری مستەفا لەنزمایی بنارەکەدا جێبهێڵین، پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کەناوی خۆی نابوو ((ئەمیری ئاخرزەمان))، بۆ؟ چونکە ئەو وای لەقەڵەمدەدات کەئێمە بەڕاستی لەئاخرزەماندا ین ((تقوم الساعة والروم اکثر الناس- واتا: کاتێك ئاخرزەمان دێت ڕۆمەکان لەهەمووکەس زۆرترن)) شوکریش ئەم وتەیە بەوە لێکدەداتەوە کە

((ڕۆمـەکان جولەکـەکانن))، بالادەسـتبوونی جولەکـەکانیش لەسـەر زەوی یەکێکە لەنیشانەکانی ئاخیرەت..

چـەندەها نیشـانەی زۆریـش بـۆ ئاخرزەمـان باسـدەکات، لەوانـە ئاوەدانکردنـەوەی بێـت المقـدس .. وشـکبوونی دەریاچـەی تەبـەریا، دارخورمـای بیسـان بـەرناگرێت، دەشـڵێت ئـەم نیشـانانە دێنـەدی، هیـچ شتێکیش نامێنێت ئەوە نەبێت کەکۆمەڵی موسوڵمانان ڕاپەڕن، بۆ ئەوەی ببنە میراتگری خوداو عەدالەت بەرقەرار کەن..

بـەلام جارێکیـتر چـۆنو؟ بـەچ چـەکێك .. شـوکری وای بـۆ دەچێـت کەپیاوەکانی پێویستیان بەچەکێکی زۆر نییە ((چونکە ئەمانە ئەوکەسانەن کەبـەرد بۆیـان دێتـەزمانو پێیـان دەڵێـت ئـەی عـەبدی خـودا وەرە ئەمـە جولەکەیەکە لەپشتمەوە خۆی شاردۆتەوە، بیکـوژە، هـەروەها ئەمانـە ئـەو کەسـانەن کەبـەبێ کوشـتار دەسـتدەگرن بەسـەر قوسـتەنتینیەداو تەنـها بەگوتەی لائیلاهەئیلەڵلا بۆیان والا دەبێت)).

... چارەنووسی شوکریو کۆمەڵەکەشی زانراوە کەچیان بەسەر هات..

بەلام پێش ئەوەی بچینە لایەکیتر، پێویستە ئەوە تۆمار بکەین کەئـەم هـەموو توندڕەویـە زیادەڕەوییـە، تەنـها دەمو قسـەبوو، چونکـە هـەروەها خاوەنی ئاڵۆزترینو توندڕەوترین قسەکانیش، بەهـەمان شێوە ئامـادەبوو

کەلەگەڵ ((تاغرت))و حکومەتی کافردا ڕێبکەوێت .. ئایا ئەمەش نەوەی ڕاستەوخۆی کۆمەڵی ئیخوان نیە؟

یەکێك لەناودارەکانی کۆمەڵی موسڵمان، کەئەویش عەبدولڕەحمان ئەبولخەیرە، گفتوگۆیەکی سەیرو سەمەرە دەگێڕێتەوە .. ڕەنگە پێویستیش بێت ئاماژەی پێبکەین .. پاش ڕووداوەکانی فیتنەی سەربازی، لەلایەن سەرکردەکانی ((کۆمەڵی مسولمان))ەوە، کۆبوونەوەیەك بەسترا .. گفتوگۆیەکەش وەك ئەوەی عەبدولرەحمان ئەبولخەیر تۆماریکردووە بەم شێوەیە ((ئەبو عەبدوڵلا (ماهیر بەکری): حکومەت پێیڕاگەیاندوین کە حەز دەکات هاوکاریمان لەگەڵدا بکات، لەسەر بنەمای ئەوەی کۆمەڵەکەمان، گەنجان لەڕێچکە کودەتاییەکان دووردەخاتەوەو بانگەواز بۆ هیجرەتدەکات. حکومەت پێویستی بەکۆمەڵێکی ئیسلامیە کەگەنجە تایبەتیەکان بگرێتە خۆی، پاشان پێویستی بەکۆمەڵێکیترە کەگەنجان بەگشتی بگرێتەخۆی .. ئینشائەڵلا ئێمەش کۆمەڵە تایبەتیەکەین و ئەوەشمان قبوڵە، ڕەنگە پێشمان بڵێن بەکرێگیراون، با بڵێین، گرنگ ئەوەیە ئێمە پێشکەوتن بۆ کۆمەڵەکە بەدیبهێنین، ئینشائەلا دەشبینە تاکە کۆمەڵە لەمیسردا)).

- ئەبولخەیر: ئەی ئیخوان موسلیمین.
- عەبدولا: لەوانەیە ئەوان کۆمەڵە گشتیە چاوەڕوانکراوە کەبن.

- ئەبولخەیر: ئەی لەبەرامبەر چیدا، ئەم تاغوتە ڕێگەمان پێدەدات بەئازادی ئیش بۆ ئیسلام بکەین.

- ئەبو عەبدولا: لەبەرامبەر دورخستنەوەی گەنجان لەکودەتا، حکومەت کەئەم حەزی هاوکاریەی پێڕاگەیاندوین، خۆی باش دەزانیت کەلەئێستادا، ڕێبازی ئێمە لەگەڵ پیلانەکانی ئەواندا پێچەوانە نییەو ڕێبازەکەمان بریتیە لەڕێبازی هیجرەت و گەنجان لەکۆبوونەوە ڕێچکە کودەتاییەکانی وەك ڕێکخستنەکەی فیتنەی سەربازی دووردەخاتەوە.

- ئەبولخەیر گومانەکانی خۆی دەخاتە ڕوو و دەڵێت ئەم تاغوتە فریومان دەدات)

- ئەبو عەبدولا: نەخێر، حکومەت بەڕاستیەتی. هەروەها پێشی ڕاگەیاندوین کە قەرەبۆیەکیشمان پێشکەش دەکات، سەبارەت بەو زیانانەی پێمانگەیشتووە لە ڕابردوودا، وەك پروپاگەندەی خراپ یان دەسگیر کردنەکان. داواشی لێکردوین شکایەت لەو ڕۆژنامەو دەزگایانە بکەین کەڕۆڵیان هەبووە لەم مەسەلەیەدا، بۆئەوەی قەرەبۆیەکی باشمان دەستبکەوێت. لەگەڵ پارێزەرەکەشدا ڕێکەوتووین .. کۆمەڵەکەش پێویستی بەپارەیە.

- ئەبولخەیر: تاغوت بۆ ئەوە ڕاماندەکێشێت کە پەنا ببەینە بەرئەو، ئەمەش بەپێی شەرع حەرامە.

- ئەبو مسعەب (ئەنوەر مەئمون سەقر): بۆچی حەرامە، پێغەمبەر (د.خ) چووە پەنای کافرێکەوە، پەنای دایە بەر مەتعەم بن عودەی تا لەکافران بپارێزرێت لە تائیف.

- ئەبولخەیر: کەواتە بەم پێیە تاغوت بۆ بەرژەوەندیی خۆی سوودمان لێدەبینێت.

- ئەبولغەوس (محەمەدلئەمین عەبدولفەتاح): قبوڵمانە، قبوڵمانە.[٤٧]

شوکری موستەفاش بەردەوامدەبێت و پاساو بۆ ئەوە دەهێنێتەوە کەدەتوانن لەگەڵ تاغوتدا ڕێبکەون.

((ئەبو سەعد (شوکری موستەفا)گوتی، من بەتاغوت دەڵێم من نابمە کۆسپ لەسەر ڕێگای تۆ، ڕێگەگرتنیشم لەئافرەتان کەنەچنە زانکۆو قوتابخانەکان، ئەوە دەگەیەنێت کەمن بەتاغوت دەڵێم، ئەوەتا من تەنگ و چەڵەمەی خوێندن و هاتوچۆیانت لەکۆڵدەکەمەوە، هیجرەت کرندیشم ترسێکی کودەتایی لەسەر تۆ دروست ناکات، بەمەش لەکەمکردنەوەی کێشەی نیشتەجێبووندا بەشدار دەبم، واز لەوەزیفەکان دێنین و ئەو

---

[٤٧] المرجع السابق ص ٨٤.

مووچانەشت بۆ دەگەڕێتەوە کەدەماندرێتی)). ئەبو عەبدولاش (ماهیر بەکری)دێتەوە تا مەسەلەکە ڕوون بکاتەوە، دەڵێت: ((چەند حسابێکی ورد هەیە بۆ بەرژەوەندیە هاوبەشەکانی نێوان کۆمەڵی مسوڵمان و جاهیلیەت، بۆ نموونە ئەگەر کارێك هەبوو کۆمەڵەکە توانی بەهاوبەشی لەگەڵ دوژمندا بیکات، بەشێوەیەك کەکۆمەڵەکە ٥٤٪ ی لێ دەستبکەوێت و دوژمنیش ٤٦٪، ئەوا دەیکەین، چونکە ئەمە پێشکەوتنی تێدایە بۆ کۆمەڵەکە .. جیهان هەمووی بەرژەوەندیی هاوبەشە، لەنێوان مسوڵمانان و جاهیلەتدا، خوداش لەگەڵ ئێمەدایەو لەگەڵ ئەواندا نییە، پاشانیش ئێمە دەتوانین پارێزگاری لەبەدەستهێنانی ڕێژەیەك بەرژەوەندیی گەورەتر بکەین، لەو ڕێژەیەی دوژمن بەدەستی دەهێنێت))[٤٨].

.. پێویستیش ناکات هیچی لەسەر بڵێین، چونکە کۆتایی هەموو ئەم شتانە زانراوە .. چارەنووسی کۆمەڵەکەو چارەنووسی سەرکردەکانیشی زانراوە.

.. ئێستاو پاش هەموو ئەم شتانە، ئایا هیچ بوارێکی تێداماوە بۆ توندڕەویی زیاتر؟

وەلامەکەشی، کە ڕەنگە سەیربێت، ئەمەیە .. بەڵێ ..

---

[٤٨] المرجع السابق – ص ٨٧.

لەسەرەتاکانی (١٩٧٩)دا محەمەد عەبدولسەلام فەرەج کتێبی ((الفريضة الغائبة)) بڵاودەکاتەوە تا تێیدا ڕابگەیەنێت کە ((تاغوتەکانی ئەم سەر زەویە لاناچن تەنها بەهێزی شمشێر نەبێت. (لەوانەیە وانەکەی باش وەرگرتبێت و وازی لەڕێکەوتن و هودنە هێنابێت - نووسەر) )).

ژمارەی ئەو دەرگای کوفرانەش زۆربوون کەحوکمڕانەکانی ئەم سەردەمە لێوەی لەمیللەتی ئیسلام چوونەتە دەرەوە، بەڕاددەیەك کەهیچ یەکێك لەوانەی، لەژیاننامەی ئەم سەرکردانە دەکۆڵنەوە گومان لەڕاستی ئەم مەسەلەیە ناکەن. حوکمڕانەکانی ئەم سەردەمە هەڵگەڕانەوە لەئیسلام، ئەمانە لەسەرسفرەوخوانی ئیستعمار پەروەردەبوون چ خاچ پەرست بێت یان شیوعی بێت یان زایۆنی). ئەمانە تەنها بەناو ئیسلامن، گەرچی نوێژیش بکەن و ڕۆژوش بگرن و واشڕابگەیەنن کەموسڵمانن))[٤٩].

ئینجا شەپۆلێکی نوێی توندڕەوتر دەستپێدەکات، چونکە ئەم شەپۆلەیان دابڕاوترە لەکۆمەڵگەو زیاتر بێزارە لێی وکۆمەڵگەو دەرهاویشتەکانیشی ڕەتدەکاتە. چەندەها ناویشیان هەبوو کەڕەنگە بەناوبانگترینیان ((کۆمەڵی ئیسلامی - الجماعة الاسلامية)) بێت، کەبە ((کۆمەڵی جیهاد - جماعة الجهاد)) ناوی دەرکردبوو.

---

[٤٩] المرجع السابق - ص ٨٧.

ئەم كۆمەڵە لەژێر ئەم نا ٍنیشانەدا ((ميثاق العمل الاسلامي))ئامانجەكانی خۆی ڕادەگەیەنێت، ئەمیش چاپكراوێكی نهێنییە .. تێیدا دەڵێت:

((مەبەستمان: ڕەزامەندیی خوای گەورەو میهرەبانە، ئەمیش بەدڵسۆزی تاك و تەنیا بۆ پەروەردگارو بەدیهێنانی شوێنكەوتنی پێغەمبەرەكەی).

عەقیدەمان: عەقیدەی سەلەفی ساڵح، سەرلەبەر.

ئامانجمان: بەعەبدكردنی خەڵك بۆ خوداكەیان.

٢- پێك هێنانی خەلافەتێكی ئیسلامی ڕەشید.

ڕێبازمان: بانگەواز كردن بۆ خودا، فەرمان بەچاكەو نەهی لەخراپە، جیهاد كردن لە پێناوی خوادا، ئەمیش لەڕێی كۆمەڵێكەوە كەبزووتنەوەكەی بەشەرعی پاك و بێگەرد ڕێكخرابێت و ڕێكەوتن و هودنە یان ملپێدان ڕەت باتەوەو ئەزموونەكانی پێشخۆی لەبەرچاوبێت.

تێشومان: زانست و تەقوا، یەقین و تەوەكول، سەبرو شوكر، دەست بەردان لە دونیاو بەباشتر زانینی ئاخیرەت.

گوێڕایەڵیمان: بۆ خوداو پێغەمبەرەكەی.

دوژمنكاریمان: بۆ ستەمكاران.

كۆبوونەوەمان بۆ یەك ئامانج، بەیەك عەقیدە، لەژێر ئاڵای یەك فیكرەدا))[٥٠].

---

[٥٠] المرجع السابق ص ١.

وا ئێمە لەبەردەم فیکری شێخ عومەر عەبدولڕەحماننداین، کەهەمار بەڵگەنامە دانی پێدا دەنێت، ئەو ئەمیری گشتیی کۆمەڵەکە بوو.[51] پێش ئەوەیش درێژەی پێبدەین، ڕادەوەستین بۆئەوەی تێبینی ئەم شتانە بکەین:

- بەعەبد کردنی خەڵك بۆ خوداکەیان .. واتا زۆر لەخەڵككردن بۆ عیبادەتکردن.
- ڕێکەوتن و مل پێدان ڕەتدەکاتەوەو ئەزموونەکانی پێش خۆی لەبەرچاوە، بەمەش مەبەستی لەڕێکەوتنەکانی ئیخوان و شوکری موستەفایەو ڕەتیشیاندەکاتەوە.
- کۆمەڵەکە ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە کۆمەڵانی ئیسلامی سیاسی، بەش بەشبن و هەوڵ بۆئەوە دەدات کەلەیەك کۆمەڵی ڕێك و پێکداو.. لەژێر ئاڵای یەك فیکرەشدا یەکبگرن.
- دەستەواژەی دەستبەردان لەدونیا، ئاماژە بەوە دەدات کۆمەڵەکە ئەوانە ڕەتدەکەنەوە کەناویان نابوون ((ئیسلامە سەرمایەدارەکان))، ئاماژەدانیش بەسەرمایە، لەبنەڕتدا مەبەستیان لەئیخوان موسلیمینەکانە.

پاشان بەڵگەنامەکە بەردەوامدەبێت و هەڵوێستی کۆمەڵەکە بەرامبەر بەڕژێم دەستنیشان دەکات:

---

[51] المرجع السابق ص ٤.

((حوکمڕان: کۆمەڵی ئیسلامی بۆچونی وایە ئەو حوکمڕانەی کاربەو شتانە ناکات کەخودا ناردونی، حوکمڕانێکی کافرەو لەئیسلام لایداوە؟.

ئەنجومەنی گەل: کۆمەڵی ئیسلامی نەیاری ئەوە بوو بچێتە ئەنجومەنی گەلەوە، لەبەرئەوەی ئەنجومەنی گەل، چەند یاسایەك دەردەکات پێچەوانەی شەرعی خودایە، خوداش سزاکەی هێندە توندکردووە کە دەگاتە ڕاددەی شیرك، هەروەها خودا ئەو کەسەشی بەدوژمنی خۆی لەقەڵەم داوە کەبەبێ گەڕانەوە بۆلای ڕێنماییەکانی خوا شەرع دادەنێت))[٥٢].

کۆمەڵەکەش شانازی بەوەوە دەکات کەتوندو تیژی بەکار دەهێنێت..

((کۆمەڵەکە ئازیزترین ڕۆڵەکانی خۆی هێناوە بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی ڕژێمی سادات، لەپێشەنگی هەمووشیاندا، خالید ئەلئیسلامبولیو چوار براکەی، شەهیدانی ساڵی ١٩٨١))[٥٣].

هەروەها بەڕاشکاوی بڕیار دەدات کەبەردەوام دەبێت لەسەر ((هەوڵدان بۆ دەربازکردنی کۆمەڵگەو شەقامی میسری لە خراپەکارییە ئاشکراکان، وەك کارگەی خواردنەوە کهولیەکان، یانەکانی ڤیدیۆ کەبازرگانی بەسێکسەوە دەکەن، لەناوبردنی بێئابڕوویی لەعەین ئەلشەمسدا. بەڵام بەمەرجێك گۆڕینی

---

[٥٢] المرجع السابق ص ١.

[٥٣] المرجع السابق ص ٥.

ئەم خراپەکاریانە، بەپێی ڕێسایەکی شەرع بێت دەنا خراپەکاری گەورەتریان لێدەکەوێتەوە))[٥٤].

سەبارەت بەهەڵوێستی کۆمەڵەکەش، بەرامبەر بەئازادیی بیرو ڕاو فیکر..

((ئامانج لەئازادیی فیکر، ئازادیی کوفرە، دەنا ئازادی چ فیکرێك کەتانە لەئیسلام بدات، یاخود لەپێودانگەو سیستەمەکانی ئیسلامەوە سەرچاوە نەگرێت))[٥٥].

... کۆمەڵەکەش لەم بەیاننامەیەیدا، کەئەمیش دوا بەیاننامەیانە پاش ڕووداوەکانی عەین ئەلشەمس، بەڕاشکاوی پەیمان بەڕژێم دەدات، جگە لەوەی بەڕاشکاویۆ لەهەمان بەیاننامەشدا، ناوی سەرکردەکانی کۆمەڵەکەی هێناوەو دووپاتیشی کردۆتەوە کەهیچ گفتوگۆیەك قبوڵ ناکات گەربێتو لەگەڵ ئەم سەرکردانەدا نەکرێت، کەئەمانیش ناودارەکانی کۆمەڵەکەن ((سەرکردەو بلیمەتەکانی کۆمەڵی ئیسلامی کە ئەندامەکانی کۆمەڵەکە پێویستە گوێڕایەڵو ملکەچیانبن، ئەمەش ناوەکانیانە: د. عومەر عەبدولرەحمان، شێخ کەرەم زوهدی، شێخ ناجی ئیبراهیم، سێخ ئوسامە حافز، شێخ عەبدولئاخەر حەماد)).

---

[٥٤] المرجع السابق ص ٢٥.

[٥٥] المرجع السابق ص ٢٧.

دەڵێم کۆمەڵەکە بەڕاشکاویی پەیمان بەدەسەڵات دەدات و دەڵێت ((ئەم پرسیارە گرنگە ماوە، ئایا کاردانەوەکانی پێشوو، هیچ کەڵکیان هەبووە؟ ئایا توانیویانە ببنە ڕێگر لەبەردەم جەورو ستەمی ئاسایشدا؟

وەڵامە بێ گومانەکەش ئەمەیە .. نەخێر ...

بەدڵنیاییەوە لەداهاتووشدا هەر ... نەخێر ... دەبێت

بەدڵنیایشەوە لەداهاتوودا بارودۆخەکان، لەیەکێك لەم دوو ئەگەرە تێپەڕناکات.

ئەگەری یەکەم: کۆمەڵی ئیسلامی هەوڵبدات وەرەقەکانی کۆبکاتەوەو بڕای بڕای وازبهێنێت لەکاری ئیسلامی، بۆ ئەوەی بەدووربێت لەو پاکتاو کردنە لاشەیی و جەنگە پارتیزانییەی کەدەوڵەت دژی ئەندامەکانیان بەرپای کردووە..

ئەگەری دووەم: کۆمەڵەکە پەنا بەرێتەبەر بەکارهێنانی چەند جۆرێکی تر، لەکاردانەوە زیاتر توندوتیژو شەڕانگێزیەکان، بەمەبەستی ئەوەی سنوورێك بۆ توندوتیژی و ستەمی ڕژێم دانێت، ئەمەش وەك کاردانەوەیەکی سروشتیی لەلایەن ئەو کەسانەوە کەزام و برینەکان، هەموولاشەیانی داگیرکردووە.

واقیع و مێژووش شایەتن کەئەگەری یەکەم وەلاوەنراوە.

ئێستا .. بێگومان پرسیارێك لەمێشکی خوێنەردا وروژاوە .. ئایا هیچ کۆتاییەك نیە بۆ ئەم توندڕەویە؟ تاکەی کۆمەڵانیئیسلامی سیاسی هەروا بەئامادەیی دەمێننەوە، بۆئەوەی زیاتر توندڕەوبن؟.

وەڵامەکەش .. بەپێی دەرهاویشتەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە .. هەتا ئەم کۆمەڵانە بەم شێوەیەبن، نەتوانن واقیع قبوڵ بکەنو ڕەتی بکەنەوە، هەتا واقیعیش دەستەوسان بێت، لەوەی ڕووبەڕوویان بێتەوە لەڕووی فیکریو ئیعلامیو سیاسیو کۆمەڵایەتیەوە بەرەنگاریان بێتەوە .. توندڕەوی لەزیادبووندا دەبێت..

## چەند تێبینیەکی کۆتایی:

کۆمەڵانی ئیسلامی سیاسی، هیچ سنوورێك نییە بۆتوندڕەوییانو چەقبەستنی فیکرییان بەدەقەکەوە بەتەنها..دەشتوانن لەواقیع یاخی بنو ڕەتی بکەنەوەو بگرە ڕووبەڕووشی ببنەوە، تەنانەت ئەگەر بزانن ئەمە پێچەوانەی واقیعو حەقیقەتیشە. چونکە بەلای ئەم کۆمەڵانەوە، خودی دەقەکەو ڕاڤەی دەقەکە لەلایەن سەرکردەکانەوە، تاکە شتو. تاکە حەقیقەتە کەپێوەی پابەندبن. پاشانیش لەسایەی ئەم بارودۆخەی ئێستادا، کەلەنەرمو نیانی نیشاندانی دەوڵەتدا خۆی دەنوێنێت، بەرامبەر توندڕەویی ئایینی، ئیتر چ لەسەرئاستی ڕاگەیاندنی بێت یان فیکری یان سیاسی، یاخود تەنانەت ئاسایشەوە بێت،کەدەوڵەت تەنها ئەویش نەك بەوە

وەستاوە کەچەند گورزێکی سەختیان لێبدات، ئەویش نەك لەکاتێکدا ئەمانە هەڕەشەیەك بۆسەر هاووڵاتیان دروستبکەن، یاخود بەربەرەکانێی فیکرو ئازادی یان تەنانەت خودی ئایینە ڕاستەکەشبکەن، بەڵکو تەنها لەکاتێکدا کەببنە هەڕەشەیەك بۆسەر خودی ڕژێم.

دەسەڵات خۆی ڕێخۆشکەری یەکەم بووە، بۆ بیرۆکەی توندڕەویی ئایینی و ئیسلامی سیاسی، لەسەرەتادا پشتگیری کردووەو زیاتر لەجارێکیش هەوڵیداوە بەکاریبهێنێت، بگرە چاوپۆشی لەچالاکیەکانیشیان کردووە ..بەمەبەستیش چاوپۆشی لێکردووە.. ئەم مەسەلەیەش لەدەقەکانی حوکمی دادگای باڵای ئاسایشی دەوڵەتدا، لەقەزیەی جیهاددا دانپیێدانراوە، بەوەی کەدەڵێت ((دەسەڵاتدارانی ئاسایش خۆیان بێ ئاگا کردبوو لەچالاکییەکانی ڕێکخستن، کەلەهاوینی ساڵی (١٩٨٠)دا دەستیان کردبەبانگەوازکردنی لاوان تا پەیوەندییان پێوەبکەن و کەوتنە پیلاندانان و کۆکردنەوەی زانیاری و ئەنجامدانی تالان و دزی و کڕین و عەمبارکردنی چەك و مەشق کردنی ئەندامەکانی، لەسەر بەکارهێنانی چەك. هەروەها سەرەڕای ئەوەش کەپاش ٢ی ئەیلولی ١٩٨١ چالاکی ئەم ڕێکخستنە چڕوپڕ بوو، ئەویش بەوەی سەرکردەکانی چەندەها کۆبوونەوەیانبەست، لەنێوان شارەکانی ناوچە دوورەکان و قاهیرەو جیزەشدا کەوتنە جموجوڵ، چالاکی مەشق کردنیشیان لەسەرچەك زیادیکرد. بەڵام هێزی ئاسایش لەگەڵ

ئەوەشدا کەدەسەلاتی سەقامگیرکردنی ئیداریشیان هەیە، کەئەمیش بریتییە لەوەرگرتنی ئیش و کاری پێویست، بۆ ڕێگری کردن لە تاوان پێش ڕوودانی، ئەویش بەبەکارهێنانی ڕێوشوێنی خۆپاراستن و زەخیرەخستن، بۆ زامنکردنی ئاسایش، هیچ ئیجرائاتێکی وایان نەکرد کەببێتەهۆی ئاشکراکردنی ئەم ڕێکخستنەو جموجۆڵەکانیان پێش ئەوەی ئامانجەکانیان ئەنجامبدەن))[٥٦].

... ئایا ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرا نیە لەسەرئەوەی ڕژێم و دەزگاکانی ئاسایش خۆیان بێئاگاکردبوو لەم کۆمەڵانە. ئەمەش چونکە ڕژێم هەمیشە لەسەرئەو بنەمایە کاردەکات کەهاوسەنگیەك، لەنێوان کۆمەڵانی ئیسلامی سیاسی و چەپڕەوەکاندا دروستبکات، هەوڵیش دەدات ئەمیان بەویان بترسێنێت، بێئەوەی هەست بەو مەترسیە بکات کەلەچاوپۆشی لێکردن و دەستگیرۆییکردنی کۆمەڵانی ئیسلامی سیاسییەوە دەکەوێتەوە.ڕەنگە هەندێك کەسیش بڵێن، خۆ ئاسایش گورزی توندوتیژ لەم کۆمەڵانە نادات. ئێمەش دەڵێین ئەمە ڕاستە، بەلام ئەم گورزانە تەنها لەکاتێکدا بەکاردەهێنرێن کە گەنجانی ئەم کۆمەڵانە دەستدەکەن بەگورزوەشاندنی ڕاستەوخۆ، لەخودی دەسەلاتی دەوڵەت یان یەکێك لەپیاوەکانی .. بەلام

---

[٥٦] حيثيات حكم محكمة امن الدولة العليا (طوارىء) الدائرة الرابعة – في قضية ٤٦٢ لسنة (١٩٨١) حصر امن الدولة العليا.

تۆقاندنی هاوولاتیان، هەرەشەکردن لەیەکێتی نیشتمان، سەپاندنی دەسەلاتی ئەم کۆمەلانەبەهێز بەسەر هاوولاتییە بێدیفاعەکاندا، ئەوا دەولەت چاوپۆشی لەهەموو ئەم شتانەدەکات.

جگە لەمەش دەولەت دەچێتە پێشبڕکێیەکی گێلانەوەو هەولیشدەدات لەم پێشبڕکێیەدا، خۆی پێش ئەم کۆمەلانە بداتەوە، ئەمەش بەوەی زۆرکات لەدەزگاکانی ڕگەیاندننەوە، زیاد لەپێویست بانگەشە بۆئایین دەکات‌و هەندێ جار توندڕەوانەش، بێ ئەوەی کەبزانێت ئەمە زەمینە لەبەردەم ئەم کۆمەلانەدا خۆشدەکات‌و هانی کەشەسەندنیان دەدات.

- توندڕەویی کاتێك دەگاتە ئەوپەڕی سنووری، ڕێگری لەوەناکات ڕێکەوتن‌و نەرمی‌و ملدان نیشانی حکومەت بدرێت، وەکو چاوەڕوان کرندێك بۆ بەهێزبوون‌و هاتنەمەیدان، وەك لەهەردوو حالەتی ئیخوان‌و شوکری موستەفادا بەدیمان کرد .. ئەمە سەرەڕای ئەوەش کە ئەزموونەتالەکانی هەولەکانی ئیخوان‌و شوکری موستەفا کاریگەریی لەسەر کۆمەلەکانی پاش خۆیان هەبووە، وەك ئەوەی کەبینیمان ئەمانە هەمیشە ڕەتکردنەوەی خۆیان بۆڕێکەوتن دووپاتکردۆتەوەو چوونەتە مەیدانی کاری ڕاستەوخۆوە.
- هەندێك کەس وای بۆدەچن کەتەنها خۆبەدوورگرتن لەم مەسەلەیە، خۆی لەخۆیدا قازانجێکی گەورەیە. بەلام ئێمە وای بۆدەچین

کەهێزو تەوژمە عەقڵانیی و لیبراڵی و عیلمانیی و هێزە پەرۆشەکانی یەکێتی نیشتمان و خاکەکەی و هاووڵاتیانی، پێویستە لەسەریان ڕیزەکانیان یەکبخەن، بۆ ئەوەی لەڕووی فیکری و سیاسی و جەماوەرییەوە، ڕووبەڕووی ئەم کۆمەڵانە ببنەوە، ئەمەش وەکو پارێزگاری کردنی نیشتمان، لەمەترسی توندڕەویی ئەم کۆمەڵانە، بەتایبەتی لەم کاتەدا کەشەپۆلە نوێیەکانی ئەم کۆمەڵانە، بەتایبەتیش کۆمەڵی ئیسلامی (کۆمەڵی جیهاد)، نەخشەی بۆ کارێکی جەماوەریی چالاك داناوەو دەستیشی کردووە بەبەکارهێنانی چەند سەرچاوەیەکی ماددی و دارایی دیارینەکراوو نەبینراو، بۆ پێکهێنانی چەند پرۆژەیەکی خزمەتگوزاریی (فێرکاری – تەندروستی – کۆمەڵایەتی)، ئەمەش بێگومان ڕەنگدانەوەی خۆی دەبێت، لەسەر ڕەهەندی جەماوەریی ئەم کۆمەڵانە.

..لەکۆتاییشداو سەرەڕای ئەم درێژەپێدانەش، ئەم مەسەلەیە هەر پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاتر دەبێت .. ئێمەش سوورین لەسەری و پەیمانیش دەدەین کەلێکۆڵینەوەی زیاتری لەسەربکەین.

# ئیخوان موسلیمین و کرێکاران

## (میسر) ۱۹۲۸ - ۱۹۵۲

## کۆمەڵە - ئایدۆلۆژی - پیادەکردن

### کۆمەڵە..

ساڵی ۱۹۲۸دێت، تامیسر خۆی لەقەیرانێکی سیاسی و دەستوریی ڕاستەقینەدا ببینێتەوە، ئەمەش بەوەی کەکۆشك - بەپشتگیریی داگیرکەران - خاوەنی دەسەڵاتی کرداریی بوو، حیزبی وەفدیش لەهەر هەڵبژاردنێکی پەرلەمانیی ئازاددا، زۆرینەی دەنگی بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوانەش بۆخۆی قۆرخ دەکرد.

لەبەرئەوەیش کەخاوەن بڕیارە کردارییەکان (کۆشك - داگیرکەر)بەچالاکیەکانی وەفد، چ بەمەبەستی سنووردانانێك بۆ دەسەڵاتی (کۆشك یاخود دەسەڵاتی داگیرکەر، تەنگەتاو ببوون. بۆیە میسر هەر لەناوەڕاستی بیستەکانەوە بەسەر ڕێگای قەیرانێکی دەستووریی بەردەوامدا کەوتەڕێ، کەئامانجی دوورخستنەوەی وەفد بوو، لەحوکمڕانی بەچەندەها شێوازی جۆراوجۆریش.

ئەم مەسەلەیەش جۆرە شکستێکی بەسەر کۆی ئەزموونە دەستووریەکەی میسردا هێنابوو ((لەنێو خەڵکیشدا هەستێکی

ڕەتکردنەوەی توندو ناڕەزام.ەندیی بەرامبەر ڕژێمی بەرقەرار بڵاوببۆوە، ئەمەش هەلی لەبەردەم ئیخواندا ڕەخساند کەسەدەها هەزار شوێنکەوتووان بۆناو ڕیزەکانیان ڕاکێشن))[1].

کۆشکیش، پاش جەنگێکی ماوە کورت، توانی دەسەڵاتی خۆی بەسەر دامەزراوە ئیسلامیە گەورەکەدا ((ئەزهەر))توندیکات و توانی بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەنییەکانی خۆی بەکاری بهێنێت. هەروەها شێخی مەراغی (یەکێك بو لەسەرکردەکانی دامەزراوە ئایینیە ڕەسمیەکە)پایەیەکی بڵندی لەکۆشکی پاشایەتیدا بەدەستهێنا بوو. ئەمەش ((ئاییینی باو))ی بەتەواوەتی خستبووە لێك دژییەوە لەگەڵ جەماوەری میللیدا، کە کۆشك و سیاسەتی کۆشکیان ڕەتدەکردەوە، ((ئەم مەسەلەیەش موسوڵمانی ئاییندداری نابووە ناو لێکدژیەکی سەختەوە، لەگەڵ کۆمەڵگەی نوێ و دەوڵەتی نوێدا))[2]

هەروەها ئەو شەپۆلە لیبرالی و ئەقلانیەش کەلەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە لەمیسردا سەری هەڵدابوو، دوو حەزی بنەڕەتیی ببووە سیمای:

أ- یەکەمیان ڕووەو خۆرئاواخوزای، بەتایبەتی ڕووەو فەرەنسا.

---

(1) Vatikotis – The Modern History of Egypt .p. 323.

(2) Grunbaum, Gustave von – Modern Islam, The Search for cultural identy p. 188.

ب- دووەمیان لەچوارچێوەدرانی لەنێو ڕۆشنبیرانی چینە بەرزو ناوەندییەکانی کۆمەڵگەدا .. ئەمەش بەشێوەیەکی ئاشکرا لەجەماوەری میللی دابڕیبوو.

سەرباری هەموو ئەمانەش، گەر قەیرانە ئابوورییە جیهانیەکە (١٩٢٨) ڕەچاوبکەین، کە سیستمە سەرمایەداریەکەی سەبارەت بەچارەسەرکردنی کێشە جەماوەرییەکان، لەشێوەی سیستمێکی دەستەوساندا دەخستەڕوو، هەروەها گەر سیستمە سۆشیالییزمەکەی (یەکیەتی سۆڤیەت)ڕەچاوبکەین کەهێشتا هەر لاوازو گەمارۆدراوبوو، ئەوا سەرهەڵدانی هەوڵێك بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی سێهەم (سیستمی ئیسلامی) شتێکی لۆژیکی بوو، بەتایبەتی کەلای زۆربەی خەڵکی، ((ئایینی ئیسلام)) بەسیستمێکی کامڵ و گشتگیر لەقەڵەم دەدرێت بۆهەموو ڕووەکانی ژیان.

هەروەها ئەو پێشکەوتنە سیاسییە یەك بەدوای یەکانەش کەپاش سەربەخۆییە کەموکوڕیەکەی میسر هاتنەکایەوە، ئەوسەربەخۆییەی کەدوای شۆڕشی ١٩١٩ میسر بەدەستیهێنا، تاڕاددەیەك گەورەجۆش و خرۆشی خەڵکانی چینی ناوەندیی (وردەبۆرژواو مامناوەندی) سەبارەت بەکاری سیاسی و پێکهاتە سیاسیە بەرقەرارەکان کەمکردەوە. ئەمەش لەڕووی پەیوەندی کردن و نۆرینی سیاسیەوە، بۆشاییەکی گەورەی لەنێو کۆمەڵگەی میسردا دروستکرد .. ئەم بۆشاییە گەورەیەش ئیخوان

موسلیمین چەقیان تیابەستو ئەم چوار چێوەیەشدا کۆمەڵی ئیخوان هاتنەکایەوە، لەبەرئەمە شتێکی ڕێکەوت نەبوو کەلەساڵی (١٩٢٨)دا دروستبوون. ساڵی سەختبوونی قەیرانی ئابووریی جیهانیو ساڵی سەختبوونی قەیرانی دەستوریی لەمیسردا، دروست بوون.

کۆمەڵی ئیخوانیش لایەنگریەکی باشیان بەدەستهێنا ((لەبەرەئەوەی ئەمان وێنایەکی وایان پێشکەش خەڵك کرد، کە بەشێوەیەکی گشتی ئامانجی گۆڕینی ڕژێمی سیاسی بەرقەرارە لەمیسردا))[٣].

ڕاستە حیزبی شیوعی میسریش تەسەورێکی گشگرو پێچەوانەی کۆمەڵگەی بەرقەراریان پێشکەشکرد، بەلام ئە م حیزبە زۆر بەتوندوتیژی، تووشی ڕاوەدونان هاتو بریارێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی دەرچوو، سەرکردەکانی دەسگیرکران، ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی کاریگەریی ئەم حیزبەی لەسەر کۆمەڵگە لاواز کرد.[٤]

بەلام کۆمەڵی ئیخوان پشتیان بەست بەو پایەو هەیبەتەی کەئایین لەکۆمەڵگەی میسردا هەیەتی، ئەمیش پایەو هەیبەتێك بوو کەهیچ هێزێکی سیاسی دیکە نەیبوو. هەروەها پشتیان بەست بە پارێزگاریی دەزگا دەوڵەتییە بەرقەرارەکانی ئەو سەردەمەش، ئەو دەزگا دەوڵەتیانەی

---

(3)Wheellook, Kwit 0 Nassesrs New Egypt (1960) p.3.

کەدەیانزانی پشتبەستن بەکۆمەڵێکی پێگە ئایینی چەند بایەخی هەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی نۆرینە جەماوەریەکەی حیزبی وەفد .. هەروەها جگە لەمانەش، سەرۆك وەزیرانی میسر ((ئیسماعیل سدقی)) هەر زۆر زوو (١٩٣٠) درکی بەبایەخی بەکارهێنانی ئایینکرد ((وەکو خاڵیکەرەوەیەکی هەورە تریشقە کۆمەڵایەتیەکان))، پاشانیش زۆر لێزانانە کۆمەڵەکەی لەم ڕووەوە بەکارهێنا.

بەم شێوەیەو بەپشتبەستن بەپایەو هەیبەتی ئایین و دەسەڵاتی حوکم و هاوپەیمانیکردنی توندو تۆڵ لەگەڵ کۆشکدا (ئیخوان وەك و پاشایەکی موسوڵمان پەیمان و بەیعەتیان دا بەشافاروق و زۆر بەسەختی هێرشیانکردە سەر وە فدیە نەیارەکانی) کۆمەڵی ئیخوان دەستیانکرد بەبینینی ڕۆڵێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی گرنگ لەکۆمەڵگەی میسردا.

## ئایدۆلۆژیاکە:

کەواتە ئێمە لەبەردەم کۆمەڵەیەکداین کەلە ((ئیسلام))ەوە پەیڕەوو پرۆگرامێکی کامڵ وەردەگرێت و وارادەگەیەنێت کە ((ئیسلام ئایین و دەوڵەتە، پەرستن و سەرکردایەتیە، قورئان و شمشێرە))[٥].

---

[٤] لمزيد من التفاصيل راجع – د. رفعت السعيد – تأريخ الحركة الشيوعية المصرية – المجلد الاول.

[٥] لمزيد من التفاصيل راجع – حسن البنا – مذكرات الدعوة والداعية.

هەروەها ئەمە کۆمەڵێکیشە لەبەرەتەوە لەڕووی ئەندامێتییەوە پشت بەچینی وردە بۆرژواو مام ناوەندی دەبەستێت، لەڕووی پیادەکردنی سیاسیانەشەوە، بەحکومەتی جیزبە کەمایەتیەکان لایەنگریکردنی کۆشکی پادشایی دەبەستێت .. ئەمەش ڕەنگدانەوەی هەبووە لەسەر تێڕوانینی ئایدۆلۆژیانەی کۆمەڵی ئیخوان، بەرامبەر مەسەلەی چینی کرێکار لەمیسردا.

لەڕاستیا، ئاینی ئیسلام وەکو هەریەکێك لەعەقیدەکانی دیکە، دەتوانێت لەزیاتر لەدەروازەیەکەوە پەنای بۆ ببەیت و بچیتە ناویەوە. ئەوەتا گەرچی چەند بیرمەندێکی ئیسلامیی وەك رفاعە ئەلتەهتاوی و جەمالەدین ئەلئەفغانی باسی ((سۆشیالیزمی ئیسلام))یان کردووەو ئەفغانی گوتوویەتی ((یەکەمین کەسان کەکاریان بەسۆشیالیزم کردبێت ئەسحابەکان بوون)) و گوتوویەتی ((سۆشیالیزم مافی زەوتکراوی گەلی کرێکار دەگێڕێتەوە))[٦] هەروەها ڕەشید ڕەزاش (قوتابیەکەی شێخ محەمەد عەبدە) دووپاتی کردۆتەوە ((کەشێخ محەمەد عەبدە وای دەبینی کەڵەکەبوونی سەروەت و سامان لای هەندێك کەس،کێشەی کۆمەلایەتی دەخوڵقێنێ،

[٦] خاطرات جمال الدين – (أملاه على محمد باشا المخزومي ص ١٦١.

مانگرتنــە کرێکارییــەکان و ئەوکێشــا نەش کەلەپەیوەندیــەکانی کــاردا ڕوودەدەن، تەنها دەرەنجامێکی ئەم بارودۆخەن))[٧]

کـەچی هـەندێکی تـر لەبیرمـەندەکان، ئـەو دەروازەیـەیان هـەڵبژاردووە کـەئایین بکەنـە چـەکێك بەدەسـتی کۆنەپەرسـتان و گـەورە خـاوەن موڵـك و خاوەن سەرمایەکانەوە.

بەلاّم حەسەن ئەلبەننا خۆی لەتەنگژەیەکی ڕاستەقینەدا بینییەوە.

چونکــە ئــەو دەیویســت جــەماوەرێك لــەناو کۆمــەڵی کرێکــاراندا، بۆکۆمەڵەکەی بەدەست بهێنێت، لەگـەڵ ئەمەشـدا نەیدەویسـت پشـتگیریی کۆشك و گەورەخاوەن موڵکەکان لەدەستبدات، لەبەرئەمە جۆرە هەڵوێستێکی وەرگرت کەدەتوانێت بگوترێت ((مام ناوەندی و نەرم بوو)). هەڵوێستێك بوو کەجیاوازیی لەنێوان قسەکانیان و کردارەکانیاندا دروستدەکرد.

ئەم هەڵوێستەش بووە هۆی دروستبوونی نەرمی، یاخود با وردتر بڵێین لێڵییەکی زۆر، چونکە ئەوەی ڕەتکردەوە کەهـەر بەرنامەیکی سیاسـی یـان ئـابووری دیـاریکراو وئاشـکرا ڕابگەیـەنێت و تەنـها بەشـتە گشـتیەکانەوە وەستا، وەك ((قورئان دەستوورمانە)).

بـەلاّم واقیعـی ژیـان بەسـەر کۆمەڵەکـەیدا دەسـەپاند کەهەڵوێسـتێك سەبارەت بە کۆی بنیاتی کۆمەلاّیەتی و ئابووری دیاریبکات .. بۆیە ناچار

---

[٧] رشيد رضا – تفسير القران الكريم – (١٣٦٧/٥ المجلد ٣– ص ١٠٧).

بوو كەوا بكاتو لەمام ناوەندێتیو نەـم بوون ڕێبازێك وەرگرێت، بۆئەوەی خــۆی بــەدوورخات لەهــەر هــەڵبژاردنێكی ئاشــكراو ڕاشــكاو، لــەنێوان كرێكارانو چەوسێنەرەوەكانیاندا. ئێستا، زۆر بەكورتیش، هەوڵدەدەین ئەو شـێوازە دیاریبكـەین كـە كۆمەڵەكـەو بیرمـەندەكانی ((هەڵوێسـتی فیكـری خۆیان)) بەرامبەر مەسەلە كۆمەلاّیەتیەكەو چینی كرێكار پێدەست نیشان كردبوو.

یەكێك لەبیرمەندەكانی كۆمەڵەكە (شێخ محەمەد لغەزالی)دەڵێت، ئیسلام سیسـتمێكی ئـابووری دەخاتـەڕوو كـەدەتوانرێت نـاوی بـنرێت سیسـتمی نێوەنـد. هـەروەها بـەبێ هیـچ ڕاڕاییـەكیش دەڵێـت، ئـەم جـۆرە سیسـتمە ((بەسەرپەرشتی ڕاستەوخۆی دەوڵەت بەچەند شێوەیەكی جیـاواز بەسـەر بەرژەوەندیی كۆمپانیا گەورەكاندا پراكتیزە كراوە .. ئەمەشە كەمن دەڵێم نێوەندێكە لەنێوان لەكارخستنو ئازادكرنی بنەمای موڵكداریدا))[^8].

لەگەڵ ئەمەشدا، یەكێكی تر لەبیرمەندەكانی كۆمەڵەكە، كەئەویش سەید قوتبــە، دەڵێــت ((سیســتمی ئیســلامی كۆیلەیــەتی نییــە .. هــەروەها دەرەبەگایەتیش نیەو شیوعیەتیش نییە، سیستمی ئیسلامی تەنها بریتییە لەسیستمی ئیسلامی))[^9].

---

[^8]: الشيخ محمد الغزالي – الاسلام والأوضاع الاقتصادية – (١٩٥٢) ص ٦٢.
[^9]: سيدقطب – مقال – مجلة المسلمون – مارس– ١٩٥٣.

ئەم دەربڕینەی سەیدقوتب، نموونەیەکی زۆر وردو تەواوە، لەسەر ئەو شێوزاەی کە کۆمەڵی ئیخوان بۆچوونەکانی خۆیانیان پێدەخستەڕوو، بەتایبەتی لەبواری کۆمەڵایەتیدا، چونکە کۆمەڵی ئیخوان تەنها بەوەوە دەوەستێت کەچەند سیماو سیفەتێك ڕەتبکاتەوە، بێئەوەی بەشێوەیەکی دیاریکراو ڕوونی بکاتەوە کەخۆی چیدەوێت .. بەڵام تێبینی دەکەین سەید قوتب ((سەرمایەداریی))ڕەت نەکردەوە لەسیستمی ئیسلامییدا، لەوانەیە لەبەرئەوەبێت کەئەوان وەك عادەتی خۆیان نەیاندەویست لەگەڵ سەرمایەداریدا بەیەکدا بدەن .. چونکە ئەو دەربڕینەی سەرەوە ساڵی ١٩٥٣ گوتراوە، ئەوکاتەی کەحوکمڕانەکانی تەمموز دژی دەرەبەگایەتی و شیوعیەتبوون، بەڵام هیچ هەڵوێستێکیان دژی سەرمایەداری وەرنەگرتەوە.

گۆڤاری ئەلدەعوەش هەوڵدەدات پەردەیەك لەتەمومژی گێلانەبدات بەسەر خودی مەسەلەی موڵکداریدا ((ئیسلام هەرچەندە باوەڕی بەگرتنەخۆ هەیە، بەڵام باوەڕی بەموڵکدارینیە. بەوەی کەمەزهەبی ئیسلامی بڕیاری داوە، ئەم گەردوونە ملکی یەك خالقی تەنهایەو لەکۆتاییدا هەموشتەکان دەگەڕێنەوە بۆلای ئەو، هەر ئەویش بەتەنها خاوەنی هەموو شتەکانە، بەماددەو ڕوحەکانیشەوە. مرۆڤ خاوەنی بنەڕەتیی هیچ شتێك نیە، تەنانەت خاوەنی خودو جەستەی خۆیشی نیە، نەخاوەن زەویەو نەخاوەن

ئـاوەو هەوايـەو نـەخاوەن مـاڵ و ئاژەڵيێـە. بـەڵكو مـرۆڤ تەنـها لـەموڵك ماڵەكەيدا جێنشينى خوداى مەزنە))[10].

ئەگەر ((موڵكدارى))ش تەنها بۆ خودا بێت و مرۆڤيش تەنها جێنشينێك بێت تێيدا: كەواتە چەوساندنەوەى خەڵكى پەيوەست نيە بەموڵكداريەوە.

ئەوەتا شێخ (البهي الخولي)، كەئەركى دانانى بەرنامەى ڕۆشنبيركردنى كۆمەڵەكەى خرابووە ئەستۆ، دەڵێت ((ڕێگريكـردن لەچەوسـاندنەوە، بـەوە نابێت كەموڵكداريى پووچەڵبكرێتـەوە، بەڵكو بـەوە دەبێت كەدەسـەڵاتێكى عاديلانە پێك بـهێنرێت. خـودى موڵكداريـش خـۆى لـەخۆيدا ڕێگـا خـۆش ناكـات بۆئـەم دوژمنكـاريى و چەوسـاندنەوەيە، چونكـە لەوانەيـە مـرۆڤ موڵكداربێـت و سـتەميش نـەكات و زۆر چاكـەخوازو دڵ و دەرون فراوانيـش بێت .. پاشانيش موڵكداريـى پێويستى بەچارەسەرو ڕێگرى لێكردن نيـە، بەڵكو پێويستى بەڕێكخستن و لەباركردن هەيە))[11].

بەپێى ئـەم پايەو بنـەما فيكرييانـە، كۆمەڵەكـە بۆچـون و هەڵوێسـتكانى خۆى پێشكەش دەكات. حەسـەن ئەلبـەنناش لەپەيامەكـەيدا بەناونيشـانى ((كێشە ناوخۆييەكانمان لەژێر ڕۆشنايى سيستمى ئيسلاميدا)) دەڵێت:

---

[10] الدعوة – العدد الاول– (١٩٥١).

[11] البرنامج التثقيفي لجماعة الاخوان المسلمون – محاضرة التثقيف الاقتصادي، وإعداد البهي الخولي.

((جیاوازیو بۆشاییو لێك جوداییەكی گەورەو ئاشكرا هەیە لەنێوان چینە جیاوازەكانی ئەم گەلەدا، دەوڵەمەندیەكی زۆر هەژاریەكی كوشندە)).

لەوانەشە خوێنەر وابزانێت ئەم ڕستەیەی خوارەوە، بەرگری كردنە لە كرێكارانو جووتیارە هەژارەكان، بەڵام لەڕاستیدا بەرگری كردنە لەچینی ناوەندی، (چینی ناوەندی)خەریكە بوونی نامێنێت. ئەویش ئێمە ناوماننا چینی ناوەندی، تەنها بریتیە لە كۆمەڵێك هەژارو نەدار، هەرچەندە كەئێمە ناویشمان ناون چینی ناوەندی، بەڵام ئێمە لەسەر ئەو بنەمایە ئەو ناوەمان لێ ناون كەهەندێك زیان لەهەندێك زیانی تر باشترە))[12].

بەنناش چەند بنەمایەك بۆ سیستمی ئابوریی ئیسلام دیاری دەكات، لەوانە:

- موڵكو ماڵی حەڵاڵ كۆڵەكەی ژیانەو پێویستە پارێزگاری بكرێت.
- پێویستە حورمەتی پارەوماڵو ڕێزی موڵكی تایبەتی بگیرێت، ئەگەر لەگەڵ بەرژەوەندیی گشتیدا پێچەوانە نەگونجا. بەنناش بۆ جەخت كردن لەسەرئەوەی كەزەوتكردنی موڵكو ماڵ حەرامە پشت بەم حەدیسە پیرۆزە دەبەستێت ((كل المسلم على المسلم حرام، دمه

---

[12] حسن البنا مجموعة – الرسائل– ص ٤٢٠.

وعرضه وماله – واتا: هەموو شتێکی موسوڵمان لەموسوڵمان حەرامە، خوێن‌و ئابڕوو موڵك‌و ماڵیشی))

بەننا بەردەوام دەبێت‌و دەڵێت ((ئیسلام ستایشی موڵك‌و ماڵی حەلاڵی کردووەو پارێزگاری کردنی‌و باش بەکارهێنانی‌و بەرهەمهێنانی کردۆتە واجب، هەروەها ستایشی پایەی ئەو دەوڵەمەندە شوکرانەبژێرەشی کردووە کەموڵك‌و ماڵی خۆی، لەپێناو بەرژەوەندیی خەڵك‌و ڕەزامەندیی خودا بەکاردەهێنێت))[١٣].

یەکێك لەمێژوو نووسەکانی کۆمەڵەکەش ئاماژە بەوە دەکات، کەکۆمەڵەکە کاتێك سەبارەت بەکێشەی کرێکاران‌و چارەسەریان دواوە، بەمەبەست لێڵی‌و نائاشکرایی لەقسەکانیدا بەکارهێناوە، ئەم مێژونووسە دەڵێت ((کۆمەڵەکە تەنها پەیوەست بوو بەچەند بۆچوون‌و دەستەواژەیەکی گشتگیرەوەو لەڕووی چینایەتیەوە مەسەلەکەی شیکار نەدەکرد، لەبەرئەوە بایەخدانەکانی کۆمەڵەکە سەبارەت بە مەسەلەکانی کرێکار، تەنها بریتیی بوو لەوەدەرخستنی هەستی ناقایلی بەرامبەر بەو هەژاری‌و نەخۆشیانەی کەکرێکارەکان بەدەستیەوە دەناڵێنن‌و ئەو چەوساندنەوەیەی کەلەلایەن خاوەن کارەکانەوە، ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. هەورەها تەنها بەوەشەوە وەستا

---

[١٣] المرجع السابق – ص ٤٢٥.

کەداوای ئەوە بکات گوزەرانی کرێکاران چاك بکرێت و بێ کارەکانیان بخرێنەسەر کار))[١٤].

پاش یەك هەفتەش لەشۆڕشی تەمموز، کۆمەڵەکە شتێکی بڵاوکردەوە کەدەتوانرێت بە ((بەرنامەیەك))ی سیاسی و ئابووری لەقەڵەم بدرێت. لەوانەشە بەئامانجی قوتدانی سەرکردایەتیە نوێیەکەیان لەژێر فشاریدا ئەمەیان کردبێت، هەروەها ئەمە وەکو هەوڵێکیش وابوو، بۆ بەدەستهێنانی جەماوەرێتیەك لەنێو شەقامی میسریدا، کە شۆڕشگێڕەکانی تەمموزو شیوعیە لایەنگرەکانیان، چەندەها شوێن و جێگەی بەبایەخیان تێدا بەدەست دەهێنا .. لەم بەرنامەیەشدا هاتووەکە:

((کارکردن فەرزە لەسەر هەرکەسێك کەبتوانێت بیکات و ناشبێت واز لەکارەکەی بهێنێت. هەورەها نابێت یارمەتی کەسێك بدرێت کەبتوانێت کاربکات، بەڵکو پێویستە زۆری لێبکرێت بۆکارکردن، پێویستیشە لەسەر وەلی ئەمرەکە لەپێناو دۆزینەوەی کاردا بۆی دەستی یارمەتی بۆ درێژبکات)).

ئەگەر هەر کاریشی دەست نەکەوت، یاخود کارەکەی بەشی پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی نەکرد، یان لەتوانایدا نەبو کەئەوکارە بکات، ئەوا پێویستە وەلی ئەمر هاوکاری بکات تابەزەکات پێداویستیەکانی ژیانی بۆ بەدەست

(١٤) د. زكريا البيومي – الاخون المسلمون والجماعات الاسلامية– (١٩٧٩) – ص ٣٠٤.

بهێنیٚ ئەگەر زەکاتیش بەشی پێداویستیەکانی نەکرد، ئەوا پێویستە لەسەر ئەوکەسانەی کەپارەو ماڵی زیادەیان هەیە، دابەشی کەن بەسەر هەژارەکاندا، بۆپڕکردنەوەی پێویستیەکانیان. ئەگەر دەوڵەمەندەکانیش ملیان نەدا بەم کارە، پێویستە حکومەت زۆریان لیٚ بکاتو چەند یاسایەك دابنێت کەبەپێی سەرهەڵدانی پێویستیو کەمو کوڕیەکان زامنی چاککردنی گوزەرانی کۆمەڵگە بکات. هەروەها پێویستە یاسا کرێکاریەکان چاکسازی تیابکرێتو توندوتۆڵ بکرێن، ئەمیش بە چاوخشاندنەوە بەیاساکانی ئێستادا، بۆئەوەی هەموو گروپە کرێکاریەکان بگرێتەوە، تەنانەت کرێکارە کشتوکاڵیەکانیش، هەروەها بۆئەوەی زامنکاریی پێویستیش بۆ کرێکارانو خێزانەکانیان دژی بیٚ کاریو نەخۆشیو پەککەوتن دابین بکرێت .. جگە لەمەش پێویستە پەیوەندی کردن بە سەندیکاکانەوە بکرێتە زۆرەملێی، یاخود ڕێگا بەدروست کردنی یەکێتیە سەندیکاییەکان بدرێتو کریٚ کرێکاران بەپێی بنەما ئیسلامیەکان دیاری بکرێت))[١٥].

ئەمە گەشەسەندنێکی لەناکاوە لەهەڵوێستی کۆمەڵەکەدا ڕوویدا، دەیەوێت بەمە لە کرێکارانو هەژاران نزیك بێتەوە بەگشتیو لافو گەزاف بەسەر دروشمەکانی شۆڕشگێڕەکانی تەممووزدا لیٚ بدات..

---

[١٥] صحف ١٩٥٢/٨/٢ نقلا عن: محمود عبدالحليم – الاخوان المسلمون احداث صنعت التأريخ – ج٣– ص ١٢١.

ئیخوانیش درێژە بەلاف و گەزافەکەیان دەدەن، ئەوەتا لە ئاهەنگی یادی لەدایك بوونی پێغەمبەردا، ساڵی ١٩٥٢، هەروەها بەئامادەبوونی محەمەد نەجیب و جەمال عەبدولناسریش، مورشیدی گشتی (ئەلهوزەیبی) وشەیەکی پێشکەش کردو تیایدا گوتی: ((هەموو مرۆڤێك واجبە لەسەری بژێویی خۆی لەرێی کاری حەلاڵەوە پەیدا بکات، بەپێی کارامەیی و لێزانی خۆی. ئەگەر پاڵی دایەوەو کاریشی نەکرد، پێویستە زۆری لێ بکرێت. ئەگەر هاتوو کارەکەیشی بەشی نەکرد، یان هەر هیچ ئیشێکی نەبوو، یاخود پەککەوتە بوو نەیتوانی کاربکات، ئەوا پێویستە هەموو موسوڵمانان بژێویی بۆ ئەو کەسە دابین بکەن و بیگرنەخۆیان، واتا دەبێت دەوڵەت لەخۆی بگرێت و نەبوونی و پێداویستیەکانی بۆ دابین بکات))[١٦].

بەڵام ئەم شتانە هەمووی لەگشتگرییەکان دەرناچن، ئیخوان هەرگیز لەلێدوانە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانیاندا لەچوارچێوەی گشتگرییەکان دەرنەچوون، ئەگەر ناچاریش بوونایە کەلەو چوارچێوەیە دەرچن و بچنە وردەکاریەکانەوە، ئەوا لە بەرژەوەندیی کرێکاران نەدەبوو و لایەنی ریزی کرێکارانیان نەدەگرت.

ئەوەتا حەسەن ئەلبەننا وانەیەك پێشکەش بە کرێکارانی کۆمەڵەکە دەکات و تیایدا دووپاتی دەکاتەوە کە ((پێویستە لەسەر کرێکاران هەمیشە

---

[١٦] المرجع السابق – ص٩٠.

ئەرکەکانی خۆیان بەرامبەر خواو بەرامبەر خۆیانو خاوەنکارەکانیان لەیاد بێت))[١٧].

سەبارەت بە ((مانگرتن))یش، ئەوا بەبۆچوونو تێڕوانینی کۆمەڵەکە، ئەمەیە مانگرتن کارێکە پەیوەندیی برایانەی نێوان موسوڵمانان تێک دەداتو ساردیو ناکۆکی دەخاتە نێوان ڕیزەکانیانەوە))[١٨]

گەر هەندێك کەسیش مانگرتن بەچەکێکی کرێکارانە دابنێن، ئەوا ئیخوان چەند چەکێکی تر پێشکەش کرێکاران دەکەن ((کرێکار پێویستە دووچەکی هەبێت، هێزی ئیمانو ڕەوشتی بەرز، بەمەش پەیوەندیی لەنێوان کرێکارو خاوەن کاردا لەسەر ڕێزو خۆشەویستی دوولایەنە دروست دەبێت، ئەمەش سەرکەوتووترین ئامرازە))[١٩].

کاتێکیش تینی قەیرانی بێکاری زیادیکردو بێکاری تەشەنەی کرد، ((بەشی کرێکاران))ی کۆمەڵەکە لیژنەیەکیان پێك هێنا کەتایبەت بوو بەکاروباری بێ کارەکانەوە، ئەم لیژنەیە کێشەکەیان تاوتوێ کردو پاشان پێشنیارێکی سەیریان خستەڕو کەئەمەیە ((گێڕانەوەی ئەو کرێکارانەی

---

[١٧] الاخوان المسلمون ١٩٤٦/٨/٢٤.

[١٨] المرجع السابق.

[19] Boehm, Jacob. Les freres Musulmans – Monde non- Cheten, XXVI June (1953) 211.

کەلەکاتی جەنگدا، لەگوندەکانیان هەڵکەنراون و کۆچیان کردوە بۆ شارەکان .. بۆ گوندەکانی خۆیان))[٢٠].

لێرەشدا پێویستە ئامارە بەمەسەلەیەکی گرنگ بکرێت کەتەوەری هەڵوێستی فیکری کۆمەڵەکە، بەرامبەر کرێکاران پێک دەهێنێت. ئەویش ئەوەیە کەئیخوان چەندەها جارو زۆربەخۆشیشەوە، هێرشیان کردە سەر سەرمایەدارە بیانیەکان (زۆربەشیان جولەکە بوون)و بەئیستیعماری ئابووریش وەسفیاندەکردن، داوای ئەوەشیان کرد کەچەند گورزێکی کوشندەیان لێ بدرێت. بەڵکو مەسەلەکە هێندە پەرەی سەند کەگەیشتە ئەوەی ساڵی ١٩٤٩ کارگەو کۆمپانیاکانیان تەقێندرانەوە، بەلام لەهەمان کاتیشدا هیچ هێرشێکیان نەکردەسەر سەرمایەدارە میسریەکان.

بەڵگەنامەیەکی بەریتانیش زۆر زیرەکانە ئامارە بەم جیاکردنەوەیە دەکات .. پاش کوژرانی حەسەن ئەلبەننا باڵیۆزخانەی بەریتانی راپۆرتێکی بۆ وەزراەتی دەرەوەی بەریتانیا ئامادەکرد، لەم راپۆرتەدا هاتووەکە:

((حەسەن ئەلبەننا دەیویست پشتگیریی کرێکارە میسریەکان بکات دژی خاوەن کارەبیانیەکان، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا، دژی خاوەن کارە موسوڵمانەکان نەبوو))[٢١].

---

(٢٠) الاخوان المسلمون ١٩٤٦/٨/١٨.

(21) F.O. 371 - 73474- J3567. (1949).

• ڕەنگە ئەم هەڵوێستەش دەرگای ئاییني و کۆمەڵایەتي و لەهەمان کاتدا هەل پەرستی خۆیشی هەبێت.

## پیادەکردن

ئینجا دێینە گۆڕەپانی پیادەکردن. واش ڕاهاتووین لەکۆمەڵی ئیخوان کەقسەکان جیاوازیی هەبێت لەکردارەکان .. لەسەرتاشدا (محەمەد شەریف)ی لێپرسراوی مەکتەبی کرێکارانی کۆمەڵەکە، ئەو ئامانجە بنەڕەتیە دیاری دەکات کەکۆمەڵەکە بەکارکردن، لەنێو جەماوەری کرێکاراندا هەیەتی .. ((محەمەد شەریف دووپاتی کردەوە کەدژایەتی کردنی کۆمۆنیزم یەکێك بووە لەو دووئامانجە بنەڕتیەی کەکۆمەڵەکە هەیبووە بۆکارکردن لەناو ڕێکخراوەکانی ناو ڕیزەکانی چینی کرێکار. ئامانجەکەی تریشیان بریتییە لەبڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام لەنێوەندە کرێکاریەکاندا))[٢٢].

بێگومان چالاکیەکی لەم جۆرەش، پێشوازیەکی زۆرگەرمی لێکراوە، چ لەلایەن حکومەتەکانیشەوە چ لەلایەن سەرمایەدارەکانیشەوە..

لەڕاستیدا خەستبوونەوەی چالاکی ئیخوان لەبەرگری کردنی کۆمۆنیزمدا، خستنیە چاڵ و کەندڕی زۆر ترسناکەوە، چونکە پاڵیان

---

[22] Beninand Loekman – workers on the Nile – (1987)- interviw with M-sharif. P.368.

بەئەندامەکانی خۆیاندەنا کە سیخوڕیی بەسەر کرێکارە چالاکەکان و بەسەر شیوعیەکانەوە بکەن بەگشتی و، دەسەلاتیان لێ ئاگادار بکەن.

لەبەردەم دادگای گەلیشدا (ئەو دادگایەی دەسەلاتی شۆڕشی تەمموزپێکی هێنا، بۆ دادگایی کردنی کۆمەڵی ئیخوان، کاتێك لەگەڵیاندا بەریەك کەوتن) یەکێك لەسەرکردەکانی کۆمەڵەکە، ئەویش سەلاحەدین ئەبولخەیرە، زۆر بەڕاشکاوی دانی پێدانا، ((کەبەشی هەوالی کۆمەڵەکە هەڵدەستا بەکۆکردنەوەی ئەو هەواڵە بەبایەخانەی کەبەلای کۆمەڵەکەوە گرنگن. هەروەها بەدوای شتی تردا دەگەڕاین .. بۆ نموونە شانە کۆمۆنیستەکان.. خۆیشم دەزانم کەئیخوان چەندەها شانەیان ئاشکرا کردبوو و دەسلاتدارانیان لێ ئاگادار کردبوونەوە))[٢٣]

بەلام زۆربەی چالاکیە سیخوڕیەکانی ئیخوان کەبەگشتی دژی چەپڕەوەکان دەکرا، لەبنەڕەتدا لەبواری کرێکاریدا خەست ببۆوە ((ئەو بوارەی کەچاوو بایەخدانەکانی دەزگاکانی ئاسایش و کۆشك و سەرمایەدارەکانیشی بەهەمان شێوە تێدا خەست ببۆوە))[٢٤].

ریچارد میشێلیش، کەتوێژەرێکی تایبەتمەندە لەمێژووی کۆمەڵەکەدا، بۆچوونی وایە کە ئەم هەڵوێستە زیانی زۆر گەورەی داوەلە چالاکیەکانی

---

[٢٣] محكمة الشعب – الجزء الثاني– ص ٢٩.

[24] for more detailes see- Badaoui, Zaki, Les problems u travail et Les organisation ouvriers.

ئیخوان لەنێو کرێکاراندا، بەشێوەیەك کە لەدەوروبەری ساڵی ١٩٤٨ دا گەیاندیە نیمچە پاکتاوکردنێك.[٢٥]

ڕەنگە هەر ئەم هەڵوێستەش بێت پاڵی نابێت بەزۆر لەتوێژینەوە ئەکادیمیەکانەوە کەلەڕێی لێکۆڵینەوەی ململانێی نێوان ئیخوان‌و شیوعیەکانەوە یاخود بەهاوتەریبی لەگەڵیدا لێکۆڵینەوە لەسەر چالاکی ئیخوان بکەن، لەنێو ڕیزی کرێکاراندا .. ئەوەتا لە کتێبی (Nile on workers)دەخوێنینەوە((ئەمەش لەنێو کرێکاراندا لەشێوەی چەند پێکدادانێکی توندوتیژ لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا ڕەنگی دایەوە، ئەویش لەهەر شوێنێکدا کەکۆمۆنیستەکان نۆرێنیان نفوزیان هەبووایە .. ئیخوان دەستیان کرد بەدژایەتی کردنی هەموو کۆمۆنیستەکان سەبارەت بەکاری سەندیکایی‌و سەربەخۆبوونی سەندیکاکان، لەخاوەن کاری کارگەکان‌و هەروەها سەبارەت بەپەرەپێدانی خەباتی کرێکارییش، کەئیخوان وەکو بانگەوازێك بۆ دروست کردنی ناکۆکی لەنێو مسوڵماناندا سەیریان دەکرد. لەهەمان کاتیشدا، کۆمەڵەکە بەردەوام بوو لەسەر بەربەرەکانی کردنی هەموو شێوەکانی سەنگ‌و نۆرینی کۆمۆنیستەکان، ئیتر چ بەپرو پاگەندەبووایە یاخود بەدەستێوەردانی کرداری بوایە. پاشانیش لەڕیزی بزووتنەوەی

---

[25] Mitcheill . Richard- The Society of the Muslim Brothers- (1969) P. 282.

کرێکاریدا، ناوچەی شبرالخەیمەو ڕستن‌و چنین ببوونە نزیکترین بوارەکانی ململانێی توندوتیژیی نێوان ئیخوان‌و کۆمۆنیستەکان))[٢٦].

... دەشتوانرێت بگوترێت بارودۆخەکە، خۆی لەخۆیدا زۆر لەباربوو بۆ ئەوەی ئیخوان چالاکی زیاتربکەن لەوەی کەکردیان.

چونکە، یەکەم هەست سۆزی ئایینی خۆی بەشێوەیەکی سروشتی زاڵ بوو بەسەر جەماوەری کرێکاراندا، ئەمەش دەتوانرێت بۆئەوە بەکاربهێنرێت کەجەماوەری کرێکاران ڕووەو کۆمەڵەکە ڕابکێشرێت.

هەروەها جگە لەمەش لەسەرەتای سیەکاندا، کاتێك ئەم کۆمەڵە دروست بوون، بۆشاییەکی سیاسی لەڕیزەکانی چینی کرێکاردا هەبوو. ئەمەش لەبەرئەوەی حیزبی کۆمۆنیستی میسر، چەند گورزێکی کوشندەی لێ درابوو. یەکێتی گشتی سەندیکا کرێکاریەکانیش، کەحیزب ساڵی ١٩٢١ دایمەزراندبوو، ئەویش بەهەمان شێوە هەڵوەشێنرابۆوەو شت‌و مەکەکانی دەستی بەسەردا گیرابوو، سەرکردەکانی زیندانی کرابوون، چەند یەکێتیەکی کرێکاریی کارتۆنیش، کە ڕاستەوخۆ سەربە حیزبە بۆرژوازییەکان یان کۆشکی پادشایی بوون، جێگایان گرتبۆوە. چەند بەگ‌و پیاو ماقوڵێك‌و بگرە یەکێك لەناودارەکانی خێزانی پادشایی دەسەڵاتداریش سەرکردایەتیەکەی گرتبووە دەست. بارودۆخی ئابووری‌و کۆمەڵایەتیش

---

[26] See Benin ibid . P. 365.

پاڵی دەنا بەکرێکارانەوە کەکاری ڕاستەوخۆ بکەن ... بەڵام ئێمە بۆچوونمان وایە کەپێچ و پەناکردنی سیاسەتەو دڵ ڕاگرتنی کۆشکی پادشایی و تووڕە نەکردنی گەورە خاوەن موڵك و سەرمایەدارەکان و هەروەها پێگە بڕواکارییەکەش، هەموو ئەمانە وای لەکۆمەڵەکە کرد، نەتوانن سوود لەم هەموو شتانە وەربگرن.

لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە لەسەرمان زۆر بەبایەخەوە تێبینی ئەوەبکەین کەیەکەمین کەسانێك پەیوەندیان بەبەنناوە کردبێت، بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەکە شەش کرێکار بوون. بەڵام بەشداری کردنی چڕوپڕ لەکرداری دامەزراندنەکەدا هیچ بوونێکی جدی کۆمەڵەکەی لەڕیزی کرێکاراندا دیارنەبوو.

بەهەرحاڵ هەڵوێستی ئیخوان بەرامبەر چینی کرێکار، لەپەیوەندیی تاکە کەسیەوە پەرەی سەند، بۆ کاری ڕاستەوخۆو ڕێکخراو. ساڵی (١٩٣٨)یش سەرەتای ئەم گۆڕرانە بوو، چونکە لە ٢٢ی ئابی ١٩٣٨دا ((کۆمەڵێك لەکرێکارە ((خوێندەوارەکان)) لەمەڵبەندی گشتی کۆمەڵەکەدا، کۆبوونەوەیان کردو ئەو گوزەرانە خراپەیان تاوتوێ کرد کە بزووتنەوەی کرێکاریی تێیدا دەژی و هەروەها ئەوەشیان خستە بەرباس و لێکۆڵینەوە کەئایا دەتوانرێت حیزبێکی کرێکاریی دابمەزرێنرێت))[٢٧]. یەکێك

[٢٧] شبرا – ١٩٣٨/٨/٢٥.

لەتوێژەرەکانیش باسی ئەم هەوڵە دەکاتو دەڵێت ((وادیارە ئەم حیزبەش لەچەند کەسێکی دیاری کراوو بۆماوەیەکی کورتیش پێکهێنراو لەمەڵبەندی گشتی کۆمەڵەکەشدا بارەگایەکی بۆ خۆی دروست کرد)).

پێدەچێت ئەمەش یەکێك بووبێت لەپێچو پەنا کردنەکەی کەکۆشك دژی وەفد بەکاری دەبرد))[٢٨].

پاش چەند مانگێکیش لەم هەوڵە سەرنەکەوتووە، واتا ساڵی ١٩٣٩، هەشت کەس لەسەرکردەی کرێکاران لەشاری (المحلة الکبری)مانیان لەخواردن گرت، ئەمەش وەکو ناقایلی دەربڕینێك، بەرامبەر خراپی گوزەرانی چینی کرێکار، داواشیان لەحکومەت کرد یاسایەك دەربکات کەرێگە بەماق ڕێکخستنی سەندیکایی بدات. لەگەڵ ئەوەشدا کەئەم مانگرتووانە چەپڕەوبوون یاخود نزیك بوون لەچەپەکانەوە، بەڵام گۆڤاری ئەلنەزیر (زمانحاڵی ئەوکاتەی کۆمەڵەکە)گرنگی بەم مانگرتنەداو، چەندەها هێرشی کردەسەر حکومەتە میسریە یەك بەدوی یەکەکان، لەبەرئەوەی ئەم حکومەتانە پەیمانەکانی خۆیانیان بۆ کرێکاران نەبردەسەر، هەروەها داواشیان لەوەزارەت کرد، چەند یاسایەکی شیاوو عادیلانە بۆ کرێکاران دەرکات. بەڵام لەهەمان کاتیشدا ئەوەیان ڕەتکردەوە کەمانگرتن وەکو ئامرازو شێوازێك بۆ ڕادەربڕین بەکاربهێنرێتو دوویاتیان کردەوەکە ئەمە

---

[٢٨] د. زكريا البيومي – المرجع السابق – ص ٣٠٥.

پێچەوانەی ڕێنماییەکانی ئیسلامە.[29] ساڵانی چلەکانیش دێت، تادەستپێکێکی چەپڕوانەی فراوان و چالاکییەکی کۆمۆنیستانە لەڕیزی کرێکاراندا بەخۆیەوە ببینێت. ڕەنگە هەر ئەمەش پاڵی نابێت بەکۆمەڵەکەوە کەدوو هێندەی جاران بایەخ بەمەسەلە کرێکاریەکان بدات. لە (٢٩)ی ئابی (١٩٤٢)شدا یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی ((الاخوان المسلمون))دەرچوو، بۆئەوەی دامەزراندنی ((بەشی کاروبارە کۆمەڵایەتیەکان))ی کۆمەڵەکە ڕابگەیەنێت .. ئەمەش واتای سەرەتای بایەخدانێکی ڕێکخراو ڕێك و پێك دەگەیەنێت، سەبارەت بەم مەسەلەیە.

هەردوو نووسەری کتێبی ((العمال علی ضفاف النیل))یش، تێبینی دەکەن: ((ئەو گوتارانەی لەوکاتەوە تا ساتی وەستانە کاتیەکەی ڕۆژ نامە، لەکانونی دووەمی (١٩٤٤)دا، سەبارەت بەچاکسازیی کۆمەڵایەتی بڵاوکرانەوە، چەند گوتارێکی گشتی بوون، تەنها دیدە ئیسلامیە کۆمەڵایەتیەکەیان دەخستەڕوو. یەك گوتاریشمان لەنێوانیاندا نەبینی کەدیدێکی دیاری کراوی دەربارەی مەسەلە کرێکاریە دەستنیشان کراوەکە لەخۆ گرتبێت))[30].

---

[29] النذیر ١٩٣٩/٦/١٩.

[30] Beinin – ibid p.366.

بەلاّم کاتێك ڕۆژنامەکە دووبارە کەوتەوەگەڕ لەکانونی یەکەمی ١٩٤٤دا، بەئاڕاستەیەکی نوێی و ڕاستەوخۆ بەرەو چینی کرێکار هاتەوەمەیدان. گوتارەکانیشی بەگشتی سیمایەکی سادەو میللی ڕواڵەتێکی سیاسیی و کۆمەلاّیەتی زیاتر توندوتیژیشیان هەبوو. ئەمەش لەگەڵ ئاڕاستەی کۆمەڵەکەدا گونجا، تا چالاکانە لەنێو ڕیزی کرێکاراندا کاربکەن.

پاش جەنگی دووەمی جیهان. ڕاستەوخۆ کۆمەڵەکە لەمەڵبەندی گشتیدا (بەشی کرێکاران)ی دامەزراند. بەلاّم بەپەرۆشیشەوە جەختی لەسەرئەوە دەکرد. ((ئامانج لەدروستکردنی ئەم بەشە، دەستێوەردانی کاروبارە سەندیکاییەکانی کرێکاران نیە، هەروەها پێشبڕکێکردنێکیش نیە لەگەڵ دامەزراوە کرێکارییەکاندا، یاخود هاتنەسەر ڕێگای کرێکارانیش نیە لەکارگەو کۆمپانیاکاندا. بەڵکو ئەمە بۆئەوە دروست کراوە کە بانگەشەکە بگەیەنرێتە دەرونی کرێکاران، بۆئەوەی ببێتە هاندەرێکیش بۆیان کەپابەندبن بەڕێنماییەکانی ئایینەوە))[٣١].

جارێکی دیکەش .. زۆربەی مێژوونووسەکانی ئەوماوەیە، گرنگی دانی ئیخوان بەکارکردن لەنێوکرێکاراندا دەبەستنەوە بەزیادبوونی نۆرینی کۆمۆنیزمەوە لەڕیزەکانیاندا، دووپاتیشی دەکەنەوە کەپێویستی ((دژایەتی

---

[٣١] الاخوان المسلمون ١٩٤٥/٦/٢٨.

کردنی کۆمۆنیزم)) یەکێك بووە لەهاندەرەکانی ئیخوان بۆ کاروچالاکی کردن لەنێو کرێکاراندا..[٣٢]

هـەروەها ئیخـوان هـەوڵی ((دروسـت کردنـی چـەند سـەندیکایەکی کرێکاریشیان دا، کەبیروبۆچوونەکانی ئیخوان لەخۆبگرێت، لەم ڕووەشەوە، چـەند سـەرکەوتنێکی سـنووردایان بەدەسـت هێنـا، ڕۆژنامەکەشـیان ڕایگەیاند کەکرێکارانی گواسـتنەوە بڕیاریـان داوە، سەندیکایەك دروسـت بکـەن کەلەسـەر ڕێنماییـەکی پـەیامی ئیخـوان کاربکـات. هـەروەها لەنێوکرێکارانی نەوی سوێسیشدا، بوونە خاوەن تۆڕینی کارا، لەئەلمحەللەو شبرالخەیمەشدا چەند کۆمەڵە کرێکارێکی ڕستن و چنینیان هەبوو))[٣٣].

بەڵام هەندێك لەتوێژەرو نەیارە سیاسـیەکانی ئیخـوان، جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکـەن کەکۆمەڵەکـەو ڕۆژنامەکـەی زیادەڕەوییـان کـردووە لەبڵاوکردنـەوەی ئـەو زانیاریانـەدا کـە باسـیان لـەچالاکی ئیخوانـی نێـو کرێکـاران کـردووە، بەڕاددەیـەك کەئـەم زیادەڕەوویانـە بونەتـە مایـەی جیاوازی دروستکردن.

ئەم ڕووداوی خواریشەوە، وەکو نمونەیەك دەگێڕینەوە:

---

[٣٢] راجع: زكريا البيومي – المرجع السابق.

[٣٣] زكريا البيومي – المرجع السابق – ص ٣٠٦.

لەپاش دامەزراندنی ((لیژنەی نیشتمانیی کرێکاران‌و قوتابیان)) (ئەمیش خڕبوونەوەیەکی چەپڕەوانەی جەماوەری بوو، چەند نوێنەرێکی کۆمۆنیست‌و چەپەکانی وەفدی نێو ریزی قوتابیان‌و کرێکارانی گرتبۆوەخۆ، سەرکردایەتی جوڵانەوەیەکی نیشتمانی فراوانیشی کرد، دژی هێزەکانی داگیرکەر، لە۲۱ی شوبات‌و ٤ی ئازاری ١٩٤٦یشدا پێشەوایی چەند خۆپیشاندانێکی گەورەشی کرد) ڕۆژنامەی ئیخوان لە۱۹ی ئازاری ١٩٤٦دا، بڵاوی دەکردەوە کەچەند لیژنەیەکی سەر بەکۆمەڵەکە لەکارگە جۆراو جۆرەکانی ناوچەی شبرالخەیمەدا - گەورەترین ناوچە پیشەسازیەکانی قاهیرە - دامەزراون‌و لیژنەیەکی باڵاش بۆ نوێنەرانی ئەم کارگانە دامەزراوە. ئەمەش وەکو هەوڵێك وابوو لەلایەن ڕۆژنامەکەوە بۆ لێك ترازانی ئەم لیژنە نیشتمانیەی کەسروشتێکی بەرەیی فراوانی هەبوو، هەروەها بۆ سەلماندنی ئەوەش کەئیخوان - ئەو ئیخوانەی لەم لیژنەیە جیابوونەوەو دامەزراندنی ئەوەیان ڕاگەیاند کەناویان نابوو بەرەی نەتەوەیی - لایەنگیریەکیان لەنێو ڕیزی کرێکاراندا هەیە..

بەهۆی ئەمەشەوە، سەرکردەکانی لیژنەی نیشتمانیی گشتی کرێکارانی شبرالخەیمە (ئەم لیژنەیە یەکێك بوو لەهێزە بنەڕەتییە پێکهێنراوەکنی لیژنەی نیشتمانی کرێکاران‌و قوتابیان) بەیاننامەیەکیان دەرکرد، کەتیایدا هاتووە: ((ڕۆژنامەی ئیخوان موسلیمین بڵاوی کردۆتەوە کەلەهەر

کارگەیەکی شبرالخەیمەدا، لیژنەیەك پێا، هێنراوەو لیژنەیەکی بالاش لەم لیژنانە دروست کراوە. لەڕاستیدا سەرەڕای هەوڵی زۆرو چڕوپڕیش لەلایەن ئەم کۆمەڵەوە، بەڵام هیچ لیژنەیەك پێك نەهێنراوە. ئێمەی نوێنەرانی ئەم هەولانەش، کەڕووبەڕووی سەندیکا کرێکاریەکان دەکرێن، چوین، بەڵام هیچ وەڵامێکی گونجاوو شیاومان دەست نەکەوت، بەڵکو بینیمان کەبەشێوازی خاوەن کارو چەوسێنەرەکان دەدوێن. بۆیە ئێمەش لەبەرامبەر ئەمەدا پێمان ڕاگەیاندن کەئێمە قایل نین هیچ لیژنەیەك پێك بهێنرێت .. ئەمەش ڕاستیەکە، بۆڕای گشتی ڕادەگەیەنین))[٣٤].

هەروەها لەو کاتەشدا، ڕێکخراوی سەندیکایی بنەڕتیی میسر ((کۆنگرەی سەندیکا کرێکاریەکانی کۆمپانیا ئەهلیەکان))، بەیاننامەیەکی دەرکرد کەتیایدا هاتووە:

((لەبەرەبەیانی ئەم ژیانەوە نیشتمانیەی ئێستاوە، کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین بەردەوام بووە لەسەر بڵاوکردنەوەی دەسیسەو ڕێکخستنی ئەو پیلانانەی کەبەگشتی دەیانەوێت بزووتنەوە نیشتمانیەکە لەناوبەرن، یاخود لەئامانجە بنەڕەتیەکانی خۆی لای بدەن، کەئەمەش جگە لەئیستعمار خزمەت بەهیچ کەسێکی دیکە ناکات. لەبەرئەوەیش کەلیژنەی نیشتمانی کرێکاران و قوتابیان، لیژنەی ڕەوای نوێنەرایەتی کردنی قوتابیان و

---

[٣٤] محمد حسن أحمد (اسم سري) – الاخوان المسلمون في ميزان الحق (١٩٤٦)– ٩٨.

کرێکـاران و فەرمانبەرانـە، بەشـێوەیەکی سەربەسـت و دیموکراسـیانەش هەڵبژێردراوە، لەپێناو خەباتی چینەکانی گەلیشدا ڕێکخراوە بۆلەناوبردنی ئیسـتعمار .. بۆیـە ئیخـوان بەتایبـەت دژی ئـەم لیژنەیـە پیلانـەکانیان دارشـتووە، دەستیشـیان کـردووە بەبڵاوکردنـەوەی ئـەوەی گوایـا چـەند لیژنەیـەکی تایبـەت بـەخۆیانیان، لـەنێو کرێکـاراندا دروسـت کـردووە .. کۆنگرەکەش و دەستەی نیشتمانیی کرێکاران و قوتابیـانیش ڕایدەگەیەنن و هاوڕێیـانی کرێکـاریش ئاگـادار دەکەنـەوە پـەیوەندی بـەهیچ لیژنەیـەك لـەو لیژنانـەوە نەکـەن کەکۆمـەڵی ئیخـوان پێکـی دەهێنـن، هـەر کرێکـارێکیش پەیوەندیی بەهەریەکێك لەو لیژنانەوە بکات، ئەوا تەنها نوێنەرایەتی خودی خۆی دەکات)).

- بژی لیژنەی نیشتمانی کرێکاران و قوتابیان.
- بڕوخێ فاشیزم.
- بڕوخێ ئیستیعمار)).[٣٥]

ڕووداوەکـانی دوایـش سـەلماندیان کەڕاگەیاندنـەکانی ڕۆژنامـەی کۆمەڵەکـە، سـەبارەت بەدامـەزراندنی چـەند لیژنەیـەکی سـەربەکۆمەڵەکە لەکارگەکانی شبرالخەیمەدا، هیچ ڕوویـەکی ڕاستیان نەبووە. چونکـە هیـچ

---

[٣٥] المرجع السابق – ١٠١.

چالاکییەك بۆئەم لیژنانە وەدەرنەکەوتن، هەرچەندە کۆمەڵەکە بوونێکی سنوورداریشی لەکارگەکانی ئەم ناوچەیەدا هەبوو.

هەردوو نووسەری ((العمال في ضفاف النيل))یش دووپاتی دەکەنەوە:

((سەرکردەکانی کرێکارانی ڕستن و چنینی شبرالخەیمە، کەپابەندبوون بەهێڵی سیاسی لیژنەی نیشتمانی کرێکاران و قوتابیانەوە، دوژمنکاری خۆیانیان نەدەشاردەوە، بەرامبەر ئەو هەوڵانەی ئیخوانییەکان دەیان دا بۆ دزەکردنە ناو ڕیزەکانیانەوە))[٣٦].

ئەو شەپۆلی دژایەتی کردنەی کەدژی ئیخوان بەرزببۆوە، تەنها بەهۆی ئەو چالاکیە سیاسیەوە نەبوو کەدژی هەست و سۆزە نیشتمانیەکان دەکرا، ئەوەی کەئیخوانی کردبووە هاوسەنگەری ئیسماعیل سدقی زۆردارو دژی بزووتنەوە جەماوەرییە میللیەکە داینابوون، ئەو بزووتنەوەیەی کەبەسەرکردایەتی لیژنەی نیشتمانی کرێکاران و قوتابیان ڕووبەڕووی ئیستیعمار ببۆوە. بەڵکو بەهۆی چەند چالاکیەکی دیاری کراوەوە بوو کەڕاستەوخۆ دژی بەرژەوەندیی کرێکاران دەکرا.. وەکو نموونەیەکیش بۆئەم چالاکیانە، توێژەرەکانی ئەومەوەیە، مانگرتنە بەناوبانگەکەی شبرالخەیمە باس دەکەن .. لەئەیلولی ١٩٤٥ دا کۆمۆنیستەکان مانگرتنێکی گشتی و سەرکەوتوویان لەناوچەی شبرالخەیمە بردبەڕێوە، بەشێوەیەك

---

[36] Binin – ibid p. 371.

کەهەموو کارگەکانی ناوچەکە لەکارکەوتن، سەرکردایەتیەکەی نهێنیش بۆ مانگرتنەکە پێك هات، کە پۆلیس نەیدەتوانی بیگاتیٚو ئاشکرای بکات.. لەسەرەتاشدا کۆمەڵەکە پشتی مانگرتنەکەیان گرت، بەڵام هێندەی پێنەچوو لێی کشانەوەو هەڵمەتی دژایەتی کردنەکانیان دەستی پێکرد، بەڵکو چەند نێردراوێکیشیان نارد بۆناوچەکە تا قەناعەت بەکرێکارەکان بکەن وازلە مانگرتنەکە بهێنن، بەبیانووی ئەوەی ((ئایین مانگرتنی حەرام کردووە، چونکە زیان لەخاوەن کارگە مسوڵمانەکان دەدات))[٣٧].

کرێکارەکانی شبرالخەیمەش سەرلەنوێ کەوتنەوە مانگرتن، مانگرتنێکی گشتیترو ڕێکخراو ترکەهەردوومانگی ئایار- حوزەیرانی ١٩٤٦ بەردەوام بوو.. هەر لەسەرەتاشەوە ئیخوان دژی مانگرتنەکە وەستان..

سەرکردەکانی مانگرتنەکەش، ئەندامەکانی کۆمەڵی ئیخوانیان تاوانبارکرد- ڕۆژنامەکانی وەفدیش لەمەدا پشتیان گرتن- بەوەی ((لیستی ناوونیشانی سەرکردە نهێنیەکانی مانگرتنەکەیان داوەتە پۆلیس، دەرەنجامی ئەمەش زیاتر لەسەد سەرکردەی کرێکاری دەسگیرکران))[٣٨].

بەڵام مانگرتنەکە سەرەڕای ئەمەش هەربەردەوام بوو.

---

[٣٧] محمد حسن احمد- المرجع السابق- ص ٩١.

[٣٨] الوفد المصري - ١٩٤٦/٥/٣١.

خاوەن کارگەکانیش بڕیاریان دا گەر کرێکارەکان بەنوسین پەیمان نەدەن کەجارێکی تر پەنا نەبەنەوە بەرمانگرتن، ئەوا ڕێگایان پێنادەن بگەڕێنەوە سەرکار.

ڕۆژنامەی ئیخوانیش پشتگیریی ئەمەی کردو داوای لەکرێکاران کرد ((کۆتایی بەمانگرتنەکە بهێنن و ئەو پەیماننامەیە ئیمزا بکەن کەخاوەن کارگەو نووسینگەی کار داوای دەکەن کەجارێکی تر لەئایندەدا پەنا نەبرێتەبەر چەکی مانگرتن)). هەروەها ڕۆژنامەکە گوتی ((هیوادارە پاش گەڕانەوەی کرێکاران بۆسەر کارەکانیان و ئیمزاکردنی پەیمانەکە، حکومەت کاری پێویست بکات، بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کرێکاران))[39].

بەڵکو ڕۆژنامەی کۆمەڵەکە لەهەوڵی هەڵوەشاندنەوەی مانگرتنەکەدا، یارمەتی دەسەڵاتی داو بەئامانجی پاکتاوکردنی مانگرتنەکە، هەواڵێکی درۆی بڵاوکردەوە، گوتی: ((وەفدێکی کرێکارانی شبرالخەیمە ڕایگەیاندووە کەکرێکاران بەتەمان کۆتایی بەمانگرتنەکە بهێنن))[40].

یەکێك لەڕۆژنامەکانی حیزبی وەفدیش، بەبەیاننامەیەك کەلەسەرکردایەتی مانگرتنەکەوە دەرچووبوو، وەڵامی دانەوەو هەواڵەکەی

---

[39] الاخوان المسلمون ٢/٦/١٩٤٦.

[40] الاخوان المسلمون ٢/٦/١٩٤٦.

بەدرۆخستەوە، دووپاتیشی کردەوە کەئیخون کار بۆ پۆلیس دەکەن‌و لەڕیزی کرێکاراندا سیخوڕی دەکەن.[٤١]

ڕۆژنامەی کۆمەڵەکەش بەردەوام بوو لەسەر پارێزگاری کردنی ئەو هەڵوێستە ئاشکراو ڕاشکاوەی کەئامانجی پاکتاوکردنی مانگرتنەکە بوو، دووپاتیشی کردەوە کە ڕێکخەرانی مانگرتنەکە ((چەند ئاژاوەگێڕێکی لێزانن))[٤٢].

کاتێکیش مانگرتنەکە کۆتایی پێهات‌و حکومەت‌و خاوەن کارەکان دەستیان کرد بەهێرشە گشتیەکەیان، بۆسەر کرێکارەکان بڕیاریای هەڵوەشاندنەوەی سەندیکا کرێکاریەکەی ئەو ناوچەیە دەرچوو، کرێکاران بڕیاریاندا مل نەدەن بەدروست کردنی سەندیکایەکی نوێ، بۆداواکردنی پووچەڵ کردنەوەی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەکەش پەنایان بردەبەر دادگا. زۆر ڕوون‌و ئاشکراش بووکەپێکهاتنی سەندیکایەکی نوێ، واتا بەخاك سپاردنی کێشەکە. بەڵام ئیخوان پێك هێنانی سەندیکایەکی نوێیان بۆ کرێکارەکانی شبرالخەیمە ڕاگەیاندو بەمەش گورزێکی سەختیان ئاڕاستەی داب‌و نەریتی سەندیکایی کرد..[٤٣]

---

[٤١] الوفد المصري ١٩٤٦/٦/٣.

[٤٢] الاخوان المسلون ١٩٤٦/٦/٣.

[٤٣] الاخون المسلمون ١٩٤٦/٧/٥.

کرێکارەکانیش ڕەتکردنەوەی خۆیان بۆئەم هەنگاوە دووپات کردەوە، ئەویش بەوەی خۆیان دابڕی لەم سەندیکایەی کەژمارەی ئەندامەکانی لەتەنها ۲۰۰ ئەندام تێپەڕی نەکرد.[٤٤]

ڕەنگە ئەم چالاکیانەش بەتەواوەتی بەس بووبن، بۆدابڕانی هێڵی ئیسلامی لەجەماوەری کرێکاران، ئیتر هەرچەندیش ئایین کاریگەری لەسەر دەروونیان هەبووبێت و بەتوندیش ڕۆچووبێتە ناوڕیزەکانیانەوە. لەم بارەیەشەوە، دوونوسەری کتێبی ((العمال علی ضفاف النیل)) دەڵێن:

((بارودۆخی بابەتیی چینی کرێکارو شێوازو ڕەفتارەکانی کۆمەڵی ئیخوان موسلیمین لەلەڕیزەکانی ئەم چینەدا، ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەیان بینی لەسەپاندنی سنورداریێتی ڕۆڵی ئیسلامی سیاسی لەبزووتنەوەی کرێکارە میسریەکاندا))[٤٥].

میشێلیش بەهەمان شێوە ئەمەی دووپات کردەوەو گوتی: ساڵی ۱۹٤۸، پاکتاوکردنێکی نۆرینی کۆمەڵەکەی لەنێوکرێکاراندا بەخۆوە بینی.[٤٦]

بەڵام ئیخوان سەرەڕای ئەمەش چەند فاکتەرێکی دیکەی هەبوو، بۆئەوەی بوونێك بۆخۆی لەڕیزی کرێکاراندا بەدی بهێنێت. چونکە ئیخوان کۆمەڵێکی دەوڵەمەندبوو دەرامەتێکی باشی هەبوو، پاشانیش دەستی کردبوو

---

[٤٤] الجماهیر ۱۹٤۷/٥/٥.

[45] Beinin- ibid p. 365.

بەدامەزراندنی ژمارەیەك كارگەی زۆر، كەزۆرجەختی لەسەرئەوە دەكرد كەتەنها ئەندامەكانی كۆمەڵەكەكاری تێدابكەن .. لەئەیلولی ۱۹٤۸یشدا، كۆمەڵەكە ((كارگەی ئیخوان موسلیمین بۆ ڕستن و چنین))ی لەشبرالخەیمە دروست كرد. لەبەرئەوەیش ناوچەی شبرالخەیمە، بایەخێكی زۆری هەبوو، بۆیە محەمەد شەریفی سەرۆكی بەشی كرێكارانی كۆمەڵەكە بەڕێوەبردنی كارگەكەی گرتبووە دەست، كارگەكەش ٤۰ مەكینەو ٦۰ كرێكاری دەگرتەخۆ.[٤٧]

هەر ئەم كارگەیەش نەبوو بەتەنها، لەئەیلولی ۱۹٤۸دا كۆمەڵەكە ئەم كۆمپانیایانەی هەبوو:

- كۆمپانیای ڕۆژنامەگەری ئیخوان.
- كۆمپانیای چاپەمەنی ئیخوان.
- كۆمپانیای ریكلامی عەرەبی.
- كۆمپانیای مامەڵە ئیسلامیەكان.
- كۆمپانیای عەرەبی كانگاو كانە بەردەكان.
- كۆمپانیای بازرگانی و كارەئەندازیاریەكان.
- كۆمپانیای بریكاریە بازرگانیەكان لەسوێس.

---

[46] Mitchell – op. Cit. P. 282.

[٤٧] المصور ۱۱/۱۱/ ۱۹٥٥.

- كۆمپانيای كێڵگەی عەركی (٨٠٠ فەدان)[٤٨].

كرێكارەكـانی ئـەم كۆمپانيايانـەش، هـەموويان بنكەيـەكی زامنيـان بۆكۆمەڵەكە پێك دەهێنا، هەروەها دەوڵەمەندێتی كۆمەڵەكەش (زۆر بەڵگـە هەيـە كەلەلايـەن بيانيـەوە يارمـەتيان دراوە)وای لەكۆمەڵەكـە كردبـوو كەبتوانێت حسابێكی تايبـەت بـۆ كرێكـارە ئەندامـەكان بكـات. ڕۆژنامـەی ئيخوانيش دووپاتی دەكاتەوە كە ((لقی شبرالخەيمەی بەشـی كرێكـارانی كۆمەڵەكـە، مووچـەی تـەواوی بـەو كرێكـارە بـیّ كارانـە دەدا كەئـەندامی كۆمەڵەكە بوون))[٤٩].

سـەير ئەوەيـە، سـەنديكاييەكی چـەپڕەويش، كەمحەمـەد متـەوەلی ئەلشەعراوی‌يەكە يەكێكە لەسەركردەكانی چالاكی سەنديكايی كۆمپانيای ميسـر بـۆ چنينـی ورد لـە (كفرالـدوار)، دووپـاتی دەكاتـەوە ((كەلەسـاڵی ١٩٤٨دا))كاتێك چالاكييە سەنديكاييەكەی خەريك بوو، دەبووە هۆی ئەوەی بشێوی لەنێوان ئەمو كۆكپانياكەدا دروست بكات، ئەم ڕاستەوخۆ پەيوەندی كـردووە بەكۆمـەڵی ئيخوانـەوەو ئابوونـەی دوومانگيشـی داوە، بۆئـەوەی لەڕووی مادديەوە ئاييندەی خۆی زامن بكات))[٥٠].

---

[٤٨] الاخوان المسلمون ١٩٤٦/٥/١٣.

[٤٩] الوفد المصري ١٩٤٦/٥/٢١.

[50] Binin- ibid p.379.

هەروەها کۆمەڵەکە جۆرەها شێوازی فشاریشی بەکاردەهێنا، بۆئەوەی کرێکاران بۆناو ڕیزەکانی خۆی ڕابکێشێت، یەکێك لەڕۆژنامەکانی وەفدیش بڵاویدەکاتەوە (یەکێك لەسەرکردە کرێکاریە ئیخوانیەکانی کۆمپانیای) نیل لەشبرالخەیمە، هەوڵی دا یەکێك لەسەرکردە کرێکارییەکان بۆناو کۆمەڵەکە ڕابکێشێت، بەڵام کاتێك ئەمەی ڕەتکردەوە، لەسەرکارەکەی دەری کرد، کرێکارەکانیش لەناو کارگەکەدا، مانیان گرت و داوای گێڕانەوەی هاوڕێکانیان دەکرد))[٥١].

سەرکردە سەندیکاییەکانی شبرالخەیمەش دەڵێن، لەپاش بەشداری کردنی ئیخوان لەهەرەس پێهێنانی مانگرتنە گەورەکەدا (١٩٤٦)، خاوەن کارگەکان دەستیان کرد بەدامەزراندنی زۆر لەئیخوانەکان و دەیانکردنە سەرکردەی کرێکارەکان، ئەمەش بۆئەوەی دژایەتی کردنی هەر ئاڕاستەیەکی چەپڕەوانە، لەنێو کرێکاراندا زامن بکەن..

کۆمەڵەکەش توانی بەهۆی ئەمەوە، ژمارەیەکی دیاری کراو لەکرێکاران بۆناو ڕیزەکانی ڕابکێشێت، هەرچەندەکە ئەمە ڕق و کینەیەکیشی، لەنێو کۆمەڵی کرێکاراندا بەرامبەر کۆمەڵەکە دروست کرد.

لەوانەشە یەکێك لەو بەڵگە گرنگانەی کەلەسەر لاوازیی چالاکی کرێکاری کۆمەڵەکە هەن، ئەوەبێت کەیاداشتنامەی تەفسیری ئەم فرمانە سەربازییەی

---

[٥١] المرجع السابق.

لە١٩٤٨دا بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەکە دەرچوو، بەدرێژی باسی چالاکیی کۆمەڵەکـە دەکـات، ئـەم یاداشـتنامەیە ئامـاژە بـەچالاکی ئیخوانـی نـاو قوتابیـان و فەرمانبـەران و جووتیـاران دەکـات، بـەڵام تەنـها یـەك ئامـاژەی تێدانیە، بۆ چالاکی نێو کرێکاران یاداشتنامەکە سیانزە بەند دەگرێتەخۆی بەدرێژی باسی چلاکییەکانی کۆمەڵەکە دەکات لەهەموو بوارەکانی ژیاندا: بەڵام تەنها یەك ژمارەی سەبارەت بەکرێکاران تێدانیە.[٥٢]

هـەندێ کەسـیش ئەمـە بـەوە ڕاڤەدەکـەن کـەچالاکی کۆمەڵەکـە لەنێوکرێکاراندا، هەمیشە لە خزمەت و بەئاگاداری دەزگای ئاسایش بووە.

کـاتێکیش کۆمەڵەکـە لـەکۆتایی (١٩٥٠)دا، سـەرلەنوێ چالاکیـەکانی دەستی پێکردەوە، هەوڵیدا هەڵەکانی ماوەی پێشووی دووبارە نەکاتـەوەو شانبەشـانی شـەپۆلە شۆڕشـگێڕیە گڕسـەندووەکەی، کەئاڕاسـتەیەکی شۆڕشـگێڕانەی هـەبوو، بکەوێتـەڕێ و.. بـەزمانی ئـەوانیش قسـە بکـات، بۆئەوەی لەنێو ڕیزی کرێکاراندا، ڕێ و شوێنێك بۆخۆی بەدەست بهێنێت..

بۆیـە سـەید قوتـب زۆری لەسـەر سۆشـیالیزمی ئیسـلامی نووسـی .. گۆڤاری ((ئـەلدەعوە))ش چەندەها گوتـاری بـەتین بڵاودەکاتـەوەو (بۆیەکـەم جـار) هـێرش دەکاتـە سـەر سـەرمایەدارەکان و بـەرگری لـەمافی مـانگرتنی کرێکـاران دەکـات (پێشـتریش جـەختیان لەسـەر ئـەوە دەکـرد کـەدژی

---

[٥٢] الامر العسكري رقم (٦٣) لسنة ١٩٤٨ بحل جماعة الاخوان ٨ ديسمبر ٩٤٧- المذكرة التفسيرية المقدمة من عبدالرحمن بك عمار وكيل وزارة الداخلية.

ڕێنماییەکانی ئیسلامە).. گوتارێکی (محەمەد ئەلفولی)ش هەیە بەناونیشانی ((سەرمایەدارەکان دژایەتی سەندیکاکان مەکەن))، تیایدا هێرش دەکاتەسەر یاسای ١٩٤٠، چونکە ئەم یاسایە پێکهێنانی یەکێتیە کرێکاریەکان قەدەغە دەکات و هەروەها مافی مانگرتنیش نادات بەکرێکاران، کەتاکە چەکە بەدەستیانەوە، بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەو ستەمەی لەلایەن سرەمایەدارەکانەوە لەخۆیان و مافەکانیشیان دەکرێت.[٥٣]

بەڵام ئەم پێشکەوتنە نوێیە، تەنها ماوەیەکی زۆر کورتی خایاندو نۆرینێکی واشی لەنێو کرێکاراندا وەبەرنەهێنا .. کۆمەڵەکەش وادەردەکەوت کەخەریك بوو لەم چینەو لەبەدیهێنانی نۆرینێکی ڕاستەقینە لەڕێزەکانیاندا بێ ئومێد دەبوو، بۆیە لەپاشاندا بایدایەوە بەلای چین و هێزەکانی تردا.

کاتێکیش شۆڕشی تەمموزی ١٩٥٢ ڕوویدا، چەندەها هەڵوێست بەرامبەر مەسەلەی چینی کرێکار هاتبوونە ئاراوە، ئیخوانیش لایەنگری کردنی ئەو گروپانەیان هەڵبژارد کەلەئەوانەی دیکە بۆمافی کرێکاران پارێزراوترو دوژمنکارتربوون.

لەڕۆژەکانی یەکەمی شۆڕشیشدا، د.محەمەد فوئاد جەلال وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی گرتەدەست، ئەمیش واناسرابوو کەیەکێکە لەپیاوەکانی ((کۆمەڵی جووتیار))و ئاراستەیەکی ڕاست ڕەوانەی ئاشکراشی هەبوو. لەلایەن ئەنجومەنی شۆڕشیشەوە عەبدولمنعەم ئەمین،

---

[٥٣] الدعوة ١٩٥١/٨/٢٨.

کەئەفسەرێکی ناسراوبوو بەئاڕاستە ڕاستو ڕەوانەکەیو پەیوەندیە توندو تۆڵەکانی باڵیۆزخانەی ئەمریکییەوە، سەرپەرشتی کارەکانی وەزراەتی دەکرد (هەروەها سەرۆکی ئەو دادگا سەربازیەش بوو کەدادگایی هەردوو کرێکار خەمیسو ئەلبەقەری کرد، بەتاوانی ڕێکخستنی مانگرتن لەکەفرلدەوارو حوکمی سێدارەی بەسەرداادان). سەید قوتبیش کەیەکێك بوو لەسەرکردەکانی ئیخوان، بەدەست نیشان کراوی لەگەڵ ئەم دووانەدا، وەکو یاریدەدەرو ڕاوێژکارێکی کاروباری کرێکاران کەوتە کارکردن.

(فەتحی کامیل)یش کەسەرکردەیەکی سەندیکایی دێرینە، دەگێڕێتەوەکەچۆن جارێك چووە بۆ وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی، بۆئەوەی سەبارەت بەدروست کردنی یەکێتیەکی گشتی بۆ کرێکاران لەگەڵیاندا ڕێکەوتن بکات.. لەکۆبوونەوەکەدا محەمەد فوئادی وەزیرو ئەفسەر عەبدولمنعەم ئەمینی ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشو کەسێکی دیکە ئامادەبوون کەئەم لەسەرەتادا نەیناسیوە، پاشان زانیویەتی کەسەید قوتبە .. فەتحی کامیل دەڵێت سەید قوتب لەهەموو ئەوانەی دیکە زیاتر بیرۆکەی پێکهێنانی یەکێتیەکی گشتی ڕەت دەکردەوەو جەختیشی لەسەر ئەوە دەکرد کەپێویستە سەندیکاکان پێش هەمووشتێك ڕیزەکانیان لە کۆمۆنیستەکان پاك بکرێتەوە.[٥٤]

ڕەنگە پێویستیش بێت ئاماژە بەوە بکەین، کەکۆمەڵەکە لەکاتێکدا لەپشت پەردەوە چەند هەڵوێستێکی دژ بەکرێکارانی وەردەگرت، لەهەمان

---

[٥٤] امين عزالدين – تأريخ الطبقة العاملة منذ نشؤها في سنة ١٩٧٠ ص ٨٠٩.

کاتیشدا – وەك لەپێشتریشدا بینیمان – لاڤ بەسەر هەمواندا لێدەداو وای ڕادەگەیاند کەبەرگری لەکرێکاران دەکات.

پێدەچێت زەرور بێت ئیخوان‌و چەپڕەوەکان لەهەموو جێگەیەکی کرێکاریدا ڕووبەڕووی یەك ببنەوە .. ئەوەتا بەهۆی دەستێوەردانی ڕاشکاوی نوێنەری کۆمەڵەکەوە، لای وەزیری کاروباری کۆمەلاّیەتی، سەبارەت گرێبەستی چەند بۆچوونێکی دژ بەکرێکاران، وەك جەخت کردن لەسەر هێشتنەوەی ماددەی ۳۹ی یاسای بەستنی کاری تاکەکەسی، کەبەپێی ئەم یاسایە ڕێگا بەفەسڵ کردنی زۆرەملێیانەی کرێکاران دەدرێت .. خالید محێدین، کەیەکێك بوو لەسەرکردە چەپڕەوە دیارەکان، لەبزوتنەوەی ئەفسەرانداو ئەندامی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بوو، وەکو ناقایلی دەربڕینێك دەست لەکارکشانەوەی خۆی لەئەنجومەن ڕاگەیاند .. لەگوتاری دەست لەکار کێشانەوەکەشیدا هاتووە ((من ئەو هێزەم لەدەست داوە کەپاڵی پێوەدەنام بۆ کارکردن، ئەمەش دەرەنجامی ئەوەی دەبینم ناتوانم بچووکترین شت لەو بۆچوون‌و مەبدەئانە بەدی بهێنم کەدەرونم حەزی پێدەکات))، هەروەها تیایدا ڕەتکردنەوەی خۆیشی ڕاگەیاندووە، بۆئەم یاسایەی کەبەستەمێکی گەورەی لەقەڵەم دەدات، سەبارەت بەکۆمەڵی کرێکاران، کەبەبڕبڕەی پشتی هەر نەتەوەیەك دادەنرێت کەبیەوێت شوێن‌و پایەی گونجاوی خۆی، لەنێوان نەتەوەکاندا بنیات بنێت.[٥٥]

---

[٥٥] رسالة خطية موجهة من خالد محي الدين عضو مجلس الثورة الى حضرة المحترم جمال عبدالناصر وكيل مجلس الثورة – مؤرخة ١٩٥٣/٣/١ (مسودة خطية).

جـاریکی تریـش ئاراسـتەی ئیخوانـی لەبـەردەم کریکـاراندا شکسـت دەهێنێت.

چونکـە دەسـت لـەکار کێشـانەوەکەی خـالید محێدیـن توانـی جـەمال عەبدولناسر، کەئامادە نەبوو لەوکۆبوونەوەیەی ناکۆکیەکەی تیا ڕوودابوو، بۆلای خۆی ڕابکێشێت .. ئینجا کۆبوونەوەیەکی نوێ بەستراو هەڵوێستێکی نـوێ وەرگـیرا. نۆریـنی سـەید قوتبیـش لـەبواری وەزارەتـی کاروبـاری کۆمەڵایـەتیدا، دەسـتی بەکـەم بوونـەوە کـردو هێنـدەی پێنـەچوو لەپلەوپایەکەی خۆی دوورخرایەوە..

لەوانەشە چەند هەڵوێستێکی لـەم جـۆرە ، بەهـەمان شێوە ڕەنگدانەوەی نێگەتیڤانەی لەسەر پەیوەندی نێوان ئیخوان و کرێکاران هەبووبێت..

دەشـتوانرێت بگوترێـت ئـەم پەیوەندیـە بـەردەوام سنووردرابووە هـەتا ئێسـتاش هـەر سـنووردارە، چونکـە سـەرەڕای بەرزبوونـەوەی تـەوژمی ئیسلامی و زیادبوونی نۆرینی کۆمەڵە ئیسلامیەکان، هـەروەها ئیخوانیـش لـەنێو چینـە جیاوازەکـانی کۆمەڵگـەدا، سـەرەڕای نۆریـنی ئیخوانیـش لەژمارەیـەك لەسـەندیکا پیشـەیەکاندا (ئـەندازیاران – پزیشـکان). بـەڵام پـاڵێوراوە ئیسـلامیەکان لـەم هەڵبژاردنانـەی دواییـدا کـەبۆ سـەندیکا کرێکاریەکان کران، دۆڕانێکی زۆر سەختیان بەدەست هێنا.

ڕەنگە هەموو ئەوانەش، دابڕاونەبن لـەکۆی هەڵوێستەکانی کۆمەڵەکە، چ هەڵوێستە ئایدۆلۆژیەکانیان یاخود کرداریەکانیان.

## کتێب و بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری لە ساڵی ٢٠٠٢ دا

## چاپ و هاوکاری کردوون

| ز | ناوی کتێب | ناوی خاوەن کتێب | جۆری کتێب | چاپ/ هاوکاری |
|---|---|---|---|---|
| ١٢٢ | قاوەیەك لەگەڵ ئەودا | کەژاڵ ئەحمەد | شیعر | چاپکردن |
| ١٢٣ | قریوە | هۆشیار بەرزنجی | شیعر بۆ منداڵان | چاپکردن |
| ١٢٤ | پێنج هەستەکە | و.مەلا بەهادین | زانستی بۆ منداڵان | چاپکردن |
| ١٢٥ | ئینسکلۆپیدیای (کەڵەفەرهەنگی وێنەداری مەعدەنەکان) | کەمال جەلال غەریب | فەرهەنگ | چاپکردن |
| ١٢٦ | حیکایەتەکانی بەفر | شیرین. ك | چیرۆك | چاپکردن |
| ١٢٧ | دیلاڤۆ مام گورگ | ساکار شریف | چیرۆکی منداڵان | چاپکردن |
| ١٢٨ | کۆمەڵە وتارێك دەربارەی کێشەی ژن | سەروەر کەریم | کۆمەڵە وتار | چاپکردن |
| ١٢٩ | ژن و گەڕان بەدوای ناسنامەدا | سۆزان مامە | کۆمەڵە وتار | چاپکردن |
| ١٣٠ | توندوتیژی خێزانی | و. ئاوات محەمەد | کۆمەڵایەتی | هاوکاری |
| ١٣١ | بیرەوەریەکانی دار کنارەکە | هاوڕێ سوپا | بیرەوەری | چاپکردن |
| ١٣٢ | کاریگەری هونەری ریپۆرتاژ لەرۆژنامە کوردیەکاندا | بەناز کوێستانی | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ١٣٣ | چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی رۆژنامەوانیی کوردی | نەوشیروان مستەفا | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ١٣٤ | ئازادی لەرۆژنامەگەری حزبیدا | کاروان عەلی | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ١٣٥ | بلندی گیان و خود پەرستی | شێخ سالار شێخ عەلی | ئاینیی | هاوکاری |
| ١٣٦ | ئەستێرە گەشاوەکانی رۆژنامەگەری کوردی | مارف ناسراو | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ١٣٧ | مەرگی وەنەوشە | یاسین قادر بەرزنجی | رۆژنامەگەری | چاپکردن |
| ١٣٨ | ژانی گەل | ئیبراهیم ئەحمەد | رۆمان | چاپکردن |
| ١٣٩ | زنجیرەی هەزارو یەك پرسیار (زەوی) | و/ حەسەن عەبدولکەریم | زانستی منداڵان | چاپکردن |
| ١٤٠ | تاریخ السلیمانیه و انحائها | ت/ محمد جمیل بندی | مێژوو | چاپکردن |
| ١٤١ | زەماوەندی خوێن | و/عەزیز گەردی | شانۆگەریی | چاپکردن |

| ١٤٢ | نیشتیمانی ماسی | و/فوئاد قەرەداغی | چیرۆکی منداڵان | چاپکردن |
|---|---|---|---|---|
| ١٤٣ | هەندێ لەبیرەوەرییەکانی بەهیەخان | ئا : لوتفیە ئیبراهیم ساڵح | بیرەوەری | چاپکردن |
| ١٤٤ | مێروولەی هونەرمەند | و: فەلاح کەریم | چیرۆکی منداڵان | چاپکردن |
| ١٤٥ | رەشەبای ژەهرو ئەنفال | عەبدوڵلاکەریم | مێژوویی و بەڵگەنامەیی | چاپکردن |
| ١٤٦ | بەرەو ئەشکەوتی دلێران | گەلاوێژ | رۆمان | چاپکردن |
| ١٤٧ | گەشت بەرەو بیابانی پڕ لەمەترسی | و: دلاوەر عەبدوڵلا | چیرۆکی زانستی منداڵان | چاپکردن |
| ١٤٨ | شازادە هۆشمەندەکانی پاشای سەرەندیب | مستەفا رەشید ساڵح | چیرۆك | هاوکاری |
| ١٤٩ | داستانە جیهانییە هەرە گەورەکان | و: د. کاوس قەفتان | داستان | چاپکردن |
| ١٥٠ | گۆڤاری پەیامی مرۆڤایەتی ژمارە ( ١٤ ) | مەکتەبی مافی مرۆڤ | گۆڤار | چاپکردن |
| ١٥١ | جوگرافیایئابووری نەفت لەکوردستاندا | د. عەبدوڵلا غفور | ئابووری | چاپکردن |
| ١٥٢ | دوو بووكو دوو زاوا | و. کامیار | منداڵان | چاپکردن |
| ١٥٣ | تیرۆرو توندرەوی | لەتیف فاتح فەرەج | توێژینەوە | چاپکردن |

# ناوەڕۆك

نووسەر ئەم دێڕانەی خوارەوەی
بەتایبەت بۆ بەرگی ئەم وەرگێڕانە
کوردیە ناردووە

الأستنارة فعل والتزام وليست مجرد قول. فثمة فارق كبير بين أن يكون الإنسان مستنيرا لنفسه وبنفسه، وأن يكون تنويريا يحمل فكره الى جوار رأسه على كفيه، صارخا ضد التأسلم رافضا الإتجار بالدين، وخلط الدين الكلي الصحة الذي هو منحة للبشرية، بالأفكار المتأسلمة المشوشة التي تختطف الدين لصالحها محاولة الإتجار به، و التستر خلفه لتحقيق مكاسب سياسية. انهم يتطلعون الى الحكم وليس الى السماء. ومن هنا فالتنوير معركة، قد تكون صعبة، وقد تكون مريرة لكنها وبالقطع ضرورية، بدونها سنخسر ديننا و دنيانا.

د. رفعت السعيد

# HASAN AL- BANNA

## When .. How .. Why

Written by ; D. Rafat Al- Saeed

Translated by: Jabar Omar